# بنەما گشتییەکانی
# یــــاسای نێودەوڵەتـــــی

**پ. ی. د. تالیب رەشید یادگار**




**٢٠١٣**



**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بلاوکردنەوە**

- **بنەما گشتییەکانی یاسای نێودەوڵەتی**
- **نووسینی: پ.ی.د. تالیب رەشید یادگار**
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: رێمان
- **نرخ:** ٥٠٠٠ دینار
- **چاپی دووەم** ٢٠١٣
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٦٠٥)ی ساڵی (٢٠١١) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧٩٥)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ ﴾

صدق الله العظيم

سورة الحجرات الآية ١٣

# نــاوەڕۆك

# دەستپێك

ئامانج لە دانانی ئەم کتێبە، جگە لە دەوڵەمەندکردنی سەرچاوەکانی یاسای نێودەوڵەتی بە زمانی کوردی، سوودگەیاندنە بە خوێندکارانی یاسای نێودەوڵەتی، وەك قوتابیانی سەرەتای زانکۆ و خوێندنی باڵا لە کۆلێجەکانی یاسا و رامیاری و کۆلێجەکانی پۆلیس و پەیمانگەی پێوەندیی نێودەوڵەتی و پسپۆر و سیاسەتمەداران و کارمەندان لە بواری نێودەوڵەتیدا.

لە دانانی ئەم کتێبە، بەپێی توانا، هەوڵمداوە پشت بە گرینگترین و نوێترین سەرچاوەی رەسەن ببەستم، وەك: پەیماننامە و رێککەوتننامە نێودەوڵەتی و بڕیاری دادگە نێودەوڵەتییەکان و بۆچوونی گەورە یاساناسان لە جیهاندا بە زمانەکانی کوردی و عەرەبی و بولگاری و ئینگلیزی و رووسی.

پێشەکی داوای لێبووردن دەکەم بەرامبەر ئەو هەڵانەی بەرچاوی بەڕێزتان دەکەون. چونکە کەمی سەرچاوە بە زمانی کوردی و دەستەواژەی بڕیاردراو لەم بوارەدا، رەنگە وەهای کردبێت چەند دەستەواژەیەکی جیاوازم بە زمانی کوردی بەکارهێنابێ بۆ دەستەواژەیەك بە زمانەکانی دیکە.

هەرچەندە ئەم بەرهەمە، بە ئاسانی نەهاتووەتە کایەوە، بەڵام خوازیارم جێگەی رەزامەندی قوتابیان و خوێندکاران و کەسانی پێوەندیدار بێت لە بواری نێودەوڵەتی و یاریدەدەر بێت لە کارەکانیاندا.

به پێویستی دەزانم، لێرە پڕ بە دڵ، سوپاسی هاوڕێی بەڕێزم مامۆستا **هیمەت عەزیز** بکەم، کە یارمەتییەکی زۆری داوم لە وەرگێڕانی تێکستی عەرەبی و داڕشتنی زمانەوانی کوردی.

لە راستیدا ئەم کتێبە بەم شێوەیە دەرنەدەچوو، ئەگەر یارمەتی (**نەجاح**)ی هاوسەرم نەبوایە و ئەو لەسەر کۆمپیوتەر تایپی نەکردایە، بۆیە سوپاس و پێزانینی خۆمی ئاراستە دەکەم.

جێگەی سوپاسی گەرمە ئەگەر هەر یەکێك سەرنج و تێبینییەکی هەیە لەسەر ئەم کتێبە، ئاگادارم بکاتەوە.

د. تالیب رەشید یادگار
هەولێر : ٢٠١١
drtalibr@yahoo.com

# دەستپێکی چاپی دووەم

به باشمزانی پێداچوونەوەیەك بۆ ئەم کتێبە بکەم دوای ئەوەی چەند یاساناس و زمانناسێك هەندێ تێبینییان لەسەر دا. وێڕای ئەوەش خۆیشم بڕیارمدا هەندێ بابەتی نوێ بخەمە پاڵ ئەو بابەتانەی پێوەندییان بە کوردستانەوە هەیە. بەم جۆرە لە بەشی پێنجەم سێ بابەتی گرینگم بۆ تەوەری دووەم زیادکردووە: ١) مافی جیابوونەوەی"الانفصال" هەرێمی کوردستان. ٢) دەوڵەتە داخراوەکان Landlocked States، بەو پێیەی کوردستان وڵاتێکی داخراوە، واتە لەسەر کەناری دەریا نییە. ٣) مەندات Mandate و کوردستان.

لای هەمووان ئاشکرایە کە دەستەواژەی بڕیار لەسەردراو بۆ هەندێ دەستەواژەی یاسایی لە زمانی کوردیدا نییە. بۆیە بە بەراورد لەگەڵ ئەو زمانانەی دەیانزانم یان دەتوانم بەکاریان بێنم لە رووی سەرچاوەوە، چەند دەستەواژەیەکم بەکارهێناوە و پێم وایە دەقاودەق واتاکانی خۆیان بە زمانەکانی دیکە دەگەیەنن. لە هەمانکاتدا چەند دەستەواژەیەکی بیانیم بەکارهێناوە، کە لەسەر ئاستێکی فرەوان و لە لایەن گەلانێکی زۆرەوە بەکاردێن. بۆ نموونە من دەستەواژەی "نۆرم "م بەکارهێناوە بۆ Norm" "ی ئینگلیزی و زۆرینەی وڵاتە ئەورووپاییەکان و"Hopm"ی رووسی و زۆرینەی زمانە سلاڤییەکان و "القاعدة"ی عەرەبی. هەروەها پێم وایە وشەی "دانپێدانان"، نە لە رووی رواڵەتییەوە و نە لە رووی ناوەڕۆکەوە، بە تەواوەتی گوزارشت لە دەستەواژەی "الاعتراف"ی عەرەبی و "Recognation" ئینگلیزی و признание""ی رووسی ناکات. بۆیە بۆ دەستەواژەی "الاعتراف"ی عەرەبی و Recognation ""ی ئینگلیزی و признание"" "پریزنانیێ"ی رووسی و بولگاری و سربی و کرواتی و " Uznání"" ئوزنانی"ی چیکی و پۆلۆنی و "Визнання " "ڤیزنانیا"ی ئۆکراینی دەستەواژەی "پێزانین"م بەکارهێناوە. وەك دەبینن نێزیکترین دەستەواژە بۆ زمانی کوردی دەستەواژە سلاڤییەکانن، کە بەرامبەرەکەی لە کوردیدا دەقاودەق دەستەواژەی "پێزانین"ـە.

الحصانە ی عەرەبی و immunity ئینگلیزی و имунитет ی رووسی لە یاسادا بەو واتایە دێت، کە ئەو کەسەی (حصانە)ی هەبێت یاسا نایگرێتەوە یان دادگەیی ناکرێ. ئەمەش سەبارەت بە دیپلۆماتکاران و هاوشێوەکانیان بە یاسای نێودەوڵەتی، سەبارەت بە

کەسایەتییەکانی ناوەخۆی دەوڵەتی پێوەندیدار بە یاسای ناوەخۆ ڕێکدەخرێت. منداڵبووم دەیانوت شێخ مەحمودی نەمر "گوللەبەندی" هەبووە، واتە گوللە کاری لێ نەکردووە. بە هەمان شێوەش دەکرێت بڵێین دیپلۆماتکارەکان و پەرلەمانتارەکان "یاسابەندییان"هەیە. بۆیە بۆ "الحصانە"ی عەرەبی و immunity ئینگلیزی و иммунитетی رووسی دەستەواژەی "یاسابەند"ی کوردی رەسەنم بەکارهێناوە.

جارێکی دی هیوادارم ئەم کتێبە بەسوودبێت بۆ ئەو کەسانەی گرینگی بە یاسای نێودەوڵەتی دەدەن، بەتایبەتی قوتابیان و خوێندکارانی خۆشەویست.

پ.ی. د.تالیب رەشید یادگار

کەرکوک ـــ ئایاری٢٠١٣

## باسی یەکەم

# پێناسەی یاسای نێودەوڵەتیی گشتی

راو بۆچوون لەبارەی پێناسەکردنی یاسای نێودەوڵەتیی جیاوازن، ئەویش لە جیاوازیی سەبارەت کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی و سەرچاوەی سزا و شێوازی دارشتنی نۆرمەکانی و سیفەتی ئیلزامییان و پێوەندیی لەنێوانی ئەم یاسایە و نێوان یاسای نێوەخۆییەوە هاتووە.

لایەنی رێبازی باو "تەقلیدی" Traditional Doctrines لە پێناسەکردنیاندا بۆ یاسای نێودەوڵەتی، جەختیان کردۆتە سەر دەوڵەت، چونکە پێیان وایە دەوڵەت تاکە کەسی یاسای نێودەوڵەتییە. ئەم پێناسەیە وەکو رەنگدانەوەیەك هاتووە بۆ سەرهەڵدانی دەوڵەتە نەتەوەییەکان لە ئەورووپا لە سەدەی حەڤدەمین و پێکەوەنانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی ئەورووپایی. بۆیە پێرەوانی ئەم تیۆرییە تەنیا دانیان بە دەوڵەتدا ناوە وەك کەسی یاسای نێودەوڵەتی. بۆیە بەو شێوەیە پێناسەی یاسای نێودەوڵەتییان کردووە، کە بریتییە لەو کۆمەڵە نۆرمە• یاساییانەی، کە پێوەندییەکانی نێوان دەوڵەتەکان رێك دەخەن، واتە تەنیا لە ماف و ئەرکی دەوڵەتەکان دەکۆڵێتەوە[1].

پێرەوانی رێبازی بابەتی Positive theory پێیان وایە: تاك، تاکە کەسی یاسای نێودەوڵەتی و ئەو دوای لقەکانی یاسایە، چونکە یاسا رووی دەمی دەکاتە ئەو تاکە کەسانەی کە تەنیا هەر خۆیان ئیرادەی سەربەخۆییان هەیە. ئەوانەش دان بەکەسی مەعنەویدا نانێن، چونکە ئەو ئیرادەی سەربەخۆی نییە، کە مەرجێکی پێویستە بۆ دانپێدانان بە کەسی یاساییدا. لێرەشدا رەتیان کردۆتەوە بە دەوڵەتدا دانبنێن وەك کەسێکی یاسایی نێودەوڵەتی، پێیان وایە تاك، تاکە کەسی یاسایی نێودەوڵەتییە.

---

• لە جیاتی "قاعدة قانونیة"ی عەرەبی دەستەواژەی"نۆرم" "норм" ""norm"ی ئینگلیزی و رووسی و زۆرینەی زمانە سلاڤییەکان لێرە بەولاوە بەکاردەهێنم.

1- Lauterpacht. H ,International Law , Collected Papers, Vol 1. General Works. Cambridge , 1970, p.489 and L.Oppenheim. International Law, 8th.ed. London. 1963. T.1, p.4

جەنگی سارد لە پێناسەکردنەکانی هەندێك لە زانایانی بەرەی سۆشالیستی پێشوودا ڕەنگیداوەتەوە. دەبینین دکتۆر (تونکین) دەڵێت: یاسای نێودەوڵەتیی بریتییە لەو کۆمەڵە نۆرمە یاساییانەی دەوڵەتەکان بە ڕێککەوتنی ئیرادە هاوبەشەکانیان دایانناوە بۆ بەڕێوەبردنی پێوەندییان لە پرۆسەی خەبات و هاوکارییاندا بە ئامانجی پاراستنی پێکەوەژیانی ئاشتییانەی دەوڵەتانی هەردوو جەمسەر و لە کاتی پێویستیشدا بەو فشارە زۆرەملێیە دەپارێزرێ، کە دەوڵەتەکان بە شێوەی یەکلایەنە یان بەکۆمەڵ پیادەی دەکەن[2].

دوای ئەو پەرەسەندنەی لە سەدەی نۆزدەهەم روویدا لە رووی فرەوانبوونی پێوەندیی نێودەوڵەتییەوە و بەستنی چەندین پەیمان و ڕێککەوتننامە و کۆنگرەی نێودەوڵەتی و دامەزراندنی دەزگەی نێودەوڵەتی پاش یەکەمین شەڕی جیهانی وەك: کۆمەڵەی گەلان و دادگەی نامژی نێودەوڵەتی هەمیشەیی، ئەمانە هەموو بوونە هۆی سەرهەڵدانی بۆچوونی نوێ، کە سەیری یاسای نێودەوڵەتیی لە چوارچێوەی مێژوویی خۆیدا دەکات و جەخت دەکاتە سەر خوێندنەوەی مێژووی دیپلۆماتی و تیۆری یاسای نێودەوڵەتی. [3]

بەم شێوەیە دەبینین یاسای نێودەوڵەتی ئەوەندە لە پەرەسەندنە، خەریکە لەو ئاستە نێزیك ببێتەوە و ئەو پەرەسەندنە گەورانە بگرێتەخۆ کە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بە سەر کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا هات.

لەبەر رۆشنایی ئەم هەموو گۆڕانکارییانە، بۆچوونە نوێیەکان پێیان وایە کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتیی ئەمانەن: دەوڵەتەکان، ئەو گەل و نەتەوانەی لە پێناو سەربەخۆییاندا خەبات دەکەن، هەروەها ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و قەوارە هاوشێوەکانی دەوڵەت، تا ڕادەیەکیش تاك. ئەمانە بەشداری دەکەن لەو پێوەندییە نێودەوڵەتییانەی، کە ماف و پابەندبوونی نێودەوڵەتییان لێ دەکەونەوە، کە بەپێی نۆرمی یاسای نێودەوڵەتیی گشتی و لە چوارچێوەیدا پیادە و جێبەجێیان دەکەن. لە بەرئەنجامی هەموو ئەمانە بۆمان دەردەکەوێ: یاسای نێودەوڵەتیی بریتییە لە کۆمەڵێك پرەنسیپ و نۆرمی یاسایی کە لە لایەن دەوڵەتەکان و ئەو دوای کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتیی گشتییەوە داڕێژراون بە ئامانجی پاراستنی ئاشتی و ئاسایش و هاوکاری نێودەوڵەتی، لەکاتی پێویستیشدا بە پەنابردنە بەر هێز لەلایەن دەوڵەتەکانەوە بە کۆمەڵ یان بە شێوەیەکی یەکلایەنە، دەپارێزرێ.

---

2- G.T. Tunkin, Co- existence and International Law,95 HR, pp. 1,51 .
3- B.S. chimni, International Law and world order, newDelhi , 1993

تایبەتمەندیی یاسای نێودەوڵەتیی ئەوەیە، کە سیستەمێکی یاسایی سەربەخۆیە و لەگەڵ سیستەمە یاساییەکانی دیکەدا جیاوازی هەیە، ئەرکە بنەڕەتییەکەشی ڕێکخستنی ئەو پێوەندییانەیە، کە لە هەموو بوارەکانی پێکەوە ژیانی نێودەوڵەتیدا دێتەئاراوە. بەم پێیە یاسای نێودەوڵەتیی هەر ئەوە نییە ئیرادەی خۆیەتی دەوڵەتەکان بەرجەستە بکات، بگرە بەرجەستە لە هۆکارە بابەتییەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیش دەکات.

گەوهەری یاسای نێودەوڵەتی، تیۆریی هاوڕازیبوونی ئیرادەی (توافق الارادات) لەخۆگرتووە، کە پێی وایە تاکە ڕێگە بۆ دانانی نۆرمی یاسایی نێودەوڵەتی مولزەم بۆ دەوڵەتان، ئەو ڕەزامەندییەیە کە گوزارشت لە ئیرادەی دەوڵەتەکان دەکات، بەڵام ئیرادەی دەوڵەتەکان تاکە پێوەری یەکلاکەرەوە نییە لەم بوارەدا، چونکە دانانی نۆرمی یاسایی نێودەوڵەتی تا ڕادەیەکی زۆر لەژێر کاریگەری کۆمەڵێك هۆکار و بارودۆخی بابەتی دەبن، کە ئەمانەش ڕەنگدانەوەیان دەبێت لەسەر پێکهاتنی ئیرادەی یاسایی دەوڵەتەکان. وەکو گوتیشمان چەند هۆکارێکی جیاجیا کاردەکەنە سەر پەرەسەندنی یاسای نێودەوڵەتی و پێکهاتنی نۆرمەکانی وەك: پەرەسەندنی ئابووری، نەریت، خوو و ڕەوشتی گشتی، بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان، زانستە تەکنیکییەکان و کێشە جیهانییەکان و...هتد.

یاسای نێودەوڵەتیی لە پەرەسەندنی مێژوویی خۆیدا و پێکهاتنی نۆرمەکانیدا کاریگەریی چەند هۆکارێکی جیاجیای بە سەرەوە بووە. وەك: کاریگەریی پێوەندییە کۆمەڵاتییەکان، شەڕوشۆڕ و ڕووداوی مێژوویی بەتایبەتی ئەو ڕۆڵەی کلێسای کاسۆلیك و ئەرسەدۆکس و ئاینی ئیسلام گێڕاوییانە لە ژیانی نێودەوڵەتیدا.

یاسای نێودەوڵەتی پێکهاتەیەکی تایبەتی دانپێدانراوی نییە، بەڵام هەموو توخمەکانی یاسای نێودەوڵەتیی وەکو پرەنسیپ و نۆرم و دەزگە نێونەتەوەییەکان، هاوبەندن لە چوارچێوەی سیستەمێکی یاسایی نێودەوڵەتیدا، کە ئەم تایبەتمەندییانەی هەیە:

١- پرەنسیپ و نۆرمە یاساییە نێودەوڵەتییەکان دابەش دەبن بۆ پرەنسیپ و نۆرمی نێودەوڵەتی و بۆ پرەنسیپ و نۆرمی هەرێمی و دەڤەری تایبەت.

٢- لە ڕووی هێزی ئیلزامییەوە دابەش دەبن بۆ نۆرمی فەرماندەر imperative، کە سیفەتی ئیلزامی هەیە، هەروەها بۆ نۆرمی نافەرماندەر Dispositive کە مولزەم نییە.

٣- پرەنسیپە گشتییەکانی یاسای نێودەوڵەتیی هێزێکی ئیلزامی گشتییان هەیە Jus

cogens که بە نێوەڕۆکی یاسای نێودەوڵەتیی دادەنرێ و کاریگەرییەکی گەورە دەکاتە سەر پەرەسەندنی یاسای نێودەوڵەتیی لە رووی یاساییەوە.

٤- یاسای نێودەوڵەتیی چەند بەشێکی لاوەکیی لێ دەکەوێتەوە و هەر بەشێکیان لە کۆمەڵێك نۆرمی یاسایی نێودەوڵەتی پێك دێ، هەر کۆمەڵێك لەمانە چەند پێوەندییەکی نێودەوڵەتیی لە یەك جۆر رێك دەخەن، سەرچاوەیان دەگەڕێتەوە بۆ پرەنسیپ و نۆرمە پەیمانی و عورفییە گشتییەکان، کە لە یاسای نێودەوڵەتیدا و بڕیارەکانی رێکخراوە نێودەوڵەتی و دەزگە دادییە نێونەتەوییەکاندا هەن و هەر لقێکیش سەرەڕای ئەوەی بەشێکە لە سیستەمی یاسای نێودەوڵەتی چەند لقێکی باوی "تەقلیدی" هەیە، وەك: یاسای پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان و یاسای دیپلۆماتی و کونسوڵی و یاسای دەریایی نێودەوڵەتی و هەروا ئەو دوای لقە نوێیەکانی وەك: یاسای رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و یاسای مافی مرۆڤ و یاسای ئاسمانی نێودەوڵەتی و یاسای ژینگەی نێودەوڵەتی و یاسای تاوانی نێودەوڵەتی.

٥- هەندێك لە بابەتەکانی یاسای نێودەوڵەتی، بەو پێیە، کە کۆمەڵێك نۆرمی یاسایین، رەنگدانەوەی تایبەتمەندیی یاسای نێودەوڵەتی گشتین، وەکو بابەتی دانپێدانانی نێودەوڵەتی و میراتگری نێودەوڵەتی و بەرپرسیاریێتی نێودەوڵەتی و ناوبژیوانی نێودەوڵەتی.

٦- ئەو نۆرمانەی لەو دوکومێنتانەدا دێن کە لە دەزگە و رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانەوە دەردەچن، وەك: بڕیار و بەیان بەشێوەی راسپاردە، مەودای فرەوانتریان هەیە و پێشکەوتووتر و هەماهەنگترن لە رووی پاراستنی مافی مرۆڤەوە. بۆیە بە بنەمایەکی پتەو دادەنرێن بۆ داڕشتن و پەسندکردنی دوکومێنتی نێودەوڵەتی ئیلزامی گرینگ.

٧- ئەو نۆرمە کۆمەڵایەتییانەی لە توێیاندا نۆرمی نەریتی نێودەوڵەتی و ڕەوشتمەندی و موجامەلەی نێودەوڵەتییان هەڵگرتووە، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کاریگەرییان هەیە بۆ دانان و داڕشتن و پەسندکردنی نۆرم و پرەنسیپی یاسای نێودەوڵەتی.

## باسی دووەم

## سیستەمی نێودەوڵەتی و پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان

یاسا گوزارشت لە یەکسانی و دادوەری و ئازادی دەکات. بەم واتایە، بیرۆکەی یاسا واتە بیرۆکەی بەرقەراری سیستەم و دوورکەوتنەوە لەو ئاژاوە و بێسەروبەرییەی، کە لەگەڵ دادوەری و بوونی سەقامگیری مرۆڤدا ناگونجێت. یاسا رۆڵێکی بنەڕەتی گێڕاوە لە کاروانی دوورودرێژی مرۆڤایەتیدا. چونکە هەر کۆمەڵگەیەك چ گەورە یان بچووك، پێشکەوتوو یان دواکەوتوو، کۆمەڵێك پرەنسیپی بۆ خۆی دارشتووە تاوەکو بتوانێ بە گوێرەیان ژیان و پێشکەوتنی خۆی رێك بخات. ئەوەی بۆی هەیە بیکات و ئەوەی بۆی نییە بیکات. کاری رێدراو و کاری قەدەخە. پێشکەوتن ئەگەرچی سەخت و هێواش بووبێ، کۆشش و هاوکاریی کۆمەڵێك پیاو و ژنە، کە لە پێناو وەدیهێنانی ئامانجی هاوبەش لەسەری رێککەوتوون، وەك: راوکردنی ئاژەڵ یان کۆکردنەوەی بەروبوومی دار، یانیش تەنیا بە ئامانجی کۆکردنەوەی ماڵ و سامان.

یاسا ئەو توخمەیە کە ئەندامەکانی کۆمەڵگە یەکدەخات لە رووی ملکەچییانەوە بۆ کۆمەڵێك بەها و پرەنسیپی دارێژراو. لەم روانگەیەوە یاسا دوو لایەنی لێ دەکەوێتەوە:

یەکەمیان: رێگەدان بە تاکەکانی کۆمەڵگە بۆ بونیادنانی چەند پێوەندییەکی یاسایی تایبەت، کە چەندین ماف و ئەرکی لێ دەکەوێتەوە وەك گرێبەست.

دووەمینیشیان: ملکەچییە بۆ یاسا و سزادانی ئەوانەی سەرپێچی لە بڕیارەکانی دەکەن، واتە یاسا برێتییە لە کۆمەڵێك نۆرم کە رەوشت رێك دەخەن و تا رادەیەکیش رەنگدانەوەی چەمك و وێناکانی ئەو کۆمەڵگەیەن کە ڕێکی دەخات.

کۆمەڵێك سیستەمی جیاجیا هەن، بەشێکیان ناوەخۆیی و بەشێکیان نێودەوڵەتین، بەڵام ئەوەی لێرە مەبەستمانە، سیستەمە یاساییە نێودەوڵەتییەکانە، کە لە رووی چوارچێوە و گشتگیرییانەوە، جیاوازن. فرەوانترینیان ئەو سیستەمە جیهانییە گشتگیرییەیە کە لە توێیدا هەموو سیستەمە یاساییە نێودەوڵەتییە لاوەکییەکان و کەسە یاساییەکانیان و پێوەندییەکانی نێوانیان لەخۆدەگرێ، وەك: سیستەمی پێوەندیی ئابووری و ژینگەیی و ئەو پێوەندییانەی

کێشەکانی پاراستنی مافی مرۆڤ ڕێك دەخەن. سیستەمە هەرێمی و ناوچەییەکانیش دوای سیستەمی جیهانیی گشتی دێن.

هەموو سیستەمێکی نێودەوڵەتی، کەسانی خۆی هەیە، ئەوانیش دەوڵەتن یان ڕێکخراوی نێودەوڵەتین، یان ئەو گەل و نەتەوانەن، کە لە پێناو وەدەستهێنانی مافی چارەنووسی خۆیان خەبات دەکەن یان تاکەکان یان هەموو ئەم کەسانە یان بەشێکیان. لە ڕەوتی پراکتیکی نێودەوڵەتی لە چوارچێوەی هەر سیستەمێکی نێودەوڵەتیدا پێوەندییەکی نێودەوڵەتی پەیدادەبێت، کە بگونجێت لەگەڵ ئەو سیستەمەدا. پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانیش لە رووی بازنەیانەوە، جیاوازن: هەندێکیان هەموو جیهان دەگرنەخۆ، هەندێکیشیان بازنەیەکی بەرتەسك دەگرنەخۆ و کەسانێکی دیاریکراو بەشداری تێدا دەکەن وەك پێوەندییە دووقۆڵییەکان و پێوەندییەکانی نێوان دوو حکوومەت.

لەپاش هەرەسهێنانی یەکەتیی سۆڤێت و بەرەی سۆشیالیزم و کۆتاییهاتن بە سەردەمی جەنگی سارد، جۆرێکی نوێ لە پێوەندیی نێودەوڵەتی سەریهەڵدا، خەسڵەتی بە نێودەوڵەتیبوونی هەموو لایەنێکی هاوکاری پێوە بوو، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا، وەك لایەنی ئابووری، زانستی تەکنۆلۆژی و دۆزینەوەی ڕێگەچارە بۆ کێشە جیهانییەکانی وەك: پاراستنی ژینگە و مافی مرۆڤ و خۆراکی جیهانی و ئاوی خاوێن و بەکارهێنانی وزە بە شێوەیەکی دروست و ئاقڵانە و شتی دی.

ئەوەی گرینگییەکی تایبەتی هەیە لەم رووەوە، مەسەلەی پێناسەکردنی سیستەمی یاساییە، کە بریتییە لە ڕێکخەری پێوەندییەکانی کەسەکانی هەر سیستەمێکی یاسایی نێودەوڵەتی. وەکو گوتمان لەوێدا دوو سیستەمی یاسایی کلاسیکی هەن: سیستەمی یاسایی ناوەخۆ و سیستەمی یاسایی نێودەوڵەتیی کە ئەمیشیان دەبێتە دوو بەشەوە: سیستەمی یاسایی نێودەوڵەتیی گشتی و سیستەمی یاسایی نێودەوڵەتیی تایبەت. لە پراکتیکی نێودەوڵەتیشدا چەند سیستەمێکی یاسایی جیاجیا هەن، چەند توخمێك لە سیستەمی یاسای نێوتەوەیی و چەند توخمێکی دیکەیش لە سیستەمی یاسایی ناوەخۆیی دەگرنەوە، وەك سیستەمی یاسایی یەکیەتیی ئەورووپی.

لێرەدا تۆژینەوەکەمان جەخت دەکاتە سەر ئەو سیستەمە نێودەوڵەتییەی، کە پێوەندییەکانی نێوان کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و قەوارە نیمچە دەوڵەت و گەل و نەتەوە خەباتگێڕەکان و هەندێ جاریش تاکەکان، دەگرێتەوە.

توخمی سەرەکیی سیستەمی نێودەوڵەتی، بریتییە لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان. دەبینین دەوڵەتەکانی دنیا لە چوارچێوەی سیستەمی نێودەوڵەتیدا لەگەڵ یەکدیدا پێکەوە دەژین و لەمیانەی تێکەڵاوی و هاوکاریکردندا، بەرێککەوتنی هاوبەش ئەو رێکخراوە نێودەوڵەتییانە پێکدێن، کە بەردەوام گرینگی و ژمارەیان لە ژیانی نێودەوڵەتیدا لە پەرەسەندندان. تاوەکو ئێستەش ژمارەیەکی زۆر لە گەلانی دنیا درێژەیان بە خەبات و تێکوشانیان داوە لە پێناو مافی بڕیاردانی چارەنووس و سەربەخۆییان. لە گەرمەی ئەم خەبات و تێکۆشان و تێکەڵییان بە دەوڵەتەکان و رێکخراوە نێونەتەوەتییەکان دەبنە بەشدار لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا.

بە بەردەوام پێوەندیی لەنێوان دەوڵەتەکان و رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و ئەو گەلانەی خەبات دەکەن لە پێناوی سەربەخۆییدا لە رووی سیاسی و ئابووری و زانستی تەکنۆلۆژیاوە ژمارەیەکی زۆری دی لەو پێوەندییانەی، کە سنووری هەرێمی دەوڵەت و دەسەڵاتی دەبەزێنن، لە گەشەکردن و پەرەسەندندان.

پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان هەندێ لایەنی هاوکاری نێودەوڵەتی دەگرنەوە، وەك پێوەندییە ئابووری و کولتووری و سیاسییەکان و... هتد پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانیش یان دووقۆڵی دەبن، یان فرەلایەن، یاخۆ هەرێمی، یان جیهانی، یانیش ناوچەیی دەبن.

چەند هۆکارێکی خۆیەتی و بابەتی جیاواز هەن کاردەکەنە سەر پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان، وەك:

١- ئاستی گەشەکردنی دەوڵەتەکان لە ڕووی ئابوورییەوە.
٢- بەها ڕەوشتمەندیی و کولتوورییەکانی کۆمەڵگەکان.
٣- بەرژەوەندییە نیشتمانییەکانی دەوڵەتەکان.
٤- بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتە دەوڵەمەندەکان.
٥- بەرژەوەندییەکانی کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان.
٦- بارودۆخی ژینگەیی و پێگەی دیمۆگرافی.
٧- کێشە جیهانییەکان.
٨- پەرەسەندنی زانستی تەکنۆلۆژیای.

بە پلەی یەکەم سیستەمی یاسای نێودەوڵەتیی لەسەر ئەو پرەنسیپە یاساییە فەرماندەرانە (المبادی القانونیة الامرة) بونیادنراون، کە بۆ کەسەکانی یاسایی نێودەوڵەتی ئیلزامین، بەڵام ئەو پرەنسیپ و بنەما لاوەکییانەی پێوەندییە دووقۆڵییە نێودەوڵەتییەکان یاخۆ پێوەندییە

فرەلایەنییەکان ڕێك دەخەن، بە گوێرەی ئەو پرەنسیپە ئیلزامییە گشتییانە، دادەڕێژرێن.

شان بەشانی نۆرمە یاساییە نێودەوڵەتییەکانیش چەند نۆرمێکی کۆمەڵایەتیی هەن لە سیستەمی یاسایی نێودەوڵەتیدا کاریان پێ دەکرێ، وەك: نۆرمە ڕەوشتمەندییە نێودەوڵەتییەکان و نۆرمی موجامەلەی نێودەوڵەتی و نۆرمی نەریتی نێودەوڵەتی.

سیستەمی نێودەوڵەتی و ئەو بەرئەنجامانەی لە هاوکاری نێودەوڵەتییەوە دێن، لە چوارچێوەی سیستەمی جیهانی گشتیدا، بایەخدارترن، چونکە کاریگەرییەکی گەورە دەکەنە سەر پەرەسەندنی ئەو دوای سیستەمەکان و پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان لەسەر ئاستی حکومی و ناحکومیدا.

# باسی سێیەم

## پێوەندیی لەنێوان یاسا و سیاسەت

ئاشکرایە ناکرێ بە شێوەیەکی تەواو جیاوازی لەنێوان یاسا و سیاسەتدا بکرێ. ئەگەر ئەو تیۆرییە یاسایی و فەلسەفییانەش، کە لە هەردوو لقەکەدا پێڕەو دەکرێن بەلاوەنێین دەبینین پێوەندیگەلێکی پتەو هەردووك یاسا و سیاسەتیان پێکەوە گرێداوە.

لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا جیاوازی دەکرێ لەنێوان دارشتنی سیاسەت و شێوازی پیادەکردنی، بۆ نموونە لە بەریتانیا پەرلەمان یاساکاری دەکات، واتە یاسا دادەنێت، بەڵام ئەرکی دەزگەی دادوەری جێبەجێکردنی یاسایە واتە کاری دادگەیی. ئەم دابەشبوونە لە ولاٌتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاشدا پێڕەو دەکرێت لەنێوان کۆنگرێس و دەزگەی داد دا. لەراستیدا مەبەست لەم دابەشبوونە ئەوەیە، وا نەکرێ ئەم دوو دەسەلاٌتە بدرێنە یەك دەزگە لە دەزگەکانی دەوڵەت. هەرچۆنێکیش بێ، دەزگەی سیاسیی خۆی یاسا دادەنێت و بە پلەی یەکەم سیستەمی یاسایی دروست دەکات. دەبینین لە چوارچێوەی پایەکانی دادگەکاندا، دادوەرەکان دەسەلاٌتێکی فرەوانیان هەیە بۆ راڤەکردنی یاسا و هەڵبژاردنی باشترین حوکم لەنێوان کۆمەڵە ئەگەرێکدا.

هەندێ هۆکار هەن وا دەکەن کاریگەریی سیاسەت بە سەر پرۆسێسی یاساییدا کەم بێتەوە. گرینگترینیان ئەو نەرێتە یاساییەیە Law Habit، کە لە هۆشی تاکەکاندا چەسپیوە. بگرە ئەو بارودۆخە یاساییە تایبەتەی، کە زاڵە سیستەمی سیاسی دەچەسپێنێ و سەربەخۆیی دەزگە یاساییەکان و شێوازی کارکردنیشیان بەهێزتر دەکات.

لە زۆرینەی دەوڵەتە دیموکراتییەکانی جیهاندا دەستێوەردانی سیڤیل لە پرۆسێسی دادوەری، یان دادگەدا بە پێشێلکردنی ئەو پرەنسیپە سەرەکییانە دەژمێردرێ، کە سیستەمی دیموکراتی لەسەریان بونیادنراوە، پاشانیش ڕووبەڕووی بەرهەڵستکارییەکی توند دەبێتەوە. بەکارهێنانی زمانی یاسایی و رێکارە یاساییە بڕیار لەسەر دراوەکان، پێکەوە لەگەڵ رێزگرتنی پیشەی یاسایی، ئەمانە هەموو سیستەمی حوکم دەچەسپێنن و مەودایەکی تەواو دیاری

دەکەن لەنێوان دەسەڵاتەکانی دەزگەی یاسادانان و دەزگەی جێبەجێکاری و دەزگەی دادوەریدا، بەڵام کاتێك مرۆڤ دەڕوانێتە یاسای نێودەوڵەتی، مەسەلەکە بەلایەوە، بە تەواوی جیاوازە. چونکە بەرئەنجام دەوڵەتەکان خۆیان دەسەڵاتیان بەسەر سیستەمی جیهانیدا دەشکێ و پیادەی هەردوو دەسەڵاتەکان دەکەن: خوڵقاندنی نۆرمی یاسایی (ئەگەر ئەو رۆڵە لاوەکییە بەدەرکەین، کە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان لەم بارەیەوە دەیگێڕن) هەروەها لێکدانەوە و پراکتیزەکردنیان. دوایەش لە سیستەمی یاسایی نێودەوڵەتیدا میکانیزمێکی پێویست نییە بۆ بڵاوکردنەوەی ((نەریتی یاسایی نێودەوڵەتی))((International Legal Habit)) لەنێوان دەوڵەتان و بەرپرسە نێودەوڵەتییەکاندا.

پێوەندیی هاوبەشی نێوان یاسا و سیاسەت لە کاروباری جیهانیدا، پرسێکی ئاڵۆزە و چارەسەرکردنی قورسە، بەڵگەش بۆ ئەوە ئەو وتووێژانەیە، کە دەکرێن لەبارەی ئەو فاکتەرانەی پاڵ بە دەوڵەتەکانەوە دەنێن بەرەو پابەندبوون بە نۆرمە نێودەوڵەتییەکانەوە. سیاسەتی بەهێز ، کێبڕکێ و ناکۆکی و باڵادەستی دەورووژێنێ و دەبێتە کۆشش لە پێناوی مانەوە و سەپاندنی دەسەڵاتدا. لێرەش ئەرکی یاسای نێودەوڵەتیی لەم بوارەدا هەماهەنگی کردنە لەنێوان بەرژەوەندییەکان و نێزیکخستنەوەی بیر و بۆچوونەکان و چارەسەرکردنیان. لێرەدا یاسای نێودەوڵەتی هەوڵ دەدات چوارچێوەیەکی گشتیی دابنێت، وەك بەستێك بۆ بەرەنگاریکردن لە رووداوی شۆك ئامێز و کاردانەوەی و سووککردنی داواکاری و سکاڵاکان و میانڕەوی کردنیان و دوایەش گەیشتن بە هاوسەنگیی بەرژەوندییەکان، ئینجا چەسپاندنی ئاشتی و ئاسایشیی نێودەوڵەتی و پاراستنیان.

سەرەڕای هەموو ئەوانەش، یاسای نێودەوڵەتیی کۆمەڵە پرەنسیپێك دادەڕێژێ، کە دەوڵەتەکان لە رەفتاریاندا پێڕەویان دەکەن. کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، وەکو هەر کۆمەڵگەیەکی مرۆیی دیکە، بۆچوون و ئامانجی خۆی هەیە و بەکردەوە تێدەکۆشی بۆ بەدیهێنانیان. دادگەی نێودەوڵەتیی سەبارەت بە کێشەی ئەفریقیای باشوور ئاماژەیکردووە، دەڵێت: (( پێویستە دادگە پێڕەوی پرەنسیپە ڕەوشتمەندییەکان نەکات، ئەگەر شێوەیەکی یاسایی تەواویان وەرنەگرتبێت. یاسا وەك گوتوویانە بۆ ئەوە پەیدابووە، لە خزمەتی پێویستییە کۆمەڵایەتییەکاندا بێت، هەر لەبەر ئەم هۆیەش ناتوانێ ئەوە وەدی بێنێ تەنیا لە چوارچێوەی ئەرکەکەی و لە میانەیدا نەبێ، ئەگینا نابێتە خزمەتێکی یاسایی وا شایستەی رێزگرتن بێت)).

یاسای نێودەوڵەتی هێشتا ئەو سەرچاوە راستەوخۆ یەکلاکەرەوەیە نییە، کە بتوانێ چارەسەری تەواوی کێشە و ململانێ و ڕووبەڕووبوونەوە نێودەوڵەتییەکان بکات، چونکە هەم لەرووی پێکهاتە و هەم لە رووی ناوەڕۆکییەوە هێشتا لاوازە.

دانپێدانەنان بەم کەم و کورتییەی یاسایی نێودەوڵەتی، هان دەدات بۆ وەرگرتنی هەڵوێستێکی ئۆتۆپییانە Utopian و نشوستیهێنان لە یەکەم بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ واقیعدا. لە لایەکی دیکەوە وەرگرتنی هەڵوێستێکی توند و بەهێزیش دەگاتە هەمان هەڵە، واتە بارودۆخەکە بەرەو گرژییەکی زێدەتر دەبات.

باشتر وایە رێگەی مامناوەندی بگیرێتەبەر، ئەویش پێزانینە• بەلایەنە بەهێز و لایەنە لاوازەکانی یاسای نێودەوڵەتی و ئەوی دەکرێ و ئەوی ناکرێ دەستنیشان بکرێت. مرۆڤ دەبێ هەوڵ بدات بۆ بلاوکردنەوەی سیستەم و خۆشگوزەرانی و دادوەری، نەك تەنیا لەو وڵاتەی تێدا دەژی، بگرە لەو سیستەمە نێودەوڵەتییەشدا کە تێیدایە.

---

•لێرە بەولاوە دەستەواژەی "پێزانین" بۆ دەستەواژەی "اعتراف"ی عەرەبی و Recognition “" ی ئینگلیزی و признание”" "پریزنانییێ" ی رووسی و بولگاری و سربی و کەرواتی و " Uznání"" ئوزنانی" ی چیکی و پۆلونی و" Визнання " "ڤیزنانیا"ی ئۆکرانی بەکار دەهێنین. نێزیکترین دەستەواژە بۆ زمانی کوردی ئەم دەستەواژە سلاڤییانەن، کە دەقاودەق بەرامبەرەکەی لە کوردیدا دەستەواژەی "پێزانین"ـە.

# باسی چوارەم

## جیاوازیی یاسای نێودەوڵەتی لە یاساکانی دیکە

ئەگەر بە گشتیی چاوێك بخشێنین بە تایبەتمەندییەکانی یاسادا، دەبینین ئەو تایبەتمەندییانە یاسای نێودەوڵەتیش دەگرنەوە وەك کۆمەڵە نۆرمێکی رەوشتیی ئیرادییانە، کە چەند پێوەندییەکی دیاریکراو لەنێوان کەسانێکی دیاریکراودا رێك دەخەن و زامنی پابەندبوونیان دەکەن بەو ئیلتیزامانەی لێیان دەکەونەوە. وێڕای ئەم تایبەتمەندییە هاوبەشانەش لەنێوان یاسای نێودەوڵەتی و لقەکانی دیکەدا هەن، بەڵام بە شێوەیەکی بنەڕەتیی لەگەڵ یاسای ناوەخۆییدا جیاوازی هەیە، ئەم جیاوازییەش بە زەقی لە شوێنی رێکخستنی یاسایی و کەسەکان و بابەت و سەرچاوەکانی یاسای نێودەوڵەتی و شێوازی دانانی نۆرمە یاساییەکان و شێوازی ناچارکردنی کەسەکان بۆ پابەندبوون پێیانەوە خۆی دەنوێنێ.

دەکرێ تایبەتیی ئەو سیستەمە یاساییە نێودەوڵەتییەی، کە یاسای نێونەتەوەیی تێیدا کاردەکات، لە چەند خاڵێکی سەرەکیی کورت بکەینەوە:

١- بوونی دەوڵەتی خاوەن سەروەری.
٢- نەبوونی دەسەڵاتێکی باڵاتر لە دەسەڵاتی دەوڵەت، کە بتوانێ ئیرادەی خۆی بەسەر دەوڵەتە سەروەرییەکاندا لە رێگەی دەرکردنی نۆرمی یاسایی مولزەم بۆیان بسەپێنێ.
٣- نەبوونی دەزگەیەکی دادوەری و جێبەجێکاری، کە بتوانێ دەوڵەتەکان ناچاربکات پابەندبن بە نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتییەوە.

ئەم تایبەتمەندییانەی کە سیستەمی نێودەوڵەتی هەیانە وا دەکەن یاسای نێودەوڵەتی ببێتە بەشێکی تایبەت و جیاوازی هەبێت لەگەڵ یاسای نێوەخۆییدا.

### ١ - جیاوازیی یاسای نێودەوڵەتی لە یاسای ناوەخۆیی:

یاسای ناوەخۆیی ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتییانە رێك دەخات، کە لە چوارچێوەی دەسەڵاتی یاسایی هەر دەوڵەتێکدا بونیادنراون و هێزی کارپێکردنیان سنووری دەوڵەتەکە نابەزێنێ، بەڵام یاسای نێودەوڵەتی ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتییانە رێك دەخات، کە هەر یەك

لە سنووری دەسەڵاتی ناوەخۆیی دەوڵەت و سنووری هەرێمیی دەوڵـەت وەك یـەك دەبـەزێنێ. پێوەندییەکانی نێوان کەسەکانی یاسای نێودەوڵـەتیی ئـەو بابەتەیـە کـە یاسـای نێودەوڵـەتی گشتی ڕێکی دەخات. ناوەڕۆکی ئەو پێوەندییانەی، کە دەبنە پێوەندیی یاسایی نێودەوڵـەتی و نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی ڕێکیان دەخەن، بریتییـە لـەو مـاف و ئیلتیزامانـەی کـە بـۆ بەشداربووانی دەکەونەوە، واتە کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتیی گشتی.، ئەم پێوەندییە یاساییە نێودەوڵەتییانە دەکرێ لەنێوان دوو دەوڵەت یان چەند دەوڵەتێك بن لەناوچـەیەکی جوگرافیـای وەکو ئەورووپا یان تەنانەت دەوڵەتەکانی هەموو جیهان.

یاسای نێودەوڵەتیی گشتی وەك لقێکی تایبەت لە لقـەکانی یاسـا، ناچـێتە چوارچـێوەی سیستەمی یاسای نیشتمانی هیچ دەوڵەتێکەوە و نۆرمی یاسایی ناوەخۆیی هـیچ کامێکیـانی تێدا نییە، بـەڵام لەهـەمان کاتـدا کاردەکاتـە سـەر دروسـتکردنی هەنـدێ نـۆرمی یاسـایی ناوەخۆیی. دەوڵەتـەکان پابەنـددەبن بـەوەی یاسـا ناوەخۆییـەکانیان لەگـەڵ ئـەو پەیماننامـە نێودەوڵەتییانەدا بگونجێنن کە مۆریان دەکەن. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە یاسای نێودەوڵـەتی کاریگەریی نۆرمە یاساییە ناوەخۆییەکانی بە سەرەوە نابێ. (لە لاپەڕەکانی داهاتوو شـرۆڤەی ئەوە دەکەین).

کەسەکانی یاسای ناوەخۆیی تاکەکان و کەسە مانەوییەکان و دەوڵـەتن بـەو پێیـەی، کـە ئەمانە شایستەی ماف و چەند ئیلتیزامێکی دیاریکراون، بەڵام کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی گشتی بریتین لە دەوڵەتەکان و ئەو گەل و نەتەوانەی لـە پێنـاو مـافی چارەنووسـیاندا خـەبات دەکەن، هەروا ڕێکخـراوە نێودەوڵەتییـەکان و قـەوارە نیمچـە دەوڵەتـەکان و تاکـەکانیش تـا ڕادەیەك، ئەمانە بەشدارن لە پێوەندییـە نێودەوڵەتییـەکان و مـاف و ئیلتیزاماتیـان هەیـە و توانای پیادەکردنیان هەیە، بەپێی یاسای نێودەوڵەتی و لە چوارچێوەیدا.

بابەتی یاسای نێودەوڵەتی گشتی هەموو شـتێك دەگرێتـەوە، کـە دەکـرێ لـە پێناویـدا کەسـەکانی یاسـای نێودەوڵـەتیی پێوەندییـەکی نێودەوڵـەتی ببەسـتن، واتـا شـتە مـادی و نامادییەکان و کار و ڕەتکردنەوەی کار، کە بەحەسری ناچنە چوارچێوەی دەسەڵاتی نـاوەخۆیی دەوڵەتەوە.

سەرچاوەکانی یاسای نێوەخـۆیی بـرێتین لـەو یاسـادانانەی، کـە لـە خـودی دەوڵەتـەوە دەردەچێ، بەڵام نۆرمە یاساییە گشتییە نێودەوڵەتییەکان بە شێوەیەکی بنەڕەتیی لـە ڕێگـەی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان و عورف و نەریتی نێودەوڵەتییەوە پێکدێن. لەکاتێکدا دەوڵـەت،

له کاتی پێویستدا هەموو هێزێکی خۆی بەکاردێنێ بۆ زامنکردنی جێبەجێکردنی نۆرمەکانی یاسای نێوەخۆیی، دەبینین کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی گشتی، بە پلەی یەك دەوڵەتان، هەڵدەستن بە دانانی نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتیی گشتی لە ڕێگەی گونجانی ویستەکانیان، کە ئەویش بەرجەستەیە لە پەیماننامەی مۆرکراو لەنێوانیاندا.

لە پێناو داڕشتنی نۆرمی یاسای نێودەوڵەتی، لایەنی پەیماننامەکان لەسەر بنەمای ئیرادەی ئازاد و بنەمای یەکسانی، پەنادەبەنە بەر ڕێککەوتن لەسەر هەڵوێستە هاوبەشەکانیان و لە ڕێگەی سازش لە هەندێ هەڵوێست و دانوستاندیی هاوبەشدا بڕیار لەسەر چەند حوکمێك دەدەن، کە تا ڕادەیەکی زۆر ڕەنگدانەوەی بەرژەوەندییەکانیانن و دەبێ لەگەڵ پرەنسیپە گشتییەکانی یاسای نێودەوڵەتی گشتیدا بگونجێ. ئەم شێوازە بۆ دانانی نۆرمی یاسای نێودەوڵەتی وا دەکات بگەینە ئەو بەرئەنجامەی، کە بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتی هاوچەرخ مۆرکێکی دیموکراتییانەی گشتیی هاوچەرخیان هەیە. یاسای نێوەخۆیی و یاسایی نێودەوڵەتیش توانای بەکارهێنانی شێوازی زۆرەملێ دەستەبەر دەکەن بۆ زامنکردنی ملکەچبوون بەرامبەر بە نۆرمەکانی یاسا. لە سیستەمی یاسای نێوەخۆییدا دەزگەکانی دەوڵەت توندوتیژی بەکاردێنن، بەپێی یاسای نێوەخۆیی و لە چوارچێوەکەیدا، بەڵام لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی خۆیان پەنادەبەنە ئەو کارڕاییانە بە تاك یان بە کۆمەڵ بەپێی نۆرمە یاسا نێودەوڵەتییە کارپێکراوەکان و لە چوارچێوەی پەیمانە نێودەوڵەتییە پێوەندیدارەکاندا.

دەکرێ سزای یاسایی نێودەوڵەتی بسەپێنرێ بە سەر ئەو دەوڵەتەی سەرپێچی لە نۆرمەکانی یاسایی نێودەوڵەتی دەکات، هەروەها دەکرێ هێزیش بەکاربهێنرێ بەپێی مادەی٤٢ لە دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان لە دژی ئەو دەوڵەتەی دەستدرێژی دەکاتە سەر دەوڵەتێك یان دەوڵەتەکانی دی. ئەم سزا نێودەوڵەتییانەش لە رووی فۆرم و ناوەڕۆکەوە جیاوازییەکی بنەڕەتییان هەیە لەگەڵ ئەو سزایانەی، کە لە یاسای نێوەخۆییدا دەسەپێنرێنە سەر ئەوەی پێشێلی یاسا دەکات.

**٢- جیاوازی نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتیی لە نۆرمی موجامەلە و نۆرمە ڕەوشتمەندییە نێودەوڵەتییەکان:**

نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتیی لەگەڵ نۆرمی موجامەلەنێودەوڵەتییەکاندا جیاوازییەکەیان لەوە دایە، کە نۆرمی موجامەلە برێتین لە کۆمەڵە نۆرمێکی رەوشتییانە، دەوڵەتەکان بۆ موجامەلەکردن لە هەڵسوکەوتی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانیاندا رەچاویان دەکەن، بەبێ ئەوەی ئیلتیزامی یاسایی یان ڕەوشتمەندییان لێ بکەوێتەوە. نموونە بۆ موجامەلەی نێودەوڵەتی: سڵاوی ئاڵای تایبەت بە کەشتییە جەنگییەکان و بەخشینی دیپلوماتکارە بیانییەکان لە باج، هەروەها ڕێوڕەسمی پێشوازیکردن لە کەشتییە جەنگییەکان و سەرۆکی دەوڵەتان و باڵوێزەکان.

سەرپێچیکردن لەو نۆرمە موجامەلە ئامێزانە بە پێچەوانەی نۆرمە یاساییە نێودەوڵەتییەکان، بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتیی لێ ناکەوێتەوە، چونکە ئەو سەرپێچییە لە یاسای نێودەوڵەتیدا بە کارێکی ناڕەوا دانانرێن و زۆر جار کاردانەوەی دەوڵەتەکانی دی لەم بارەدا بە هەمان شێوە دەبێ.

گەلێك جار لەگەڵ رەوتی رۆژگاردا نۆرمە موجامەلەنێودەوڵەتییەکان دەبنە نۆرمی یاسایی هێزدار بە رێگەی نەریتەوە (عرف) یان بە دانانیان لە چوارچێوەی رێککەوتنی نێوان دەوڵەتەکاندا وەکو نۆرمە یاساییە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە یاسابەندی((حەسانەتی)) دیپلۆماتی و ئەو ئیمتیازاتانەی کە پێشتر بە شێوەی موجامەلەی نێودەوڵەتی بوون.

دەبێ تێکەڵی نەکرێ لەنێوان نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی و نۆرمە ڕەوشتمەندییە نێودەوڵەتییەکاندا ئەگەرچی لە هەندێ رووەوە تێکئاڵاون، چونکە وەکو پێشتر گوتمان نۆرمە یاساییە نێودەوڵەتییەکان لە رووی فۆرم و ناوەرۆکەوە، نۆرمی یاسایین. نۆرمە ڕەوشتمەندییە نێودەوڵەتییەکان گوزارشت لە هەست و ویژدانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەکەن و هێزێکی ئیلزامییان نییە، بگرە شێوەیەکن لە شێوەکانی ئەو هەستەی، کە دەبێ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، رەچاویان بکات. لە هەمان کاتیشدا کاریگەرییان هەیە بۆ پێکهێنانی نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی. گونجانی نۆرمە یاساییە نێودەوڵەتییەکان لەگەڵ نۆرمە ڕەوشتمەندییە نێودەوڵەتییەکاندا گەورەترین دەربڕینە لە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، چونکە هەرچەند ئەو دوو نۆرمە لە یەکتر نێزیك ببنەوە، هەلی زیاتر دەڕەخسێ لە پێش پاراستنی بەرژەوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا.

نۆرمە ڕەوشتمەندییە نێودەوڵەتییەکان لە گەلێك باردا دەبنە نۆرمی یاسایی مـولزەم بـە ڕێگەی ڕێککەوتننامە یـان نـەریتی نێودەوڵەتییـەوە وەکـو یاسـا مرۆییـەکانی تایبـەت بـە چاککردنی باری بریندراران و تووشبووانی نەخۆشی لە مەیدانی شەڕدا (ڕێککەوتننامەی سـاڵی ١٨٦٤و ڕێککەوتننامـەکانی ١٨٩٩-١٩٠٧ و ڕێککەوتننامـەکانی جنـێڤ ١٩٢٩-١٩٤٩ لەبارەی مامەڵەکردن لەگەڵ دیلەکاندا.

### ٣- جیاوازی یاسای نێودەوڵەتی گشتی لە یاسای نێودەوڵەتی تایبەت:

لـە رووی تیـۆری و پراکتیکیشـەوە، زاراوەی (یاسـای نێودەوڵـەتی) لـەجیاتی یاسـای نێودەوڵەتیی گشتی بەکاردێت، کە جیـاوازیی هەیـە لەگـەڵ یاسـای نێودەوڵـەتیی تایبەتـدا. دەبینین لە تەك پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانیشدا لە رەفتاری نێودەوڵەتیدا چـەند پێوەندییـەکی تایبەت هەن، هەم توخمی یاسای شارسـتانی نێوەخـۆیی و هـەم تـوخمی یاسـای نێودەوڵـەتیی دیکەیان تیایە. ئەم پێوەندییانە یاسای نێودەوڵەتیی تایبەت ڕێکیاندەخات.

چەند پرسێك لە یاسای نێوەخۆیی نیشتمانی سەرهەڵدەدەن، وەکو ئەوەی لە یاسـای بـاری کەسێتی و یاسای شارستانی و یاسای کار، کە توخمێکی بیانییان هەیە و چەند رەهەنـدێکییان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پێوەندییە یاساییە نێودەوڵەتییانـەی، کـە چوارچـێوەی یاسـای نێوەخـۆیی دەوڵەت دەبەزێنن و چەند تاك و کەسانێکی مەعنەوی لەچـەند دەوڵـەتێکی جیاجیـا تێیانـدا بەشداردەبن، یانیش چەند پێوەندییەك کە لەسەر هەرێمیی زیاتر لە دەوڵەتێك پیادەدەکرێن. بە کردەییش ئەم پێوەندییانە لەلایەن یاسای نێوەخۆیی و یاسای نێودەوڵەتییەوە ڕێك دەخرێن. بە واتایەکی فـرەوانتر، یاسـای نێودەوڵـەتی گشـتی و یاسـای نێودەوڵـەتی تایبـەت پێوەندییـە نێودەوڵەتییـەکان ڕێکدەخـەن، لـە کاتێکـدا یاسـای نێودەوڵـەتیی گشـتی ئـەو پێوەندییانـە ڕێکدەخات، کە لەنێوان دەوڵەتەکان و کەسەکانی دیکەی یاسـای نێودەوڵەتیـدا، هـەن، بـەڵام یاسای نێودەوڵەتی تایبەت بە پلەی یەکەم، ئەو پێوەندییە یاساییە نێوەخۆییانـە ڕێکـدەخات، کە توخمێکی یان رەگێکی نێودەوڵەتییان هەیە.

هەندێ کەس پێیانوایە کە یاسای نێودەوڵەتی تایبـەت بەشـێکە لـە یاسـای نێودەوڵـەتی گشتی، کەچی کەسانێکی تر بە بەشێك لە یاسای نێوەخۆیی (یاسـای شارسـتانی) دایـدەنێن، کۆمەڵێکی دیکەش پێیانوایە، کە ئەم یاسایە چەند نۆرمـە یاسـایەکی یاسـای نێودەوڵـەتیی گشتی و هەروەها چەند نۆرمە یاسایەکی نێوەخۆییش دەگرێتەوە.

یاسای نێودەوڵەتیی تایبەت نە ئەوەیە بەشێك بێت لە یاسای نێودەوڵـەتیی گشـتی و نـە لقێکیشییە. بێگومان یاسای نێودەوڵەتی تایبـەت لـە چـەند کۆمەڵـە نۆرمێـك پێکهـاتووە، هەنـدێکیان پێوەندیگـەلێکی یاسـایی شارسـتانیی نێوەخـۆیی ڕێکدەخـەن، کـە مـۆرکێکی نێودەوڵەتییان پێوەیە، ئەمـەش واتـا یاسـای نێودەوڵـەتی تایبـەت دوو جـۆر لـە نۆرمـەکان دەگرێتەوە، جۆری یەکەمیان مـاف و ئیلتیزامگـەلێك پێکـدێنی ( ڕاسـتەوخۆ پێوەندییـەکان ڕێکدەخات)، دووەمین جۆریشیان برێتییە لە نۆرمی هەواڵەکردن بۆ یاسای نێوەخۆیی دەوڵەتی پێوەندیدار بە چارەسەرکردنی پێوەندیی نێوان لایەنەکان. بۆ نموونە، هەواڵەکردن بەرەو بازنـەی یاسایی ئەو دەوڵەتەی کە پەیماننامەکە یان گرێبەستی هاوسەرێتی تێـدا بەسـتراوە، یـان ئـەو دەوڵەتەی شتەکان لە هەرێمەکەیدان.

یاسای نێودەوڵەتی تایبەت تەنیا پشتنابەستێ بە یاسای نێوەخۆی دەوڵەت، بگـرە هـەمان کات پشتدەبەستێ بە نۆرم و پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی گشتیشەوە.

لـە ڕەفتـاردا، پێوەندییـەکی ڕوون هەیـە لـەنێوان یاسـای نێودەوڵـەتی گشـتی و یاسـای نێودەوڵەتی تایبەت، هەروەها لەنێوان یاسای نێودەوڵەتی تایبەت و یاسای نێوەخۆیی. ئێسـتە بۆچـوونێك سـەریهەڵداوە بـەرەو قووڵکردنـەوەی هاوپێوەنـدیی نێـوان نۆرمـەکانی یاسـای نێودەوڵەتیی گشتی و یاسای نێودەوڵەتیی تایبەت. بەڵگـەش بـۆ ئـەم قسـەیە، فرەوانبـوونی پێوەندییە لەسەر بناخەی هەردوو یاساکە. بـۆ نموونـە دەوڵەتـەکان کۆمەڵـە پەیماننامەیـەکی ئـابووری درێژخایـەن مۆردەکـەن، لـە پاشـان لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو پەیماننامانـەدا چـەند ڕێککەوتننامەیەکی لاوەکیی مۆردەکەن لەنێوان کۆمپانیا تایبەتەکانیان کە چـەند تـوخمێکی بیانییان پێوەیە کە دەچنە خانەی کارکردنی یاسای نێودەوڵەتیی تایبەتەوە.

## باسی پێنجەم

## سرووشتی یاسای نێودەوڵەتیی گشتی

کاتێك لە یاسای نێودەوڵەتی دەکۆڵینەوە، یەکەمین شت ڕووبەڕووی دەبینەوە، مەسەلەی سیفەتی یاسایی یاسای نێودەوڵەتییە. لە پراکتیکدا لە هەر کێشە و ناکۆکییەکی نێودەوڵەتیدا دەبینین هەردوو لایەن وا نیشاندەدەن، کە ڕێزدەگرن لە پرەنسیپەکانی سیستەمی نێودەوڵەتی و رەچاوی دەکەن و بەگوێرەی بڕگەکانی کاردەکەن و هەر یەکە و ئەوی دیکەیان تاوانبار دەکات، کە بەبێ پاسا و دەستدرێژی کردۆتە سەر و کاردانەوەی، ئەمەش پەنابردنە بۆ بەکارهێنانی مافی خۆی بۆ بەرگری لەخۆکردن.

لەوانەشە دەوڵەت دەست بخاتە سەر ماڵ وسامانی بیانییەکان و لەم لایەنەوە ڕووبەڕووی گازاندە و رەخنە بێتەوە، بەڵام ئەو رەنگە بە سەروەری نیشتمانی و دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوەخۆ بەرەنگاریان ببێتەوە. هۆی تێڕوانینی دەوڵەت بەرەو خۆپەرستی ئەوەیە، کە دەزگەیەکی نێودەوڵەتی سەربەخۆ نییە بتوانێ لە مەسەلەکە بپێچێتەوە و چارەسەرییەکی کۆتایی بۆ دابنێت.

هەر کەسێ لە یاسای نێودەوڵەتی بکۆڵێتەوە، پێوستە هەندێك لەو پرەنسیپانەی لە یاسای نێوەخۆییدا کارپێکراون شارەزابێت، چونکە یاسای نێوەخۆیی تایبەتمەندی خۆی هەیە وەك بوونی دەزگەیەکی تەشریعی بۆ یاسادانان و داڕشتنی یاساکان، هەروا بوونی دەزگەیەکی دادوەری کە پێکدێت لە کۆمەڵە دادگەیەکی خاوەن دەسەڵاتی پلەیی کە ئەرکیان جیبەجێکردنی یاساکانە، بوونی دەزگەیەکی جێبەجێکاری کە ئەرکی سەپاندنی سزایە بەسەر ئەوانەی سەرپێچی لەو یاسایانە دەکەن. جا بەبێ بوونی دەسەڵاتی یاسادانان و دەسەڵاتی دادوەری و دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن ناکرێ باس لەبارەی سیستەمی یاسایی نێوەخۆییەوە بکرێ. لێرەشدا دەپرسین ئەی لەبارەی یاسای نێودەوڵەتییەوە، دەڵێین چی؟ ئایا لەوێڕا سیستەمێکی یاسایی نێودەوڵەتی هەیە؟

فەیلەسووفی ئینگلیز (John Austin) لە سەدەی نۆزدەمدا تیۆرییەکی لەبارەی یاساوە

داناوه، پوختەکەی برێتی بوو لە بوونی دەسەڵاتێکی سەروەری، هەم فەرمان دەردەکا، هەم سزای ئەوانە دەدات، کە سەرپێچی لە فەرمانەکان دەکەن. جا لەبەرئەوەی یاسای نێودەوڵەتی ئەم نۆرمەی لەسەر جێبەجێ نابێ، بۆیە ئەویش گەڕاندوویەتییەوە بۆ کۆمەڵە نۆرمە ڕەوشتمەندییەکی بابەتییانە Positive morality.

ئەم تیۆرییە لێتۆژەکان رەخنەیان لێگرتووە لەبەرئەوەی شتەکانی بە سادەیی وەرگرتووە، تەنانەت سرووشتی راستەقینەی یاسا و کۆمەڵگە دەشێوێنێ و رۆڵی سزا لە سیستەمدا گەورە دەکاتەوە و بە هەر یاسایەکەوە بێ، دەیبەستێتەوە.

هەندێك دەپرسن، لە حاڵێکدا ئەگەر هات و چەند دەزگەیەکی تایبەت بە دانانی یاسا و جێبەجێکردنی و سزادانی ئەوانەی سەرپێچی دەکەن بوونیان نەبێت، ئەی چۆن دەتوانین بڵێین: یاسای نێودەوڵەتی، یاسایە؟

بۆ ئەوەی سیفەتی یاسایی ئیلزامی نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی بسەلمێنین، پێویستە لەو سێ مەرجە بکۆڵینەوە، کە ئەوانە دایاننناوە کە سیفەتی یاسایی یاسای نێودەوڵەتی ئینکاردەکەن، کە ئەویش بوونی دەسەڵاتێکە بۆ یاسادانان و دەسەڵاتێکی دادوەری و دەسەڵاتێکیش سزا بسەپێنی بە سەر ئەوانەی سەرپێچی لە یاسا دەکەن.

### ١- دەسەڵاتی یاسادانان:

لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا دەزگەیەکی تایبەتی نییە بۆ یاسادانان و لە هەمان کاتدا کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان بە دەسەڵاتێك دانانرێت، کە تایبەت بێت بەدانانی یاسای نێودەوڵەتی، هەرچەندە تێکڕای دەوڵەتانی جیهان نوێنەریان تێدا هەیە. بڕیارەکانی ئەم رێکخراوە، لە ڕووی یاساییەوە، تەنیا بۆ دەزگەکانی خۆی مولزەمن، ئەویش تەنیا لەبارەی هەندێ کاروبار[٤]، بەڵام ئەم راستییە کارناکاتە سەر سیفەتی ئیلزامی نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی.

پێکهاتەی یاسایی سیستەمی نێوەخۆیی جیاوازی هەیە لەگەڵ پێکهاتەی یاسایی سیستەمی نێودەوڵەتی. دەبینین پێکهاتەی نێوەخۆیی هەموو کۆمەڵگەکان، تەنانەت بە پێکهاتە سەرەتاییەکانیشەوە، پێکهاتەیەکی پلەییە hierarchical دەسەڵاتیش ستوونییە بەشێوەی هەرەم سەرۆك یا دەزگەی سەروەری تێیدا لە لووتکەیە، بەڵام سیستەمی نێودەوڵەتی

٤- بڕوانە: بڕگەی یەکەمی مادەی ١٧ی دەستووری رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

شێوەیەکی ئاسۆیی وەردەگرێ و لە ١٩٤ دەوڵەتی سەربەخۆ پێکهاتووە و هەموویان لە رووی یاساییەوە یەکسانن و خاوەنی سەروەریی خۆیانن و بە پیێ ئەم سەروەری و یەکسانییەش دان بە هیچ دەسەڵاتێك نانێن لە سەرووی دەسەڵاتی خۆیانەوە •. لە سیستەمی نێوەخۆییدا کەسەکانی یاسا واتا تاکەکان یاسا دانانێن، بگرە لەوێ دەزگەیەکی تایبەت هەیە، کە ئەویش پەرلەمانە و ئەرکی یاسادانانە. کەچی دەبینین لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا مەسەلەکە جیاوازە، چونکە دەوڵەتەکان خۆیان یاسا دادەڕێژن و ملکەچی دەبن. بەم پێیە یاسای نێودەوڵەتی لە دوو جۆرە نۆرم پێکهاتووە، جۆری یەکەم پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان دایاندەنێن، جۆری دووەمیش لە نەریتی نێودەوڵەتییەوە دەکەونەوە کە لە بناخەدا جۆرە کارێکن دەوڵەتەکان بەردەوام لەسەریان دەڕۆن و لەلایەن هەموانەوە پێناسراون.

وڵاتەکان بە هاوگونجانی ئیرادەیان سیفەتی ئیلزامیبوون دەبەخشنە نۆرمە یاساییەکان، سەرچاوەیان هەرچییەك بێت: چ پەیماننامە بێ یانیش عورف بێ. کەواتە نەبوونی دەزگەیەکی باڵاتر بۆ یاسادانان لە سیستەمی نێودەوڵەتی، نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی لە سیفەتە ئیلزامییەکەیان داناماڵێت.

### ٢- دەسەڵاتی دادوەری:

دادگە لە یاسای نێودەوڵەتیدا جیاوازیی هەیە لەگەڵ ئەوەی لە یاسای نێوەخۆییدا هەیە. لە یاسای نێودەوڵەتیدا دادگە ناڕێکە هەرچەندە بە چەند شێوەیەکی جیاجیا و هەر لە کۆنەوە وەکو ئامرازێك ناسراوە بۆ یەکلاکردنەوەی کێشە نێودەوڵەتییەکان. ئەوە بوو لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا چەند لیژنەیەکی ناوبژیوانی و دەستەی دادوەری نێودەوڵەتی سەریان هەڵدا، وەکو: دادگەی نامۆی نێودەوڵەتی هەمیشەیی لە لاهای ساڵی ١٨٩٩ و دادگەی نامۆی نێودەوڵەتی ساڵی ١٩٤٥، کە جێگەی دادگەی نامۆی نێودەوڵەتی هەمیشەیی گرتەوە. دادگەی نامۆی نێودەوڵەتیی لە لاهای تەنیا دەڕوانێتە ئەو کێشانە، کە دوولایەن یان چەند لایەنێك هەواڵەی دەکەن و ناتوانێت گەرەنتی جێبەجێکردنی بڕیارەکانی خۆی بکات. بۆیە رۆڵێکی لاوەکی دەگێڕێ لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا. لەگەڵ ئەوەشدا رۆڵێکی گرینگی هەیە لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان. لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا دەبینین چەندین کێشەی ئاڵۆزی نێودەوڵەتی هەواڵەی ئەم دادگەیە دەکرێن.

---

• لە ٢٠١٢/٦/٢٦.

### ٣- دەسەڵاتی جێبەجێکاری:

لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا دەسەڵاتێکی جێبەجێکاری باڵا نییە توانای هەبێ سزا بسەپێنی بە سەر ئەوانەی سەرپێچی لە نۆرمە یاساییەکانی نێودەوڵەتی دەکەن. بۆچوونی سەرەکی ئەوە بوو کە ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی ئەم رۆڵە بگێڕێ، واتا: رۆڵی دەسەڵاتی راپەڕاندن بگێڕێ لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا، بەڵام ئەو ڤیتۆیەی ئەندامە هەمیشەییەکانی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان هەیانە، (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، رووسیای فیدراڵ، چین، فەرەنسا و بەریتانیا)) تەگەرە و ئاستەنگی خستووەتە بەردەم ئەم رۆڵە.

بوونی نۆرمە یاساییە نێودەوڵەتییەکان و سیفەتی ئیلزامیبوونیان، پێوەست نین بە پێشێلکردنیان یانیش بە لایەنێکی خاوەن دەسەڵات، کە توانای سزادانی سەرپێچیکەرانی هەبێ. چونکە ئەرکی سزا مسۆگەرکردنی جێبەجێکردنی نۆرمە یاساییەکانە بە شێوەیەکی باشتر و رێکتر، بۆیە دەبێ تێکەڵاوی نەکەین لەنێوان ئەو سەرچاوەیەی سیفەتی ئیلزام لە نۆرمی یاسایی دروستدەکات و لەنێوان ئەو ئامرازەی زامنی جێبەجێکردنی دەکات بە شێوەیەکی باشتر.

بەپێچەوانەی ئەو هەستەی بڵاوە، دەوڵەتەکان زیاتر پابەندن بە نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی تاوەك ئەو تاکانەی کە پابەندن بە نۆرمەکانی یاسای نێوەخۆیی و پێشێلکارییەکانی یاسای نێودەوڵەتیش وەکو داگیرکردنی چەکداری و جیاوازیی رەگەزی زۆر کەمترن ئەگەر بەراوردبکرێن بە بارەکانی کوشتن و دزی و دەستدرێژیکردنە سەر ناموس لە چوارچێوەی سیستەمی یاسایی نێوەخۆیی. ئەم تاوانانە لە یاسای نێوەخۆییدا لای هاووڵاتییان ئەو هەستە دروست ناکەن، کە یاسا بوونی نییە، بەهەمان شێوەش سەرپێچییەکانی نۆرمی یاسای نێودەوڵەتی دەگەڕێتەوە بۆ لاوازیی سیستەمەکەی و ناکامڵبوونی.،ئەمەش کارگەرییەکی نەرێنی زۆری نییە لەسەر سیفەتە ئیلزامی و زەرووەرەکەی. دەکرێ بڵێین دەوڵەتەکان سەرەڕای پێشێلکردنێکی زۆر، پابەندن بە زۆرینەی پرەنسیپ و نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتییەوە و ئیلتیزامیان پێدەکەن و چەندین جۆری جیاجیا لە سزا دارێژراوە بۆ ئەو لایەنانەی نۆرمەکانی پێشێلدەکەن.

## باسی شەشەم

## بناخەی یاسای نێودەوڵەتی گشتی

پاش ئەوەی گەیشتینە ئەو بەرئەنجامەی کە یاسای نێودەوڵەتی گشتی بریتییە لە چەند نۆرمێکی مولزەم بۆ کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتیی گشتی، دەبێ بزانین ئەم سیفەتە ئیلزامییە لەسەر چ بناخەیەك بونیادنراوە؟

تیۆرییەکان لەم لایەنەوە کراون بە چەند بەشێکەوە، هەندێکیان پێیانوایە یاسا گوزارشت لە ئیرادەی تاکی دەوڵەت یان کۆمەڵ دەکات و ئەو ئیرادەیە سیفەتی ئیلزام دەداتە یاسا. بۆچوونێکی تریش وای دادەنێت، کە بناخەی هێزی ئیلزامیی یاسای نێودەوڵەتی دەگەڕێتەوە بۆ هەندێ هۆکاری بابەتی مادییانە کە لە دەرەوەی ئیرادەی مرۆڤن. بۆچوونی سێیەمیش لە چەند رووداوێکی نێودەوڵەتی دیکەوە دەڕوانێ، کە دواتر باسی دەکەین.

### رێبازی ئیرادەیی:

رێبازی ئیرادەیی بناخەی ئیلتیزامکردن بە نۆرمە یاساییە نێودەوڵەتییە گشییەکان دەباتەوە بۆ ئیرادەی دەوڵەت بە ئاشکرا بێ یان بە بێدەنگ "چمنی" بێ. دەبینین لایەنگرانی تیۆری خۆ-پێبەندی Self-Limitation، کە لقێکە لە رێبازی ئیرادەیی، پێیان وایە دەوڵەتەکان تەنیا پابەندن بەو نۆرمە یاساییانەی کە پێشتر قایلبوونە ئیلتیزامیان پێوە بکەن، چونکە ئەو دەوڵەتەی کە دەچێتە چەند پێوەندییەکی نێودەوڵەتییەوە، تەنیا بە ویست و ئیرادەی خۆی پابەنددەبێ بە یاسای نێودەوڵەتییەوە. ئەوەش واتای وایە دان بەدەسەلاتێکی بالاتر نانێت، کە توانای هەبێت ئیرادەی بە سەریدا بسەپێنێ، بۆیە دەوڵەتەکان بە ئیرادەی خۆیەتی خۆیان، خۆیان دەبەستن بە نۆرمە یاساییە نێودەوڵەتییەکانەوە، واتە پێیانەوە ئیلتیزام دەکەن.

بەلام تیۆری ئیرادەی کۆدەنگی" توافق" دەوڵەتەکان Doctrine of consensus رەنگدانەوەیە لە رۆڵی زۆرینە بۆ خولقاندنی نۆرمی یاسایی نوێتر و قبوولکردنی لەلایەن

دەوڵەتـەکانی دیکـەوە. جـا ئـەم تیۆرییـە هەوڵێکـە بـۆ گـۆڕینی گرینگیـدان بـە دەوڵەتـە نەتەوەییـەکان، بـە تایبـەتی ئاراسـتەکردنی ئـەو گرینگیدانـە بـەرەو شـێوەکانی هاوکـاری نێودەوڵەتی.

بێگومان کەسێك ناتوانێ ڕۆڵی کۆدەنگی (توافق) لە یاسای نێودەوڵەتیدا پشـتگوێبخات، چونکە زۆرینەی نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی لە لایەن دەوڵەتەکانەوە بە ڕێگەی چـوونە نێـو پەیماننامەی نێودەوڵەتییەوە دانراون. بۆیە نابێ لە گرینگی ئەم پرۆسێسە کەم بکەینەوە. باشتر وایە ڕوانینمان بـۆ هـاوڕازیبوون تـەنیا لـە گۆشـەنیگای پەسـەندکردنی هەنـدێ لـەو نۆرمـە تایبەتانەوە نەبێت، کە کۆی یاسای نێودەوڵەتی پێکدەهێنن، بگرە لە گۆشەنیگای هەڵوێسـتی دەوڵەتەکانیشەوە بێت بە گشتی بەرامبەر بە تێکڕای نۆرمەکان و چەمك وجۆرەهـا ڕەوشـت و قەوارەی سیسـتەمی نێودەوڵـەتی و چەسـپاندنی[5]. لەواقیعـدا ئێمـە نـاتوانین وێنـای بـوونی سیستەمێکی یاسایی نێودەوڵەتی بکەین، ئەگەر دەوڵەتەکان قایل نەبن بە سیستەمی گشـتی یاسای نێودەوڵەتی، یان نەچنە ریزی. هەر ئەمەشە ئەو چـەمکەی کـەوا ناسـراوە بـە گشـتی هەڵویسـت یـان هـاوڕازیبوونی ئـیرادەی هاوبەشـی دەوڵەتـەکان یـانیش برێتییـە لـەو بازنـە سەرەکییە، کە تێیدا ڕازیبوونی دەوڵەتە تاکەکان دەگۆڕێت بۆ ڕازیبوونی گشتی.

**ڕێبازی بابەتی:**

لایەنگرانی ڕێبازی بابەتیی Positivism لەناو هەنـدێ هۆکـاری بابـەتی، لـە دەرەوەی ئیرادەی دەوڵەتەکان، بۆ هۆی سیفەتی ئیلزامـی نۆرمـەکانی یاسـایی نێودەوڵـەتی دەگـەڕێن. یاساناسەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا، کە فەلسەفەی ئابووری تێیدا لە گەشـەدابوو، جـەختیان دەکردە سەر گرێبەست وەك نۆرمێکی یاسایی کە هەردوولا بە ئازادی پشتیان پـێ بەسـتووە. ئەمەش بەلایەنی خۆیەوە کاریگەری هەبووە بۆ سـەرهەڵدانی تیـۆری ڕەزامەنـدی لـە یاسـای نێودەوڵەتیدا (Theory of consent). ئەو کات دەوڵەتەکان لە ئەورووپا ئازاد و سـەربەخۆ بوون و تەنیا بە ڕێککەوتننامەکانیانەوە بەسترابوون، لەوێ دەسەڵاتێکی باڵا نەبوو بە شـێوەی نەزەری یان بە پراکتیك بتوانێ نۆرمەکانی خۆی بە سەر دەوڵەتە نەتەوەییەکاندا بسەپێنێ. ئەو

5- J. Charney ,Universal International. Law 87 Ajil 1993 p.529.

تیۆرییە لەسەر ئەو گریمانەیە بونیادنرابوو، کە بەرجەستەبوو لەوەی هەر سستەمێکی یاسایی لەکۆمەڵە نۆرمێکی یاسایی پلەیی پێکهاتووە، هەر نۆرمێك هێزە یاساییەکەی لەو نۆرمەوە وەردەگرێ، کە بە پایە لەو بالآترە تاوەکو دەگاتە لوتکەی پلەکە، کە ئەویش نۆرمە سەرەکییەکەیە و برێتییە لە نۆرمی پیرۆزیی رێککەوتن و بەجێهێنانی پەیمان ( pacta Sunt Servanda).

## تیۆریی هاوکاری کۆمەڵایەتی Social Solidarity:

لایەنگرانی ئەم رێبازە پێیان وایە، کە بناخەی هێزی مولزەمی یاسا، هاوکاری کۆمەڵایەتییە. واتا هەستکردنی تاکەکان بە هاوکاری و یەکڕیزیی نێوانیان و تێکەڵبوون لە کۆمەڵگەدا و پابەندبوون بە چەند نۆرمێکی رەوشتەوە بۆ بەردەوامبوونی ژیان بە شێوەیەکی رێك وپێك. ئەمەش تاکەکانی هەموو کۆمەڵگەکان دەگرێتەوە لە سەرانسەری جیهاندا.

قوتابخانەی سۆشیالیستیش پێیوایە، کە بناخەی هێزی مولزەمی نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی دەچێتەوە سەر پرەنسیپی پێکەوە ژیانی نێوان دەوڵەتە خاوەن سیستەمە کۆمەڵایەتی و ئابوورییە جیاجیاکان. چونکە بەرژەوەندیی ئەم دەوڵەتانە لەوەدایە، کە لەسەر چەند نۆرمێکی یاسایی مولزەم بۆ هەردوولا رێکبکەون لە پێناو پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی، کە بەبێ ئەم دوو فاکتەرە کۆمەڵگەی ئادەمیزاد پەرەناسێنێ.

پێمان وایە گشت ئەو تیۆرییانەی باسمان کردن کۆك نین سەبارەت بە دەستنیشانکردنی ئەو بنەمایەی یاسا پشتی پێدەبەستێ لە سیفەتە ئیلزامییەکەیدا.

نێزیکترین بۆچوون لە واقیعەوە، ئەوەیە کە کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتیی گشتی و دەوڵەتەکان بەتایبەتی، نۆرمی یاسایی مولزەم دادەڕێژن بە رێگەی هەماهەنگی ئیرادەکانیان و تۆمارکردنیان لە پەیماننامە نێونەتەوەیەکاندا، بەگوێرەی ئەو هەڵوێستە هاوبەشانەی کە لەسەری رێکدەکەون بە رێگەی دانووستاندن و نێزیکبوونەوەی بەرژەوەندییەکانیان لە یەکدیی و هاوسەنگکردنیان.

لە ژیانی رۆژانەی نێودەوڵەتیدا رەچاوی دەیان هەزار پەیماننامە و نۆرمی نەریتی دەکرێت. دەبینین لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا هەستێکی بلاو هەیە، بە پێویستی دەزانێ جۆرە چوارچێوەیەك هەبێ بۆ کاروباری نێودەوڵەتی تاوەکو بە شێوەیەکی سرووشتی بەڕێوەبچن. ئەم رۆڵەش یاسای نێودەوڵەتیی خۆی دەیگێڕێ و داخوازییەکان فەراهەمدەکات. دەوڵەتەکان

هەست بەم زەروورەتە دەکەن، چونکە یاسای نێودەوڵـەتی فاکتـەری سـەقامگیری و ئاشـتی و ئاسایشە بۆ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی. دەبینین کاتێك ناکۆکییەك یان ململانێ لەسەر کێشەیەك لەنێوان دەوڵەتەکاندا روودەدات، باشتر ئەوەیە، دەوڵەتەکان پەنا ببەنە بەر نۆرمەکانی یاسـای نێودەوڵەتیی تاوەکو لەسەر چوارچێوەیەکی هاوبەش رێك بکەون و گوێ لە بیانوو و بەڵگەکانی یەکتر بگرن و بۆچوونەکان نێزیك بخەنەوە بۆ ئەوەی لەسەر زمانێکی هاوبەش لەگەڵ یەکتر رێك بکەون. فاکتەری پێوندیی و دیدەوانی بناخەی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانە، بەڵام لـە یەکـدیی حاڵینەبوون دەبێتە هۆکـاری گـرژی و ململانێـی سـەخت و رەنگـە بەرئـەنجامی خراپـی لـێ بکەوێتەوە.

دەوڵەتەکان بە ئیرادەی تەواوی خۆیان سیاسەتی دەرەوە و نـاوەوەی خۆیـان پیـادە دەکـەن بەپێی سەروەریی نیشتمانی و سەربەخۆیی نیشتمانییان، بەڵام ئەو شتە چییە هانی دەوڵەتەکان دەدات پابەندبن بە یاسای نێودەوڵەتییەوە و نۆرمەکانی پشتگوێ نەخەن؟ بۆ نموونە دەپرسـین، ئایا ئەو نۆرمە یاساییەی رێگەنادا دەستدرێژی بکرێتە سەر دەوڵەتێك یان لایەنێکی تر، خۆی لە خۆیدا زاڵە بەسەر تەماحە سیاسییەکانی دەوڵەتدا؟.

ئەوە راستە پۆلیسی نێودەوڵەتی نییە، کە نـەهێڵێ ئـەو جـۆرە کـردەوە دوژمنکارییانـە رووبـدەن، بـەڵام هـەمان کـات کۆمەڵـە بەهایـەکیش هـەن مـۆرکی نۆرمـە یاسـاییەکانی نێودەوڵەتییان وەرگرتووە و لەوانەیە کارێکی وا بکـەن سـنوورێك بـۆ دەسـتدرێژکار دابنـێن، دەکرێ ئاماژە بەم بەهایانە بدرێن، کە بەم شێوەیەی لای خوارەوە دیاریکراون:

**١- هەڵسوکەوتی بەرامبەر:**

ئەم پرەنسیپە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیـدا بـە چـەکێکی کاریگـەر دەژمێـردرێ، چـونکە دەوڵەتەکان گەلێك جار لەو کردەوانە خۆ دەپارێزن، کە چەند بەرژەوەندییـەکیان بـۆ وەدەسـت دێنێ، کە خزمەتی چەند ئامانجێکی کورتخایەنیان دەکەن، بەڵام لەوانەیە پێوەندییەکی هاوبەش تێك بدەن و ناکۆکی درێژخایەن بنێنەوە لەگەڵ دەوڵەتێك یان چەند دەوڵەتێکی تردا. بۆ نموونـە ئەگەر هات و دەوڵەتێك ئەرکی پاراسـتنی دیپلۆمـاتی لـە دیپلۆماتکـارە بیانییـەکانی سـەر هەرێمەکەی خۆی جێبەجێ نەکات، ئەوە بەم کارەی دیپلۆماتکارانی خـۆی لـە دەرەوەی وڵات دەخاتە مەترسییەوە. بۆیە مومارەسە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا دەسەلمێنێ، کە باشـتر وایـە دەوڵەت سیاسەتێکی حەکیمانەی میانڕەویی بگرێتە بەر بۆ ئەوەی لە بەرامبەریدا دەوڵەتەکانی

دیکەش هەمان هەڵوێست بگرنەبەر و تووشی هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەك نەبنەوە، بەڵام جێی ئاماژەپێدانە، کە لە هەندێ باردا دەوڵەتەکان پاش ئەوەی لە هەموو ئەگەرەکان دەکۆڵنەوە و دەگەنە ئەو بەرئەنجامەی، کە تاکە ڕێگە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکی بنەڕەتی ئەوەیە مل بنێن بەرەو سەرپێچیکردن لە یاسای نێودەوڵەتی، ئەو کات دەیکەن و ئامادەش دەبن بەرپرسیارێتی ئەو کارە و دەرئەنجامەکەی بگرنە ئەستۆ، چونکە وەختێك مەسەلە پێوەست بێت بە بوون و وجوودەوە، ئەوا یاسا بەپلەی دووەم دێت.

**٢- بەرژەوەندی:**

هۆکارە گرینگەکەی دیکە دەسکەوتە، یان ئەو شتە بەرامبەرەیە، کە دەوڵەت وەدەستی دێنێ لە بەرامبەر پابەندبوون بە یاسای نێودەوڵەتیی لەبارێکی دیاریکراو، یان لە پرسێکی دیاریکراودا. ئەم پابەندبوونە لەوانەیە پاڵ بە دەوڵەتە دۆستەکان، یان بێلایەنەکانەوە بنێت پشتگیری لایەنێك لە لایەنەکان بکەن لە جیاتی ئەوەی بەرهەڵستی بکەن، یانیش لەوانەیە ڕۆڵێکی کاراتر ببینێ بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەکە لە بەرژەوەندی ئەم لایەنە یان لایەنەکەی تر. زۆر جار پابەندبوونی دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکان بە یاسای نێودەوڵەتییەوە، وەکو داواکارییەك دەزانرێ بۆ رای گشتی بۆ ئەوەی پشتگیری هەڵوێستەکەی بکەن. ئەم تاکتیکە زۆرێك لە دەوڵەتەکان بەکاری دێنن. مومارەسەی نێودەوڵەتی لە گەلێك ڕووەوە شایەتحاڵی ئەوەن، کە دەوڵەتەکان پێڕەوی برگەکانی یاسای نێودەوڵەتی دەکەن و پابەندن بە ئەحکامەکانییەوە. بۆ نموونە یەکیەتیی سۆڤیێتی پێشوو زۆر جار بیانووی یاسایی بەکاردێنا لە هەوڵەکانیدا بۆ خۆدزینەوە لە ئەرکی بەشداربوونی لە پرۆسێسی ئاشتی پارێزی نەتەوە یەکگرتووەکان. ویلایەتە یەکگرتووکانی ئەمەریکاش نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی دەقۆزتەوە وەکو پاساوێك بۆ هەڵوێستی سەبارەت بە تەنگژەی کووبا، ڤێتنام، یۆگوسلافیا و عێراق.

پەنابردنە بەر یاسای نێودەوڵەتی لەم جۆرە حاڵەتانەدا، هەندێ جار بەرئەنجامی ئەکتیڤی لێ دەکەوەتەوە، هەندێ جاریش بەرئەنجامی نەرێنیی لێ دەکەوتەوە، بەڵام پەنابردنی هەموو دەوڵەتەکان بۆ یاسای نێودەوڵەتی، نیشانەیەکی چاکە بەرەو ئاراستەی دروست، چ سەربکەوێ، یان سەرنەکەوێ.

### ٣- بازرگانی نێودەوڵەتی International Business:

پەرەسەندنی بازرگانی نێودەوڵەتی و ریزبەندیکردنی لە یاسای نێودەوڵەتیدا، فاکتەرێکی دیکەیە کە هانی دەوڵەتەکان دەدات زێدەتر ملکەچی یاسای نێودەوڵەتی بن. دەبینین لە پێوندییە بازرگانییە نێودەوڵەتییەکاندا ئەو خاڵانەی لەسەری رێککەوتن کراوە و ئەوانی تر کە هێشتا ناکۆکییان لەسەرە لە چەند چوارچێوەیەکی یاسایی تایبەت دادەنرێن بەپێی نەریتە کارپێکراوەکان و رێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان. راوبۆچوونی زاناکانی یاسای نێودەوڵەتیش و داواکاری و سکاڵاکانیش بەپێی نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی دادەڕێژرێن، نەوەك نۆرمە ڕەوشتمەندی و موجامەلەنێودەوڵەتییەکان. ئەمانە هەموو لەبەر دەستی کۆمەڵێك فەرمانبەری بەتوانا لە دەزگەکانی دەوڵەتی پێوەندیدار و کارمەندانی دەزگە نێودەوڵەتییەکان دادەنرێن. دامەزراندنی زۆرێك لە یاساناسەکان لە پۆست و پلەی یاسایی بەرزدا لەناوەوەی دەوڵەت وا دەکات، مۆرکی خۆیان بە سەر پرۆسێسی یاسایی نێودەوڵەتییەوە، بەجێ بێڵن.

# باسی حەوتەم

## پێوەندیی نێوان یاسای نێودەوڵەتی و یاسای نێوەخۆیی

لەناو پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، لە کۆنەوە، دوو سیستەمی یاسایی کلاسیکی و سەربەخۆ باون، ئەوانیش سیستەمی یاسایی نێوەخۆیی و سیستەمی یاسایی نێودەوڵەتین. ئەو دوو سیستەمە لەوەتی هەن یەکیان لەوی دیکە جیانەبووەتەوە و کاریگەرییان هەبووە بە سەر پرۆسێسی پێکهاتنی نۆرمە یاساییەکانەوە.

چەند فاکتەرێك هەن هاوپێوەندیی نێوان هەردوو سیستەمەکە دیاریدەکەن، وەکوو هاوپێوەندیی نێوان سیاسەتی نێوەخۆیی و دەرەوە و سیاسەتی دیبلوماتی، کە دەوڵەتەکان پیادەی دەکەن. ئەو رۆڵەی دەوڵەتەکان لە جیهانی هاوچەرخدا ئەمرۆ دەیگێڕن، رۆڵێکی ئالۆزە. دەبینین بەپێی تیۆرییەکانی یاسای نێودەوڵەتی، دەوڵەتەکان لەنێو خۆیاندا یەکسانن و هەر یەکەیان سەروەریی خۆی هەیە، بەلاّم لە واقیعدا ئەگەر ئەو گەشەکردنە بە هەند وەربگرین، کە لە رووی پێوەندی و هوشیاری و پەرەسەندنی کێبڕکێی جیهانییەوە هەن، ناکرێ تەنانەت بەهێزترین دەوڵەت لە جیهاندا لە رووداوە هەنووکەییەکان سەربەخۆ بن و سەروەریی تەواویشیان بپارێزن. ئەو تێکەلاّوی و پێکئالاّوییەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی سیاسی و بازرگانی ئێستە هەیانە، وا دەکەن هەر کارێك دەوڵەت ئەنجامی بدات بە لای سیستەمی نێودەوڵەتی بە گشتی و هەروەها لەو بڕیارانەی دەوڵەتەکانی تر دەیدەن، رەنگدانەوەی هەبێت. بەو جۆرە واقیع سنوور بۆ تیۆریی سەروەری دادەنێ لە پراکتیزەکردندا و زەرووڕەتی هەماهەنگی نێودەوڵەتی فرەوانیش دەچەسپێنێ لە گەلێ کاروباری تری وەك ئەو سیاسەتانەی ئامانجیان چارەسەرکردنی کێشە ئابووری و ژینگەییە ان و مەترسی تیرۆری نێودەوڵەتییە.

شان بەشانی گەشەکردن و فرەوانبوونی یاسای نێودەوڵەتی، ئەو رۆڵەی دەوڵەت دەیگێڕێ لە چوارچێوەی سیستەمی نێودەوڵەتی و پێوەندیی لەنێوان سیستەمی یاسایی نێوەخۆیی دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکان و لەنێوان نۆرم و پرەنسیپە سیاسییەکان لە هەموو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا، گەشەدەکات و بایەخی زیاتری پێدەدرێت. یاسای نێوەخۆیی، لایەنە نێوەخۆییەکانی دەوڵەت و پێوەندی لەنێوان تاکەکان و هەروا لەنێوان تاکەکان و دەزگە

کارگێڕییەکاندا ڕێکدەخات، بەڵام یاسای نێودەوڵەتی بە زۆری جەختدەکاتە سەر پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان، وێڕای هەموو ئەوەش لەویٚ پانتاییگەلێك هەن دەکریٚ تێیاندا ناکۆکی سەرهەڵبدات بەرەو نانەوەی ئاستەنگ لەنێوان هەردوو سیستەمەکەدا. دەبینین لە کێشەیەکی پێش دادگەیەکی نێوەخۆییدا، دەکریٚ پشت ببەستریٚ بە نۆرمێکی یاسایی نێودەوڵەتی وەك بەڵگە. بۆ نموونە دادگەییکردنی کەشتیوانێك لەبەرئەوەی کەشتییەکەی هەرێمی وڵاتێکی بەزاندووە، کەچی ئەو ئاوەی ئەو تێیدا بووە، بە ئاوێکی ئازادی نێودەوڵەتی دادەنریٚ لە یاسای نێودەوڵەتیدا.

## ١- تیۆری دووانەیی Theory of Dualism:

لایەنگرانی ئەم تیۆرییە بابەتییە جەخت دەکەنە سەر گرینگی دەوڵەت و بەو پێیە دەڕواننە یاسای نێودەوڵەتی، کە بریتییە لە کۆمەڵە نۆرمێك و بە ئیرادەی دەوڵەتەکان پێکهاتوون و پێیان وایە ئەو شتەی نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی پێکدێنیٚ نەریت و پەیماننامە نێودەوڵەتییەکانن، نەوەك پێکهاتەی رووکەشی و بەرئەنجامە تیۆرییەکان یان نۆرمە ڕەوشتمەندییەکان. کاتێك هەوادارانی تیۆری بابەتی وەك Tripet -Strupp لە پێوەندیی نێوان یاسای نێودەوڵەتی و یاسای نێوەخۆیی دەکۆڵنەوە، پشت بە بنەمای باڵادەستی دەوڵەت دەبەستن و داندەنێن بە بوونی زۆرێك جیاوازی لەنێوان هەردوو سیستەمەکە و تاکیددەکەن، کە نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی سەربەخۆن لە نۆرمەکانی یاسای نێوەخۆیی، واتا هەردوو یاساکە بە دوو سیستەمی یاسایی یەکسان و سەربەخۆ و جیاواز لە یەکدی، دادەنرێن.

بە رای لایەنگرانی ئەم تیۆرییە، جیاوازی نێوان هەردوو یاساکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جیاوازییەی، کە هەیە لەنێوان سرووشتی پێوەندییەکان، لەناوەوەی دەوڵەت و لەناو پێوەندییە نێونەتەوییەکان، هەروەها جیاوازیی پێکهاتەی یاسایی ناوەخۆی دەوڵەت لەگەڵ پێکهاتەی یاسایی نێوان دەوڵەتەکان. دەبینین کاتێك یاسایەکی نێوەخۆیی ڕێگەدەدات بە جێبەجێکردنی نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی ئەوە نیشانەی باڵادەستی دەسەڵاتی دەوڵەتە لەنێو هەرێمەکەیدا و بە باڵادەستی یاسای نێودەوڵەتی بەسەر یاسای نێوەخۆییدا دانانریٚ[٦].

ئەم تیۆرییە لایەنگرانی توندڕۆی هەن، هەندێکیان بەهیچ شێوەیەك دان نانێن بەبوونی

6- Oppenheim s International Law 9th Eden 1992, by Sir R. Jennings and Sir A. Watts. p.53

پێوەندییەکی هاوبەش لەنێوان هەردوو یاساکەدا. ئەمانە هەردوو یاساکە بەسەر دووهێڵیێ هاوتەریبەوە دادەنێن یان هاوپێوەندییەکانی نێوان هەردوو سیستەمەکە دەگەڕێننەوە بۆ هاوکاریگەری هەردوو سیستەمەکە و بۆ زەرووڕەتی گونجانی یەکیان لەگەڵ ئەوی تردا. بەم جۆرەش حاشادەکەن لە هاوکاریگەری کردەیی لەنێوان پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان و یاساکانی نێوەخۆییدا لە پرۆسێسی ڕێکخستنی یاساییدا، بەڵام ژمارەیەکی دیکە دان بە بوونی هاوپێوەندییەکی کردەییدا دەنێن لەنێوان یاسای نێودەوڵەتی و یاسای نێوەخۆییدا. هۆکاری ئەم هاوپێوەندییەش دەگەڕێننەوە بۆ چەند فاکتەرێکی بابەتیی گرینگ وەك هاوکاریگەری کردەیی لەنێوان سیاسەتی نێوەخۆیی و سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتدا. ئەوی لەم بارەیەوە گرینگییەکی زێدەتر وەردەگرێ، لە واقیعدا ئەوەیە کە دەوڵەتەکان بە چەند شێوازێك و لە چەند قۆناخێکی جیاجیادا نۆرمەکانی یاسای نێوەخۆیی و نۆرمە یاساییە نێودەوڵەتییەکان دادەنێن بەشێوەیەك، کە بەرجەستە لە بەرژەوەندییە هاوبەشەکانیان بکەن.

تیۆری گۆڕین Transformation وەکو ڕەنگدانەوە لە ڕێبازی بابەتی دوانەیی، سەریهەڵدا، ئەم تیۆرییە لەسەر بناخەی پێزانین بە بوونی دوو سیستەمی یاسایی جیاواز بونیادنراوە، کە بە شێوەیەکی جیاواز لە یەکتر کاردەکەن. کەواتا پرەنسیپ و نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی لەنێو ئەو هەرێمەی، کە لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتدایە، هیچ هێزێکی ئیلزامییان نییە ئەگەر بە ڕاشکاوی و بەشێوەیەکی تایبەت لە ڕێگەی میکانیزمێکی دەستووری پەسندکراو، نەگۆڕدرێتە یاسایەکی نێوەخۆیی وەك یاسایەك، کە لە لایەن پەرلەمانەوە دەردەچێت. ئەم تیۆرییە لەو کارڕاییانەوە هەڵقوڵاوە، کە بە گوێرەیان پەیماننامەی نێودەوڵەتی سیفەتی یاسای نێوەخۆیی کارپێکراو وەردەگرێت لە ڕێگەی پەسندکردنەوە لە لایەن دەسەڵاتی پێوەندیدارەوە. بەوەش بیرۆکەکە پەرەی سەند بەرەو زەرورەتی گۆڕینی هەر نۆرمێك لە نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی یان پەسندکردنیان بە شێوەیەکی تایبەت بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی سیستەمی یاسای نێوەخۆیی، کارپێکراو بن.

لایەنگرانی تیۆری تێکەڵبوون Incorporation تەرکیزدەکەنە سەر دانانی یاسای نێودەوڵەتی بە ئۆتۆماتیکیانە وەك بەشێك لە یاسای نێوەخۆیی، بۆیە پێویست ناکات پەنا ببرێتە بەر کردەکاری"اجراءات" پەسندکردنی پەیماننامەی نێودەوڵەتی بە شێوەی دەستووری بۆئەوەی مۆرکێکی نێوەخۆیی پێ بدرێ.

ئەم تیۆرییە پشت بە نۆرمە یاساییە نەرێتی و پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان دەبەستێت.

ئەوەبوو دادگەکانی بەریتانیا لە سەدەی هەژدەهەمەوە کاریان پێکرد، بۆ نموونە لە کێشەی Buvot V. Barbut لۆرد Talbot تاکیدی کردەوە، کە ((یاسای گەلان تێکڕای بەشێك بووە لە یاسای بەریتانیا و کارەکەی دەرخەربووە، لە ڕووداوێکی تایبەتەوە سەریهەڵداوە))..((هەروەها پێویستە لە مومارەسەی گەلانی جیاجیا و کتێبەکانی یاساناسەکانەوە بگەینە بەرئەنجامی یاسای گەلان..))[7].

## ٢- تیۆری یەکتایی یاساکان Theory of Monism:

لایەنگرانی ئەم تیۆرییە، وێنای ئەوە ناکەن دوو سیستەمی یاسایی هەبێت بەبێ باڵادەستی یەکێکیان بەسەر ئەوی تردا. بۆیە سەبارەت بەوەی کامێك لەو دوو سیستەمە بەسەر ئەوی تردا باڵادەستە، لایەنگرانی ئەم تیۆرییە دەبنە دوو کۆمەڵەوە. کۆمەڵی یەکەمیان جەختی کردۆتە سەر بیرۆکەی باڵادەستی یاسای نێوەخۆیی، کۆمەڵی دووەمیشیان بانگەشە بۆ بیرۆکەی باڵادەستی یاسای نێودەوڵەتی دەکات.

ئەم تیۆرییە لەسەر بناخەی پلەیی یاسایی بونیادنراوە، واتا هەر نۆرمێکی یاسایی هێزە مولزەمەکەی لەو نۆرمەوە سەرچاوەی گرتووە، کە بە سەرییەوەیە لە ستوونەکەدا تاوەکو دەگاتە نۆرمە بنەڕەتییە گشتییەکە، کە ئەویش بەلای لایەنگرانی باڵایی یاسای نێوخۆییەوە دەستووری دەوڵەتە واتە یاسای نێوەخۆیی. بەلای ئەوانی دیکەیشەوە، یاسای نێودەوڵەتییە، کە ئەوانیش لایەنگرانی باڵادەستی یاسای نێودەوڵەتین بەسەر یاسای نێوەخۆییدا.

تیۆریی یەکتایی یاسا لەگەڵ باڵادەستی یاسای نێوەخۆییدا لە لایەن هەندێ دەوڵەتانەوە، وەکو شێوازێك بەکاردێت بۆ بەرەنگاربوونەوە لە پرەنسیپ و نۆرمە پێشکەوتووەکان لە یاسای نێودەوڵەتیدا. بۆ ئەمە پاساوی سەروەریی ڕەهای دەوڵەت و دەستێوەرنەدان لە کاروباری نێوەخۆیی بۆ پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لە چوارچێوەی سنووری دەوڵەتەکانیان، دێننەوە.

لە لایەکی دیکەوە هەندێك لە دەوڵەتەکان تیۆری یەکتایی یاسا لەگەڵ باڵادەستی یاسای نێودەوڵەتی بەکاردێنن لە ڕێگەی شرۆڤەکردنی بڕگە و پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتییەوە و دانانیان بە یاسایەکی باڵاتر و بەهێزتر وەکو بیانوویێك بۆ پێشێلکردنی مافی گەلانی تر و دەستێوەردان لە کاروباری نێوەخۆییاندا.

---

7- (1737) Cases T. Talbot 281

(Lauterpacht ) کە لە لایەنگرانی تیۆری یەکتایی یاسا و باڵادەستی یاسای نێودەوڵەتییە، لە گرینگپێیدانی زۆرییەوە بە مافی مرۆڤ کەڵکی وەرگرتووە بۆ داڕشتنی ئەو بیرۆکەیەی، کە دەڵێ: لەبەرئەوەی ئەرکی سەرەکیی یاسا بۆ خێر و خۆشیی تاکی مرۆڤە، ئەوە باڵادەستی یاسای نێودەوڵەتی چێترین رێگەیە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە. ئەم تیۆرییە گوزارشت لە چەند گومانێکی قووڵ دەکات بەرامبەر بە سیستەمێکی نێودەوڵەتی پشت بەستراو بە سەروەری دەوڵەتان و سەر بەخۆیی رەهایانەوە، لە کاتێکدا بەرجەستە لە متمانەی قووڵ دەکات بە توانای نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی بۆ دەوڵەمەندکردنی سیستەمی نێودەوڵەتی بە چەمکەکانی داد و ئینساف و ئەو ڕەوشتانەی، کە ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ و خۆشگوزەرانی مرۆڤ بناخەیانە[8].

لە لایەکی دیکەوە Kelsen بۆ لێکدانەوەی تیۆریی یەکتایی یاسا کەڵکی لە تیۆرییە فەلسەفییەکەی Kant وەرگرتووە سەبارەت بە یاسا، کە دەڵێت یاسا لە سیستەمێك پێکهاتووە برێتییە لەچەند نۆرمێکی رەوشت، پێویستە ئیلتیزامیان پێوە بکرێ و هەروەها لەچەند ئەحکامێکیش بۆ سزادانی ئەوانەی سەرپێچی دەکەن. جا لەبەرئەوەی پێناسەکە چەند نۆرمێك لە سیستەمی نێوەخۆیی و چەند نۆرمێکی تری لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی لەخۆگرتووە و هەروا لە بەرئەوەی دەوڵەتەکان بناخەی پێوەندییە یاساییەکانی نێوانیان دەگێڕنەوە بۆ نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی وەك ئەوەی بانگەشە بۆ یەکسانی دەکەن، کەچی دەوڵەتان خۆیان ناتوانن لە بەردەم یاسادا یەکسان بن ئەگەر ئیلتیزامی پێوە نەکەن، ئەوە بەرئەنجام ئەوەیە کە یاسای نێودەوڵەتی باڵاترە لە یاسای نێوەخۆیی یان بناخەیەك پێکدێنێ بۆ یاسای نێوەخۆیی.

بۆچوونێکی نوێ هەیە لەبارەی پێوەندیی نێوان یاسای نێودەوڵەتی و یاسای نێوەخۆییدا، ئەمەش دەکرێ بە پەرەسەندنێك دابنرێ بۆ تیۆریی دووانەیی یاسا.

Roussean و Fitzmaurice و هەندێ یاساناسی تر لایەنگری ئەم بۆچوونەن. ئەمانە هەوڵدەدەن چوارچێوەیەکی تیۆری پێزانراوی وا دابڕێژن، کە بەسترابێتە واقیعەوە. ئەوان پێیانوایە چوارچێوەیەکی هاوبەشی وا نییە، کە هەردوو یاسای نێودەوڵەتی و یاسای نێوەخۆیی بگرێتەوە، بە شێوەیەك کە وا بکات یەکێکیان لەوی دیکەیان باڵاتربێت. هەر سیستەمێکی

8- H. Lauterpacht. International Law and Human Rights, London. 1950
9- Kelsen.H Principles of International Law 2 Eden, New York. 1966, pp. 557-559

یاسایی لە بازنەی خۆیدا باڵایە. دەبینین سیستەمی یاسایی فەرەنسی لـە فەرەنسـادا باڵایـە و سیستەمی یاسایی بەریتانیش لە بەریتانیادا باڵایە. لێرەش چۆن نـاکرێ بگـوترێ سیسـتەمی یاسایی فەرەنسی باڵاترە لە سیستەمی یاسایی بەریتانیا، بەهەمان شـێوەش نـاکرێ بگـوترێ یاسای نێودەوڵەتی باڵاترە لە یاسای نێوەخۆیی و بەپێچـەوانەوە، چـونکە هـەر سیسـتەمێکی یاسایی لەوی دیکە سەربەخۆیە و لە بازنەی تایبەتی خۆیدا کاردەکات.

لە بارێکدا ئەگەر دەوڵەت لە چوارچێوە نێوەخۆییەکەیدا و بەپێی ئەو ئیلتیزامانـەی، کـە لە یاسای نێودەوڵەتییەوە هەڵقوڵاون، رەفتارنەکات، ئـەوا ئـەم رەفتـارەی لەلایـەن نـۆرمێکی یاسایی نێودەوڵەتییەوە پووچەڵ ناکرێتەوە، بگرە هەڵوێستەکەی بە پێشێلکردنێك دادەنرێ بـۆ نۆرمێك لە نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی و چارەسەرکردنی لە چوارچێوەی یاسای نێودەوڵەتیی دەبێ، چ بە رێگەی پرۆتستۆی دیپلۆماتی یان بە رێگەی دادگەوە.

ئەم شێوازە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، پەناناباتە بەر چەند چەمکێکی تیۆریی، بگـرە هەوڵ دەدات لەبەر رۆشنایی هۆکارگەلێکی کردەیـی گونجـاو لەگـەڵ کـردەوەی دەوڵەتـەکان و بڕیارەکانی دادگەی نێودەوڵەتیدا چارەسەریان بکات[10].

بنەمای گشتیی لەبارەی پێوەندیی یاسای نێودەوڵەتی بە یاسای نێوەخۆییەوە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی ئەمەیە: ئەو دەوڵەتەی کە پێشێلی نۆرمێکی یاسایی نێودەوڵەتی دەکات نـاتوانێ لە بەرپرسیارێتی هەڵێت بە رێگەی هەواڵەکردن بۆ بڕگەکانی یاسا نێوەخۆییەکەی، چونکە ئەوە ناکرێ بەرگری لە پێشێلکردنی ئیلتیزامێکی نێودەوڵەتی بکرێ بە بیانووی ئەوەی، کە دەوڵەت بەگوێرەی یاسا نێوەخۆییەکەی رەفتاری کـردووە. هـۆی رێگەنـەدان بـە بـەکارهێنانی نۆرمـە یاساییە نێوەخۆییـەکان بـە بیـانووی خۆدزینـەوە لـە بەرپرسـیارێتی نێودەوڵـەتی زۆر روون و ئاشـکرایە، ئـەویش رێگەگرتنـە لـە کـارکردنی یاسـای نێوەخـۆیی لـە بوارەکـانی یاسـایی نێودەوڵەتی.

لە پاشانیش مومارەسەکردنی دەوڵەتەکان و دادگەی نێودەوڵـەتی جـەختیان لەسـەر ئـەم بۆچوونە کردووە بۆ رێگرتن لەو دەوڵەتانەی بەکێشە و ململانێ نێودەوڵەتییەکانەوە گلاون، کە پشت بە یاسای نێوەخۆیی ببەستن وەکو شێوازێك بۆ خۆلادان لە بڕگەکانی یاسای نێودەوڵەتی. لە مادە(٢٧)ی رێککەوتننامەی ڤیـەننا سـەبارەت بـە یاسـای پەیماننامـەی سـاڵی ١٩٦٩ی

10- G. Fitzmaurice, The General Principles of International Law ,Considered from standpoint of the Rule of Law, 92. HR. 1957. 11. PP.70 – 80

هاتووە: ((لایەنەکان بۆیان نییە پەنا ببەنە بەر حوکمی یاسا ناوەخۆییەکەیان بۆ پاساودانەوەی سەرنەکەوتنیان لە جێبەجێکردنی پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی)). ئەم دەقە لەو نۆرمانەشدا هاتووە، کە پێوەندییان بە ململانێی نێودەوڵەتییەوە هەیە.

دادگەی نێودەوڵەتی لە مێژەوە جەختی کردۆتە سەر باڵادەستی یاسای نێودەوڵەتی بەسەر یاسای نێوەخۆییدا بەبێ رەچاوکردنی سەرچاوەی یاسای نێودەوڵەتی جا چ پەیماننامەی نێودەوڵەتی یان نەریتی نێودەوڵەتی یان پرەنسیپی یاسای گشتی بێت. بۆ نموونە لە کێشەی ئەلاباما‌دا کە دادگەیەکی ناوبژیوانی نێودەوڵەتی لە ساڵی ١٨٧٢ لە جنێڤدا سەیری دەکرد، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەرامبەر بە بەریتانیا پرۆتستۆی نواند، چونکە ئەمیان رێگەی بە کەشتییەکی دابوو، کە لە لیڤەرپوولەوە دەهات، هێرش بکاتە سەر کەشتییەکانی ئەمەریکا. دادگەکە تاکیدی کرد کە نەبوونی حوکمێکی یاسایی وا لە یاسای بەریتانیدا، کە ئەو جۆرە کارانە قەدەخەبکات، نابێتە بەڵگە بۆ دەربازبوون لە بەرپرسیارێتی، بۆیە بەریتانیا بەرپرسیارە بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانانەی، کە لە لایەنی ئەمریکی کەوتووە.

لەکێشەیەکی ناوبژیوانی تر کە لە ساڵی ١٩٨٨ روویدا، دادگەی نێودەوڵەتی تاکیدی کرد کە یاسای نێودەوڵەتی بەسەر یاسای نێوەخۆییدا باڵادەستە[11]. دادوەر (شهاب الدین)یش لە کێشەی (لۆکەربی)دا[12] جەختی لەسەر ئەوە کردووە، کە بێدەسەڵاتی لە کارکردن لە سایەی یاسای نێوەخۆییدا پاساوێك نەبووە بۆ پیادەنەکردنی ئیلتیزامێکی نێودەوڵەتی. هەروەها دادگەی نێودەوڵەتی لە کێشەی Electtronica Sicula SPA[13] جەختی کردۆتە سەر ئەو واقیعەی، کە رەفتارێکی ناشەرعی دەسەڵاتی گشتی لە چوارچێوەی یاسای نێوەخۆییدا ئەوە ناگەیەنێ، کە دەبێ ئەم رەفتارە لە یاسای نێودەوڵەتیشدا ناڕەوابێت. بەهەرحاڵێکیش ئەم بیروبۆچوونانە لەمەڕ باڵادەستی یاسای نێودەوڵەتی بەسەر یاسای نێوەخۆییدا، ئەوە ناگەیەنێ کە حوکمەکانی یاسای نێوەخۆیی زەروور نین و پێوەندییان بە یاسای نێودەوڵەتییەوە نییە، بەپێچەوانەوە، رۆڵی نۆرمەکانی یاسای نێوەخۆیی رۆڵێکی کارایە بۆ کارکردنی میکانیزمی یاسای نێودەوڵەتی. خوێندنی یاسای نێوەخۆیی یەکێکە لە شێوازە گرینگەکان بۆ زانین و دۆزینەوەی هەڵوێستی یاسایی دەوڵەتەکان لەبارەی زۆرێك لە پرسە گرینگەکانی یاسای

11- International Court of Justice (ICJ) Rep.1988, pp 12 -13

12- CJ. Reports, 1992, pp. 3.32.94

13- ICJ. Reports, 1989, pp.15.73-74.88

نێودەوڵەتی. دەبینین دەوڵەتەکان لە یاسا نێوەخۆیەکاندا چەند پرسێکی گرینگی نێودەوڵەتی دەچەسپێنن چ وەك مەودای ئاوی هەرێمییان و دەسەلاتی یاساییان یانیش مەرجەکانی بەخشینی مافی هاونیشتمانێتی بە بیانییەکان و... هتد. بەم جۆرە لە رەفتاردا: دادگەی نێودەوڵەتی پێش ئەوەی بڕیار لەسەر ئەو کێشەیە بدات، کە خراوەتە پێشی هەست دەکات کەوا پێویستە ئەو حوکمانەی هاوشێوەن لە یاسای ناوەخۆدا دراسەبکات.

جگە رۆلی یاسایی نێوەخۆی بۆ زانینی هەلوێستی دەوڵەت بەرانبەر هەندێ کێشەی گرینگ لە یاسای نێودەوڵەتیدا، دەتوانرێت ئەحکامەکانی یاسایی ناخۆ بەکاربهێنرێت وەك بەڵگە بۆ چاوەدێریکردنی ئیلتیزامی نێودەوڵەتی یان پێشیلکردنی.

لە کێشەی(Upper silesia) لەنێوان پۆلۆنیا و ئەڵمانیا، دادگەی دادی نێودەوڵەتی هەمیشەیی جەختی کرد، کە (( لە کاتێکدا لە ئەرکەکانی دادگەدا نییە لە یاسای پۆلۆنی بپێچێتەوە، وەك یاسا، بەلام شتێکیش نییە رێگە لە دادگە بگرێ رای خۆی سەبارەت ئەو مەسەلە بدات، کە ئایا پۆلۆنیا ئەو یاسایە پیادەدەکات یان نا. تاوەکو بزانێت تاچەند پۆلۆنیا پابەندە بە ئیلتیزامەکانی بەرامبەر ئەڵمانیا بە گوێرەی رێککەوتننامەی جنێڤ))[14].

وێڕای ئەرك و فەرمانە زۆرەکانی نۆرمی یاسای نێوەخۆیی لەسەر ئاستی یاسای نێودەوڵەتی، بەلام دەبێ جەخت لەسەر ئەو مەسەلەیە بکرێ، کە نەبوونی حوکمێکی دیاریکراو لەنێو سیستەمی یاسایی نێوەخۆیی بە دەستووریشەوە، ناکرێ بە پاساوێك دابنرێ بۆ خۆدزینەوە لە ئیلتیزامی نێودەوڵەتی، هەر رێگەچارەیەکی دیکەش یاسای نێودەوڵەتی ڕووبەڕووی مەترسی دەکاتەوە.

14- Brownlie. I, Principles of Public International Law, 5th Eden, Oxford. 1998, PP.42-43.

# باسی یەکەم

## سەرهەڵدانی یاسای نێودەوڵەتی

یاسای نێودەوڵەتی گشتی وەك سیستەمێك کە برێتییــە لــە کۆمەڵــە نــۆرم و پرنســیپێکی یاسایی پــەیمانی و عــورفی پێوەندییــەکانی نێــوان دەوڵەتــەکان، لــە قۆنــاخێکی دیــاریکراوی پەرەسەندنی کۆمەڵگەی مرۆییدا، ڕێك دەخات. سەرهەڵدانی دەوڵەت، کــە جگــە لــە ئەرکــە ناوەخۆییەکانی، ئەرکی دەرەکیشــی مومارەســەدەکرد، وایکــرد پێوەندییــە نێونەتەوەیــەکان و پاشانیش یاسای نێودەوڵەتی بێتەکایەوە.

یاسای نێودەوڵەتی International Law یــاخود (یاســای نەتــەوەکان ) وەکــو ئێســتە هەیە، تارادەیەکی زۆر لەگەڵ پەرەسەندنی کولتــووری ڕۆژئــاوایی و ڕێکخــراوە سیاســییەکاندا ســەریهەڵداوە. چــونکە گەشــەکردنی تیــۆری ئــەورووپایی تایبــەت بــە ســەروەریی دەوڵەتــە نەتەوەییەکان و سەربەخۆکان، پێویستی بە پیادەکردنی شێوازێکی نوێ دەکــرد. لــە پێوەنــدی دەوڵەتاندا. ئەم مومارەسەش دەبوایە پشت بەچەند نۆرمێکی ڕەوشــت ببەســتێ، کــە لــە لای گشت لایەنەکانی ئەو یەیوەندییە پەسەندبێت. یاسای نێونەتەوەیش ئــەرکی پڕکردنــەوەی ئــەم بۆشاییە بوو. هەر لەگەڵ هەڵهاتنی سەردەمی بووژانەوە لــە ئــەورووپادا یاســای نێودەوڵــەتی گەشەی سەند، بەڵام ڕەچــەڵەکی فرەرەگــەزە و دەگەڕێتــەوە بــۆ ســەردەمانی کــۆنی مێــژووی مرۆڤایەتی. کەواتا یاسای نێودەوڵەتی دوای بڕینی قۆناخێکی دووری پێشکەوتنی مرۆڤایــەتی گەیشتۆتە ئەم سەردەمەی ئێستەی.

## سەردەمە کۆنەکان:

لە کاتێکدا دەکرێ مێژووی سیسەتمی نێودەوڵـەتی نـوێ ببەینـەوە بـۆ نێزیکـەی (٤٠٠) ساڵێك لەمەوبەر، بەڵام هەندێك لە چەمکە گەوهەرییەکانی یاسای نێودەوڵەتی، پێش هەزاران ساڵ چۆتە نێو پێوەندییە سیاسییەکانی نێوان قەوارەکانی ئەوساوە. سەرنج دەدەیـن نێزیکـەی دەوروبەری ٢١٠٠ پێشی زایین پەیماننامەیـەکی فـەرمی بەسـتراوە لـەنێوان هـەردوو پاشـای Lagash و Ummaی سۆمەری. ئەو دوو شار- دەوڵەتانەی کە کەوتووبوونە ئەو ناوچەیەوە، کە ناسراوە بە میزۆپۆتامیا واتە (وڵاتی نێوان هەردوو رووبار). دەقـی ئـەم پەیماننامەیـە کـە لەسەر پەیکەرێکی بەردین تۆمـارکرابوو، جـەختی کردۆتـەوە لەسـەر رێزگـرتن لـە سـنووری دارێژراوی نێوان هەردوولا، بە گەواهیدانی ژمارەیەك لە خواوەندی سـۆمەرییەکان[1]. هـەروەها پەیماننامەیـەکی ئاشـتەوایی و هاوپـەیمانی لـە سـاڵی ١٢٧٩ی پـێش زایـین لـەنێوان شـا (رەمسـیس)ی دووەم فیرعـەونی میسـر و پادشـای حیتییـەکان (الحیثـیین) مـۆرکراوە. ئـەم پەیماننامەیە بە زمانی ئەکەدی / بابلی نووسراوە، کە لەو سەردەمەدا زمانی دیپلۆماتی بووە. بەپێی پەیماننامەکە هەر لایەنێك پابەندبووە ریزبگرێت لە یەکپەتیی هەرێمی لایەنەکـەی تـر و کۆتایی بێنن بە باری دوژمنایەتی نێوان هەردوو وڵات و پەیمانێکی بەرگری هاوبەش ببەستن.

رێککەوتننامەکانی نێوان قەوارە رۆژهەڵاتییەکان شێوەیەك لە پیرۆزی و رێورەسمی ئـاینی باڵی بەسەریاندا کێشابوو، پتر ئامانجیان بەستنی هاوپەیمانییەکی سیاسی بـووە بەرامبـەر بـە کاریگەریی ئیمپراتۆرییەتێکی بەهێزتر.

چەند نۆرم و بڕگەیەکی یاسایی هەن ماکی مێژووییان دەچێتەوە سەر رۆژهەڵاتی ئاسیا، کە بەر لەسـەدەها سـاڵ پـێش زایـین دانـراون، وەك نۆرمـە یاسـاییە هیندۆسـییەکان کـە زیـاتر رەنگدانەوەی هەستی رەوشتی بەرز و رەسەنایەتییە. بۆ نموونە یاسای (مانۆ)ی بەناوبانگ کـە نێزیکەی هەزار ساڵ پێش زایین دانراوە، چەند نـۆرمێکی یاسـایی لـەخۆگرتووە سـەبارەت بـە رێکخستنی پێوەندییە نێودەوڵەتییـەکان لـە وەخـتی ئاشـتی و شـەڕ وبەسـتنی پەیماننامـە و دامەزراندنی باڵوێزخانە. ئیمپراتۆرییـەتی چـینیش چـەندین نـۆرمی یاسـایی دارشـتووە بـۆ رێکخستنی پێوەندی لەنێوان هەرێمەکانیدا بە تەرحێکی گونجاو و بۆ زاڵبوون بەسەر ئـاژاوە و پشێویدا و رێکخستنی پێوەندیی نێوان کۆمەڵە جیاوازەکان و بـۆ رێزگـرتن لـە دانیشـتووانی

---

1- Nusbaum,A.Concise History of the Law of Nations, New York, Macmillan, 1962 pp. 1-2

سیڤیل و دانانی چەند بەهایەکی رەوشتی بەرز بۆ پەروەردەکردنی چینە دەسەڵاتدارەکان.

شارستانییە کۆنەکان لە رووی کولتووری و جوگرافیاوە سنووردرابوون و تیۆرییەکیش نەبوو لەبارەی کۆمەڵگەیەکی نێودەوڵەتی بە جۆرێك دەوڵەتەکان هەموو بگرێتەوە و لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا پێکەوە بژین.

رەهەندەکانی نۆرمە نێودەوڵەتییەکانیش زۆر سنووردرابوونە و ئەوەشی هەبووە برێتیبووە لە چەند چەمکێکی دیاریکراو وەك پیرۆز راگرتنی پەیماننامە کە تا وەکو ئەم رۆژگارەمان باوە وەك تۆخمێکی گرینگ لە کۆمەڵگەدا. بیرۆکەی کۆمەڵگەیەکی جیهانی خاوەن بۆچوونی تایبەتی خۆی لە چوارچێوەی سیستەمێکی نێودەوڵەتیدا پێشتر ناسراو نەبوو.

### سەردەمی یۆنانەکان:

لە سەردەمی یۆنانی کۆندا، شار ـ دەوڵەتەکان، باڵوێزیان لەنێوان خۆیاندا ئاڵوگۆڕکردووە و رێککەوتننامەی هاوپەیمانی و ئاشتییان بەستووە (وەکو پەیمانی نیکییف لەنێوان ئەسینا و سپارتە ساڵی ٤٢١پێش زایین) و رێککەوتننامەکانی هاریکاریی هاوبەش و بازرگانی و... هتد. شار— دەوڵەتە یۆنانییەکان پێوەندییەکانیان لەگەڵ ئەو وڵاتانە بەستووە، کە لەناوچەکانی دیکە بوون. بۆ نموونە سپارتە لە ساڵی ٣٨٧ پەیمانی (ئەنتالکید)ی لەگەڵ ئێراندا مۆرکردووە، ئەسیناش پەیمانێکی لەگەڵ مەکەدۆنیا لە ساڵی ٣٤٦پ.ز مۆرکردووە. شارەکانی یۆنان نێردراو و باڵوێزیان بەکارهێناوە بۆ بەستنی پێوەندی دەرەوەیان. هەروا سیستەمێکیش هەبووە بۆ پاراستنی بیانییەکان، سیستەمەکە دەسەڵاتی بە کەسانێکی دیاریکراو دەدا، کە ببنە بریکاری بیانییەکان و بەرگری لە بەرژەوەندییەکانیان بکەن و یارمەتییان بدەن.

چەند نۆرمێکیش هەبوو شار ـ دەوڵەتەکان لەسەری رێککەوتبوون بۆ شەڕکردن و جاڕدانی شەڕ و رێگرتن لە بەکارهێنانی چەکی ژاراوی و نەکوشتنی ئەو کەسانەی پەنادەبەنە بەر پەرستگەکان لەکاتی داگیرکردنی شاردا. دیلەکانیش ئەگۆڕدرانەوە، یان لە بەرامبەر قوربانییەك، بە (پارەو ماڵ و سامان) بەرەڵادەکران، یانیش لە دواییدا دەکرانە کۆیلە و ماڵ و سامانی شاری داگیرکراویش هەموو دەبوونە دەسکەوتی ئەوی سەرکەوتوو بووە لە شەڕدا.

### سەردەمی رۆمانییەکان:

لەسەردەمی رۆمانییەکاندا یاسای نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی بەرچاو پەرەی سەند، بە

تایبەتی سیستەمی باڵوێزی. لێرەدا باڵوێز دەسەڵاتی پێدرابوو پەیماننامە مۆربکات و کێشەکان چارەسەربکات و شەڕ جاڕبدات و پەیمانی ئاشتەوایی ببەستێت و ئەم کاروبارانە بخاتە پێش ئەنجومەنی پیران و ئەنجومەنی نیشتمانی بۆ گفتوگۆکردن. ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی جۆرەها پەیمانی وەك هاوپەیمانی و دۆستایەتی و بازرگانی و دەریاوانی و...هتد، دەبەست و هەروا سیستەمی پاراستنی بیانییەکانیش پەرەی سەند.

عورفە جەنگییەکانی رۆمانییەکان زۆر سەختبوون. سوپای رۆمان شارەکانی دوژمنەکەی وێراندەکرد و وەکو دەسکەوتیش دەستی بەسەر موڵك و سامانەکانیاندا دەگرت و نەك تەنیا سەربازەکانی سوپای دوژمنەکەی، بگرە دانیشتووانی شارە داگیراوەکانیشی هەموو دەکردە کۆیلە. شەڕەکانیان دژوار و بێرەحمانە بوون، هیچ کۆتێك لە بەردەمیاندا نەبوو، ئەوە نەبێ هەندێك نۆرم هەبوو بۆ بەکارنەهێنانی چەکی ژاراوی و بەکارنەهێنانی ژەهر لەشەڕدا. هاوکات لەگەڵ جاڕدانی شەڕ، یاخود بەستنی پەیمانی ئاشتیدا، ئاهەنگی فەرمی سازدەدرا.

ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی رێزی لە سیستەم و یاسا دەگرت. یاسا کاڵایەك بووە بڕابوو بە باڵای هەموو بەشەکانی ئەو ئیمپراتۆرییەتە و ببووە سەرچاوەیەکی زیندوو لە ژیانی هەموو تاکێکی خەڵکی. یاسای شارستانی Jus civile، کە لە قۆناخەکانی سەرەتادا تەنیا هاووڵاتییە رۆمانییەکانی دەگرتەوە، ئاڵۆز و نائامان بوو و گوزارشتی لە کۆمەڵگەیەکی بچووکی دواکەوتوو دەکرد بە جۆرێك نەدەگونجا لەگەڵ دەوڵەتێکدا، کە بەردەوام لە پەرەسەندن و فرەوانیدا بوو. ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی (یاسای گەلان Jus gentium)، کە برێتی بوو لە چەند پرەنسیپێکی سادە بۆ رێکخستنی پێوەندی لەنێوان خودی بیانییەکان و هەروا بیانی و هاووڵاتیدا. سەرهەڵدانی یاسای گەلان لە بەرئەنجامی ئەو پرۆسە فەرمییەوە هات، کە بە (Praetor Peregrinus) ناسرابوو، ئامانجی ئەوە بوو مۆرکێکی نێودەوڵەتییانە بداتە هەموو پێوەندییە یاساییەکان، بەمەسەلە بیرۆکراتی و بازرگانییەکانیشەوە لە چوارچێوەی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانیدا. ئا بەو جۆرە یاسای شارستانی تەنگی پێهەڵچنرا تاوەکو رێگە چۆڵ بکات بۆ یاسای گەلان و ئەم یاسایە ببێتە یاسای گشتی بۆ ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی و بەرە بەرە بەرەو جیهانگیری بڕوات.

کڵێسا لە چاخەکانی ناوەڕاستدا دەسەڵاتی فرەوانی هەبوو بە شێوەیەکی هەمەلایەنە پراکتیزەی دەکرد بەسەر ئەو گەل و نەتەوە ئەورووپاییانەی، کە هەموو مەسیحی بوون و ملکەچی یاسای کڵێسا بوون. بۆیە ئەم قۆناخە بە قۆناخی ململانێی نێوان دەسەڵاتی ئاینی و فەرمانڕەوایانی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی ناسراوە.

هەندێ جار ململانێکان لە بەرژەوەندی پاپا چارەسەردەکران، بەڵام ئەم بارە زۆری نەخایاند، چونکە کاروبارە ئاینییەکان بەرە بەرە لە بازنەی گرینگیپێدانی ئیمپراتۆرییەتی رۆمان دوورکەوتنەوە، بە پێچەوانەی کێشە سیاسی و هەرێمییەکان، کە لە ئەرکی ئەودا بوون.

یاسای نێودەوڵەتی گشتی لەم ماوەیەدا تایبەتمەندیی ئەو قۆناخەی هەڵگرتبوو، کە بریتی بوو لە دابەشبوونی هەرێمە سیاسییەکان و کلکایەتی و کەمخایەنی تەمەنی قەوارە دەوڵەتییەکان و بەرپابوونی جەنگی دەرەبەگایەتی و دەستبەسەرداگرتنی زەوی و زاری خەڵکی دیکە و تالانکردن و رووتاندنەوەی گەلانی دی و بە کۆیلەکردنیان، شەڕوشۆڕیش لەنێوان دەرەبەگەکاندا لە چوارچێوەی دەوڵەتێکدا روویدەدا وەکو شەڕی گوڵی سپی و شەڕی گوڵی سوور لە ئینگلستاندا لەنێوان سالانی ١٤٥٥_١٤٨٥ هەروەها لەنێوان دەوڵەتە جیاجیاکانیشدا وەکو شەڕی سەد ساڵەی نێوان ئینگلستان و فەرەنسا ١٣٣٧-١٤٥٣. لە چاخەکانی ناوەڕاست و لە چاخە کۆنەکانیشدا، سیستەمی یاسای نێودەوڵەتی گشتی نەناسرابوو.

لە کاتێدا یاساکانی کڵێسا لە ئەورووپادا پێڕەودەکران، هەر یەك لە نۆرمی یاسای بازرگانی و یاسای دەریاوانی سەریان هەڵدا. دەبینین لە یاسای ئینگلیزی یاسای بازرگانی کەوتەوە، کە پێکهاتبوو لە کۆمەڵە نۆرمێکی بازرگانی کە بیانییەکان ملکەچی بوون و بە یاسایەکی گشتی دادەنرا و بەسەر هەمووانداجێبەجێدەکرا.

لە هەموو ئەورووپا دادگەی بازرگانی پێکهاتن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوان بازرگانەکان لە هەموو بوارێکدا. ئەگەرچی ناکرێ بڵێین یاسای بازرگانی هەرێمی پێکهات، بەڵام نیمچە نۆرم و عورفێکی هاوبەش لە بزووتنەوەی بازرگانی لە ئەورووپا پەرەی سەند. ئەمەش بناخەیەکی دارشت بۆ یاسای بازرگانی نێودەوڵەتی. هەروا لە هەموو ئەو کیشوەرەدا نۆرمی دەریایی پەسندکران. هەر بەو شێوەیەش یاسای رهۆدیان (Rhodian-Sea-Law)ی دەریایی بیزەنتی دانرا، کە زۆرێك لە نۆرمەکانی گواسترانەوە بۆ یاسای ئولیرون Rules of Oleron و یاسا دەرياییەکانی تر لە سەدەی دوانزدەهەم. پیادەکردنی زنجیرە نۆرمێکی عورفییانەی دەریایی هاوبەش بوونە هۆی گەشەکردنی هێزەکانی دەریایی لە کەنارەکانی ئۆقیانووسی ئەتڵەسی و دەریای سپی ناوەڕاست[٢].

2- Nussbaum, Concise History of the Law of Nations pp. 29-31

هەرچەندە ئەم نۆرمە بازرگانی و دەریاییانە تەنیا دەربڕی سیستەمە یاساییە ناوچەییەکان بوون لەم قۆناخەدا، بەڵام بوونە سەرچاوەیەك بۆ دەوڵەمەندکردنی یاسای نێونەتەوەیی، چونکە ئاسۆیەکی بەرفرەوانیان کردەوە بۆ پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان و رەنگدانەوە بوون بۆ زەروورەتی بوونی چەند نۆرمێك، کە بارودۆخە نێودەوڵەتییە باوەکانی ئەو سەردەمە پڕ بکەنەوە.

سیستەمی یاسایی لەم قۆناخەدا بەشێوەیەکی ناهەموار و توندوتیژ بەڕێوەدەچوو، لەو دەمەدا دەربەگەکان دەسەڵاتیان نەك تەنیا بەسەر زەوی و زار و شێوازەکانی بەرهەمدا پیادەدەکرد، بگرە بەسەر ئەو جووتیارە کۆیلانەشدا، کە لەسەر زەویوزاری ئەوان دەژیان، تەنانەت دەسەڵاتیان بەسەر ئەو بیانیانەشدا دەشکا، کە لەناو موڵك و زەوی و زارەکانیاندا دەژیان. بەپێی یاسای کەنار دەرەبەگ دەستی بەسەر باری ئەو کەشتیانەدا دەگرت، کە بەهۆی کارەساتی دەریاییەوە لەوێ لەنگەریان دەگرت. بیانییەکان لە مافی وەسییەتنامە بێبەش بوون. دەبینین ماڵ و سامانی ئەو بیانییەی دەمرد، دەگواسترایەوە بۆ دەرەبەگ. سوپاکانی دەوڵەتە ئەورووپاییەکان لەم سەردەمەدا لەنێوان شەڕکەران و خەڵکی سیڤیل جیاوازییان نەدەکرد. دیلەکانیش دەبوونە موڵکی ئەوی لە جەنگدا سەرکەوتووە و هەرچی نەخۆش و برینداریش بوون، ئەوا لە گۆڕەپانی شەڕدا لێدەگەڕان بە دەردی خۆیانەوە رووبەرووی چارەنووسیان ببنەوە.

هەروەها ئەو گوند و شارانەش کە دەستیان بە سەردا دەگیرا، بە تەواوی کاولدەکران بە قەڵاو خانوو وبەرەو دامودەزگە و کێڵگەکانیشیانەوە.

**سەردەمی ئیسلامی:**

لەناوەڕاستی سەدەی حەوتەمەوە دەوڵەتی ئیسلامی پێکهات و دواتر پەرەی سەند و سنوورەکانی گەیشتنە سنووری قەوارەی غەیرە ئیسلامی. ئەمە پێویستی دەکرد پێوەندییەکانی ئەم دەوڵەتە لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێدا لەسەر سیستەمێکی یاسایی رێك بخرێت. بەم ئاراستەیە زانایانی ئیسلامی سەرەتای رێکخستنی هەندێ بواری یاسای نێودەوڵەتییان داڕشت، وەك شەڕ و ڕاگرتنی و ئاشتەوایی و نامۆژیوانی و گۆڕینەوەی دیل و بێلایەنی و جیهاد و هەڵسوکەوت لەگەڵ غەیرە ئیسلام.●

● د. محمد طلعت الغنيمي: الأحكام العامة في قانون الأمم ١ قانون السلام - منشاة المعارف ص ٥٢-٦٧ و ١٤٥-١٥٠

زانایانی ئیسلامی بواری پێوەندیی نێودەوڵەتییان لەژێر فقهی نێودەوڵەتی ئیسلامیدا خستووەتە بەر باس و ناویان ناوە (( السیر)).

ئیمام ( محمد بن الحسن الشیبانی ٧٤٨- ٨٠٥ی زایین ) یەکەم زانای ئیسلام بووە، کە تۆژینەوەی تایبەتی تەرخانکردووە بۆ پێوەندیی نێودەوڵەتی لە ئیسلامدا. لە پەرتووکی (السیر الکبیر)دا باسی جیهاد و شەڕ و ئەحکامی ئاشتەوایی و پەیمان و ناردنی شاند و باڵوێز و ئەنجامی شەڕ و سیاسەتی ئیسلام لە ڕێکخستنی شەڕدا دەکات. یاسای نێودەوڵەتی ئیسلامیش وەك هەر لقێکی دیکەی فیقهی ئیسلامی، هەمان سەرچاوەی هەیە. ئەوانیش ئەمانەن: قورئانی پیرۆز، سونە، کۆی زانایان (اجماع)، پێوانە یاخۆ بەراورد (القیاس)، بە باشزانین (الاستحسان) و هەندێ سەرچاوەی دیکەیش بە رای هەندێ زانایان.

بەپێی زانستی فیقهی ئیسلامی کۆمەڵە ئەحکام و نۆرمێکی گرینگ هەن، کە پێوەندیی ئیسلامەکان لەگەڵ گەلانی دیکەدا ڕێك دەخەن، ئەوانیش دەکرێنە دوو بەشەوە: بەشی یەکەمیان جۆرە نۆرمێکن کە پێوەندییان بە شەڕ و ئاسەوارەکانییەوە هەیە، دوومیان پێوەندیی نێودەوڵەتی لە کاتی ئاشتیدا ڕێك دەخات.

بەلای ئیسلامەوە شەڕ خۆی لەخۆیدا کارێکی خراپە. بۆیە قورئانی پیرۆز ڕێگەی شەڕی نەداوە ئەگەر لە پێناو دەعوەتی ئیسلامی و بەرگریکردن لەخۆ و لەناوبردنی دوژمنکاری لەسەر وڵات نەبێت. خوای مەزن و میهرەبان لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: **(وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ) (فَإِنْ قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ) (وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّه)**.

لەکاتی شەڕدا جیاوازی کراوە لەنێوان شەڕکەر و خەڵکی سیڤیل و ئافرەت و پیر و منداڵ و نەخۆش و پەککەوتە و کەمئەندام.

لە هەرکاتێکدا بوار ڕەخسابێت و بەرژەوەندی موسڵمانانی تێدا بوو بێت دەسەڵاتداران پەنایان بردۆتە بەر ئاشتەوایی (صلح).

ئیسلام پەنای بردۆتە بەر چەند ئامێرێکی ئاشتییانە بۆ چارەسەرکردنی ئاشتییانەی ناکۆکیی نێوان دەوڵەتان. لەم ڕووەوە تەحکیم و ناوبژیوانی و ئەمان بەکارهێنراون بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوان موسوڵواتان خۆیان و ئەمان و و غەیرە ئیسلامیش.

لە پێناو ڕێکخستنی پێوەندیی بە شێوەیەکی ئاشتیانە، ئیسلام جۆرەها پەیماننامەی بەستووە وەك:

### ١ - پەیماننامەی ئاشتەوایی گشتی (الصلح العام).

ئەم جۆرە پەیواتانە لەنێوان دەوڵەتی ئیسلامی و غــەیرە ئیسـلامی دەبەسـترێت و تێیـدا هەردوولا رێك دەكـەون لەسـەر دابینكردنـی ئاشـتی و راگـرتنی توندوتیـژی بـۆ ماوەیـەكی دیاریكراو یان دیاری نەكراو.

ئەم جۆرە پەیواتانە وەك جۆرە چەترێك وابوونـە، لـە ژێریانـدا چـەندەها پەیماننامــەی تـر بەستراون وەك پەیماننامەی بازرگانی و ئابووری و زانستی و گۆڕینەوەی ئەزموون... هتد، بەڵام دەبێت بابەتی ئەم پەیماننامانە شتێك نەبێت، كە ئیسلام حـەرامی كردبێـت وەك خواردنــەوەی ئەلكەحول و وەرگرتنی ریبا و قوماربازی و هاوشێوەكانیان.

### ٢ - پەیماننامەی ئاسایشی گشتی (الامان العام).

ئەمە جۆرێكە لە جۆرەكانی ئاشتەوایی (صـلح) كـە لەگـەڵ كەسـانێك دەبەسـترێت كـە ئابڵۆقەدراون و ناچارن خۆ بە دەستی دەوڵەتی ئیسلامییەوە بدەن، بەپێی چەند مــەرجێك كـە هەردوولا رێكدەكەون لەسەریان.

### سەردەمی بووژانەوە ( رێنیسانس) Renaissances:

ئەورووپا لە سـەرەتای سـەدەی شـانزەهەم پێـی نایـە قۆنـاخێكی نوێـوە، ئـەوەش لـەژێر كاریگەری چەند هۆكارێكی مێژووییەوە بـوو، وەك رووخـانی ئیمپراتۆرییـەتی بیـزەنتی، كـە پایتەختەكەی قوستەنتینۆف پۆل"ئەستەنبوڵی ئێستە" بوو لە لایەنی سوپاكانی توركەوە ساڵی ١٤٥٣. لە ئەنجامدا ژمارەیەكی زۆر لە زاناكانی یۆنان پەنایان بردە ئەورووپا و تێكەڵبوون بـە كولتووری ئەورووپایی. لە لایەكی تـرەوە ئیمپراتۆرییـەتی جـەرمان هەرەسـیهێنا و ئـەورووپا دابەشبوو بۆ چەندین دەوڵەتی نەتەوەیی سەربەخۆ لە ئاكامی گۆڕانی سیستەمی دەرەبەگایەتی بۆ سیسـتەمی بـۆرژوا و دۆزینـەوەی كیشـوەری ئەمــەریكا و سـەرهەڵدانی هەسـت و بـیری نەتەوایەتی و بزووتنەوەی ئەو چاكسازییە ئاینییەی، كە یەكیـەتیی ئاینییـە ئەورووپاییەكـەی تێكشكاند و هەروەها جیابوونەوەی دەوڵەتە نەتەوییەكان لە كڵێسا.

سەرهەڵدانی هەندێ لە بنەما یاساییەكانی تایبەت بە دەریاوانی و ناوبژیوانی و بازرگانی و جەنگ و پێوەندی دیپلۆماتی و...هتـد لـەم قۆناخـەدا بناخـەی یاسـای نێودەوڵـەتی پتـەوتر كردەوە، بەڵام بەرلەوەی ئەم یاسایە دابڕێژرێ، پێویست بوو هەوەڵین جار هزری ئـەورووپی لـەو شۆڕشە كولتوورییەوە گەشەبكات، كە بە چاخی رێنیسانس لە ئـەورووپا ناسـرا. چـونكە ئـەم

هزره جیاجیایانه رووی کۆمەڵگەی ئەورووپاییان گۆڕی و گواستیانەوه بەرەو قبوولکردنی چەند چەمکێکی مرۆیی تەرخانکراو بۆ خزمەتکردنی تاکی مرۆڤ.

له چاخی ڕێنیسانسدا لەخۆباییبوون و چاوچنۆکی ئەورووپاییەکان، که له پێناو سامان و ماده خاوه گرانبەهاکاندا له پەرەسەندندا بوون، بازنەی کیشوەری ئەورووپایان بەزاند. ئەوه بوو له کۆتایی سەدەی پانزەهەمدا عەرەبەکان له دوورگەی ئیبریا Iberia دەرکران و کیشوەری ئەمەریکا دۆزرایەوه. دەستپێکردنی پرۆسەی دروستبوونی یەکەی هەرێمی سەربەخۆ لەرووی تیۆری و پراکتیکەوه، له هەر ولاتێکدا، سەرەتای پێکهاتنی دەوڵەته نەتەوەییەکان بوو، به تایبەتی له ئینگلستان و فەرەنسا و ئیسپانیا.

ئەمەش بووه هۆی بونیادنانی پێوەندیی باش لەنێوان یەکه سەربەخۆکان، پاشانیش ڕێکخستنی ئەم پێوەندییانه به شێوەیەکی قبوولکراو بەلای هەمووانەوه. بەم شێوەیه لەم قۆناخەدا دەوڵەتەکان کۆششیان دەکرد له پێناو پتەوکردنی هێزی سیاسی و کاریگەرییان.

شاره- دەوڵەته ئیتالییەکان له پێناو بالادەستیدا، درێژەیان به خەبات دا، له کاتێکدا پاپاش بووه هێزێکی ئاینی وا نکۆڵی لێنەدەکرا. له ئاکامی ئەم خەباته توندوتیژەدا بناخەی ژیانی نێودەوڵەتی نوێ هاتەکایەوه، که بریتی بوو له دیپلۆماتی و زانستی سیاسەت و تیۆری هاوسەنگی هێز و بیرۆکەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی[3].

سیاسەتی ئەم دەوڵەتانه بریتی بوو له مانۆر و فرتوفێل بۆ بالادەستی و هاوپەیمانێتی سیاسییانه و ناپاکی و بەکارهێنانی دەزگەکانی دەوڵەت له پێناو بەرژەوەندی ئەو ئامانجانه.

ئەوی زۆر کاریگەریی هەبوو بۆ چەسپاندنی پرەنسیپه یاساییه نێودەوڵەتییەکان له چاخەکانی دواتردا، بریتی بوون له شۆڕشی هۆڵەندا له سەدەی شانزەهەم و شۆڕشی ئینگلیزەکان لەسەدەی حەڤدەیەم، لەپاشانیش شۆڕشی فەرەنسا به تایبەتی سالانی١٧٨٩-١٧٩٤، که له سایەی کاریگەرییەکەیدا چەند پرەنسیپێکی بنەڕەتی له یاسای نێونەتەوەی گشتی جاڕدران وەك یەکسانی لەنێوان دەوڵەتەکان و سەربەخۆیی و دەستێوەرنەدان له کاروباری ناوەخۆ و ڕێزگرتن لەو پابەندبوون و ئیلتیزامانەی، که له پەیمانه نێودەوڵەتییەکانەوه هەڵقولاون. ئەوه بوو دەستووری فەرەنسای ساڵی ١٧٩٤بەشێکی تایبەتی تێدا بوو سەبارەت به پێوەندی فەرەنسا لەگەڵ دەوڵەتەکانی تر، ئەمه دەقەکەی بوو: ((گەلی فەرەنسا دۆستی

3- G. Mattingly, Renaissances. London. 1955

گەلانی ئازادە و هاوپەیمانێکی سرووشتییە بۆیان و دەست ناخاتە کاروباری گەلانی ترەوە، بەڵام ڕازی نابێت گەلانی تر دەست بخەنە کاروبـاری ناوەخۆیــەوە. گـەلی فەرەنسـا مــافی پەنابــەری سیاسـی دەبەخشـێتە ئــەو بیانییانــەی لــە وڵاتەکانیانـدا بــە هــۆی داوای مــافی ئازادییــەوە دەردەکرێن، بەڵام مافی پەنابەری نابەخشێتە ستەمکاران. پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئەو دوژمنــەدا نابەستێ، کە دەست بەسەر خاکیدا دەگرێ)).

شۆڕشی فەرەنسا چەند پرنسیپێکی نوێی هێنایە ناو ئەو نۆرمانەوە، کـە تایبــەتبوون بــە بەرپابوونی شــەڕەوە. دەبیــنین ڕاســتەوخۆ لــە دوای ئــەو شۆڕشــە، فەرەنسـا چــەند شــەڕێکی بەرگرییانەی بەرپاکرد لە دژی ڕژێمە پاشایەتییە دیکتاتۆرییەکاندا لە ئــەورووپا. لــە هــەمان کاتیشدا چەند پرەنسیپێکی مرۆییانەی پیادەدەکرد لــەکاتی شــەڕدا لەگــەڵ دیــل و برینــدار و نەخۆش و دانیشتووانی سیڤیلدا.

ئەو کۆنگرە نێودەوڵەتییانــەی لــە ســەرەتای ســەدەی نۆزدەهــەم دەبەســتران و کۆمەڵــە نۆرمێکی یاسایی نێودەوڵەتی گشتیان داڕشت تەکانێکی گەورەیان دایە پێشــکەوتنی یاســای نێودەوڵەتی گشتی. ئەوە بوو لــە کــۆنگرەی ڤیــەننا ســاڵی ١٨١٥ بڕیــار لەســەر ژمارەیــەك سیستەمی یاسایی نێودەوڵەتی دران، وەك سیستەمی پلەی نێردراوە دیپلۆماتەکان و جــاڕدانی قەدەخەکردنی بازرگانی بە رەشپێستەکان و پەسندکردنی بیرۆکەی بێلایەنی هەمیشەیی.

لەکۆنگرەی پاریسیشدا ساڵی ١٨٥٦ گۆڕانکارییەکی گەورە بەسەر یاســای نێودەوڵەتیــدا هات، لە بواری یاسای دەریاکان و جەنگی دەریاییــدا. ئــەوەش بــرێتی بــوو لــە پەســندکردنی پرەنسیپی ((ئالاٌ کالاٌ دەپارێزێ)) و پرەنسیپە یاساییە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە دەریاوانی لە رووباری دانۆب پەسندکران و بڕیارێکیش وەرگیرا سەبارەت بــە سیســتەمی دەریــاوانی لــە دەربەندی پسفۆر و دەردەنیلدا.

لــە کــۆنگرەی بەرلینــدا ســاڵی ١٨٧٨ بڕیــاری دانپێــدانانی بــە کۆمــەڵ پەســندکرا بــە مۆنتینیگرۆ و سربیا و رۆمانیا. هەروەها لە کۆتایی ســەدەی نۆزدەهــەم و ســەرەتای ســەدەی بیستەم چەند کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی لە (لاهای) بەســترا بــۆ تۆمــارکردنی ئــەو یاســایانەی تایبەتن بەجەنگ و لە کۆی (١٣)ریککەوتننامەی مۆرکراو (١١) رێککەوتننامەیان پێوەست بوون بە پێوەندییەکانی نێوان دەوڵەتەکان لــە کــاتی جەنگــدا و دوانیشــیان پێوەنــدیی نێــوان دەوڵەتەکانیان لە کاتی ئاشتیدا رێکدەخست و یەکێکیشیان تایبەت بــوو بــە چارەســەرکردنی ئاشتییانەی کێشە نێودەوڵەتییەکان.

لە کاتێکدا سەدەی هەژدەهەم سەردەمی پێگەیشتنی ئەو هزرە زانست و فەلسەفییانە بوو، کە بەشدارییان کرد لە گەشەکردنی تیۆری یاسای نێودەوڵەتی گشتی، دەبینین سەدەی نۆزدەیەم سەردەمی پێڕەوکردنی ئەو هزارانە بوو بە پراکتیك و دانانیان لە دیکۆمێنت و بەڵگەنامەی تۆمارکراودا، بەڵام شەڕی یەکەمی جیهانی کۆتاییهێنا بە سەدەیەکی پڕ بە دینامیکی و گەشبینی، بە لای وڵاتە ئەورووپاییەکانەوە. لە کاتێکدا ئیمپراتۆرییەتە ئەورووپاییەکان دەسەڵاتیان بەسەر هەموو جیهاندا دەشکا و هزر و ئایدیۆلۆژییە ئەورووپاییەکان باڵادەست بوون، یەکەمین شەڕی جیهانی ١٩١٤-١٩١٨ بناخەی شارستانێتی ئەورووپایی لەقکرد و بێ ئومێدی جێی گەشبینی و بڕوابەخۆبوونی گرتەوە. ئەمەش بە زەروورەت وایکرد ئەوکات پێداچوونەوەیەك بەخۆدا بکرێ بە پێداچوونەوەی یاساشەوە.

## سەردەمی پاش یەکەمین جەنگی جیهانی:

لە چوارچێوی گرینگترین ئەو بڕیارانەی پەیماننامەی ئاشتەوایی ساڵی ١٩١٩ لە روانگەی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە، دای، بڕیاری دامەزراندنی کۆمەڵەی گەلان بوو، چونکە سیستەمە بێسەروبەرییە کۆنەکە نوشوستی هێناو بڕوای ئەوە زاڵبوو، کە پێویستە ئەنجومەنێکی نێونەتەوەی هەبێ کە بتوانێ گەرەنتی ئاشتی بکات و بیپارێزێت. ئەو کۆمەڵەیەی کە لە دەستەیەکی گشتی و ئەنجومەنێکی جێبەجێکاری پێکهاتبوو هەر لە سەرەتای پێکهاتنییەوە ئەمەریکا و یەکیەتیی سۆڤێت خۆیان لێی بەدوورگرت بە درێژایی نێزیکەی نیوەی تەمەنی و زیاتر بە شێوەی رێکخراوێکی ئەورووپایی مایەوە.

ئەگەرچی لە رووی پاراستنی سیستەمی نێودەوڵەتییەوە، هەندێ سەرکەوتنی وەدەستهێنا، بەڵام ڕووبەڕووی چەند وڵاتێکی بەهێزی دەستدرێژکار بووەوە و تووشی نوشوستی هات. ئەوە بوو ژاپۆن لە ساڵی ١٩٣١ چینی داگیرکرد و دوو ساڵیش دواتر لە کۆمەڵەی گەلان پاشەکشەی کرد. ئیتاڵیاش پەلاماری ئەسیوپیای دا و ئەڵمانیاش چەند کردەوەیەکی دوژمنکارانەی لەسەر ئاستی ناوەخۆ و دەرەوە پیادەکرد، یەکیەتیی سۆڤێتیش پاش ئەوەی فنلەندای داگیرکرد، لە ساڵی ١٩٣٩ لە کۆمەڵە دەرکرا.

وێڕای هەموو ئەم فاکتەرانە کۆمەڵەی گەلان، لەو ماوە کورتەی تەمەنیدا، هەندێ دەسکەوتی بە دەستهێنا، ئەمەش وایکرد لە دواییدا رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان پێك بێت.

دادگەی دادی هەمیشەیی نێودەوڵەتی لەساڵی ١٩٢١ لـە لاهـای دامــەزرا و لـە سـاڵی ١٩٤٦ بووە دادگەی دادی نێودەوڵەتی. ڕاستەوخۆ دوا بــەدوای جــەنگیش، ڕێکخـراوی کـاری نێودەوڵەتی دامەزرا و تاوەکو ئێستەش لە کارەکـانی بەردەوامــە. لـەو ماوەیەشـدا چـەندین ڕێکخراوی نێودەوڵــەتی دامــەزران و دەیـان ڕێگـە خۆشـکران بـۆ پێکهاتنیـان. یـەکێك لـە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵەی گەلان دامەزراندنی سیستەمی ئینتیدابی mandate systemی ئیمپریالیزمی بـوو بـە مەبەسـتی دابەشـکردنی سـامان ومیراتــەکانی دەوڵــەتی عوسمـانی و ئەڵمانیا. ئەو پەیماننامەیە بۆ یەکەمین جار چەند پرەنسیپێکی یاسایی نێودەوڵەتی تۆمـارکرد لە پێشییانەوە پرەنسیپی ڕێزگرتن لە نۆرمی یاسای نێودەوڵەتی لەلایەن دەوڵەتانەوە، هەروەها بونیادنانی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان لەسەر بناخەی ڕاستگۆیی و داد و شەرەفمەندیدا.

گـرینگترین ئـەو پرەنسـیپانەی لــە پەیماننامــەی کۆمەڵــەی گەلانـدا هـاتبوو، پرەنسـیپی حەرامکردنی جەنگ بوو وەکو شێوازێك بۆ چارەســەرکردنی کێشــە نێودەوڵەتییــەکان[٤] و هــەروا پرەنسیپی چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکییە بە ئاشیتیانە وەکو دانووستان و ناوبژیوانی نێودەوڵەتی و پەنابردنە بەر دەزگە پێوەندیدارەکانی کۆمەڵە و یان پرەنسیپی سەپاندنی چەند سزایەکی سیاسـی و ئابووری و سەربازی بەسەر ئەو دەوڵەتە ئەندامانــەی کـە پێشـێلی بنــەماکانی حـەرامکردنی پەنابردنە بەرجەنگ دەکەن بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی لە پەیماننامەکەدا هاتوون.

کۆمەڵەی گەلان نەیتوانی ئەو ئامانجە گرینگانە بەجێبێنێ، کە لـە پێناویانـدا دامــەزرا و بریێتی بوون لە: سووککردنی پڕچەککردن لای هەموو دەوڵەتــەکان و پەنانەبردنـە بـەر شـەڕ و چارەسەرکردنی کێشــە نێودەوڵەتییــەکان بــە شـێوەی ئاشـتیانە. زۆر کـۆنگرە لـەبارەی ئـەم بابەتانەوە بەستران وەکو کۆنگرەی جنێڤ لە ساڵی ١٩٢٤ و پەیماننامەی بریان کیلۆج لە ساڵی ١٩٢٨ بۆ قەدەخەکردنی شەڕ و ڕاگەیاندنی هاوبەشی جنێڤ، کە لە لایەن کۆمەڵەی گەلانــەوە ساڵی ١٩٢٨ دەرچوو بـۆ چارەســەرکردنی کێشــە نێودەوڵەتییــەکان بــە ڕێگـەی ئاشـتییانە و کۆنگرەی داماڵینی چەك لە جنێڤ ساڵی ١٩٣٢.

ڕووداوەکانی دووەمین شەڕی جیهان کۆمەڵەی گەلانی بە تەفرەبرد و ڕێگەی خۆش کرد بۆ

---

٤- دەستووری کۆمەڵەی گەلان ڕێیداوە پەنا ببرێتە بەر جەنگ بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیی لە نێوان دەوڵەتەکاندا" دوای پەسەندکردنی بڕیارێکی دادگەیی یان دوای دەرچوونی ڕاپۆرت لە لایەن ئەنجومەنی کۆمەڵەوە بە سێ مانگ" مادەی ١٢ لە دەستووری کۆمەڵەی گەلان".

بونیادنانی ڕێکخراوێکی دیکه، که بتوانێ لەو هەڵانە دووربکەوێتەوە که کۆمەڵەی گەلان تێی کەوتبوون، بەڵام وێڕای هەوڵ و تەقەلاکانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بۆ خۆدوورخستنەوە لە جەنگ، کەچی ڕووبەڕووی خوێناویترین و کاولکاریترین جەنگ بووەوە لە مێژووی دوور و درێژیدا.

## سەردەمی پاش دووەمین جەنگی جیهانی:

لە قۆناخی دووەمین جەنگی جیهانی دوو بۆچوونی جیاواز سەریان هەڵدا، یەکەمیان هاوپەیمانێتی نازییەکان سەرکردایەتییان دەکرد و ئامانجیان پەراوێزکردنی ڕۆڵی یاسای نێودەوڵەتی و بڵاوکردنەوەی سیستەمی زاڵبوونی هێزی ڕەها بوو، دووەمیشیان هاوپەیمانێتی دژی سیستەمی نازی پێڕەوی دەکرد و ئامانجی پەرەپێدانی دیموکراتیزەکردنی یاسای نێودەوڵەتی و هاوکاری هەمەلایەنەی نێودەوڵەتی بوو لە چوارچێوەی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکاندا. لەم ماوەیەدا چەند کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی گرینگ گرێدران و کاریگەرییەکی گەورەیان هەبوو بۆ پەرەسەندنی یاسای نێودەوڵەتی، لە وانە: کۆنگرەی مۆسکۆ و کۆنگرەی تاران لە ساڵی ١٩٤٣ و کۆنگرەی یالتە و کۆنگرەی پوتسدام لە ساڵی ١٩٤٥ و بە تایبەتیش کۆنگرەی دمبرتن ئۆکس و سانفرانسیسکۆ، که هەردووکیان پەیماننامەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیان داڕشت و لە ١٩٤٥/٦/٢٦ بڕیاری لەسەر درا.

دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان قۆناخێکی پێشکەوتووانە پێکدێنێ لە قۆناخەکانی پەرەسەندنی یاسای نێودەوڵەتی، چونکه (٧) پرەنسیپ لە پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی هاوچەرخ لەخۆدەگرێ و برێتییە لە ئامێرێك بۆ هاوکاری و هەماهەنگی نێودەوڵەتی و تۆمارگەیەکیشە بۆ یاسای نێودەوڵەتی پێشکەوتنخواز.

یاسای نێودەوڵەتی لە نیوەی سەدەی ڕابوردوودا بەرەو چەندین ئاراستە پەرەیسەند وەکو بە پیرەوەچوونێك لە بەرامبەر هەموو لایەنەکانی ژیان لە سەردەمی نوێدا. چونکه ڕەوش و نەریتە باوەکان لە هەر کۆمەڵگەیەکدا ڕەنگدەدەنەوە سەر ئەو یاسایانە، که لەوێ کاریان پێدەکرێ. هەندێ لایەنی تایبەت لە کۆمەڵگەدا وەکو لایەنە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەکان گۆڕانکارییان بە سەردا دێ و پەرەسەندنێکی بەرچاو بە خۆیانەوە دەگرن، ئەم کارەش مۆرکی خۆی بەسەر ئەو چوارچێوە یاساییەوە بەجێدێڵێ، که لەو ژینگەیەدا ژیان ڕێکدەخات. بەم چەشنەش یاسای نێودەوڵەتی بەری ژینگەکەیەتی. واتە یاسای نێودەوڵەتی لە بەرئەنجامی

پەرەسەندنی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە پەرەیسەند. جا بۆ ئەوەی بەردەوام بێت، پێویستە لەگەڵ واقیعی ئەو سەردەمەی تێیدایە، بگونجێت. بەهەرحاڵ جیاوازییەك هەیە لەنێوان ئەو بنەمایانەی چەسپاون و لەنێوان ئەو هێزە پەرەسەندووانەی ئامانجییان گۆڕانکارییە بەسەر سیستەمدا. دەبینین یەکێك لە گەورەترین کێشەکانی یاسای نێودەوڵەتی دیاریکردنی کات و چۆنێتی داڕشتنی نۆرمی رەوشتی نوێیە و ڕووداوە نوێیەکانی ژیانە لە قاڵبی حازردا. هەروا لێرەدا دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکرێ، کە پەرەسەندنی یاسای نێودەوڵەتی پێشی پەرەسەندنی سیستەمی نێودەوڵەتی دەکەوێت، چونکە سیستەم لە خودی یاسا هێورتر بەڕێوەدەچێ.

ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا هاتن، بایەخ و دەنگدانەوەیەکی گەورەیان هەبوو لە چوارچێوەی سیستەمدا. بۆ نموونە بەدیارکەوتنی چەکی ئۆتۆمی هاوسەنگی چەکداری لە ئەورووپا و هەروا هاوسەنگی تیرۆریشی لەسەر ئاستی هەموو جیهان، دروستکرد. ئەوی ئێستە بۆتە مایەی نیگەرانی مرۆڤ، چەند دەوڵەتێك لە جیهاندا تێدەکۆشن تەکنۆلۆژیای ئۆتۆمی وەدەست بێنن. نموونەکەی تر توانای تەکنۆلۆژیایە بۆ مینرێژکردنی ئۆقیانووسەکان و بەرئەنجامی تەقینەوەشیان بۆ سەر سرووشت و ژینگە و هەروا ئەو کەسانەش کەڵکی لێ وەردەگرن، دەزانرێت چی دەبێت. نموونەی زۆر هەن سەبارەت تاچەند پێویستە گۆڕانکاریی بەردەوام بکرێ لە پێکهاتەی یاسای نێودەوڵەتی و نۆرمەکانیدا تاوەکو شان بە شان پێشکەوتنی هاوچەرخ بڕوات و پێشبکەوێ.

بازنەی یاسای نێودەوڵەتی لەم رۆژگارەماندا پەرەسەندنێکی بەرفرەوانی بەخۆوەدیوە بە جۆرێك گەلێ بواری گرتۆتەوە وەکو رێکخستنی نێردراوە نێوئاسمانییەکان و دابەشکردنی بنەوەی ئۆقیانووسەکان و پاراستنی مافی مرۆڤ و بەڕێوەبردنی سیستەمی دارایی نێودەوڵەتی. دەتوانین بڵێین یاسای نێودەوڵەتی لە تەك بایەخ و گرینگپێدانی بە پاراستنی ئاسایشی نێودەوڵەتی گرینگی دەدات بە هەموو ئەو کاروبارانەی پێوەستن بە ژیانی نێودەوڵەتییەوە.

پێویستیی و تایبەتمەندییەکانی سیستەمی سیاسیی نێودەوڵەتی کاریگەرییەکی یەکلاکەرەوەیان هەیە لەسەر پێکهاتەی یاسای نێودەوڵەتی. دەبینین کاتێك چەند قەوارەیەك لە چوارچێوەی سیستەمێك لە سیستەمەکاندا هەن، پێویستە رێگەیەك هەبێ بۆ چۆنێتی مامەڵەکردن لەنێویاندا. جا ئایا ئەم هەڵسوکەوت و مامەڵەکردنە لەسەر بنچینەی هاوژیانی ئاشتییانە دەبێ، یانیش دژایەتیکردن و خۆ دوورخستنەوە؟ ئاشکرایە یاسای نێودەوڵەتی لە سەرەتای پەرەسەندنییەوە لە سەدەی حەڤدەهەمدا بە گشتی بانگەشەی بۆ بیرۆکەی

دژایەتیکردن و ڕووبەڕووبوونەوەی بەردەوامی دەکرد (لە چەند حاڵەتێکی گرینگدا نەبێ). چونکە دەوڵەت کە خاوەن بەرزترین دەسەڵاتی ناوەخۆیە دەیەوێت سەروەریشی لە دەرەوە بپارێزێت و هەوڵدات دەوڵەتەکانی تر سەربەوبن.

بەم جۆرە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە گەشەکردنی سیستەمی یاسایی نێودەوڵەتی سەردەم، هەرچەندە کەموکوڕی هەیە لە رووی کاملی و ڕێکخستنەوە، شان بەشانی گەشەکردنی شارستانێتی ئەورووپایی ڕۆیشتووە لە گشت قۆناخەکانیدا. بەم جۆرە گەشەکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و یەکیەتیی سۆڤیەتی پێشوو بووە هۆی لاوازبوونی ئەورووپا. لە لایەکی دیکەیشەوە بووە هۆی فرەوانبوونی پرۆسەی لەناوبردنی ئیمپریالیزم. ئەمە واتە ئەو یاسا نێودەوڵەتییەی کە ڕووبەڕووی چەند گۆڕانکارییەکی رادیکالییانە، لە پێکهاتەی هێز لە جیهاندا، بۆتەوە، پێویستە چاوەدێری ئەو چەمکە نوێیانە بکات، کە ناکرێ پشتگوێ بخرێن[5].

ئەو سەنترالیزمە ئەورووپییەش، کە یاسای نێودەوڵەتیشی گرتبووەوە لە ماوەی ئەم شەست ساڵانەی دواییدا، تووشی لاوازییەکی زۆر هات. لێرەدا چەند هزر و پێداویستییەك سەریان هەڵدا بەئامانجی ئەوەی کولتوورەکانی تریش ڕۆڵێکی گەشەسەندوو ببینن لە رووی پەرەسەندنی هزری یاسایی نێودەوڵەتییەوە[6]. دەبینین یاسای نێودەوڵەتی، بەر لە هەموو شتێك، ڕەنگدانەوەی ئەو سیاسەتە نێودەوڵەتییەیە، کە لە بنەڕەتدا دەوڵەتەکان ئاراستەی دەکەن. بەم جۆرە دەوڵەتە سەربەخۆ و یەکسانەکان لە رووی گرتنەدەستی دەسەڵاتە سەرەکییەکانی دەوڵەتەوە، توانیویانە سیستەمێك بخولقێنن، کە ڕێز لەو بەهایانە بگرێ. ئەو نموونانەی دەکرێ لێرەدا ئاماژەیان پێبدەین ئەوەن: دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناخۆ و یەکیەتیی هەرێمی دەوڵەت، بەکارنەهێنانی هێز، یەکسانی دەنگدان لە کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان.

سەرەڕای ئەوەش هەندێك لەو هزرانە سنووری دەوڵەتەکانیان بەزاند و سەرنجی سیاسەتی نێودەوڵەتییان راکێشا. وەك هاوپێوەندی ئابووری و گرینگیپێدانی نێودەوڵەتی بە مافی مرۆڤ و گەشەکردنی هێزی تەکنۆلۆژی[7]. سیاسەتیی دەوڵەتەکان و هاوسەنگی هێزی نێودەوڵەتی و هەرێمیش ئەو چوارچێوە زەروورە پێکدێنی، کە تێیدا یاسای نێودەوڵەتی کاردەکات.

5- G. Schwarzenegger and E.D. Brown, manual of International Law, 6th ed , London. 1976 pp. 9-12
6- L.C. Green, today, 23 Canaian YIL, 1985-p-3
7- M.N. Shaw, Title to Territory in Africa, International Legal Issues; oxford, 1986; pp.1-11

گرینگە ئەوە بزانرێ، کە دەوڵەت پێویستی بە یاسایە تاوەکو چەند ئامانجێکی ناسراو وەدیبێنێ، وەك: مانەوە و گەشەی ئابووری و ئاسایش و بڵاوکردنەوەی بیر و هزری ئایدیۆلۆژییانە. بۆیە دەبێ سیستەمەکە توانایەکی تەواوی هەبێ بۆ ئەوەی ئەو ئامانجانە وەدی بێن، زۆریش نەرم بێت بۆئەوەی لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا بگونجێت[8].

یاسای نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی ئاسۆییانە پەرەی نەسەند تاوەکو تەنیا ئەو دەوڵەتانە بگرێتەوە، کە تاڕادەیەك تازە پێکهاتوون، بگرە پەلی کێشاوە بۆ ئەوەی تاك و کۆمەڵە و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانیش تا ڕادەیەك بخاتە بازنەکەیەوە. هەروەها باڵی کێشاوە بەرەو چەند بوارێکی نوێ و گەلێ ڕەهەندی گرینگی گرتۆتەوە وەکو بازرگانی نێودەوڵەتی و کێشەکانی پاراستنی ژینگە و ئاسمانی دەرەوە.

گەشەکردنی تیۆری دانان (وضعي) لە سەدەی نۆزدەهەمدا وایکرد یاسای نێودەوڵەتی گرینگی زیاتر بدات بە دەوڵەتە خاوەن سەروەرییەکان. چونکە بەپێی ئەم تیۆرییە تەنیا ئەوان کەسانی یاسای نێودەوڵەتی بوون و پێگەی یاساییان جیاوازبوو لە پێگەی یاسای دەوڵەتە ناسەربەخۆکان و تاکەکان، کە برێتی بوون لە بابەتی یاسای نێودەوڵەتی، بەڵام ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی بە سەر تیۆری داناندا هات و هەماهەنگی ئەو لەگەڵ سەرهەڵدانی چەند هەڵوێستێکی نوێی لەبارەی هەموو پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان بازنەی ئەم بابەتە زیادەی، کە تەنیا دراوەتە دەوڵەت، بەزاند بۆ ئەوەی ئەو ڕۆڵەش بگرێتەوە، کە چەند قەوارەیەکی تریش دەیگێڕن و دەوڵەت نین، وەکو: تاکەکان و ڕێکخراوە نێونەتەوەیەکان و بزووتنەوە ڕزگاریخوازە نیشتمانییەکان و کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان. بێگومان هەر لە زووەوە، تاکی مرۆ ئەو مافەی پێدراوە تاوەکو لە حوکمەکانی یاسای نێودەوڵەتی سوودمەندبێت، بەڵام جاران وەکو ئێستە ئەو توانایەی نەبوو ڕاستەوخۆ بتوانێ ڕەفتار بکات لەسەر ئاستی یاسای نێودەوڵەتی و بێ ئەوەی پاڵبداتە دەوڵەتە نیشتمانییەکەیەوە.

دادگەی نوێرنبێرگ و دادگەی تۆکیۆ، کە هەردوو لە پاش دووەمین شەڕی جیهان لە لایەن وڵاتانی هاوپەیمانی سەرکەوتووەوە دامەزران، بەشێکی گرینگ بوون لەم پرۆسێسە. تاوانی هەموو ئەو کەسانە سەلمێنرا، کە تۆمەتبار کرابوون بە ئەنجامدانی تاوان دژی مرۆڤایەتی و ئاشتی و سزادران. ئەمە پێزانینێك بوو بە بەرپرسیارێتی تاك بەپێی یاسای نێودەوڵەتی.

8- S.Hoffman, International Systems and International Law, 14 world politics.1961-2 p.205

بەهەمان شێوەش ڕێککەوتننامەی قەدەخەکردنی جینۆسایدی ساڵی ١٩٤٨ جەختی کـردووە، کە دەکرێ ئەنجامدەرانی ئەو تاوانە لە لایەن دادگە نیشتمانییەکان یانیش لەلایەن دادگەیـەکی تاوانی نێودەوڵەتییەوە سزابدرێن، هەروەها بایەخدانی زیاد بە مافی مـرۆڤ لایـەنێکی تـرە لـە لایەنەکانی کارکردن لە پێناو پەرەسەندنی ڕۆڵی تاك لە یاسـای نێودەوڵەتیـدا. ئـەوە بـوو لـە ساڵی ١٩٤٨ ڕاگەیاندنی جیهانی مافی مرۆڤ لە لایەن نەتـەوە یەکگرتووەکانـەوە دەرچـوو بـۆ ئـەوەی کۆمـەڵێك مـافی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی بگرێتـەوە. هەرچـەندەش سـیفەتی هێـزی پابەندبوونی یاسایی پێوە نییە، بەڵام بە بەڵگەیەکی گشتی گرینگ دادەنرێ بۆ ئـەو مافانـە، بەڵام دەبینین ئەو ڕێککەوتننامە ئەورووپاییەی، کە بۆ پاراستنی مـافی مـرۆڤ و سەربەسـتییە بنەڕەتییەکانی لە ساڵی ١٩٥٠ مۆرکرا و هەروەها هەردوو پەیمانی نێودەوڵەتی مافی مرۆڤ لـە ساڵی ١٩٦٦، مۆرکێکی یاسایی تریان پێوەیە. چونکە بە مولزەم دادەنرێن بۆ ئەوانەی مۆریان کردووە. چەندین دەزگەش بۆ بەدواداچوونی جێبەجێکردنی ئـەو مافانـە و چـاوەدێریکردنیان، پێکهاتن. تاکی مرۆ لە چوارچێوەی یەکیەتیی ئەورووپادا مافی ئەوەی هەیە ڕاستەوخۆ سـکاڵا بەرزبکاتەوە بۆ دادگەی دادی ئەورووپایی دژی ئەو بڕیارانەی لە دەزگەکانی ئەو یەکیەتییەوە دەرچوون. جگە لەوەش دەکرێ تاك بڕواتە بەردەم دادگەی نێودەوڵەتی.

ئێستە دانراوە کە ڕێکخراوی نێودەوڵەتی خاوەن کەسایەتی نێودەوڵـەتی جیـاوازە، واتـە ماف و ئەرکی جیاوازیـان هەیـە. لـە رای راوێـژکاری دادی نێودەوڵـەتی لـە سـاڵی ١٩٤٩دا هاتووە: ((ڕێکخـراوی نەتـەوە یـەکگرتووەکان بـە کەسـێك دادەنـرێ لـە کەسـەکانی یاسـای نێودەوڵەتی و بە گوێرەی ئەمە بۆی هەیە مافی خۆی پیادە بکات سەبارەت بـە بەرزکردنـەوەی سکاڵای نێودەوڵەتی لە دژی ئیسرائیل لەسەر کوشتنی (کۆنـت برنـادۆت) کارمەنـدی نەتـەوە یەکگرتووەکان)). ئەمەی لێرە گوتراوە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی تـریش دەگرێتـەوە، وەك: ڕێکخراوی کـاری نێودەوڵـەتی و ڕێکخـراوی خـۆراك و کشـتوکاڵیی نێودەوڵـەتی، واتـا ئـەم ڕێکخراوانە کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتی تایبەتی خۆیان هەیە.

لە کاتێکدا دەوڵەت بەکەسی سەرەکی یاسای نێودەوڵەتی دادەنرێ ئێسـتە لـە پێوەندییـە نێودەوڵەتییەکاندا چەند قەوارەیەکی تری نادەوڵەتیش لەگەڵیدا بەشدارن، کە گرینگی و ڕۆڵیان لە داهاتوودا بێگومان زیـاتر دەبـێ. هـەروەها دەبـێ ئاماژەبـدرێ بـە زیـادکردنی ژمـارەی ڕێکخراوە هەرێمییەکان و ڕۆڵیان لـە ژیـانی نێودەوڵەتیـدا. ژمارەیـەك لـەو ڕێکخراوانـە بـۆ ئامانجی سەربازی پێکهاتوون، وەك پەیمانی باکووری ئەتڵەسی، پەیمانی نـاتۆ، هـەروا پـەیمانی

وارشۆی هەڵوەشاوە، کە وەکـو پـەیمانی نـاتۆ بـوو. لەگـەڵ ئەمـەدا ڕێکخـراوی دیکـە هـەن نوێنەرایەتی جۆرە کولتوورێك دەکەن وەك ڕێکخراوی یەکیەتیی ئەفریقیا و ڕێکخراوی دەوڵەتە ئەمەریکاییەکان و کۆمکاری وڵاتە عەرەبییەکان. وەکو پێشـینەیەکی دەگمـەن لـە مێـژوودا یەکیەتیی ئەورووپا قۆناخێکی دوورتری بڕی لە هەماهەنگی ئابووری و یەکخستنی یاساکان و پێکهێنانی چەندین دەزگەی هاوبەش، کە چەند نووسینگەیەکی پێشکەوتوو بەڕێوەیان دەبات و برۆکسلیان کردۆتە بارەگەی خۆیان.

سەرەڕای چارەسەرکردنی کێشەگەلێکی زۆر، کە تووشـی یاسـای نێودەوڵـەتی بـوو لـە ئەنجامی پەرەسەندنی ژمارەی هاوبەشەکانی سیستەمی نێودەوڵەتی بە بەردەوام ئەو بابەتانەی یاسایی نێودەوڵەتی دەیانگرێتەوە فرەوانتر بوونەوە. ئیمڕۆ یاسای نێودەوڵەتی تەنیا ئـاوڕ لـەو مەسەلانە ناداتەوە، کە پێوەستن بە هەرێم و سەروەریی دەوڵەت لە چەمکە تەسکەکەیدا، بگرە گرینگیش دەداتە چەند کێشەیەکی تایبەت بە کۆمەڵگەی هاوچەرخ، کـە پێشـتر ئاماژەمـان پێـداون، وەك: مـافی مـرۆڤ و پاراسـتنی ژینگـە و تۆژینـەوەی ئاسمـانی و یاسـای ئـابووری نێودەوڵەتی وەبەرهێنانی مـادە خاوەکـان لـە ئۆقیانووسـەکان و بنـەوەیان. هـەروەها دەکـرێ ئاماژەبدەین بەو حوکمانـەی پێوەسـتن بـە کـارگێڕی دەزگـە نێودەوڵەتییـەکان، واتـە یاسـای کارگێڕیی نێودەوڵەتی و بنەماکانی کاری نێودەوڵەتی و تەندروستی نێودەوڵـەتی و هاتوچـۆی نێودەوڵەتی.

## باسی دووەم
## سەرهەڵدانی تیۆریی یاسای نێودەوڵەتی

هاتنەکایەوەی دەوڵەتان و کێبرکێی نێوانیان لە ئەنجامی گەشەسەندنی بیرۆکەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی سەرەتای رێگەی یاسای نێودەوڵەتی تەختکرد. چاخی رێنیسانس بووە میراتگری ئەو کارە سەرەتایانەی، کە بوونە هۆی دروستبوونی بیرۆکەی سەربەخۆیی و بیرۆکەی رەخنە و بیرۆکەیی مرۆڤایەتی و هەڵوێستی ئاینی بەرامبەر بە ژیان و ئەو چوارچێوە سیاسییەی، کە رۆڵێکی زیندووی بۆ گەشەکردنی یاسای نێودەوڵەتی گێڕا. چاکسازیی و جەنگە ئاینییە ئەوروپاییەکان و پەرەسەندنی هێزی دەوڵەتە نەتەوەییەکانیش کاریگەرییان هەبوو بۆ ئەم گەشەکردنە. ئەو جەنگانە بە چەندین شێوە بوونە هۆی کۆتایی پێهاتن بە سیستەمی کیشوەری (Continental System)، کە لەسەر ئاین بونیادنرابوو و دروستبوونی سیستەمێکی تر لە جێگەیدا، کە لەسەر باڵادەستی دەوڵەت، واتا سەروەری دەوڵەت state sovereignty، بونیاد نرابوو.

لە چوارچێوەی ئەم دەوڵەتانەدا، وای دەخواست تیۆرێکی نوێ هەبێت لەبارەی مرۆڤ و پێوەندییەکانی دەوڵەتەکان وەکو یەك. ئەوی مایەی پەلەکردن بوو لەم رووەوە وەکو گوتمان، لاوازی کڵێسا و بەدیارکەوتنی ئەوەی پێی دەوترێت هزری ئازاد بوو. تیۆری یاسای نێودەوڵەتیش، کە بیروباوەڕی یونانی_رۆمانی زۆر کاری تێکردبوو، بەشداریکردووە لە هەڵسەنگاندنەوەی ژیانی سیاسی لە ئەوروپا. جا لە بەرئەنجامی ئەو پێشکەوتنە ئەو هزرە یاساییە سرووشتییە لەدایکبوو، کە لە چاخەکانی دواتر گەشەیسەند. بەو جۆرە کومەڵە رێبازێك سەریان هەڵدا بۆ ئەوەی ببنە پاڵپشتی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان و یاسا بە بەشێك لە یاسای سرووشتی گشتی دابنرێ.

فەیلەسووفی ئیسپانیایی فرانچیسکۆ فیتۆریا (١٤٨٠-١٥٤٦) بە یەکەمین کەس دادەنرێ، کە بانگەشەی بۆ هزری پێشکەوتنخواز بەرامبەر کردەوەکانی وڵاتەکەی لە ئەمەریکای باشوور کردووە. ناوبراو داوای ئەوەی دەکرد هیندییەکان بەگەلێك دابنرێن، کە خاوەن بەرژەوەندیی نەتەوەی یاسایی خۆیەتی. بۆیە ناکرێ شەڕ دژیان بە ڕەوا بزانرێت ئەگەر

لەسەر بنەمایەکی عادیلانە نەبێ[9]. ئەگەرچی ئەم تێڕوانینە لـە جێـی خۆیـدا هـاتووە، بـەڵام فیتۆریـا تـەنیا دەربـڕی بەرژەوەنـدیی داگیرکـەرە ئیسـپانەکان بـوو، چـونکە بـەلای ئـەوەوە دژایەتیکردنی کردەوەی بڵاوکەرەوەکانی مەسـیحیەت لەلایـەنی هیندییەکانـەوە، هۆکـارێکی عادیلانە بوو تاوەکو شەڕیان لە دژدا بەرپابکرێت. فیتۆریا و فرانسیسـکۆ سـواریس ١٤٨٠-١٥٤٦، بایەخێکی تایبەتیان بە مافی شەڕ و کێشەی تـالانکردنی کۆلونـەکان و پەرەسـەندنی تیۆری یاسای سرووشتی داوە. هەروەها (ئولبیرتۆ جینتیلی) لـە بـواری یاسـای نێودەوڵـەتی، بەتایبەتی یاسای دیپلۆماتی و یاسای پەیماننامەکان بەشداریکردووە.

لەو ماوەیەش زاناکانی رووسیش بەشدارییان لە پێشخستنی یاسای نێودەوڵەتی کـردووە و لە نووسـراوەکانیاندا باسـیان لـە بیرۆکـەی سـەربەخۆیی دەوڵەتـەکان و یـەکگرتنی دەوڵەتـە سلاڤییەکان و پابەندبوون بـەو ئیلتیزامانـەی لـە پەیماننامـە نێودەوڵەتییەکانـەوە هـەڵقولاون کردووە. دەبینین (مەکسیم کریك ١٤٨٠-١٥٥٦) بانگەشەی بۆ بیرۆکەی بونیادنانی پێوەندیی ئاشتییانە لەنێوان هەموو دەوڵەتە مەسیحییەکان و پاراستنی بیانییەکان کردووە. لە کاتێکدا (ف.مالینۆفسکی) لە کتێبەکەیدا (چەند سەرنجێك لەبارەی شەڕ و ئاشتی ) لە سـاڵی ١٧٩٨ بانگەشەی کردووە بـۆ بیرۆکـەی پێکهێنـانی رێکخـراوی نێودەوڵـەتی لەچەشـنی ئەنجومـەنی دەوڵـەتان بـۆ زامنکردنـی ئاسایشـی هاوبـەش و چارەسـەرکردنی کێشـەی نێودەوڵەتـەکان و پیادەکردنی چەند کردەکارییەکی خۆپاراستن لە دژی پێشێلکردنی سەقامگیریی و ئاشتی.

لە بەرئەنجامی گەشەکردنی دەوڵەتە نوێیەکان و پێوەندییە یەکسانە نێودەوڵەتییەکانیشـدا ئەو تیۆرییە سەروەرییە سەریهەڵدا، کە بـۆ یەکـەمین جـار (جـان بـۆدین) لـە سـاڵی ١٥٧٦ شرۆڤەی لەبارەیـەوە کـرد. ئـەم تیۆرییـە باسـی پێکهاتـەی دەسـەڵاتی دەکـرد لـە دەوڵـەتی سەردەمدا. بەم جۆرە جان بـۆدین، کـاتێ لـە نووسـینەکانیدا پشـتی بـە تیۆرییەکـەی خـۆی دەبەست، جەختی لەسەر سیاسەتی ئـەورووپا دەکـرد لـەجیاتی مشـتومڕی تیـۆری لـەبارەی پرەنسیپی رەبەق، هەروەها پێیوابوو، کە پێویستە دەسەڵاتێکی سەروەری بەتوانا هەبێت لەناو دەوڵەتدا، کە بتوانێت یاسا دابنێت، بەڵام بێ ئەوەی خۆی ملکەچـی بێـت. ئـەو پێـی وابـوو سەرچاوەی یاسا دەبێت خوا و سرووشت بێت[10].

9- Nussbaum, Law of Nations p. 79-84

10 -M.N Shaw, the Title to Territory in Africa: International Legal Issues, Oxford, 1986, .p.19

له ساڵی ١٦٢٥ زانای هوڵەندی ناسراو بە باوکی یاسـای نێودەوڵـەتی (هۆگـۆ گـرۆتیس) کتێبێکی بڵاوکردەوە بە ناونیشانی: (لەبارەی یاسـای جـەنگ و ئاشـتییەوە)، تییـدا پاسـاوی هێناوەتەوە بۆ زەرورەتی پاراستنی موڵکداری لە کاتی شەڕ و چوونە شەڕەوە لە چوارچـێوەی چەند نۆرمێکی دیاریکراودا. ئەم زانایە پێی وابوو موڵکداری مافێکی سرووشتی مرۆڤە. جـا دەوڵەتەکان بەو سیفەتەی کە مـوڵکدارن رێك دەکەون لەسەر ئەو نۆرمە رەفتارانەی، کە خۆیان دایاندەرِێژن نەك هەر تەنیا لە کاتی ئاشتیدا، بگرە لە سەردەمی جەنگیشدا. بـە بـڕوای ئـەو جەنگ بارێکی سرووشتییە لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، بەڵام نابێ پەنای بۆ ببردرێ تەنیا لە حاڵەتی گێڕانەوەی دادوەری نەبێ. هەروا پێویسـتە لایەنـە شـەڕکەرەکان رێـز لـە ئـازادی بازرگانی و ئازادی کـۆچ و ئـازادی دەریـاوانیش بگـرن. هۆگـۆ بەشێکیشـی لـە کتێبەکـەی تەرخانکردبوو بۆ شرۆڤەکردنی پایەی یاسـایی باڵیوزەکـان و تێیـدا پاسـاوی هێناوەتـەوە بـۆ یاسابەندی ((حەسانەتی)) باڵوێزەکان و شوێنی نیشتەجێبوونیان. بۆ یەکـەمین جـاریش جـاڕی بیرۆکەی ئازادیی دەریـای دا و بەرهەڵسـتی لـە بیرۆکـەی دەریـای داخـراوی کـرد، کـە زانـا پورتوگالییەکان بانگەشەیان بۆ کردبوو و (جۆن سلدن)ی زانای ئینگلیـزیش پشـتگیری لێیـان کردبوو. بۆچوونەکانی (هۆگۆ گروتیس) بەڵگەی بیروڕا پێشـکەوتنخوازەکانێتی سـەبارەت بـە یاسای نێودەوڵەتی لە سەردەمی خۆیدا. بۆیە کلێسا لە ساڵی ١٦٢٧دا کتێبەکەی: ((لـەبارەی یاسای جەنگ و ئاشتییەوە)) خستە ریزی کتێبە قەدەخەکراوەکانـەوە، چـونکە هزرەکـانی لـە دژی کلێسا بوون.

زانای سویسری ئەمیر فاتیل وەکو یەکێك لە هەوادارانی هۆگـۆ لـە بـواری هـزری یاسـای نێودەوڵەتیدا لە کتێبەکەیدا: "مافی گەلان" ساڵی ١٧٥٨ وێڕای ئەوە باس لـە چـەمکی ئـەو (یاسا سرووشتییە) دەکات، کە سرووشت بە سەر گەلان و تاکەکاندا چەسپاندوویەتی، ئاماژەی داوە بە چەمکی (یاسای دانراو)، کە لە رێککەوتنی نێوان دەوڵەتەکانەوە، هـەڵقوڵاوە. فاتیـل جەختی لەسـەر ئـەوە کـردووە، کـە (گـەل)خۆی خـاوەنی سـەروەرییە نـەوەك (شـا). هـەروا هەڵوێستێکی بەرهەڵستکارانەشی گرتۆتەبەر بەرامبەر بە شەڕی دوژمنکارانە.

هزرە پێشکەوتنخوازەکانی زانا فەرەنسـاییەکان لـە سـەدەی هەژدەمینـدا کاریگـەرییان هەبووە بۆ پەرەسەندنی تیۆری یاسای نێودەوڵەتی. ئەوەبوو شارل مۆنتسکیۆ ١٦٨٩ ـ ١٧٥٥ داوای کرد شـێوازی توندوتیـژ لـە شـەڕدا قەدەخـەبکرێن و نـاڕەزایی دەربـڕی بەرامبـەر بـە کۆیلەکردنی دیلەکانی شەڕ. کەچی (جان جاك رۆسۆ)١٧١٢ ـ ١٧٧٨ ئاماژەی بـەوە دا، کـە

شەڕوشۆڕ و داگیرکردن لە لایەك و دەسەڵاتی ڕەهاش لەلایەکی تر تەواوکەری یەکترن.

هەمووان لەسەر ئەو ڕایە کۆکن کە ئەو تیۆرییە یاساییە نێودەوڵەتییەی لە سەدەی حەڤدەمیندا پەیدابوو، پێوەندییەکی توندوتۆڵی هەبووە بە کارەکانی هۆگۆ گرۆتیس، پاشانیش لە کاروانی پێشکەوتنی دووروودرێژیدا کاریگەری چەند فاکتەرێکی جیاجیای بەسەرەوە بووە وەکو شەڕ و شۆڕش و کوودەتا.

یاسای نێودەوڵەتی لەم سەردەمەدا کۆمەڵێك تیۆری و ڕێباز و چەمکی لەخۆگرتووە، کە لەلایەن پەیمانگە و دەزگە زانستییەکانەوە دانراون و کۆمەڵە تۆژینەوە و نووسینێك کە گەورە زانایانی یاسای نێودەوڵەتی گشتی نێوگەلانی جیاجیای جیهان دایانڕشتووە.

## باسی یەکەم
## چەمکی سەرچاوە گشتییەکانی یاسای نێودەوڵەتی

دەستوور لە یاسای نێوەخۆییدا بە ڕێبەرێك دادەنرێ بۆ زانینی ئەو لایەنەی دەسەڵاتی پێدراوە، کە یاسا دەربکات. بۆیە نەبوونی دەزگەی یاسادانان و جێبەجێکاری و دادوەری لە سیستەمی یاسای نێودەوڵەتیدا، پرۆسێسی گەڕان بە دوای نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی ئاڵۆزدەکات. چونکە لێرەدا دەزگەیەکی تایبەت نییە بۆ داڕشتنی یاسای مولزەم بۆ هەموو دەوڵەتەکان. هەروا سیستەمێکی دادوەریش نییە لە چەند دادگەیەك پێکهاتبێ و دەسەڵاتێکی ئیلزامی گشتیی هەبێت بۆ لێکدانەوە و جێبەجێکردنی یاسا. ئەمەش وای کردووە ڕێگەی دۆزینەوەی نۆرمی یاسایی نێودەوڵەتی ڕووبەڕووی ئاستەنگ بێتەوە[1]، بەڵام ئەمە ڕێگە لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ناگرێ دان بنێت بە سیفەتی ئیلزامی ئەو نۆرمە یاساییانەی لەو سەرچاوانەوە وەرگیراون کە بە گشتیی دانیان پێدانراوە.

یاساناسەکان سەرچاوەکانیان کردووە بە دوو جۆرەوە: سەرچاوەی فۆرمی ( Formal sources) و سەرچاوەی مەتریالی(Material sources).

سەرچاوەی فۆرمی برێتییە لەو کارڕایی و ڕێگەیانەی، کە بۆ دروستکردنی نۆرمگەلێکی یاسایی پیادە دەکرێن، کە دەکرێ بە شێوەیەکی گشتی جێبەجێ بکرێن و بە شێوەی یاسایی ئەوانەی رووی دەمیان لێ دەکات، پابەندبکات.

بەڵام سەرچاوە مەتریالییەکان، بەڵگە دەخەنەڕوو بۆ ئەوەی بوونی نۆرمی یاسایی بسەلمێنن و هەر کاتێکیش سەلمێندرا ئەوە سیفەتی نۆرمی یاسایی مولزەم وەردەگرن.

لە یاسای نێوەخۆییدا میکانیزمی دەستووری بۆ داڕشتنی یاسا بەپێی دەستوور، بە سەرچاوە فۆرمییەکانی یاسا دادەنرێ[2]. بۆ نموونە لە دەوڵەتە پەرلەمانییە دیموکراتییە پێشکەوتووەکاندا، یاسا سیفەتە مولزەمەکەی لەو پرەنسیپە وەردەگرێ، کە دەڵێت ئەو یاسایانەی لە پەرلەمانەوە دەردەچن باڵادەستن.

1- M.N. Shaw International Law 4th Eden , Cambridge.1999 p. 54
2- Brownlie I, Principles of Public International Law, 5th Eden, Oxford. 1998, P 1-24.

هەرچەند میکانیزمێکی دەستووری نییە بۆ دانانی نۆرمی یاسای نێودەوڵەتی، بەڵام بڕیارەکانی دادگەی نێودەوڵەتی و بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە بە کۆی دەنگ وەرگیراون و پێوەستن بە بابەتەکانی یاسای نێودەوڵەتییەوە توانای ئیلزامکردنی دەوڵەتەکانیان هەیە بە شێوەیەکی گشتی و بە هەمان ئەو شێوازەی کە یاسای پەرلەمانی وڵاتێك ئیلزامی هاووڵاتیانی دەکات.

دوو تیۆری هەن لەبارەی سەرچاوەکانی یاسای نێودەوڵەتی:-

### ١- تیۆری ئیرادی

ئەم تیۆرییە پێی وایە ڕێککەوتنی دەوڵەتەکان، تاکە سەرچاوەی نۆرمی یاسای نێودەوڵەتییە چ ئەو ڕێککەوتنە بە دەربڕینی ئاشکرابێت لە شێوەی پەیمان، یان بە بێدەنگی بێت لە وێنەی عورف (نەریت) بێت، واتا ئەم تیۆرییە جگە لە پەیمان و نەریت هیچی دی بە سەرچاوەی یاسای نێودەوڵەتی دانانێت.

### ٢- تیۆری بابەتی

ئەم تیۆرییە گرینگی بە دوو سەرچاوە دەدات، ئەوانیش سەرچاوە مەتریالی و سەرچاوە فۆرمییەکانن، کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێدان. تیۆرییەکە سەرچاوە مەتریالیەکان بە سەرچاوەی ڕاستەقینەی یاسا دادەنێت. واتا ئەو سەرچاوەیەی یاسا لێیەوە هەڵدەقوڵێت. کەچی بە لایەوە سەرچاوە فۆرمییەکان برێتین لەو پەیماننامە و نەریتانەی، کە نۆرمی یاسایی پێك ناهێنن، بگرە ڕۆڵیان گەڕانە بە دوای بوونیان و تاکیدکردن لێیان.

لە بەرئەوەی سەرچاوە فۆرمییەکانی یاسای نێودەوڵەتیی سوودێکی گرینگیان هەیە لە کردەوەدا کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی تێکۆشاوە بۆ کۆکردنەوە و تۆمارکردنیان لە دۆکومێنتە نێودەوڵەتییەکاندا. سەرنج دەدەین ڕێککەوتننامەی دوازدەهەمینی لاهای ساڵی ١٩٠٧، کە دادگەی دەسکەوتی نێودەوڵەتی داناوە، لە بەندی حەوتەمیدا دەسەڵاتی بە دادگە داوە ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییە کارپێکراوەکان و نۆرمە یاسا باوەڕپێکراوەکان بە گشتی و پرەنسیپە گشتییەکانی یاسای نێودەوڵەتی و پرەنسیپەکانی دادوەری و ئینساف یەك لە دوای یەك جێبەجێ بکات.

ئەگەرچی ئەو ڕێککەوتننامەیە نەچووە واری جێبەجێکردنەوە، بەڵام ئەمە لە گرینگییە مێژووییەکەی کەمناکاتەوە وەك هەنگاوێك بەرەو نووسینەوەی سەرچاوەکانی یاسای نێودەوڵەتی.

## باسی دووەم
## جۆرەکانی سەرچاوەی یاسای نێودەوڵەتی

پێڕەوی ناوەخۆی دادگەی دادی هەمیشەیی نێودەوڵەتی کە لە ١٩٢٠/١٢/١٦ دەرچـووە، لە مادەی (٣٨)دا ئەو سەرچاوانەی لەخۆگرتبوو، کە پێویستە لەسـەر دادگەکـە پراکتیزەیـان بکات.

لە پاش دووەمین شەڕی جیهان دادگەی دادی نێودەوڵەتی لە ساڵی ١٩٤٥ شوێنی دادگـە نێودەوڵەتییەکەی پێشووی گرتەوە و دەقی مادەی (٣٨)یش گوێزرایەوە بـۆ پێـڕەوی نـاوەخۆی دادگە نێودەوڵەتییە نوێیەکە. دەقی مادەکەش بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە:

"١- ئەرکی دادگە یەکلاکردنەوەی ئەو کێشانەیە بۆی بەرزدەکرێنـەوە بـەپێی ئـەحکامی یاسای نێودەوڵەتی و لەم ڕووەوە پیادەی ئەمانە دەکات:-

ا- ئەو ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییە گشتی و تایبەتییانەی جۆرە نۆرمێـك دادەنـێن، کـە دەوڵەتە لایەنەکانی بە ڕاشکاوی دانیپێدادەنێن.

ب- ئەو نەریتە نێودەوڵەتییەی کە وەکو یاسایەك ناسراوە و بەپێی بەکارهێنانی بـەردەوام چەسپاوە.

ج- ئەو پرەنسیپە یاساییە گشتییانەی نەتەوە شارستانییەکان پەسەندیان کردووە.

د- بڕیارەکانی دادگە و ڕێبازەکانی گەورە زانایانی یاسای گشـتی نێـو گـەلانی جیاجیـا. ئەمە یان ئەوی تریان، بە سەرچاوەیەکی یەدەك دادەنـرێ بـۆ نۆرمـەکانی یاسـا، ئـەویش بـە ڕەچاوکردنی مادەی(٥٩).

٢- ئەو دەقەی لە سەرەوە باس کرا، بـە پێشـێلکردنی دەسـەڵاتی دادگـە نـاژمێرێ، کـە هەیەتی لەبارەی سەیرکردنی کێشەکە بەپێی داد و ویژدان، ئەگەر لایەنەکانی داواکە پێی ڕازی بن".

هەرچەند ئەو ئەحکامانە ئاماژەدەکەن بۆ ئەو سەرچـاوە یاسـاییە نێودەوڵەتییانـەی، کـە دەبێ دادگە نێودەوڵەتییەکە پراکتیزەیان بکات، بەڵام ئەگەر پەنا ببەینە بەر کـەتوارو واقیـع، دەبیـنین ئـەرکی دادگەکـە ئەوەیـە: (( ئـەو کێشـانەی بـۆی بەرزدەکرێنـەوە دەبـێ بـەپێی ئەحکامەکانی یاسای نێودەوڵەتی، یەکلایان بکاتەوە)) لە لایەکی تریشەوە لەبەرئەوەی هەموو

دەوڵەتەکانی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا دەبنە لایەن لە پێڕەوی ناوەخۆی دادگـەی دادی نێودەوڵەتی بەپێی دەقـی مـادەی ٩٣ی دەسـتووری نەتـەوە یـەکگرتووەکان، دەتـوانین بڵـێین کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بە گشتی ئـەو ئەحکامانـە قبـووڵ دەکـات وەك سەرچـاوەی یاسـایی نێودەوڵەتی[٣]. زاناکان ئەو سەرچاوانەی لـە مـادەی (٣٨)ی پێـڕەوی نـاوەخۆی دادگـەی دادی نێودەوڵەتیدا هاتوون، دەکەن بە دوو بەشەوە:

١- سەرچاوە بنەڕەتییەکان، ئەمانە بریتین لە پەیماننامە نێودەوڵەتی و عورفە نێودەوڵەتی و پرەنسیپەکانی یاسای گشتی.

٢- سەرچاوە یاریدەدەرەکان، ئەمانەش بریتین لە ئەحکامەکانی دادگەکان و ڕێبازی گەورە زانایان و پرەنسیپەکانی داد و ویژدان.

## ١- سەرچاوە بنەڕەتییەکان

### ١- پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان

پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان بە گرینگترین سەرچاوە سەرەکییەکانی یاسای نێودەوڵەتی لەم ڕۆژگارەماندا، دادەنرێن. دەبینین دەسپێکەکەی ڕێککەوتننامەی ڤیەننا سـەبارەت بـە یاسـای پەیماننامەکان ساڵی ١٩٦٩، جەختی کردۆتە سـەر ڕۆڵـی بـاڵای پەیماننامـەکان لـە مێـژووی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان و زیادبوونی گرینگییەکەی بەو پێیە، کە سەرچاوەیەکە بۆ یاسـای نێودەوڵەتی و شێوازێکیشە بۆ پەرەپێدانی هاوکاری ئاشتییانە لەنێوان دەوڵەتەکان بە هـەموو جۆرە سیسـتەمە دەسـتووری و کۆمەڵایەتییەکانیانـەوە. هـەر نووسـینەوە و پەرەسـەندنێکی زیاتریشی یاسای پەیماننامەکان پتەوکردنەوەی پرەنسیپەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانـە، کـە لـە دەستوورەکەیدا هاتوون وەك پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی و پەرەپێـدانی پێوەنـدی دۆستایەتی نێو دەوڵەتەکان و بەدیهێنانی هاوکاری نێودەوڵەتی.

زۆرینەی نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی لە ڕێگەی مۆرکردنی پـەیمانی نێودەوڵـەتی نێـوان کەسـەکانی یاسـای نێودەوڵـەتی پێکهـاتوون. زاراوەی پەیماننامـەی نێودەوڵـەتی لـە یاسـای نێودەوڵەتیدا بۆ هەر ڕێککەوتننامەیەك بەکاردێت، کە ڕواڵـەتی دۆکـومێنتێکی نێودەوڵـەتی بگرێتەخۆ و ئەو نۆرمانەی تێدا هاتوون لە دوای پەسندکردنیان دەبنە مولزەم بۆ ئەو لایەنانەی

3- M.N. Shaw International Law 4th Eden , Cambridge.1999 p. 55

مۆریان کردووە. هەموو پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان بە سەرچاوەی یاسای نێودەوڵەتی گشتی دەژمێردرێن بێ ئەوەی سەیربکرێت ئایا گشتین یان هەرێمین یان کێ دایانیناوە و یان ژمارەی ئەو پەیواتانە چەندن. ئەوەی پێویستە لێرە ئەوەیە کە دەبێ مەرجە یاساییەکانیان تیا بێ وەك لارینەبوونیان لەگەڵ نۆرمێکی فەرماندەر لە یاسای نێودەوڵەتیدا.

ئەو پەیمانە بە کۆمەڵییانەی ئەمڕۆ ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان پێکدێنن گرینگییەکی زۆریان هەیە، چونکە چەند نۆرمێکی گشتی دادەنێن، کە ژمارەیەکی زۆر لە دەوڵەتەکان ئیلزام دەکەن. بۆ نموونە هەمووان ڕێکن لەسەر ئەوەی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان بریتییە لە پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی وا، کە هێزە یاساییەکەی بالاترە لە هێزی هەموو پەیماننامە نێودەوڵەتییەکانی تر. چونکە ئەو پرەنسیپانەی لە مادەی (٢)ی دەستوورەکەدا هاتوون بوونەتە بەشێك لە پرەنسیپە ناسراوەکان بە گشتی لە یاسای نێودەوڵەتی هاوچەرخدا. سەرەڕای ئەوەش مادەی (١٠٣)ی دەستوورەکە جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە: (ئەو ئیلتیزاماتانەی ئەندامەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان پێوەیان بەستراون بە گوێرەی ئەحکامەکانی ئەم دەستوورە، ئەگەر لارییان هەبێت لەگەڵ هەر پابەندبوونێکی (ئیلتیزامێکی) نێودەوڵەتی تر کە پێوەی بەستراون، ئەوە پێڕەوی ئەو ئیلتیزامانە دەکرێت، کە لەم دەستوورە دەکەونەوە)، لەبەرئەوەی نێزیکەی هەموو دەوڵەتەکانی جیهانیش ئەمڕۆ لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا ئەندامن، ئەوا دەستووری ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکە ئەمڕۆ گرینگترین و بەهێزترین پەیماننامەی نێودەوڵەتییە.

پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان وەکو نۆرمێکی گشتی ئیلتیزاماتی یەکسانییان بۆ هەموو لایەنەکان لێ دەکەوێتەوە و ڕۆڵی جیاجیا دەگرنە ئەستۆ لە پێوەندییە نێودەوڵەتییە هاوچەرخەکاندا. دەبینین فاکتەری گرینگی بایەخی پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی خۆی ئەو بابەتەیە کە لێی دەکۆڵێتەوە. بۆ نموونە گرینگی پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی لەسەر کەمکردنەوەی چەکی ئۆتۆمی و لەناوبردنی وەك پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی نییە لە بواری بازرگانی ڕستن و چنین یان ڕۆن لە رووی گرینگییەوە. ئەوی گرینگی دەبەخشێتە پەیماننامەکان بە پلە دوو ژمارە و جۆری ئەو دەوڵەتانەیە، کە پەیمانەکە مۆردەکەن. هەرچەند لایەنەکانی پەیماننامەکە زۆربن یان لە دەوڵەتە بەهێزەکان بن، ئەوەندە گرینگی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکە زیاتر دەبێت.

دەکرێ فاکتەرێکی تر بخرێتە سەر ئەو فاکتەرانەی، کە دەبنە مایەی گرینگییەکی زۆری

پەیماننامەکە، ئەویش پیادەکردنی پەیمانەکە و جێبەجێکردنێتی بە پراکتیك. چونکە پەیماننامە هەرچەند نۆرم و پرەنسیپەکانی تیا گرینگ بن، ئەگەر جێبەجێنەکرێ مردووە و هیچ پابەندبوون و مافێکی لێ ناکەوێتەوە بۆ لایەنەکانی.

پرۆسێسی مۆرکردنی پەیمانە نێودەوڵەتییەکان لەنێوان کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتیدا لە میانەی گونجانی ئیرادەکاندا، بە دوو قۆناخی دیاردا تێدەپەڕێ. قۆناخی یەکەم پێوەستە بە گونجاندنی ئیرادەکان لەسەر دەقی پەیماننامەکە. ئەمیش دابەش دەبێتە سەر چەند قۆناخێك لەوانە:

١- دیاریکردنی بابەتی پەیماننامەکە لەنێوان لایەنەکاندا، ئەگەر لەنێوان دەوڵەتەکاندا یان لە چوارچێوەی ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیدا، مۆرکرا.

٢- داڕشتنی دەقی پەیماننامەکە لە لایەن پسپۆڕانەوە.

٣- ئیقرارکردنی دەقی پەیماننامەکە لە لایەن نوێنەرەکانی دەوڵەتەکانەوە یان لە لایەن ئەوانەو، کە جێگەی نوێنەرانی دەوڵەتەکان دەگرنەوە لە کۆنگرە نێودەوڵەتییەکاندا یان ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکاندا.

٤- مۆرکردنی دەقی پەیمان لە لایەن نوێنەرانی دەوڵەتەکانەوە یان ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانەوە.

بەمەش پەیماننامەکە دەگاتە کۆتایی قۆناخی یەکەم، بەڵام لەم قۆناخەیدا پەیماننامەکە ناچێتە واری جێبەجێکردنەوە و نابێتە سەرچاوەیەك بۆ یاسای نێودەوڵەتی. لەم ڕووەوە کۆمەڵێك لە زاناکان پێیان وایە سەرچاوەکانی یاسای نێودەوڵەتی، بریتین لە پرۆسێسێك بۆ داڕشتنی نۆرمی یاسای نێودەوڵەتی(قۆناخی یەکەم) و پاش چوونە واری کارپێکردن، نۆرمەکان دەبنە سەرچاوەیەك بۆ یاسای نێودەوڵەتی کە ئەمەش دواین قۆناخی ئەم پرۆسێسەیە.

دوایین قۆناخی ڕێککەوتنی ئیرادەکان بریتییە لەو ڕێکارییە یاسایانەی، کە هەر لایەنێکی پەیماننامەکە دەیگرێتەبەر، بەپێی یاسای ناوەخۆی خۆی، بۆ پەسەندکردنی ئەو نۆرمانەی کە لە پەیماننامەکەدا هاتوون.

## ٢- نەریتی"عرف" نێودەوڵەتی International Customs

نەریتی نێودەوڵەتی سەرچاوەیەکی بنەڕەتی تری یاسای نێودەوڵەتی گشتییە. ئەم نەریتە تاوەکو سەدەی نۆزدەهەم شوێنێکی سەرەکی هەبوو. دواتر پاشەکشەی کرد تاوەکو نەختە

نەختە شوێن چۆڵ بکات بۆ پەیمانی نێودەوڵەتی وەك باشترین شێوە بۆ هاوکاری نێودەوڵەتی.

کاتێك دەوڵەتەکان رێکدەکەون لەسەر دانانی نۆرمە ڕەوشتێکی دیاریکراوی مولزەم بە لایانەوە ئەوە دەگەیەنێ، نۆرمێکی یاسایی نێودەوڵەتی نەریتی دادەنێن. مادەی(٣٨-١-ب)ی لە پێڕەوی ناوەخۆی دادگەی دادی نێودەوڵەتی جەختی کردۆتە سەر دانانی (نەریتی نێودەوڵەتی باوەڕپێکراو وەك یاسایەك، کە بەکارهێنانی بەردەوامیی ناساندوویەتی).

دروستبوونی نۆرمی نەریتی لە ئەنجامدانی هەڵسانی دەوڵەتەکان دەبێت بە کاری هاوشێوە یان کاری لە یەك جۆر. بە ڕێگەی ئەم ڕەفتارە هاوبەش و هاوڕازیبوونە نیازیان دەردەبڕن، کە ئەو ڕەفتارە بەردەوام دووبارەکراوە سیفەتی فەرماندەری هەیە. بەمەش سیفەتی یاسایی پێدەدەن وەك نۆرمێکی یاسایی لە نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتیی گشتی.

تایبەتمەندی نەریتی نێودەوڵەتی لەوەدایە، کە برێتی نییە لە دۆکومێنتێکی فەرمی کە نۆرمە ڕەفتارێکی ئاشکرا بگرێتەخۆ بۆ کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی. بگرە لە دۆکومێنتە سیاسییە دەرەکییە نێودەوڵەتییەکان و نامە ئاڵوگۆڕکراوە دیپلۆماتییەکانی نێوان دەوڵەتەکان پێکدێ لە میانەی هەڵسانی ئەو دەزگەیانەی دەوڵەت، کە پێوەندی دەرەکییان گرتۆتە ئەستۆ بە جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان بە بەردەوامی. بەم شێوەیە نۆرمی نەریتی نێودەوڵەتی چەند تایبەتمەندییەك وەردەگرێ، کە لە نۆرمی یاسایی پەیمانی تۆمارکراو لە دۆکومێنتێکی تایبەت، جیای دەکەنەوە. بۆیە پرۆسێسی ناسینی ناوەڕۆکی نۆرمی نەریتی ئاڵۆزترە لە ناسینی ناوەڕۆکی نۆرمی پەیمانەکی (تعاهدی). نموونە زۆرە بۆ نۆرمی نەریتیی نێودەوڵەتی وەك: رێزگرتن لە شکۆمەندیی ئەو بارەگە فەرمییانەی شاندی دەوڵەتەکان تیا دەبن بۆ ئامادەبوونی کۆنگرەی نێودەوڵەتی و کۆتاییهێنان بە پەیمانە دووقۆڵییە نێودەوڵەتییەکان و ڕاگرتنی پەیماننامەی نێودەوڵەتی بە کۆمەڵ بە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی نێوان دەوڵەتە لایەنەکان و دانانی کەنداوە مێژووییەکان وەك بەشێك لە ئاوی هەرێمیی دەوڵەتەکانی کەنار. ئەمانە هەموو بە نۆرمی نەریتیی نێودەوڵەتی دەژمێردرێن.

هەندێ جار، نۆرمی یاسایی نەریتی لە ماوەیەکی تا رادەیەك کورتیشدا پێکدێت. بۆ نموونە نۆرمی نەریتی تایبەت بە ئازادی دەوڵەتەکان لە بەکارهێنانی بۆشایی ئاسمانی دەرەوە لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی پێشوو، پێکهات. کەچی لە میانەی چەند دەیەیەکدا بووە نۆرمێکی پەیمانی (تعاهدی)ی تۆمارکراو. هەندێ جار، لە رەوتی نێودەوڵەتیدا، هەندێ نۆرم کە هێشتا لە هەندێ پەیمانی نێودەوڵەتی پەسەندنەکراون، هاتوون، جێبەجێدەکرێن بە

شێوەیەکی کاتی وەك نۆرمێکی نەریتیی یاسای نێودەوڵەتی، لە کاتێکدا رەنگە دواتر ئەو پەیمانە پەسەندنەکرێت و نەشچێتە بواری جێبەجێکردنیشەوە.

پێویست ناکات بە گشتی بڕیار لەسەر نۆرمی نەریتی بدرێ لەلایەن هەموو دەوڵەتەکانەوە و لە یەك کاتدا وەك مەرجێك بۆ پێکهاتنی ئەو نۆرمە. کۆمەڵێکی دیاریکراو لە دەوڵەتەکان، بۆیان هەیە بڕیار لەسەر نۆرمێکی یاسایی نەریتی نێودەوڵەتی بدەن و لە پاشان چەند دەوڵەتێکی تر بچنە ریزیانەوە، بەڵام لە رووی تێپەڕبوونی زەمەنی نۆرمی نەریتییەوە، ئەوە لە زانستی یاسای نێودەوڵەتیدا رێککەوتنێك نییە بۆ تێپەڕبوونی کاتێکی دیاریکراو تا وەکو ئەو نۆرمە پێك بێت. دەکرێ بەرئەنجام بڵێین کە نۆرمی یاسایی نەریتی لە ئاکامی بەکارهێنانی بەردەوامی لەلایەن دەوڵەتەکانەوە، تایبەتمەندی ئیلزام وەردەگرێ و لە میانەی ڕەفتاریاندا نیازی خۆیان دەردەبڕن بۆ بڕیاردان لەسەر ئەم ڕەفتارە یان پێزانینیان وەك نۆرمێکی یاسایی مولزەم بە لایانەوە لە پێوەندییە یاساییە هاوبەشەکانیاندا.

سێ فاکتەر هەن نەریتی نێودەوڵەتی جیادەکەنەوە:

**یەکەمیان:** بەردەوامی پرۆسێسی دروستبوونی نۆرمی نەریتی.

**دووەمیان:** پێزانین پێی یان پەسەندکردنی بە گشتی.

**سێیەمیان:** سیفەتی ئیلزامی یاسایی واتا نەریتی نێودەوڵەتی مولزەمە.

ئەم فاکتەرانە زەروورن بۆ گۆڕینی نەریت بەرەو نۆرمێکی یاسایی نێودەوڵەتی. نەریتی نێودەوڵەتی لەگەڵ پەیماننامەی نێودەوڵەتیدا ناکۆك نییە بەو پێیە هەردووکیان سەرچاوەیەکی یاسای نێودەوڵەتین، بگرە هەردووکیان کاردەکەنە سەر یەکتر ویەکتر تەواو دەکەن لە ڕەوتی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا. هێشتا هەردووکیان سەرچاوەی پێویستن بۆ پێکەوەنانی پێوەندییە نێودەوڵەتییە هاوچەرخەکان لەسەر بناخەیەکی ئاشتیانە و بۆ پیادەکردنی یاسای نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی کارا، بەڵام دەبێ بزانین کە پرۆسێسی داڕشتنی نۆرمێکی یاسایی لە ڕێگەی پەیماننامەی نێودەوڵەتییەوە خێراترە لە پرۆسێسی پێکهاتنی نەریتی نێودەوڵەتی، کە پێویستی بە وردەکاری و ڕوونکردنەوە هەیە. چونکە لێرەدا نۆرمی ڕەوشت، ناخرێتە بەر وردبینی و گفتوگۆ و لێکۆڵینەوەی پێویست و یەکسانی مومکین وەکو ئەوەی لە پرۆسێسی یەکەمدا هەیە.

لەم دەیانەی دواییدا پرۆسێسی گۆڕینی نۆرمی نەریتی یاسایی نێودەوڵەتی بەرەو نۆرمی پەیمانەکی (تعاهدی) بەخۆوەبینی. ئەوە بوو توانرا نۆرمە یاساییە عورفییەکانی تایبەت بە

یاساکانی پەیماننامە و یاسایی دیپلۆماتی و یاسای کونسوڵی تۆمـاربکرێن. بـۆ نموونـە ئـەو دەوڵەتانەی یاسای دەریای ساڵی (١٩٨٢)یان پەسەندنەکردووە، کە هەموو نۆرمەکانی نەریتی یاسای دەریای تیایە و لە ساڵی ١٩٩٥چۆتە واری جێبەجێکردن، هێشتا وەك نـۆرمی یاسـایی درێژەیان بە پراکتیزەکردنی داوە.

### ٣- پرەنسیپە گشتییەکانی یاسا General Principles of Law

بەپێی مادەی (٣٨—١- ج) لە پێڕەوی ناوەخۆی دادگەی دادی نێودەوڵەتی کاتێك دادگەکە ئەرکی خۆی پیادە دەکات لەبارەی یەکلاییکردنەوەی ئەو کێشـانەی بـۆی بەرزدەکرێنـەوە بـە گـوێرەی ئـەحکامی یاسـای نێودەوڵـەتی، تـەنیا رێککەوتننامـە نێودەوڵەتییـە گشـتی و تایبەتییەکان و نەریتی نێودەوڵەتی ڕەچاوکراو جێبەجێ ناکـات، بگـرە دێـنێ ئـەو پرەنسـیپە گشتییانەی یاساش، کە نەتەوە پێشکەوتووەکان پەسەندیان کردووە، جێبەجێدەکات. بـۆ ئـەو بڕگەیەی سەرەوەی پێـڕەوی نـاوەخۆی دادگـەی دادی نێودەوڵـەتی، دوو شـرۆڤەکردنی جیـاواز هەیە. هەندێك لە یاساناسانی نێودەوڵەتی لەو بڕوایەدان ئەوەی لە پێڕەوی ناوەخۆکەدا هاتووە، شتێکی نوێی نەخسـتۆتە سـەر کـۆی ئـەو مـاف و ئەرکانـەی کـە لـە بناخـەدا لـە یاسـای نێودەوڵەتیدا هەن[٤]. وێڕای ئەوەش لە گەلێك بۆنەدا، دادگەی دادی نێودەوڵەتی پەنای بردۆتـە بەر ((پرەنسیپەکانی یاسا)) وەك سەرچاوەیەك لە سەرچاوە بنەڕەتییەکان. لە چەند حاڵـەتێکی تـریش وەك هۆیـەك بـووە بـۆ ڕەچـاوکردنی داد ((ئینسـاف)) لـە کـاتی دیـاریکردنی ئـەو ناکۆکییانەی، کە چەند کێشەیەکیان لەخۆگرتووە و تایبەتن بە ئەرکی یاسای نێودەوڵەتییەوە.

پرەنسیپە گشتییەکانی یاسا بە سەرچاوەی سێیەم دەژمێردرێن لـە سەرچـاوەکانی یاسـای نێودەوڵەتی. دەبینین نێوەڕۆکی ئەو پرەنسیپە گشتییانەی نەتـەوە شارسـتانییەکان پەسـەندیان کردووە ڕووبەڕووی مشتومڕێکی توند بووە و بەرئەنجام دوو ڕای بەهێز سەریان هەڵـدا. بـەپێی یەکەمیان دەستەواژەی (( پرەنسیپەکانی یاسای گشتی کە نەتەوە شارستانییەکان پەسـەندیان کردووە))، ئەو پرەنسیپانە دەگرێتەوە کە لە یاسا نێوەخۆییەکانـدا بـاون و دەکـرێ لـە کێشـە یاساییە نێودەوڵەتییەکاندا پیادەبکرێن.

ڕای دووەمیش پێی وایە مەبەست لە دەستەواژەکە پرەنسـیپە گشـتییەکانی یاسـایە، کـە

---

4-V. Tunkin, General Theory of sources of International Law، Indian J Int L 474 (1797)

بەستراون بە یاسای سرووشتییەوە، بەو شێوەیەی لە سەدەکانی دواییندا لە ڕۆژئاوا شرۆڤەکراون، کە ئەو پرەنسیپە گشتییانەی یاسا کە دەکرێ بەسەر هەموو مرۆڤایەتیدا جێبەجێ بکرێن و بگوازرێنەوە بۆ نۆرمی یاسای نێودەوڵەتی، بەڵام دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکرێ کە یاسای سرووشتی لە ڕوانگەی یاساییەوە برێتییە لە سەرچاوەیەکی نادیار و لاوازی یاسای نێودەوڵەتی. بۆیە ژمارەیەکی زۆر لە یاساناسانی هاوچەرخ پرەنسیپە گشتییەکانی یاسا لەو سەرچاوە لاوەکییە نێودەوڵەتییانە دادەنێن، کە بە دەگمەن لە پراکتیکدا بەکاردەهێنرێن، ئەگەرچی هەندێك جار سوودبەخشن.

کاتێك ئەم سەرچاوەیە خرایە نێو پێڕەوی ناوەخۆی دادگەی دادی نێودەوڵەتی هەمیشەییەوە، لێژنە یاساییەکە ساڵی ١٩٢٠ چەندین شرۆڤەی بۆ واتاکەی خستەڕوو. دەرکەوت مەبەست لە دانانی ئەوە بوو کە دادگە نەکەوێتە حاڵەتێکەوە کە نەتوانێت بڕیار لەسەر کێشەکە بدات، لەبەرئەوەی " نۆرمێکی کارای کاریگەر نییە". جا دەستەواژەی ((پرەنسیپە گشتییەکان)) دەسەڵات بە دادگە دەدات لە چوارچێوەی نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی کە بە گشتی پەسەندکراون، دەربچێت و بگەڕێ بۆ ئەو پرەنسیپە هاوبەشانەی لە سیستەمە جۆراوجۆرەکانی دەوڵەتەکاندا هەن. واقیعیش ئەمەی سەلماندووە، چونکە ژمارەیەکی زۆر لە بڕیارەکانی دادگەی نێودەوڵەتی و پەیمانە نێودەوڵەتییە بریارِ لەسەر دراوەکان پاڵیان داوە بە پرەنسیپە گشتییەکانی یاسا.

لە گۆشەنیگای تیۆرییەوە قایلبوون بە پیادەکردنی پرەنسیپە گشتییەکانی یاسا لە یاسای نێودەوڵەتیدا، کە بەردەوام لە گەشەکردندایە بە ڕەتکردنەوەی ڕێبازی دانەریی (وچعی) توندڕۆ دادەنرێت، ئەو ڕێبازەی کە تەنیا بڕوای بە شەرعییەتی ئەو نۆرمانەیە لە پەیمانە فەرمی و نەریتییە نێودەوڵەتییەکانەوە پێکدێن. وێڕای ئەوش هەندێك لە یاساناسان گومانیان هەیە لەو بۆچوونانەی بڕیاردەدەن، کە نۆرمە گشتییەکان لە ڕاستیدا سەرچاوەیەکن لەو سەرچاوانەی قابیلی جێبەجێکردنن لە یاسای نێودەوڵەتیدا.

داڕشتنی پێڕەوی دادگەی دادی نێودەوڵەتی لە هەلومەرجێکدا بوو جیاوازی هەبوو لەگەڵ ئەو هەلومەرجانەی تیایدا پێڕەوی ناوەخۆی دادگەی دادی هەمیشەیی نێودەوڵەتی داڕێژرا، ئەمە و شرۆڤەکردنی ناوەڕۆکی مادەی (٣٨) لە واقیعی هەنووکەییدا تا ڕادەیەك جیاوازە. دەبینین تایبەتمەندییەکی گرینگی پرەنسیپە گشتییەکانی یاسا ئەوەیە، کە دێت بە دەنگی پێداویستییە بابەتییەکانی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە لە پێشەوەشیان زامنکردنی هاوکاری

نێوان دەوڵەتەکان. ئا لەم بارەشدا گەشەکردنی پێوەندییە یەکسان و هاوسەنگییە نێودەوڵەتییەکان پێویستی بە زەرووڕەتی بوونی پرەنسیپی یاسایی هاوبەش و بڕیار لەسەردراو و پەسەندکراو دەکات. وەك ئەو نۆرمە یاساییانەی کە بە رەوتی ڕۆژگار لەلایەن هەموو سیستەمە یاساییە نیشتمانییەکان و سیستەمی یاسایی نێودەوڵەتییەوە پەسەندکراون، وەك نۆرمی "تایبەت کۆتی گشتی دەکات" و" یاسای دواتریش ئەوی پێشووتر پووچەڵدەکاتەوە".

پرەنسیپە گشتییەکانی یاسا ڕۆڵێکی گرینگ دەگێڕن بۆ پەیدابوونی سەرچاوە بنەڕەتییەکانی تری یاسای نێودەوڵەتی وەك خاڵی دەسپێکردن بۆ پەیدابوونی نۆرمە یاساییە نێودەوڵەتییە پەیمانەکی (تعاهدی) و نەریتییەکان. سیستەمی یاسایی نێودەوڵەتی ژمارەیەکی زۆری نۆرمە ڕەوشتییەکانی تێدایە، واتا ئەو پرەنسیپ و نۆرمە یاساییە نێودەوڵەتییانەی کە دابەشدەبن بۆ نۆرم و پرەنسیپی گشتی و هەرێمی و تایبەت. نۆرمە گشتییەکان پێوەندییە جیهانییە گشتییەکان ڕێکدەخەن، بۆیە لەسەر بناخەی ئەوان، بە ڕێککەوتنی بە کۆمەڵی یان دووقۆڵی نۆرمە هەرێمییەکان دادەڕێژرێن و پێڕەودەکرێن.

یاسای نێودەوڵەتی بەوردی جیاوازی ناکات لەنێوان نۆرمی یاسایی و پرەنسیپی یاساییدا، چونکە دۆکومێنتێکی نێودەوڵەتی نییە بتوانێ ئەوە ڕوون بکاتەوە کام نۆرمی ڕەوشت، نۆرمی یاساییە و کامیشیان پرەنسیپی یاساین. بەپێی زانستی یاسا و پراکتیکی نێودەوڵەتی، پرەنسیپی یاسای نێودەوڵەتی بە نۆرمی یاسایی دادەنرێن و لە هەندێك تایبەتمەندیدا جیاوازییان هەیە لەگەڵ ئەودوای نۆرمی یاسایی یاسای نێودەوڵەتی، بەڵام مەودای جیاوازییەکان ڕێژەیین نەك رەهایی. جا وەکو نۆرمێکی گشتیی دەشێ نۆرمە یاساییەکان پێوەندی یاسایی دیاریکراو ڕێکبخەن وەك مۆرکردنی پەیماننامە دووقۆڵییە نێودەوڵەتییەکان. لەم ڕووەشەوە دەکرێ بڵێین، نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی یەکەم: لە ڕووی پێکهاتنەوە لە پرەنسیپ خێراتر پێکدێن. دووەم: خێراتریش دەچنە واری جێبەجێکردنەوە. سێیەم: چەند پێوەندییەکی دیاریکراو ڕێك دەخەن. چوارەم: بە گوێرەی هۆکاری تایبەت دەشێ کۆتایی بە کارپێکردنیان بهێنرێ.

بەڵام پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی، جیاوازیان هەیە لەگەڵ نۆرمە یاساییەکان لەوەی کە لە ماوە زەمەنێکی درێژتر پێکدێن و پێوەندیگەلێکی نێودەوڵەتی ڕێکدەخەن لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتی بە گشتی و ماوەی کارپێکردنیشیان درێژە و فاکتەری نێوەخۆیی کاریگەرییان بە سەرەوە نییە و ناکرێ کۆتاییان پێ بهێنرێ، بگرە پەرەیان پێدەدرێ و نوێ دەکرێنەوە بە

نۆرمگەلی نویٚ لە هەمان چەشن، بەتایبەتی ئەوی هاوبەندە بەو پرەنسیپانەی نۆرمی فەرماندەر لەخۆدەگرن.

لە زانستی یاسای نێودەوڵەتیدا ناکۆکی نییە لەبارەی سیفەتی مولزەمی پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی. دەبینین مادەی (٢) لە دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان، کە بەڵگەنامەیەکی نێودەوڵەتییە و گەورەترین هێزی یاسایی هەیە، جەختیکردووە کە رێکخراوەکە و ئەندامەکانی بە گوێرەی ئەو پرەنسیپانەی هێناونی، کاردەکەن. هەروەها رێکخراوەکە کاردەکات لەسەر ئەوەی دەوڵەتە نائەندامەکان تیادا لەسەر ئەم پرەنسیپانە بڕۆن بەقەد ئەوەی زەروورەتی پاراستنی ئاشتی و ئاسایش ئەوە دەخوازیٚ. لە راگەیاندنی تایبەتیش بە پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی کە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٧٠ پەسەندیکرد، تاکیدکراوەتە سەر ئەم پرەنسیپانە، مادەی (٣٨)لە رێککەوتننامەی ڤیەننای ساڵی ١٩٦٩ تایبەت بە پەیماننامە دەڵێت دەکریٚ نۆرمێکی هاتوو لە پەیمانێکدا مولزەم بێت بۆ دەوڵەتێك، کە ئەندامیش نەبێت لەو پەیمانە، بەو پێیەی ئەو نۆرمە نۆرمێکی نەریتیی یاسای نێودەوڵەتییە و بەم سیفەتەش پێزانراوە. هەروەها مادەی (٥٣)ی جەختدەکاتە سەر ئەوەی کە ((پەیماننامە بە شێوەیەکی رەها بە پووچەڵ دادەنریٚ ئەگەر لە کاتی بەستنیدا ناکۆك بێت لەگەڵ نۆرمێکی فەرماندەر لە نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی. بۆ مەبەستەکانی ئەم رێککەوتننامەیە، نۆرمی فەرماندەر ئەو نۆرمە یاساییە نێودەوڵەتییە گشتییەیە، کە ناکریٚ پێشێل بکرێت یان هەمواربکرێت تەنیا بە نۆرمێکی دواتر نەبیٚ لە نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی گشتی هاوشێوە ".

لەوەی وترا، بۆمان دەردەکەویٚ نۆرمی فەرماندەر لە یاسای نێودەوڵەتی بناخەی سیستەمی نێودەوڵەتییە و برێتییە لە پێوەرێك بۆ رەوایی تەواوی سیستەمی نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی. بەم واتایەش پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی و بەشێك لە نۆرمە گشتییەکانی وەکو یاسابەندی "حصانە" دیپلۆماتی دەگرێتەخۆ.

پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی، بەو سیفەتەی گرینگترین نۆرمن، کە بە گشتی لەسەریان رێککەوتوون، بۆ رێکخستنی رەفتاری کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی، زۆر کاردەکەنە سەر دروستکردنی نۆرمە یاساییە نێودەوڵەتییەکان وەك نۆرمێکی رەوشت بۆ کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی، بەڵام نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی لەلایەن خۆیانەوە کاردەکەن بۆ پەرەپێدان و دەوڵەمەندکردنی پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی.

لەبەرئەوەی پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی گشتیی هاوچەرخ ڕواڵەتێکن لە ڕواڵەتەکانی پێوەندیی نێودەوڵەتی، برێتین لە نۆرمی نێودەوڵەتی جێگیر و بڕیار لەسەردراوە و سیفەتی ئیلزامی گشتییان هەیە بۆ کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی لە کاتی ڕێکخستنی بوارێك لە بوارەکانی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان.

کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لە پێوەندییەکانیدا کۆمەڵێك پرەنسیپی پەسەندکرد و لە دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان داینان و جەختی لەسەر یان کرد و شرۆڤەیانی کرد و لە ڕاگەیاندنی پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی ساڵی ١٩٧٠ و هەندێ بەڵگەنامەی هەرێمی وەکو بەڵگەنامەی کۆتایی هلسنکی ساڵی ١٩٧٥ داینان، ئەم پرەنسیپانەش ئەمانەن:

ا- بەکارنەهێنانی هێز یان هەڕەشەکردن پێی بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان.

ب- چارەسەرکردنی کێشە و ململانێ نێودەوڵەتییەکان بە ئاشتیانە.

ج- دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوەخۆ.

د- پابەندبوونی دەوڵەتەکان بە هاوکاری بەپێی دەستووورەکە.

هـ- یەکسانی و مافی گەل و نەتەوەکان لە بڕیاردانی چارەنووسدا.

و- یەکسانی نێوان دەوڵەتەکان.

ز- Pact sunt servanda جێبەجێکردنی پەیماننامە و پابەندبوون بە بەڵێن.

ح- پیرۆزیی سنوورەکان.

گ- سەلامەتیی هەرێمی یان یەکیەتیی هەرێمی.

ی- ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانی.

پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی پێکەوە هاوبەند و بەستراون لە چوارچێوەی سیستەمێکدا، کە برێتییە لەو نۆرمانەی کە ناکرێ یەکیان بەجیا لەوی تر تەماشابکرێن، بگرە دەبێ لە ڕەوتی هەموو پرەنسیپەکانی تر تەماشابکرێن.

## ١- سەرچاوە یاریدەدەرەکان:

### ١- ئەحکامی دادگەکان و بۆچوونی یاساناسان

بڕگە (٤)لە مادەی (٣٨)ی پێڕەوی ناوەخۆی دادگەی دادی نێودەوڵەتی ئەحکامی دادگە و ڕێبازی گەورە نووسەرانی یاسای نێودەوڵەتی گشتی لەنێو گەل و نەتەوە جۆربەجۆرەکاندا، بە

سەرچاوەیەکی یـەدەگی نۆرمـەکانی یاسـا دانـاون. پێـڕەوی ناوەخۆیەکـە لـە مـادەی (٥٩) جەختیکردووە، کە ئەو حوکمەی بەپێی ئەم سەرچـاوەیە هێـزی ئیلزامـی تـەنیا بـۆ ئەوانـەی لەنێوانیانـدا دەرچـووە و سـەبارەت بـەو کێشـەیەی تێیـدا یەکلاکراوەتـەوە هەیـە. دادگـەی نێودەوڵـەتی پەنادەباتـە بـەر بڕیـاری دادگـەکان بـۆ دۆزینـەوەی سەرچـاوە یاریـدەدەرەکان و شـرۆڤەکردن و دراسـەتکردنیان. دەبیـنین دادگـەی دادی نێودەوڵـەتی هەمیشـە هـەوڵ دەدا ئەحکامەکانی پێشووی پێـڕەو بکـات و بـە گوێرەیـان رەفتـار بکـات تـاوەکو دڵنیـابێ لـەو هەنگاوانەی دەنرێن.

ئەگەرچی یاسای نێودەوڵەتی پێزانین ناکات بە سیستەمی پێشینە بڕیاری دادگەیی، کە لە سیستەمی ئەنگلۆ-سەکسۆنیدا هـەن، بـەڵام دەبیـنین دەوڵەتـەکان و یاساناسـان ئامـاژە بـە ئەحکامی دادگەی دادی نێودەوڵەتی هەمیشەیی و دادگـەی دادی نێودەوڵـەتی دەکـەن وەکـو بڕیـاری فـەرمی. خـودی دادگـەی دادی نێودەوڵـەتیش بـە وردی لـە بڕیارەکـانی پێشـووی دەتوێژێتەوە بۆ دووراگرتنی ئەو رێگەچارانەی کە پێی وایە ناکرێ بەسەر ئەو کێشەیەی تێـی دەڕوانێ، پراکتیزەبکرێن. بۆ نموونە دادوەرانی دادگەی دادی نێودەوڵەتی و دادوەرانی ئینگلیـز هەندێ جار دێنن لە میانەی شرۆڤەکردن و دەسنیشانکردندا یاسا دەخولقێنن. دیارترین نموونە بۆ ئەمە، ئەو بڕیارە بوو، کە دادگەی دادی نێودەوڵەتی لە کێشەی راوکـەرانی ماسـی نێـوان بەریتانیا و نەرویژ دەریکرد سەبارەت بە پێوەری دانپێدانان بەو هێڵە سەرەکییەی، کە پێـوانی هەرێمی دەریا لێوەی دەستپێدەکات، لە پاشاندا لە ڕێککەوتننامەی (جنـێڤ)ی تایبـەت بـە دەریا هەرێمییەکان و ناوچە پاشکۆکەی لە ساڵی ١٩٥٨ تۆمـارکرا[٥]. نموونـەی دیکـەش هـەن وەکو کێشەی قەرەبووکردنەوە[٦]، کە دادگە لە میانەیدا پێـزانینی کـرد بـە کەسـایەتی دەزگـە نێودەوڵەتییەکان لە هەندێ باردا، هەروا کێشەی جینۆساید[٧]. بێگومان ئەمـە واتـای وانییـە بڕیاری دادگە بە حەتمی لە بڕیارەکانی دواتر و لە میانەی داڕشـتنی یاسـادا، وەردەگـیرێ. بـۆ نموونە هەندێ بڕیاری دادگە هەیە، وەك ئەو بڕیارەی کە تایبەت بـوو بـە کێشـەی (لۆتـۆس)، ڕووبەڕووی ڕەخنە و پشتگوێ خستنەوە بوون لەلایەن ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکانـەوە وەك ڕێککەوتننامەی (جنێڤ)ی تایبەت بە یاسای دەریـا سـاڵی ١٩٨٢، بـەڵام کـەم جـار ئەمـە

---

5- ICJ Reports, 1951, P.18 ILR, P.86
6- ICJ Reports, 1949, P.174
7- ICJ Reports, 1951, P. 15

ڕووده‌دات به‌ به‌راورد له‌گه‌ڵ ڕاده‌ی ئه‌و ڕێز و قبووڵه‌ی، که‌ دادگه‌ پێی ناسراوه‌ و ئه‌و بڕیارانه‌ی، که‌ به‌ شێوه‌یه‌کی کارا به‌شداریده‌که‌ن له‌ ده‌وڵه‌مه‌ندکردنی یاسای نێوده‌وڵه‌تی.

ده‌سته‌واژه‌ی ((ئه‌حکامه‌کانی دادگه‌کان)) سه‌ره‌ڕای بڕیاره‌کانی دادگه‌ی دادی هه‌میشه‌یی نێوده‌وڵه‌تی و بڕیاره‌کانی دادگه‌ی دادی نێوده‌وڵه‌تی، چه‌ند ئه‌حکام و بڕیارێکی دادگه‌کانی نێوبژیوانی نێوده‌وڵه‌تیش ده‌گرنه‌خۆ، وه‌ك: دادگه‌ی نێوبژیوانی هه‌میشه‌یی، که‌ له‌ لاهای ساڵی ١٨٩٩ و ١٩٠٧ پێکهات، هه‌روا دادگه‌کانی تری نێوبژیوانی تێکه‌ڵ وه‌کو دادگه‌ی نێوبژیوانی ئێرانی – ئه‌مه‌ریکایی. ئه‌م ده‌زگه‌ نێوبژیوانییانه‌ی، که‌ له‌ گه‌لێ لایه‌نه‌وه‌ جیاوازن له‌گه‌ڵ دادگه‌ نێوده‌وڵه‌تییه‌کاندا، له‌ ڕێگه‌ی بڕیاره‌کانیانه‌وه‌ به‌شدارییه‌کی کارا ده‌که‌ن بۆ په‌ره‌سه‌ندنی یاسای نێوده‌وڵه‌تی.

باشترین به‌ڵگه‌ بۆ ئه‌مه‌ ڕاپۆرته‌کانی ئه‌و دادگه‌یانه‌ن، که‌ نه‌ته‌وه‌ یه‌کگرتووه‌کان له‌ ساڵی (١٩٤٨)ه‌وه‌ ده‌ستی کرده‌ بڵاوکردنه‌وه‌یان. هه‌روا په‌نادەبردرێته‌ به‌ر بڕیاره‌کانی دادگه‌ نێوده‌وڵه‌تییه‌کان بۆ به‌کارهێنانیان وه‌کو به‌ڵگه‌یه‌ك بۆ بوونی نۆرمێکی نه‌ریتی (عورفی) یان دۆزینه‌وه‌ و گه‌یشتن به‌ کاری مادییانه‌ی پێویست بۆ سه‌لماندنی نۆرمێك له‌ نۆرمه‌کانی یاسای نه‌ریتی. ئه‌مه‌ش هه‌ندێ له‌ یاساناسانی ئینگلیز و ئه‌مه‌ریکا له‌ بانگه‌شه‌کردنیاندا بۆ گه‌ڕانه‌وه‌ی جدی بۆ بڕیاره‌کانی دادگه‌ نێوه‌خۆییه‌کان پێڕه‌وی ده‌که‌ن.

لێره‌دا وا باشه‌ ئاماژه‌ به‌ بڕیاره‌کانی دادگه‌ باڵاکان له‌ ده‌وڵه‌ته‌ فیدراڵییه‌کانی، وه‌ك: سویسرا و ویلایه‌ته‌ یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مه‌ریکا بده‌ین. ده‌بینین بڕیاره‌کانی ئه‌م دادگه‌یانه‌، که‌ تایبه‌تن به‌ یه‌کلاکردنه‌وه‌ی کێشه‌کانی نێوان ویلایه‌ته‌کان له‌م وڵاتانه‌، هه‌وڵ ده‌ده‌ن بۆ په‌ره‌پێدانی نۆرمه‌کانی یاسای نێوده‌وڵه‌تی له‌ هه‌ندێ بواردا وه‌ك سنوور و هه‌رێم. چاره‌سه‌رکردنی ناکۆکییه‌کانی سنوور له‌نێوان دوو ویلایه‌تی ئه‌مه‌ریکاییدا له‌لایه‌ن دادگه‌ی باڵای ئه‌مه‌ریکاوه‌ له‌ زۆر لایه‌نه‌کانییه‌وه‌ له‌و ڕێگه‌چاره‌یه‌ ده‌چێ، که‌ دادگه‌ی دادی نێوده‌وڵه‌تی بڕیاری له‌سه‌ر ده‌دات سه‌باره‌ت به‌ کێشه‌یه‌کی سنووری له‌نێوان دوو ده‌وڵه‌تی سه‌ربه‌خۆدا. ئه‌م مه‌سه‌له‌یه‌ش گرینگییه‌کی زۆر ده‌به‌خشێته‌ بڕیاره‌کانی ئه‌و دادگه‌یانه‌ به‌ره‌و پێشخستنی یاسای نێوده‌وڵه‌تی.

ماده‌ی (٣٨) **ڕێبازه‌کانی گه‌وره‌ نووسه‌رانی** بواری یاسای گشتی له‌نێو گه‌ل و نه‌ته‌وه‌ جیاجیاکاندا به‌ سه‌رچاوه‌یه‌کی یاریده‌ده‌ر داده‌نێت بۆ دیاریکردنی نۆرمی یاسای نێوده‌وڵه‌تی. نووسه‌ره‌ ئه‌کادیمییه‌کان به‌شدارییه‌کی گه‌وره‌یان نواندووه‌ به‌ره‌و په‌سه‌ندکردنی یاسای

نێودەوڵەتی. دەبینین لەوپەڕی گەشەی یاسای سرووشتیدا وەختێك ڕاو شرۆڤەکردنی یاساناسان ڕۆڵێکی بنەڕەتی گێڕاوە لە دروستکردنی یاسادا، بایەخێکی کەم دراوە بە نۆرمەکانی پێشووتر و بڕیارە دادوەرییەکان. یاساناسانی وەکو (گرۆتیس و بفیندرۆف و فاتیل) لە هەردوو سەدەی شازدە و هەڤدە، ئەوپەڕی دەسەڵاتیان هەبووە و جێ پەنجەی دیاریان بەسەر فرە جۆری نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی و شێوە و ناوەڕۆکیانەوە، بەجێهێشتووە.

لەوەتی ڕێبازی دانەری (وضعي) سەریهەڵدا و دوایەش جەختکرایە سەر سەروەری دەوڵەت و پەیماننامە و نەریت و رۆلی بەرزیان لە گوزارشتکردن لە یاسای نێودەوڵەتی، گرینگی یاسادانانی تۆمارکراو لە ژیانی ڕۆژانەدا پەرەیسەند. بۆیە دەبینین پەڕتووکەکانی یاسا بوونە سەرچاوەیەك بۆ زانینی حوکمی یاسا لە هەر کێشە و ململانێیەکدا لە جیاتی گەڕان بە دوای سەرچاوەی ڕاستەقینەی نۆرمی یاسایی. هێشتاش هەندێ لە یاساناسان کاریگەرییەکی زیندوویان هەیە بۆ پەرەسەندنی هەندێ لە بەشەکانی یاسای نێودەوڵەتی، وەك کاریگەری (Gidel) لەسەر یاسای دەریاکان. هەروا کتێب و پەرتووکەکانی یاساناسانی تر لەبارەی یاسای نێودەوڵەتی بە گشتی وەکو ئۆپنهایم (Oppenheim) و رۆسۆ (Roussean) لەم ڕووەوە بە سەرچاوەی کلاسیکی دادەنرێن لە رووی کاریگەرییان بەسەر ئەو پێشکەوتنەی کە لە یاسای نێودەوڵەتی لە سەدەی بیستەم ڕوویدا.

سەرەڕای ئەوەش، کتێب و پەرتووکە یاساییەکان هاوکارییەکی زۆریان هەیە بۆ داڕشتنی پێکهاتەی یاسای نێودەوڵەتی و ڕواڵەتەکانی و لێکدانەوەی سرووشتی و مێژووی و پیادەکردنی نۆرمەکانی بە پراکتیك و هاندانی جۆرەها هزرییان داوە لەبارەی ئامانجەکانی یاسای نێودەوڵەتی و ئەو بەهایانەی، کە دەیەوێ لەنێو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا بیچەسپێنێ و کەموکوڕییەکانی نێو سیستەمی نێودەوڵەتی دەرخا و پێشنیاری گونجاو بخاتەڕوو بۆ چارەسەرکردنیان. نەبوونی چەند دەسەڵاتێك و دەزگەیەکی باڵا لە سیستەمی یاسای نێودەوڵەتیدا بەرپرسیارێتییەکی گەورەتر دەخاتە ئەستۆی یاساناسانی هەموو گەلان لە پێناو دەوڵەمەندکردنی سیستەمی نێودەوڵەتی بە توخمی گونجاندن و ڕێکخستن و دیاریکردنی رەوت و ئامانجەکانی نۆرمی یاسای نێودەوڵەتی.

هەندێ لە دەزگە نێودەوڵەتی و نیشتمانی و بەرپرسانی نێودەوڵەتی و نێوەخۆیی لە کاتی پاساوهێنانەوە بۆ بڕیارەکانیان یان بۆ پاڵپشتی بیروڕاکانیان پەنادەبەنە بەر کەڵك وەرگرتن لە ڕا و بۆچوون و ڕێبازەکانی گەورە یاساناسەکان و ئاماژە بە نووسینەکانیان دەکەن، بە تایبەتی

لـه كـاتی بەرزكردنـەوەی سـكالاَی نێودەوڵـەتی و پێشكێشـكردنی ڕاوێـژ لـە لایـەن گـەورە ڕاوێژكارانی یاسا بۆ حكوومەتەكانیان لەسەر وەرگـرتنی هەڵوێسـتێكی نێودەوڵـەتی. هـەروا كاتێك دەزگە دادوەری و ڕاوێژكارییە نێودەوڵەتییەكان و هەندێ جاریش نێوەخۆییەكان هەندێك لە بڕیارەكانیان لـەبارەی مەسـەلەیەك یـان كێشـەیەك تـوخمێكی نێودەوڵـەتی لـەخۆدەگرێ. لەبەرئەوەی هەر یاساناسێك یان لێتۆژێك تـا ڕادەیـەكی زۆر بەرجەسـتە لـە چـەمك و بـەها بالاَدەستەكانی نێو كۆمەڵگەكەی خـۆی دەكـات، بۆیـە دەبێـت كۆمەڵگـەی نێودەوڵـەتی زۆر ئاگەداربێت، نەوەك ئـەو كەسـانە، ئـەو جـۆرە چـەمك و بەهایانـەی، كـە نـاگونجێن لەگـەڵ كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی هاوچەرخ ، بگوێزنەوە ناو یاسای نێودەوڵەتی. بۆیە پێویسـتە لەسـەر لایەن و كەسە پێوەندیدارەكان ئەو ژینگە نیشتمانی و هەرێمییەی ئەو كەسەی تێدایە، كـە وا دەخوازێ ڕاو بۆچوونەكەی پێڕەوبكەن، باش هەڵسەنگێنن.

## ٢- پرەنسیپەكانی داد و ئینساف:

جگە لە كەڵك وەرگرتن لە ئـەحكامی دادگـە نێودەوڵـەتی و نێوەخـۆیی و ڕاو بۆچـوونی یاساناسان، دادگەی نێودەوڵەتی هەندێ جار هانا دەباتە بەر پشتبەستن بە پرەنسیپەكانی داد و ئینساف وەك كۆمەڵە بەهایەك، كە لە هەموو سیستەمێكی كۆمەلاَیەتیدا، هـەن. ئەگەرچـی مادەی (٣٨) لە پێڕەوی ناوەخۆی دادگەی دادی نێودەوڵەتی ڕێ بە دادگە نادا بگەڕێتـەوە بـۆ داد و ئینساف تەنیا ئەو كاتە نەبێ، كە هەردوولای كێشەكە بە ڕاشكاوی دەسەلاَتی پێدەدەن، دادگەی نێودەوڵەتی لە زۆر باردا پەنای بۆ دەبات. بەناوبانگترین ئـەو بڕیـارەی لـەم بارەیـەوە وەرگیرا بڕیاری دادوەر هدسون(Hudson) بوو لـە كێشـەی میـوس(Meuse) سـاڵی ١٩٣٧ لەبارەی دابەشكردنی ئاوی نێوان هۆڵەندا و بەلچیكا، ئەو جەختی كرد كە پرەنسیپەكانی داد و ئینساف لە سەردەمانێكی زووەوە وەكو بەشێك لـە یاسـای نێودەوڵـەتی دادەنـرێن و لەلایـەن دادگەكانەوە پیادە دەكرێن و گوتی: ( بە گـوێرەی مـادەی (٣٨)ی پێـڕەوی نـاوەخۆی دادگـە تارادەیەك دادگە ئازادە، بەلاَم نەوەك بـەدەر لـەم مادەیـە- بـۆ ئـەوەی پرەنسـیپەكانی داد و ئینساف ڕەچاو بكات وەك بەشێك لە یاسای نێودەوڵەتی كە پێویستە پراكتیزەبكرێ))[٨].

---

8- 8ILR,PP.444,450

**پرەنسیپەکانی داد و ئینساف سێ ئەرکیان هەیە:**

١- گونجاندنی یاسا لەگەڵ بارودۆخی کێشە تایبەتەکان Eqity infra legem .

٢- تەواوکردنی کەموکوڕی یاسای دانراو (الوضعي) Eqity praeter legem.

٣- پەنادەبردرێتە بەر ڕەتکردنەوەی پیادەکردنی یاسای نادادپەروەر"غير عادل" Eqity contra legem.

دەکرێت ئەرکی گونجاندنی یاسا لە زۆر حاڵەتدا بەکاربهێنرێت وەك ئەو دۆزانەی، کە تێیاندا هەندێك لادەدرێت لە جێبەجێکردنی دەقی یاسا بە شێوەیەکی توند واتا پەنا بردنەبەر سوککردنەوەی توندوتیژی دەقەکە و هەروەها ئەو دۆزانەش، کە تێیاندا رۆحی یاسا بەسەر دەقەکەیدا زاڵدەکرێت و ئەوانەش کە لە میانەیاندا داد و ئینساف وەك نۆرمێکی یاسایی دادەنرێ. کەواتا ئەو دادوەرەی ئارەزوییێتی دەقی یاسایەك جێبەجێ نەکات، دەتوانێت بڕیاربدات، کە جێبەجێکردنی دەقی یاساکە ناکۆکە لەگەڵ روحەکەی، یان بڵێت یاسادانەر مەبەستییێتی کە پێویستە بەدەر "استثناء"هەبێت لە دەقی یاساکە ( Equity lnfra Legem) یان بڵێت ناکرێت یاساکە بەسەر دۆزەکەدا جێبەجێ بکرێت. بۆیە لەم حاڵەتانەدا دەکرێت دادوەر پەنا بەرێتە بەر پرەنسیپی داد و ئینساف بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی روودەدا (EquityPruexer) یان یاساکە بەلاوەنێت و لەبەر ناعادیلانەیی دەبێت جێبەجێنەکرێت بەسەر دۆزی پێوەندیدار (Equity lnfra Legern).

کاتێك دادگە پەنادەباتە بەر پرەنسیپەکانی داد و ئینساف لە زۆر باردا واتای ئەوە نییە کە ئەم پرەنسیپانە بوونەتە سەرچاوەیەکی فەرمی یاسا. چونکە دادوەرەکان لە دادگە نیشتمانییەکاندا زۆر جار دێن ڕەچاوی پرەنسیپەکانی داد و ئینساف دەکەن وەختێك یاسا ناڕوونییەك دایدەپۆشێ، وێڕای ئەوەش بە سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی یاسای نێوەخۆیی داینانێن.

کاتێك دادوەر بڕیارێك سەبارەت بە کێشەیەکی ناڕوون یان گوواتاوی دەردەکات، دەبێ بەڵگەی هەبێت کە ئەو نۆرمەی پیادەی دەکات نۆرمێکی دادوەرییە و کارپێکراوە و پیادەکردنی ئاسانە و دەگونجێ لەگەڵ ئەو دەرهاویشتانەی پێشبینی دەکرێ، کە لە ئەنجامی فاکتەری نایاسایی تر وەك فاکتەری ئاینی و ڕەوشتمەندی و ڕەوشتی گشتی و دراوسێتی باش و لۆژیك و هەستی گشتی و ویژدانی هاوبەش و فاکتەرە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و جوگرافی و زانستییەکان سەرهەڵدەن.

جا ئەم فاكتەرانە بە پرەنسیپەكانی داد و ئینسافیشەوە، بریتین لە سەرچاوە مادییەكانی یاسا، نەوەك سەرچاوە فەرمییەكان. لەبەرئەوەی یاسای نێودەوڵەتی لە یاسایی نێوەخۆیی لە ڕووی دەزگەییەوە كەمتر پێشكەوتووە، ئەوا جیاوازی لەنێوان سەرچاوە فەرمی و سەرچاوە مادییەكاندا كەمتر ڕوونە لە یاسای نێودەوڵەتیدا لەوەی لە یاسای نێوەخۆیی. مەسەلەی ئایا پرەنسیپەكانی داد و ئینساف سەرچاوەیەكی فەرمی یاسای نێودەوڵەتین یان نا، مەسەلەیەكی تیۆریی فرەوانە. وەلاٌم هەر چۆنێك بێت ئەوە لەوێدا هەقیقەتێكی حاشا هەڵنەگر هەیە، ئەویش ئەوەیە دادگە نێودەوڵەتییەكان زۆرجار پەنادەبەنە بەر پراكتیزەكردنی پرەنسیپەكانی داد و ئینساف و بەم كارەیان ڕۆڵێكی زیندوو دەگێڕن بۆ پێشخستنی یاسای نێودەوڵەتی و گۆڕانكاری دینامیكی دێنن بەسەر سیستەمەكەیدا و وا دەكەن پیادەكردنی نۆرمە توند و ڕەقەكانی نەرمتر بێت.

دادگەی نێوبژیوانی نێوان هیندستان و پاكستان لەبارەی كێشەی ڕان كیچ ( Rann of Kutch Case) پیڕەوی پرەنسیپەكانی داد و ئینسافی كرد، وەك بەشێك لە یاسای نێودەوڵەتی و داواشی لە هەردوولا كرد پشتیان پێ ببەستن بۆ چارەسەركردنی ناكۆكی نێوانیان[9]. هەروا دادگەی دادی نێودەوڵەتی لە كێشەی Continental Shelf (الجرف القاري) لە دەریای باكوور پشتیبەست بە پرەنسیپەكانی داد و ئینساف لە بڕیارێكیدا سەبارەت بە دابەشكردنی كۆتایی (الجرف القاري) نێوان هەر یەك لە ئەڵمانیا و هۆڵەندا و دانیمارك[10]. ڕێككەوتننامەی ڤیەنای تایبەت بە یاسای دەریا ساڵی ١٩٨٢ ڕێیداوە لە هەندێ باردا پەنابردرێتە بەر پرەنسیپی داد و ئینساف. مادەی (٥٩)ی ڕێككەوتننامەكە دەڵێت: "لەو حاڵەتانەی ڕێككەوتننامەی یاسای دەریاكان لەناوچەی ئابووری پەتی The exclusive economic zone مافێك یان دەسەلاٌتێك ناداتە دەوڵەتە كەنارییەكان یان دەوڵەتانی تر و لەسەر بەرژەوەندنی نێوانیان ناكۆكی لەنێوان دەوڵەتەكانی كەنار یان ئەوانی تر سەرهەڵدەدا، دەبێ ئەو ناكۆكییە لەسەر بنەمای ئینساف و لە بەر ڕۆشنایی هەموو بارودۆخە پێوەندیدارەكە چارەسەربكرێ بە ڕەچاوكردنی گرینگی بابەتی ناكۆكییەكە بەلای هەموو لایەنەكانەوە و بەلای كۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە بە گشتی)). هەروا بڕگە یەك لە مادەی (٧٤) جەختی كردووە كە: "دیاریكردنی سنووری ناوچەی ئابووری پەتی نێوان دەوڵەتەكانی خاوەن كەنارە بەرامبەرەكان

9- SO ILR,P.18
10- CJ Reports, 1969 PP.3,53

یان پێکەوە لکاوەکان بە ڕێگەی ڕێککەوتن بەپێی یاسای نێودەوڵەتی دیاریدەکرێ لە پێناو گەیشتن بە چارەسەرێکی دادوەرانە، هەر وەکو چۆن لە مادەی (٣٨)ی پێڕەوی ناوەخۆی دادگەی دادی نێودەوڵەتیدا ئاماژەی پێدراوە". لە بڕگەی (١)ی مادەی (٨٣)یش بە هەمان واتا هاتووە سەبارەت بە دیاریکردنی سنووری (الجرف القاري)ی نێوان دەوڵەتە خاوەن کەنارە بەرامبەرەکان یان پێکەوە لکاوەکان.

ئەم ئەحکامانە بە تایبەتمەندیی نەرمیی ناسراون، کە لە یاسای نێودەوڵەتیدا گرینگە، بەلاّم لە هەمان کاتدا تا ڕادەیەك ڕوون نین. چونکە دیار نییە چۆن و بە چ شێوەیەك ناکۆکییەکی دیاریکراو بە وردی چارەسەردەکرێ و بە گوێرەی چ پرەنسیپێك. ئەمانە هەموو وا دەکەن چارەسەرکردنی ئەم جۆرە کێشانە بەسترابێ بە چەند فاکتەرێکی گرینگی وا، کە ناکرێ پێشبینی زۆرێکیان بکرێ.

هەروەها دادگە نێودەوڵەتییەکان پەنادەبەنە بەر بەکارهێنانی داد و ئینساف لە هەندێ لە بارەکانی دیاریکردنی سنووری نادەریایی کە تیادا دۆکومێنتێك نییە لەبارەی شوێنی هێڵی سنوورەکە. بۆ نموونە لە کێشەی بۆرکینا فاسۆ و کۆماری مالی دادگە بەم شێوەیە ئاماژەی لەبارەی گۆماوی سۆیوم (Pool of Soum) داوە: ((دەبێ دانی پێدا بنرێ سۆیوم گۆماوێکی سنوورییە و نەبوونی هیچ نۆرمێك لە دەقەکانی ئەو ئەحکامانەی کە هێڵی سنوور دیاریدەکەن وا دەخوازێ هێڵەکە، گۆماوی سۆیوم بە شێوەیەکی عادیلانە دابەش بکات)).

ئەمەش واتا دابەشکردنی گۆماوەکە بە شێوەیەکی عادیلانە و ئینسافانە. وێڕای ئەوەش ئینساف هەمیشە بە واتای یەکسانی نایەت، بەلاّم ئەگەر حاڵەتێکی تایبەت نەبێ یەکسانی بە چاکترین دەربڕین دادەنرێ بۆ ئینساف بە شێوەیەکی گشتی. لە شوێنێکی تردا دادگە لەسەر ئەمە جەختی کردووە: ((پەنابردنە بەر بیرۆکەی ئینساف لە پێناو هەموارکردنی سنوورێکی دانراو بە تەواوی ناعادیلانەیە))[11]. جگە لەوەش ئەو پرەنسیپ و چەمکە گشتێنراوانەی بانگەشە بۆ چاکە و بەهای بەرزدەکەن لە کۆمەڵگەدا و برێتین لە نۆرمی ڕەوشتی گرینگی بەرفرەوان، بە نۆرمی یاسایی نێودەوڵەتی مولزەم دانانرێن بە تەنیا، ئەگەر لەلایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە و بە ڕێگەی میکانیزمی دروستبوونی نۆرمی یاسایی نێودەوڵەتییەوە، قبوولّ نەکرێن. چونکە پرەنسیپە مرۆییە قبوولکراوەکان گەوهەری ئەو نۆرمانەن و هەوڵدەدەن بۆ

11- ICJ Reports,1986,PP.554,633

پاساوهێنانەوەی بوونیان بە شێوازێکی فرەوان و ڕۆڵێکی بە نرخ دەگێڕن بۆ ئەوەی وزەیەکی زیاتر بدەنە ئەم جۆرە نۆرمانە لە چوارچێوەی سیستەمی نێودەوڵەتیدا. بۆ نموونە دادگەی نێودەوڵەتی لە کێشەی ڕەوایی هەڕەشەکردن بە بەکارهێنانی چەکی ئۆتۆمی لە ڕایە ڕاوێژکارییەکەی جەختی کردۆتە سەر ئەوەی کە گۆڕینی ئەو نۆرم و پرەنسیپانەی پێوەندییان هەیە بە یاسای مرۆیی نێونەتەوەیەوە دەگەڕێتەوە بۆ زاڵبوونی هەستی مرۆڤایەتی[12].

### ٣- بڕیارەکانی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان:

لە لێتۆژینەوەماندا لەبارەی سەرچاوە جۆراوجۆرەکانی یاسا کە لە پێڕەوی ناوەخۆی دادگەی دادی نێودەوڵەتیدا هاتوون، بینیمان جیاوازییەك هەیە لەنێوان سەرچاوە ڕاستەقینەکانی نۆرمی یاساییدا، ئەویش ئەو ئامرازەیە کە دەتوانێ نۆرمی یاسایی نوێ بونیاد بنێ وەك پەیمانی یاسادارێژ و یاسای نەریتی و ژمارەیەکی زۆر لەو بڕیارانەی دادگەی دادی نێودەوڵەتی دەریان دەکات، کە ناکرێ بخرێنە چوارچێوەی ئەو کۆمەڵە سەرچاوانەی تەنیا یاسا دیاریدەکەن و ڕوون دەکەنەوە لەلایەك، هەروا لەنێوان ئەو ئامرازە و پراکتیکانەی کە دۆکومێنت دەخەنەڕوو بۆ سەلماندنی بوونی نۆرمە یاساییەکان وەك ڕاو بۆچوونی یاساناسان و هەندێك لە بڕیارەکانی دادگەکان لەسەر هەردوو ئاستی نێودەوڵەتی و نێوەخۆییدا لە لایەکی ترەوە. لە واقیعدا هەر سەرچاوەیەك لەم سەرچاوانە تا ڕادەیەك توانایان هەیە نۆرمی نوێ دابنێن، لە هەمان کاتیشدا ئەوەی هەیە پێناسەی بکەن. هۆی ئەوەش بە شێوەیەك لە شێوەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارە نارێکە لە یاسای نێودەوڵەتی و خودی ئەو ئەحکامانەی لە مادەی (٣٨)دا هاتوون.

لەوەتی دووەمین شەڕی جیهان بەسەرچووە، لە هەموو ئەو شێوازانەی، کە لە مەسەلەی پەرەسەندنی یاسا دەکۆڵنەوە، دەکرێ هەمان بێسەروبەریمان بەرچاوبکەوێت، لەنێوان ئەوی یاسا دادەنێ و ئەوی کەشفی دەکات و ئەوی دەیسەلمێنێ، چونکە سەرەڕای کاریگەری شارستانێتی ئەورووپایش لەسەری. مەسەلەی پێگەی بڕیار و ڕاگەیاندنەکانی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان لەو مەسەلانەن، کە لە سەرهەڵدانیانەوە گرینگی وڵاتانی جیهانی سێیەم دەردەخەن سەبارەت بە سیستەمی نێودەوڵەتی.

---

12- ICJ Reports,1996, Paras.79 and 95

هەموو بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان مولزەم نین بۆ دەزگەکانی وڵاتانی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان. بگرە هەندێکیان لە رووی یاساییەوە مولزەم نین و تەنیا راسپاردەن و گوزارشت لە رای زۆرینە دەکەن لەبارەی کێشە لێکجیاوازەکانی دەوڵەتەکان. ئەمەش برێتییە لە هەڵویستێکی کلاسیکی و رەنگدانەوەی ئەو ئارەزووییە کە کۆمەڵەی گشتی لە رەوتدا بکرێتە دەزگەیەکی پەرلەمانی راوێژکاری و ئەنجومەنی ئاسایشیش بکرێتە دەزگەیەك بۆ دەرکردنی بڕیاری مولزەم.

بەڵام بارەکە ئێستە تارادەیەك ئاڵۆزترە. چونکە کۆمەڵەی گشتی، ژمارەیەکی زۆر لە بڕیار و راگەیاندنی هەرە گرینگی دەرکردووە و نابێ هەموو ئەوانە کاریگەرییان نەبێ بەسەر رەوتی پەرەسەندنی یاسای نێودەولەتی هاوچەرخدا. ئەو شێوازەی دەوڵەتەکان بە گوێرەی، لە کۆمەڵەی گشتی، دەنگ دەدەن و هەروا ئەو روونکردنەوانەی لەم لایەنەوە دەردەچن بەڵگەی ئەوەن، کە دەوڵەتەکان لە پراکتیك و هەڵوێستیاندا بە شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ ئەو بڕیارانە دەکەن وەك بڵێی یاسان. بۆ نموونە پاش ئەوەی دەوڵەتێك چەند جارێك دەنگ لە پێناو کۆتاییهێنان بە جیاوازیی رەگەزی دەدات، دواتر ناتوانێ حاشا لە بوونی نۆرمێکی نەریتی بکات، کە جیاوازی رەگەزی ریسوادەکات، بگرە رەنگە ئەو نۆرمە نەریتییە ببێتە نۆرمە یاسایەکی نەریتی مولزەم بەلایەنی ئەو دەوڵەتەوە.

دادگەی دادی نێودەوڵەتی لە کێشەی نیکاراگوادا، ئاماژەی دا، کە کاتێ بڕیاری کۆمەڵەی گشتی گونجاندنی یاسایی بۆ دەکرێت، دەبێ توانای وەدەستهێنانی نۆرمی Opinio Juris لەبەر چاوبگیرێ، واتا بڕوابوون بە ئیلزامییەتی رەفتارکردن لەگەڵ ئەو بارودۆخەی لەسایەیدا بڕیارەکە وەردەگیرێ و جێبەجێدەکرێ، هەروا دەڵێت: دەکرێ بڕوابوون بە ئیلزامییەتی هەمان کار وەدەستبهێنێ لە هەڵوێستەکانی هەردوولایەن ((ئەمەریکا و نیکارەگوا)) و هەروا لە هەڵوێستەکانی دەوڵەتەکانی تر بەرامبەر هەندێ لە بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، نەخاسمە بڕیاری ژمارە(٢٦٢٥) بە ناونیشانی ((جاڕدانی پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی تایبەت بە پێوەندیی دۆستایەتی نێوان دەوڵەتەکان بەپێی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان)) [١٣].
((رێککەوتن لەسەر بڕیارگەلێکی وەها دەبێ وا بزانرێ، کە قبووڵکردنە بۆ کارپێکردنی نۆرمەکە، یان ئەو کۆمەڵە نۆرمەی، کە بە بڕیار جاڕدراون)). [١٤] بەڵام دەبێ پراکتیزەکردنی ئەم

---

13- ICJ Reports, 1986,PP.14,99-100
14- Ibid,P.100

بۆچوونە، تەنیا لەو حاڵەتانە بێت، کە لە میانەیاندا پێناسەکردن یان روونکردنەوەی ئەحکامی پەیمانێکی دانراو ئەنجامدەدرێ، بۆ نموونە وەکو دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان.

کاتێك زۆرینەی دەوڵەتەکان بۆ چەند جارێك دەنگ لە بەرژەوەندیی چەند بڕیار و راگەیاندنێك لە مەڕ بابەتێك بدەن، ئەم رەفتارەیان هەڵدەکشێ بەرەو ئاستی پراکتیکێکی نێودەوڵەتی وا کە نۆرمێکی مولزەمی لێدەکەوێتەوە، بە مەرجێك لەو رەفتارەیاندا پێویستییەکانی رێبازی باوەڕبوون بە ئیلزامیبوونی رەفتاری تیابێت (OpinioJuris). با بۆ نموونە راگەیاندنی دانی سەربەخۆیی بە وڵات و گەلانی ژێردەسەڵاتی کۆلونیالیزم، کە کۆمەڵەی گشتی لە ساڵی ١٩٦٠ پەسندیکرد وەربگرین. دوای ئەم بڕیارە زنجیرە بڕیارێك تۆمارکران بۆ ریسواکردنی کۆلونیالیزم بە شێوەیەکی گشتی یان ریسواکردنی هەندێ لە شێوەکانی و داوایان دەکرد بۆ مافی چارەنووسی هەموو گەلانی ژێردەستی کۆلونیالیزم و داگیرکردنی بیانی. ئەم بڕیارانە چەمکی مافی چارەنووسیان گۆڕی لە پرەنسیپێکی سیاسی و ڕەوشتمەندییەوە بۆ مافێکی یاسایی و دواتریش بەرەو ئیلتیزامێکی نێودەوڵەتی، بەتایبەتی پاش ئەوەی بەسترا بە راگەیاندنی پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتییەوە لە ساڵی١٩٧٠[١٥].

هەروەها دەکرێ راگەیاندنی تریش وەربگیرێ وەکو ئەو راگەیاندنەی تایبەتە بە رێکخستنی چالاکییەکانی دەوڵەتەکان بۆ بەکارهێنانی بۆشایی دەرەوە ساڵی ١٩٦٣ وەك نموونەیەك بۆ مومارەسەی دەوڵەتەکان، کە بووە هۆی دانانی نۆرمێکی مولزەم لە نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی نەریتی. ئەم بڕیارانە جگە لەوەی مومارەسەیەکە بۆ دەوڵەتەکان دەکرێ وەکو دۆکومێنت بەکاربێت بۆ سەلماندنی بوونی بۆچوونێك بەرەو دانانی نۆرمێك یان بڕوابوون بە ئیلزامییەتی ئەو کارە (Opinio Juris)، کە مەرجێکی سەرەکییە بۆ دانانی نۆرمێکی نەریتی. جگە لە وەش ئەو بڕیارانەی کۆمەڵەی گشتیی دەریان دەکات، دەکرێ لە چەند حاڵەتێکی تایبەت لێیان تێبگەین وەك شرۆڤەیەکی رەسمی بۆ هەندێ لەو پرەنسیپانەی لە دەستوورەکەیدا هاتوون.

دوایەش ئەم بڕیارانە لە توانایاندایە گوڕێك بدەن بەپرۆسێسی دانی شەرعییەت بە پراکتیکی دەوڵەتەکان و گواستنەوەی خێرا بەرەو گونجاندنی نۆرمە نەریتییەکان لەگەڵ بارودۆخی ژیانی هاوچەرخدا. نوێنەرایەتیکردنی هەموو دەوڵەتەکانی جیهان لە کۆمەڵەی

15- M.N.Shaw.International Law. 4th Ed.Combridge.1999,P.179

گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان لە نرخ و بەهای ئەم دەزگەیە زیاتر دەکات، لە رووی رامیاریی گشتی و جۆراوجۆریی مومارەسەکانی دەوڵەتەکانەوە. ئەم مەسەلەیەش لەوانەیە ببێتە هۆی بونیادنانی نۆرمی نەریتی مولزەم. بۆ نموونە هەر وەکو چۆن دادگەی دادی نێودەوڵەتی لە کێشەی نیکاراگوا دا ئاماژەی دا، هەندێ لەو جارنامانەی کۆمەڵەی گشتی دەریان دەکات و دەوڵەتەکان پەسندیان دەکەن، گوزارشت لە دانپێدانانیان دەکەن بە پرەنسیپی قەدەخەکردنی بەکارهێنانی هێز وەکو پرەنسیپێك لە پرەنسیپەکانی یاسای نەریتی نێودەوڵەتی. ئەوە بوو دادگەکە لە رووی ئەوەی تاچەند رەوایە هەڕەشەکردن بە چەکی ئۆتۆمی بەکاربێت لە بۆچوونە راوێژکارییەکەی خۆی گوتی: ((دادگە جەختدەکا کە بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتی تەنانەت ئەگەر مولزەمیش نەبن، هەندێ جار واتایەکی یاساییان هەیە، لە هەندێ باردا دەتوانن بەڵگەی گرینگ پێشکێش بکەن بۆ سەلماندنی بوونی نۆرمێکی یاسایی یان مەبەستێکی یاسادانان. هەروا بۆ ئەوەی بزانرێ ئایا بڕیارەکە بە هەقیقەت لە بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکانە ئەوە پێویستی بە وردبوونەوەیە لەناوەڕۆك و بارودۆخی پەسندکردنی و ئایا بڕوابوون بە ئیلزامییەتی رەفتار و سیفەتە یاساییەکەی تێیدا فەراهەم دەبێ، یان زنجیرە بڕیارەکان پێشکەوتنی پلەیی نۆرمی بڕوابوون بە ئیلزامییەتی رەفتارەکە دەردەخەن، کە پێویستە بۆ دانانی نۆرمێکی یاسایی نوێ)). [16]

دادگەکە کۆمەڵە بڕیارێکی کۆمەڵەی گشتی لەبارەی رەوایی بەکارهێنانی چەکی ئۆتۆمی خستە بەر باس و جەختی کرد، کە پەسندکردنی هەندێکیان لە لایەن ژمارەیەك لە دەوڵەتەکانەوە بەرهەڵستیان لێکراوە یان ناقایلبوونە لەسەر ئەوەی دەنگیان لەسەر بدەن و روانگەی ئەو بڕیارانە هەمیشە جێگیرنەبووە. بۆیە دادگەکە گەیشتۆتە ئەو بەرئەنجامەی، کە ئەم بڕیارانە بنەمای بڕوابوون بە ئیلزامییەتی رەفتاریان نییە لە رووی رەوایی چەکی ئۆتۆمییەوە.

سەرەڕای هەموو ئەوەش پێویستە مرۆڤ لەو مەترسییە ئاگەداربێت، کە خۆی متداوە لە بەخشینی واتایەکی یاسایی بە هەموو ئەو بڕیارانەی لە لایەن کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەردەچن. چونکە زۆر جار بڕیارەکان تەنیا لە بەرئەنجامی سەوداکردن یان رێگەچارەگەلی سیاسییەوە دێن، لەم روانگەیەشەوە هەرگیز ئامانجیان ئەوەنییە نۆرمی یاسایی

---

16- ICJ Reports,1986 PP.14,102

مولزەم دروست بکەن. جا مەسەلەکە پێویستی بە پشوودرێژی هەیە بۆ جیاکاری لەنێوان ئەوەی، کە مومارەسەی سیاسی دووبارەن و ئەوی نۆرمی یاسایی دروستکراون.

هەرچی پێوەستیشە بە پراکتیکی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی ترەوە، دەکرێ هەمان هەڵوێست وەربگیرێ، بەڵام بە وریاییەکی زیاتر. دەکرێ بڕیارەکان وەکو بەڵگەیەك دابنرێن بۆ بوونی نۆرمێکی نەریتی یان وەکو پراکتیکێکی دووبارە، کە ئامانجی دروستکردنی نۆرمێکی نەریتییە، یان لە میانەیاندا بگەیتە بەرئەنجامی نۆرمی بڕوابوون بە ئیلزامییەتی ڕەفتار لەو بارودۆخەی پێیان ئالاوە، بەڵام بە وریاییەکی زۆر. هەندێ جار بەشێوەیەکی گشتی وا باوەڕدەکرێ، کە هەندێك لەو نۆرم و ئەحکامە نامولزەمانەی لە پەیمانەکاندا هاتوون جۆرێکی تایبەت پێکدێنن لە جۆرەکانی ئەو نۆرمانەی بە (یاسای نەرم) ناسراون. ئەم دەستەواژەیە بۆ ئەوە بەکاردێت وا بگەیەنێت، کە نۆرمەکە یان حوکمە پێوەندارەکە خۆی لە خۆیدا (یاسا) نییە، بەڵام پێگەیەکی گرینگی هەیە لە چوارچێوەی گشتی پێشکەوتنی یاسای نێودەوڵەتی، ئەمەش وا دەخوازێ بایەخێکی تایبەتی پێ بدرێ. ئەوەی پێویستە جەختی لەسەر بکرێ ئەوەیە، بۆ نموونە دۆکومێنتێك ئەوە ناخوازێ، کە برێتی بێ لە پەیماننامەیەکی ئیلزامی ئەوسا کاریگەری هەبێ بە سەر سیاسەتی نێودەوڵەتیدا. بەڵگەنامەی (هلسنکی) ساڵی ١٩٧٥ دیارترین نموونەیە بۆ ئەو شتە. ئەگەرچی ڕێککەوتننامەیەکی مولزەم نەبوو، بەڵام کاریگەرییەکی زۆری هەبوو بۆ جەختکردن لەسەر ڕۆڵ و گرینگیی مافی مرۆڤی نێودەوڵەتی لەناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی ئەورووپادا. لە هەندێك لە بوارەکاتی یاسای نێودەوڵەتیدا نۆرمەکانی "یاسای نەرم" بەو سیفەتەی بەرهەمی بەڵگەنامەگەلێکی گرینگن، بەڵام نامولزەمن. زیاتر کاردەکەن لە نۆرمەکانی تر، وەك یاسای ئابووریی نێودەوڵەتی و یاسای ژینگەی نێودەوڵەتی.[١٧] بەکارهێنانی ئەم جۆرە بەڵگەنامانە لەژێر هەر ناونیشانێکدا بن، ڕاسپاردە یان ڕێبەر، یان شێوەی مامەڵەکردن یان حوکم یان نۆرم، بایەخێکی گرینگیان هەیە بۆ ڕوونکردنەوەی پەرەسەندن و بۆ داڕشتنی چەند بنەمایەکی گشتیی بۆ گواستنەوەیان بۆ نۆرمی یاسایی مولزەم. ئەم بەڵگەنامانە گرینگ و کاریگەرن، بەڵام خۆیان لە خۆیاندا نۆرمی یاسایی نین.

لە یاداشتنامەی یاریدەدەری ڕاوێژکاریی یاسایی بۆ کاروباری پەیمان لە وەزارەتی دەرەوەی

17- P.Bririe and A.Boyle,Internationed Law and the Environment,Oxford,1992,P.26

ئەمەریکا سەبارەت بــە ڕێککەوتننامــە نێودەوڵەتییــە نامولزەمــەکانی نێــوان دەوڵەتەکانــدا هاتووە: ((مومارەسەی نێودەوڵەتی لە زووەوە دانیناوە بــەوەدا، کــە حکوومەتــەکان دەتــوانن ڕێکبکەون لەسەر بەیاننامەی هاوبەش، کە سیاسەت و هەڵوێستی خۆیانیــان تیابێــت، بــەبێ ئەوەی ئیلتیزاماتی یاسایی لێ بکەوێتەوە. لە دەیەکانی دواییدا ئەوە بووە شێوازێکی هاوبەش بۆ ڕاگەیاندنی بەرئەنجامی ئاڵوگۆڕی دیپلۆماتی و هەروا بووە هەڵوێستی هاوبەش سەبارەت بە مەسەلەی سیاسی و کــارە هاوبەشــە پروگرامکراوەکانیــان ســەبارەت بــە کێشــە پێوەندیــدارە هاوبەشەکان و ئەو هاوکارییەی لەنێوان یەکتردا دەیکەن. هەندێ جار وەکــو ڕێککەوتننامــەی نــامولزەم یــان ڕێککەوتننامــەی موجامەلــە ئــامێز Gentlements agreements یــان بەیاننامە یان ڕاگەیاندنی هاوبەش ئاماژە بەم دۆکومێنتانە دەدرێن)). [18]

لێرەدا دیاردەی بنبڕ لەبارەی سرووشتی یاسایی دۆکومێنت، لــەم حاڵەتانــە، ئــەو ســیفەتە نییــە کــە دۆکومێنتــە پێوەندیدارەکــەی پــێ وەســف دەکرێــت، بگــرە نیــازی ئــەو لایەنــە پێوەندیدارانەیە، کە دەردەخرێن لە بارودۆخی دەوروبەرەکەی، لەبارەی ئــەوەی ئایــا مەبەســتی پێکەوەنانی پێوەندیی یاسایی مولزەمە لەنێوانیان لەو بوارە پێوەندیدارە یان نا.

18- 88 AJIL,1994,PP.515

## باسی یەکەم

# چەمکی پەیمانی نێودەوڵەتی

مێژووی پەیمانە نێودەوڵەتییەکان (Tabua, contract) بۆ پێش پەیدابوونی کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتیی دەگەڕێتەوە. کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتی لە میانەی پەیمانە نێودەوڵەتییەکاندا پێکهات. ئێستە پێوەندییە پەیمانییەکان هەموو دەوڵەتەکان پێکەوە دەبەستن لە بوارە کۆمەڵایەتی و ئابووری و یاساییەکاندا. بەم مانەیەش ئەم میکانیزمە یاساییە نێودەوڵەتییە برێتییە لە شێوازێکی گرینگ بۆ رێکخستنی پێوەندییەکان لەنێوان دەوڵەتەکان و رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و گەل و نەتەوەکان. هەروەها پەیمان بەکارهێنراوە بۆ تۆمارکردنی مێژووی قۆناخەکانی شارستانێتی مرۆیی و رووداو و شۆڕش و پەیمان و هەرەسی ئیمپراتۆرییەتەکان و پەیدابوونی دەوڵەتە نوێیەکان و بونیادنانی پێوەندییە دۆستایەتییەکان. بەو پێیەش کە سەرچاوەیەکی بنەڕەتیی یاسای نێودەوڵەتییە پەیمان رۆڵێکی باڵای هەبووە بۆ پێکهاتنی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی هاوچەرخ.

### ١- چییەتی پەیمانی نێودەوڵەتی:

یاسای پەیمانە نێودەوڵەتییەکان برێتییە لەو لقە یاسایەی، کە پێکدێت لە کۆمەڵێك نۆرمی یاسایی نێودەوڵەتی، پێوەندیی نێوان دەوڵەتەکان و ئەودوای کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی رێکدەخەن لە رووی بەستن و کارپێکردن و کۆتایی پێهاتنی پەیمانی نێودەوڵەتییەوە. خودی پەیمانە نێودەوڵەتییەکان بابەتی پەیمانی نێودەوڵەتین. لەبەرئەوەی پەیمانی نێودەوڵەتی بایەخێکی گەورەی هەیە بەو پێیەی سەرچاوەیەکی بنەڕەتی یاسای نێودەوڵەتییە، ئەوا هەر گۆڕانکارییەك بەسەر ئەم لقەدا بێت، بەزەرووڕەت بەسەر لقەکانی تری یاسای نێودەوڵەتیدا رەنگدەداتەوە.

پێش ساڵی ١٩٦٩ نۆرمی نەریتی( عرف -Custom ) نێودەوڵەتی پێوەندییەکانی نێوان کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی تایبەت بە بەستنی پەیمانە نێودەوڵەتییەکان و کارپێکردنیان و کۆتایی پێهاتنیانی رێکدەخست. دەبینین رێکخراوی کۆمەڵەی گەلان لە رۆژی دامەزراندنییەوە

تا کۆتایی پێهاتنی چەندین هەوڵیداوە بۆ تۆمارکردنی نۆرمە نەریتییەکان و گۆڕینیـان بـەرەو نۆرمی پەیمانەکی"تعاهدی". ئەگەرچیش ئەو هەولانە سەریان نەگرت، بەلام بناخەی کارێکیان دارشت بۆ رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەم لایەنەوە. ئەوە بوو کۆمیتەی یاسـایی نەتـەوە یەکگرتووەکان چەندین پەیمانی نێودەوڵەتی گرینگی دارشت، کە دواتـر بوونـە سەرچـاوەیەکی گرینگی یاسای پەیمانە نێودەوڵەتییەکان پاش ئەوەی کۆمەڵەی گشتی نەتـەوە یـەکگرتووەکان پەسەندیانی کرد. گرینگترینیان ئەمانەن:

## ١- رێککەوتننامەی ڤیەننا لەبارەی پەیمانە نێودەوڵەتییەکان ساڵی ١٩٦٩:

ئەم رێکەوتننامەیە لە دیباجەکەیدا جەخت دەکاتـە سـەر رۆڵـی بنـەڕەتی پەیمانـەکان لـە مێژووی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا و بە زۆر گرینگییان دەزانێت وەك سەرچاوەیەکی یاسـای نێودەوڵەتی و هەروا وەك شێوازێك بۆ پەرەپێدانی هاوکاری ئاشتیانەی نێوان دەوڵەتـەکان، بـە بێ گوێدان بە جـۆری سیسـتەمی دەسـتووری و کۆمەلایـەتییان. جەختدەکاتـە سـەر ئـەوەی تۆمارکردن و پەرەسەندنی زیاتری یاسای پەیمانەکانی لـەم رێککەوتننامەیـەدا هاتوونەتـەدی، یارمەتی ئەو پرەنسیپانەی نەتەوە یـەکگرتووەکان دەدات، کـە لـە دسـتوورەکەیدا هـاتوون و ئەمانەن: پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی و پەرەسەندنی پێوەندی دۆسـتایەتی نێـوان دەوڵەتەکان و بەدیهاتنی هاوکاری نێودەوڵەتی.

رێککەوتننامەی ڤیەننای یاسـای پەیمانـە نێودەوڵەتییـەکانی سـاڵی ١٩٦٩ لـە بەسـتنی پەیمانە نێودەوڵەتییەکان و هاتنە واری کارکردنیـان وریزگرتنیـان و پراکتیزەکـردن و شـرۆڤە و هەموارکردن و گۆڕین و پووچەڵکردن و کۆتایی پێهێنان و وەستانی کارپێکردن و راستکردنەوە و تۆمارکردنیـان بـاس دەکـات و دەگرێتـەخۆ. ئـەو ئـەحکام و نۆرمـە فرەوانانـەی لـەم رێککەوتننامەیـەدا هـاتوون، وا دەکـەن ببێتـە سەرچـاوەی بنـەڕەتیی یاسـای پەیمانـە نێودەوڵەتییەکان.

## ٢- رێککەوتننامـەی ڤیـەننا بـۆ میراتگـری "خیلافـەتی" دەوڵەتـەکان state succession لەپەیمانە نێودەوڵەتییەکان ساڵی ١٩٧٨:

لەم رێککەوتننامەیەدا تۆمارکردن و پەرەپێدانی ئەو نۆرمـە یاسـاییانە ئەنجامـدران، کـە پێوەستن بە هەندێك لە لایەنەکانی خیلافەتی دەوڵەت لە پەیمانە نێودەوڵەتییە هەمەلایەنەکان.

ئــەم ڕێککەوتننامەیــە دۆکۆمێنتــە بونیادنــەرەکانی ڕێکخــراوە نێودەوڵەتییــەکان و ئــەو پەیماننامانەش دەگرێتەوە، کــە لــە چوارچــێوەی ڕێکخــراوە نێودەوڵەتییەکانــدا مــۆردەکرێن. جەختیش دەکاتە سەر گرینگیی خیلافەت وەك شێوازێك بۆ جێگیرکردنی بنەما یاسـاییەکانی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان.

## **٣- ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ ئەو پەیماننامانەی لەنێوانی دەوڵەتـەکان و ڕێکخـراوە نێودەوڵەتییەکان یان لەنێوان خودی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان دەبەسترێن ساڵی ١٩٦٨**

ئەم ڕێککەوتننامەیە ئەو پەیمانە نێودەوڵەتییانە دەگرێتەوە، کـە لـەنێوان دوەڵەتـەکان (دەوڵەتێك یاخود چەند دەوڵەتێك) و لەنێوان ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان (ڕێکخراوێك یـاخود چەند ڕێکخراوێك) یانیش لـەنێوان خـودی ڕێکخـراوە نێودەوڵەتییەکانـدا، مـۆردەکرێن. لـەو بەڵگەنامەنەش دەکۆڵێتەوە، کە دروستکەری ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانن و هەر پەیمانێکیش، کە لە چوارچێوەی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی دەبەسترێت، هەموو لایەنێکی پـەیمانی نێودەوڵـەتی لەم بوارە ڕێکدەخات، وەك مۆرکردن و کارپێکردن و پراکتیزەکردن و شرۆڤە و ڕزێـرڤ " **تحفـظ** резерв Reservation ". بە گشتی ئەم ڕێککەوتننامەیە بە تەواوکەری ڕێککەوتننامەی ڤیەننا سەبارەت بە یاسای پەیمانە نێودەوڵەتییەکانی ساڵی ١٩٦٩دادەنرێ.

لەبەرئەوەی پەیمانە نێودەوڵەتییەکان گرینگییان بە بەردەوامی لە زیادبووندایە، ئەوا یاسای نێوەخۆییش، بایەخێکی گەورە دەدا بە بەشـداریکردن تێیانـدا. دەبیـنین زۆرینـەی دەسـتوورە پێشکەوتووکان یان چەند ئەحکامێکی بنەڕەتی لەخۆدەگرن لەبارەی شێوازی بەستنی پـەیمان و پەســەندکردن و کــارپێکردن و تۆمــارکردن **و بڵاوکــردن**ــەوەیان، یــانیش هەواڵــەی یاســایەکی نێوەخۆیی تری دەکەن. ئەوەتا مادەی(٦١)ی دەستووری عێراقی هەمیشەیی ساڵی ٢٠٠٥ بـۆ نموونــە لــە بڕگــەی(٤)یــدا دەڵێــت: " پرۆســەی پەســەندکردنی پەیماننامــە و ڕێکەوتنــە نێودەوڵەتییەکان بـە یاسـایەك ڕێکـدەخرێت، کـە بـە زۆرینـەی ٣/٢ ی دەنگـی ئەنـدامانی ئەنجومەنی نوێنەرانەوە پەسەنددەکرێت" مادەی (٧٣)یـش لـە بڕگـەی دووەمیـدا دەسـەڵاتی ""پەســەندکردنی پەیماننامــە و ڕێکەوتنــە نێودەوڵەتییــەکان پــاش وەرگــرتنی ڕەزامەنــدی ئەنجومەنی نوێنەران" بەسەرۆك کۆمار داوە.

بــەڵام بڕگــەی شەشــەمی مــادەی (٨٠) دەســەڵاتی دانووســتاندن لەســەر بەڵێننامــە و ڕێکەوتننامــە نێودەوڵەتییــەکان و ئیمزاکردنیــانی داوە بــە ئەنجومــەنی وەزیــران. لــە بەشــی

چوارەمیش و لەبارەی ئەرکی دەسەڵاتە فیدراڵییەکان، مـادەی (١١٠) لـە بڕگـەی یەکەمیـدا ئەرکی" رەنگڕێژکردنی سیاسەتی دەرەوە و نوێنەرایەتی دبلۆماسی و ئەنجامدانی دانووسـتاندن لەسەر پەیمان و ڕێکەوتنە نێودەوڵەتییەکان و سیاسـەتی قـەرزکردن و واژۆکـردن لەسـەریان و یەکلاکردنەوە و رەنگڕێژکردنی سیاسەتە ئـابووری و بازرگانییـە دەرەکییـە سـەروەرییەکان"ی خستۆتە سەر شانی دەسەڵاتە فیدراڵییەکان.

پراکتیکی دادگـەی دادی نێودەوڵـەتی بۆمـانی روون دەکاتـەوە، کـە مەسـەلەی دانـانی بەڵگەنامەیەك لە بەڵگەنامەکان بە پەیمانی نێودەوڵەتی یان دانـەنانی بەرئـەنجامی پراکتیـزی گرینگی هەیە لە یاسـای نێودەوڵەتیـدا، وەك: دیـاریکردنی دەسـەڵاتی دادگـە سـەبارەت بـە سەیرکردنی کێشەکە. ئەگەر هەر بەڵگەنامەیەك، کە بابەتەکەی کێشەیەکی ناکۆکی لەسەر بێ و وەك پەیمان نەناسرێ، ئەوە دادگە بۆی نییە سەیری ئەو کێشەیە بکات.

پەیمانی نێودەوڵەتی برێتییە لە ڕێککەوتننامەیەکی راشکاوانە لەنێوان دوو یان زیـاتر لـە کەسـەکانی یاسـای نێودەوڵـەتی بـۆ ڕێکخسـتنی پەیوندییـەکان لەنێوانیانـدا لـە ڕێگـەی دروستکردنی یان هەمووارکردنی یان کۆتایی پێهێنانی ماف و پابەندبوونی بەرامبەری، بـەپێی یاسای نێودەوڵەتی.

لەبەر رۆشنایی ئەم پێناسەیە دەکرێ بگەینە ئەم دەرئەنجامانەی لای خوارەوە:

١- بە پێچەوانەی نەرێتی نێودەوڵەتییەوە، کە لە بەرئەنجامی رەزامەندیی بێدەنگی لە ڕێگەی ئەنجامدانی کاری وێکچووی یەك لە دوای یەکـەوە درووسـتدەبێت، پـەیمانی نێودەوڵـەتی ئەنجامی ڕێککەوتنێکە بە ڕێگەی دەرخستنی راشکاوانەی رەزامەندییەوە دێت.

٢- دەبێ ڕێککەوتن بکرێت لەنێوان دوو، یان زیاتر لە کەسەکانی یاسـای نێودەوڵـەتی واتـا دەوڵەتان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و گەلانی خەباتگێڕ لە پێناوی مـافی چـارەی خـۆ نووسین و قەوارە شێوە دەوڵەتییەکان. واتا ڕێککەوتن لەنێوان دەوڵـەت و کۆمپانیایـەکی بیانی بە پەیمانی نێودەوڵەتی ناژمێردری، بگرە بە گرێبەستێکی مەدەنی دادەنرێ.

٣ - دەبێ ئامانجی ڕێککەوتنی نێوان لایەنـەکان، ڕێکخسـتنی پێوەنـدی نێوانیـان بێـت لـە میانـەی دامەزرانـدن یـان هـەمووارکردن یـان کۆتـایی هێنـانی مـاف و ئیلتیزامـاتی هاوبەرامبەر. جا ئەگەر ئـەم ئامانجـە لـەئارادا نـەبێت، ئـەوا بـە پـەیمانی نێودەوڵـەتیی ناژمێردرێ.

٤ - دەبێ ڕێکخستنی ڕێککەوتننامەی نێوان لایەنـەکان بـەپێی یاسـای نێودەوڵـەتی بێـت،

تاوەکو ڕێککەوتننامەکە بە پەیماننامەی نێودەوڵەتی دابنرێ.

ئەو ماف و ئیلتیزامە بەرامبەرانەی ڕێککەوتننامەکە ئامانجییەتی دەبێ لە یاسای نێودەوڵەتیدا هاتبێتن. بۆ نموونە ناکرێ گرێبەستی کڕینی پارچە زەوییەك، بە گوێرەی یاسای شارستانی، بۆ بیناکردنی بالاخانەی باڵوێزخانەیەك لەسەری لە دەوڵەتێکی بیانیدا، بە پەیماننامەی نێودەوڵەتی دابنرێ، بەڵام کاتی خۆی فەرەنسا بە گوێرەی پەیمانێکی نێودەوڵەتی بەشێکی بچووکی لە هەرێمەکەی بە سویسرا فرۆشت بەمەبەستی فرەوانکردنی فڕۆکەخانەی جنێف . لەم بارەدا مەسەلەکە جیاوازە، چونکە فەرەنسا بە پەیمانێکی نێودەوڵەتی وازی لە بەشێکی سەروەری هەرێمیی خۆی هێناوە بۆ سویسرا.

دەوڵەتەکان بەپێی مادەی (٦)ی ڕێککەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان سەبارەت بە یاسای پەیمانەکان ساڵی ١٩٦٩، توانای یاسایی تەواویان بۆ بەستنی پەیمانی نێودەوڵەتی هەیە. وێڕای ئەوەش لە پراکتیکی نێودەوڵەتیدا چەندین پەیمانی نێودەوڵەتی دەبینین، کە شانبەشانی دەوڵەتەکان چەند قەوارەیەك تیایدا بەشداری دەکەن، کە توانای کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتییان نییە. لە نموونەی ئەم پەیماننامانەی بە پەیمانی تێکەڵاو یان ئاڵۆزیش دەناسرێن، ڕێککەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکانە بۆ سیستەمی مانگی دەسکردی تایبەتمەند بە پێوەندییە دەریاییەکانی ساڵی ١٩٧٦ و پەیماننامە پاشکۆکەی لەبارەی بەکارهێنانی ئەو مانگە دەسکردانەی، کە ڕێکخراوە نیشتمانییەکان لە هەندێ دەوڵەتاندا بەشداری تیادەکەن.[1]

ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانیش مافیان هەیە پەیمانی نێودەوڵەتی گرێبدەن بەپێی مادەی(٥)ی ڕێککەوتننامەی ڤیەننای ساڵی ١٩٨٦.

لەنێو ئەو ڕێکخراوە نێودەوڵەتییانەدا، ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان فرەوانترین توانای یاسایی هەیە بۆ گرێدانی پەیمانی نێودەوڵەتی لەگەڵ دەوڵەتەکان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان لە بوارەکانی ڕامیاری و مرۆڤایەتی و سەربازی.

بەڵام ئامانج و بابەتەکانی ئەو پەیماننامانەی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئاژانسە پسپۆڕییەکانی و ڕێکخراوە هەرێمییەکان دەیبەستن، پێویستە بگونجێن لەگەڵ ئەو ئەحکامانەی کە لە دۆکومێنتە دامەزرێنەرەکانیاندا هاتوون و لەگەڵ پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی، کە لە ڕێککەوتننامەی ڤیەننای ساڵی ١٩٨٦ هاتوون.

---

1- И. Владимировор;  Международно публично право, София. 2001,стр.80

هەر گەل و نەتەوەیەکی خەباتگێڕیش لە پێناو رزگاریـدا، بـەو پێیـەی کەسـێکی یاسـای نێودەوڵەتین، دەتـوانن پـەیمانی نێودەوڵـەتی ببەسـتن، بـە بـێ لەبەرچـاوگرتنی شـێوازی ئـەو داگیرکردنە بیانییەی کە ملکەچین، یاخود لە لایەن دەوڵەتەکانی ترەوە دانیانپێدانرابێ یان نا. بۆ نموونە رێکخراوی رزگاریخوازی فەڵەستین و رێکخراوی میللی باشـووری رۆژئـاوای ئـەفریقیا (سواپۆ) بەڵگەنامەی کۆتایی کۆنگرەی سێیەمی نەتەوە یەکگرتووەکانیان تایبەت بـە یاسـای دەریایی ساڵی ١٩٨٢ مۆرکرد بە ناوی هەردوو گەلی فەڵەستین و باشووری ئەفریقیاوە.

### ٢- جۆرەکانی پەیمانی نێودەوڵەتی:

مافی کەسی یاسایی بۆ بەشـداربوونی لـە پـەیمانێکی نێودەوڵەتیـدا بەسـتراوە بـە جـۆری پەیمانکەوە و ئەو بەرژەوەندییانەی دەیەوێ لە رێگەیەوە بە دەستی بێنێ.

پەیمانە نێودەوڵەتییەکان لە رووی ژمارەی بەشداربووانیانەوە دەکرێنە دوو بەشەوە: پـەیمانی دووقۆڵی و پەیمانی فرەلایەن. ئەمەی دواییشیان بەشەکانی پەیمانی جیهانی و پەیمانی هـەرێمی لێ دەکەونەوە. دەبینین بەپێی بەڵگەنامەی کۆتـایی کـۆنگرەی ڤیـەننای تایبـەت بـە یاسـای پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان کە لە ساڵی ١٩٦٩ بەسترا، پەیمانە گشتییە هەمەلایەنەکان برێتین لـەو پەیواتانـەی کـە ئامانجیـان تۆمـارکردن و پەرەسـەندنی پێشـکەوتنخوازییانەی یاسـای نێودەوڵەتییە و بابەت و ئامانجەکانیان جێی گرینگیپێدانی هەموو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییە و رێگـە والایـە بـۆ هـەموو کەسـەکانی یاسـای نێودەوڵـەتی بێنـە ریزیانـەوە، بـەڵام پەیمانـە هەرێمییەکان ئەوانەن، کە ژمارەیەکی دیاریکراو لە دەوڵەتەکان تیایدا بەشداری دەکـەن، وەك ئەو دەوڵەتانەی کەوتوونەتە ناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراو. دەبینین مادەی(٥٢) لە دەستووری نەتەوە یـەکگرتووەکان رێـی داوە بـە مـۆرکرنی پـەیمانی نێودەوڵـەتی هـەرێمی یـان دانـانی دەزگەگەلێکی هەرێمی نێودەوڵەتی.

هەموو دەوڵەتێك، چ دانیپێدا نرابێ یان نا، مافی یاسایی تەواوی هەیە لە بەستنی پەیمانی نێونەتەوەی گشتی یان تایبەت. هەر بوار نەدانێکیش لەپێش دەوڵەتەکاندا بۆ بەشداریکردن لە پەیمانێکی نێودەوڵەتی هەمەلایەندا، بە بیانووی ئەوە دانیپێدانەنراوە لەلایەن هەندێ دەوڵەتانی بەشداربوو، پێچەوانەی یاسـای نێودەوڵەتییـە، بـەڵام دەوڵەتـەکان لـە کـاتی مـۆرکردن یـان هاتنەریزی پەیماننامە نێودەوڵەتییە هەمەلایەنەکەوە، یان لە کاتی پەسندکردنی، بۆیان هەیـە رزێرڤی خۆیان تۆماربکـەن، کـە دان بـە دەوڵەتگـەلێکی بەشـداربوو نـانێن بـۆ ئـەوەی ئـەم

ڕەفتارەیان بەدان پێدانانێك دانەنرێ پێیان. لەم بارەشدا پەیماننامەکە بەرئەنجامی یاسایی لێ ناکەوێتەوە لەنێوان ئەو دەوڵەتەی رزێرڤەکەی تۆمارکردووە و ئەو دەوڵەتەی رزێرڤی لە بەرامبەرا تۆمارکراوە.

پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان تەنیا ئیلتیزامیان بەرامبەر لایەنە بەشداربووەکان لێ دەکەوێتەوە. وەك نۆرمێکی گشتیش پەیماننامە ئیلتیزام یان ماف ناخاتە ئەستۆی دەوڵەتانی تر بەبێ ڕەزامەندی خۆیان (مادەی (٣٤)ی یاسای تایبەت بە پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان). ناکرێتیش ئیلتیزام و مافی دەوڵەتەکانی تر بکرێنە بابەتی پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی. چونکە ئەو پەیماننامەیەی مافی دەوڵەتانی تر پێشێلدەکات بە نارەوا دەژمێردرێ، بەڵام دەکرێ بە بڕگەیەکی چەسپێنراو لە پەیمانەکەدا دەوڵەتێکی تر ببێتە خاوەن ماف ئەگەر لایەنەکانی پەیمانەکە نیازیانە بەو بڕگەیە ماف بدەنە ئەو دەوڵەتە یان کۆمەڵە دەوڵەتێك ئەو دەوڵەتەیانیشی تێدا بێت یان بە تێکڕای دەوڵەتەکان و دەوڵەتەکەی تر بەمە رازی بوو و ئەگەر کارێکی وای نەکرد نارازیبوونی لێ بوەشێتەوە، ئەوە بە رازیبوو دادەنرێ و ئەگەر پەیمانەکە شتێکی تری نەگوتبێت (مادەی ٣٦ لە یاسای پەیمانی نێودەوڵەتی). بۆ نموونە مادەی (یەك) لە ڕێککەوتننامەی سیستەمی دەریاوانی لە ڕووباری دوناڤ (دانوب) بۆ ساڵی ١٩٤٨، مافی دەریاوانی بازرگانی بە هەموو دەوڵەتەکان وەك یەك بەخشیوە.

بەپێی یاسای پەیمانە نێودەوڵەتییەکان دەکری نۆرمگەلێك کە لە پەیماندا هاتوون ببنە نۆرمی مولزەم لە ڕێگەی نەریتی نێودەوڵەتییەوە بۆ دەوڵەتانی لایەنی سێیەم. مادەیی(٣٨)ی یاسای پەیمانەکان جەخت دەکات، کە ئەو ئەحکامانەی لە یاسای پەیماننامەکاندا هەن ڕێگەناگرن نۆرمێك کە لە پەیمانێکدا هاتبێت، ببێتە مولزەم بۆ دەوڵەتێك، کە لایەن نییە تییدا بەو پێیەی ئەمە نۆرمێکی نەریتی ناسراوە لە نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی و بەم سیفەتەیشی دانپێدانراوە.

## باسی دووەم

## بەستنی پەیمانە نێودەوڵەتییەکان

شێوازێکی دیاریکراو نییە لە یاسای نێودەوڵەتیدا، کە پێویست بکات لایەنەکان پێڕەوی بکەن بۆ بەستنی پەیمانی نێودەوڵەتی. کردەکاری"اجراءات" بەستنی پەیمان و رێگەکانی، دەوەستنە سەر ئارەزووی لایەنەکانی و رێککەوتنیان.

پەیمان دەکرێ لەنێوان دەوڵەتەکان، یان حکوومەتەکان، یان سەرۆکەکانی وڵاتەکان، یان دەزگە حکومییەکاندا، ببەسترێ. بۆ نموونە زۆرینەی ئەو پەیواتانەی پێوەستن بە لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگەوە، لەلایەن دەزگە حکومییەکانەوە گرێدەدرێن، وەك رێککەوتننامەی بازرگانی.

### ١- دەسەڵاتپێدان (التفويض) ( Authorization )

بەپێی یاسای نێودەوڵەتی، دەوڵەتەکان توانای بەستنی پەیمانی نێودەوڵەتییان هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی دەوڵەت کەسێکی سرووشتی نییە تا بتوانێ گوزارشت لە ئیرادەی خۆیەتی خۆی بکات، نۆرمی تایبەت دانراوە، کە دەسەڵاتیان بە کەسەکان داوە نوێنەرایەتی دەوڵەت بکەن بۆ گرێدانی پەیماننامە بە ناویەوە. دەبێت ئەم جۆرە کەسانە دەسەڵاتی ((تەفویز))ی تەواویان پێ بدرێت بۆ قبوولکردنی دەقی پەیمانێك یان ئیعتمادکردنی یان بۆ دەربڕینی رەزامەندی دەوڵەت بۆ ئیلتیزامکردن پێوەی(مادەی (٧) لە یاسای پەیمانەکان).

دەسەڵاتپێدان (تفويض) واتا ئەو بەڵگەنامەیەی لە دەسەڵاتی پێوەندیداری دەوڵەتەوە دەردەچێ و ماف دەدات بە کەسێك یان کەسانێك نوێنەرایەتی دەوڵەت بکەن لە وتووێژێك بۆ قبوولکردنی پەیمانێك یان بەخشینی سیفەتی فەرمی پێی، یانیش لە دەربڕینی رەزامەندی دەوڵەتەکە بۆ ئیلتیزامکردن پێوەی، یان ئەنجامدانی هەر کارێکی تر پێوەست بێت بە پەیمانێکەوە. جا ئەم دەسەڵاتپێدانە وا دەکات لایەنی بەرامبەر دڵنیابێ لەوەی، کە هەڵدەستێ بە گرێدانی پەیمانێك لەگەڵ کەسانێکدا، کە دەسەڵاتیان پێدراوە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، بەڵام کەسانێك هەن بەنوێنەری دەوڵەتەکانیان دەژمێردرێن بەپێی ئەو ئەرك و پایانەی هەیانە بەبێ

ئەوەی پێویست بە پێشکێشکردنی دۆکومێنتی دەسەڵاتپێدان هەبێت. ئەو کەسانەش ئەمانەن:

أ- سەرۆکی دەوڵەتان و سەرۆکەکانی حکوومەت و وەزیرانی دەرەوە بۆ ئەو کارانەی کە پێوەستن بە بەستنی پەیمانێك.

ب- سەرۆکانی شاندە دیپلۆماتییەکان سەبارەت بە پەسندکردنی دەقی پەیماننامەیەك لەنێوان دەوڵەتی نێرەر و وڵاتی خانەخوێ.

ج- نوێنەرانی باوەڕپێکراوی دەوڵەتان لە کۆنگرەیەك یان ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی یان لقێکی لەبارەی پەسەندکردنی دەقی پەیماننامەیەك لەوێدا[٢].

ئەگەر کەسێك لە لایەن دەوڵەتەکەی خۆیەوە دەسەڵاتی پێ نەدرابێت وەك پێویست و بڕوات ئەنجامی ئەو رەفتارانەی پێوەندیدارن بە گرێدانی پەیماننامەیەك بدات، ئەوا ئەو رەفتارانە هیچ بەرئەنجامێکی یاساییان لێ ناکەونەوە ئەگەر دواتر روخسەت نەدرێن لە لایەن ئەم دەوڵەتەوە. ئەمە لە کاتی بەستنی ڕێککەوتننامەی دیاریکردنی جۆری پەنیر لە ساڵی ١٩٥١ روویدا. ئەوەبوو تەنیا نوێنەرێك لەجیاتی هەردوو دەوڵەتی سوید و نەرویژ مۆریکرد و دواجار دەرکەت تەفویزی پێ نییە، تەنیا لەلایەن نەرویژەوە نەبێ، بەڵام پاشان هەردوو دەوڵەت ڕێککەوتننامەکەیان پەسندکرد و چووە واری کارپێکردنەوە[٣].

## ٢- رەزامەندیی ئیلتیزامکردن بە پەیماننامەوە:

پەیمان دوای داڕشتنی لە لایەن وتووێژکارانی ڕێپێدراوەوە بە چەند قۆناخێکدا تێدەپەڕێ پێش ئەوەی ببێتە مولزەم بۆ لایەنەکان. جا ئەگەر دەوڵەتە وتووێژکارەکان بگەنە داڕشتنی پەیمان دەبێ بە رەزامەندی هەموو ئەو دەوڵەتانەی لە داڕشتنیدا بەشدارییان کردووە، دەقەکەی پەسندبکرێ، بەڵام ئەم مەسەلەیە جیاوازی هەیە ئەگەر لە کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتیدا بکرێ. ئەو کاتە پەیمانەکە بە زۆرینەی ٣/٢ی دەنگی دەوڵەتە ئامادەبووەکان لەکاتی دەنگداندا پەسنددەکرێ، ئەگەر بەهەمان زۆرینە بڕیارنەدرێت، کە نۆرمێکی جیاواز پێڕەوبکرێت. نەتەوە یەکگرتووەکان و زۆرینەی کونگرە نێودەوڵەتییە هەنووکەییەکان وەك نۆرمێکی گشتی ئەم شێوازە پێڕەودەکەن.

---

١- بڕگەی دوو لە ماددەی حەوتی یاسای پەیماننامەکان

3- See Yearbook of ILC، ،١٩٦٦ Vol ., p.195.

ژمارەیەکی زۆر لە رێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان، لـە رێگـەی ئـەو بڕیارانـەی نەتـەوە یەکگرتووەکان دەریان دەکات، پەسندکران وەك هەردوو پەیمانی تایبەت بە مـافی مـرۆڤ سـاڵی ١٩٦٦ و هەروا رێککەوتننامەی قەدەخەکردنی ئەشکەنجەدان ساڵی ١٩٨٤.

ئێستە بۆچوونێك هەیە بـەرەو پەسـندکردنی رێککەوتننامـەی نێودەوڵـەتی لـە کـۆنگرە هەنووکوییەکاندا بە رەزامەندی گشتی و پەنا نەبردن بۆ دەنگدان، ئەگەر هەموو هەوڵدانێك لە پێناو رێککەوتن بە رەزامەندی گشتی نەگیرێتەبەر.

رەزامەندی دەوڵەتە لایەنەکان لە پەیماننامەی پێوەندیداردا، بە فاکتەری بنەڕەتی دادەنـرێ بۆ بەستنی پەیماننامەکە. چونکە دەوڵەتەکان تەنیا ئیلتیزام بە رەزامەندی خۆیانـەوە دەکـەن. پەیماننامەکانیش لەم رووەوە بە گرێبەستێك دادەنرێن لەنێوان دەوڵەتەکاندا، ئەگەر رەزامەندی هەموو لایەنەکانی وەرنەگرێت، ناکرێ ئەحکامەکانی ئیلتیزامیان بخاتەسەر.

دەوڵەتەکان بە چەند شێوازێك گوزارشت لە ڕەزامەندی خۆیان دەکەن بۆ ئیلتیزامکردن بـە پەیمانێکی نێودەوڵەتییەوە. بەپێی مادەیی(١١)ی یاسـای پەیمانـەکان، دەوڵـەت بـۆی هەیـە ئیلتیزامکردنی بە پەیمانێکی نێودەوڵەتییەوە دەربڕێ بە ئیمزاکردن لەسەری یان بە گۆڕینەوەی ئەو بەڵگەنامانەی پێکیدێنن یان بە پەسندکردن یان بەقبووڵ یان بەقایلبوون یان بە هاتنەریزی یان هەر شێوەیەکی تر لەسەری رێك بکەون.

### ١- ئیمزاکردن (Signature)

دەوڵەت گوزارشت لە رەزامەندی خۆی دەکات، کە پابەنددەبێ بە پەیمانێك لە رێگەی ئیمزای نوێنەرەکەیەوە ئەگەر لە پەیمانەکەدا هاتبێ، کە ئیمزاکردن ئەو ئاسەوارەی دەبێ یان بەشێوەیەکی تر ئەگەر سەلمێنرا دەوڵەتی وتووێژکار رێککەوتووە لەسەر ئەوەی ئیمزاکردن ئەم ئاسەوارەی دەبێ یان ئەگەر نیازی دەوڵەتەکە روون بێ، کـە ئیمزاکـردن ئـەو ئاسـەوارەی دەبـێ لـە دۆکـومێنتی تەفویزکردنی نوێنەرەکەی یان لەکاتی وتووێژدا ئەوەی دەربڕیوە. هەروا ئیمزاکردن بە پیتی یەکەم لەسەر دەقی پەیمان بە ئیمزای پەیمانەکە دەژمێـردرێ ئەگـەر هـات و سـەلمێندرا، کـە دەوڵـەتی وتووێژکار لەسەری رێککەوتووە. ئیمزاکردنیش بە مەرجی گەڕانەوە بۆ دەوڵەت لەلایەن نوێنـەری دەوڵەتەوە، بە ئیمزای تەواو دادەنرێت ئەگەر هات و دەوڵەتەکە دواتر رازیبێت لەسەری[٤].

---

٤- ماددەی ١٢ لە یاسای پەیماننامەکان

ڕێککەوتننامەی چوارچێوەی گشتی بۆ ئاشتی لە بۆسنا و هرسەگۆڤینا بەپیتی یەکەم لـە ١٩٩٥/١١/٢١ لە دایتۆن ئیمزاکرا و لە ١٩٩٥/١٢/١٤ لە پاریس ئیمزای کۆتایی کرا.

لێرە دەبینین لەم ڕێککەوتننامەیەدا هەندێ کردەکاری نائاسـاییی گیراوەتەبـەر. بـۆ نموونـە تێیدا هاتووە، کە ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەکە بەپیتی یەکەم تەنیا لایەنـەکان پابەنـدناکات ئیمزای دەقەکانی ڕێککەوتننامەکە بکەن، بگرە تـەعبیر لـە ڕەزامەنـدییانیش دەکـات، کـە پێیەوە پابەندیش بن. کەچی مادەی(١١)ـەیش دەڵێت دەبێ بـە شـێوەیەکی ئۆتۆماتیکییانـە ئەم ڕێککەوتننامەیە جێبەجێ بکرێت دوای ئیمزاکردنی. هەرچەندە ڕازیبوون بە پابەندبوون بە پەیمان لە ڕێگەی پەسندکردنییەوە ناسراوترین ئامرازی بەکارهێنراوە لە کاری ڕۆژانـەدا، بـەڵام ڕەزامەندیی پابەندبوون لە ڕێگەی ئیمزاوە هێشـتا هەنـدێ لایـەنی گـرینگ لـەخۆدەگرێ بـە تایبەتی ئەگەر زانیمان کە سووربوون لەسەر ئەوەی پـەیمان سـیفەتی پابەنـدبوونی هەیـە دوای پەسندکردن بارێکی قورس دەخاتە سەرشانی دەزگە کارگێڕییە حکومییـەکان و دەبێتـە هـۆی دواکەوتنێکی زۆر، بەڵام ڕەزامەندیی پابەندبوون بە پەیمان لە ڕێگەی ئیمزاوە لەگەڵ ڕێکارییـە پێویستەکاندا دەگونجێ و لە کاریگەریی سیاسەت بۆ سەر پەیمان کەم دەکاتەوە.

پرۆسێسی ئیمزاکردنی پەیمان کارێکە لە کارە ڕەسمییە تەواوەکان، بۆیە زۆرجـار سـەرۆکی دەوڵەت ئیمزای پەیمانی نێودەوڵەتی گـرینگ دەکـات لـە ڕێـورەسمێکی تایبەتیـدا، بـەڵام لـە ڕێککەوتننامە فرەلایەنەکاندا، خولێکی تایبەتی ڕێك دەخرێت تێیدا نوێنەرە ڕاسپێردراوەکانی لایەنەکان ئیمزای پەیمانەکە دەکەن.

کاتێك پەیمان قبوولّ دەکرێ، یـان پەسـنددەکرێ یـانیش ڕەزامەنـدیی لەسـەر وەردەگـیرێ ئیمزاکردن تەنیا دەبێتـە پرۆسێسـێکی ڕواڵـەتی و وا دەگەیـەنێ، کـە نوێنـەری دەوڵەتـەکان ڕازیبوونە لەسەر دەقێك و دەینێرن بۆ حکوومەتەکانیان تاوەکو بڕیاری پێویست بدەن ئایا پێی ڕازین یان نە. لەم حاڵەتانـەدا و لـە کـاتی چـاوەڕێکردنی پەسـندکردن یـان قبـووڵکردن یـان ڕەزامەندیی دەوڵەت پابەنددەبێ، هیچ کـارێکی وا نـەکات، کـە ئامانجەکـەی پووچـەڵکردنی مەبەستی پەیمانەکە بێت تاوەکو نیازی ئاشکرای خۆی دەردەبڕێ بەرامبەر پەیمانەکە[٥].

هەندێ جار ڕەزامەندی پابەندبوون بە پەیمان بە ڕێگەی گۆڕینـەوەی دۆکـومێنتی تایبـەتی وەك ئەو حاڵەتەی لەم دۆکومێنتانەدا دێت، کە گۆڕینەوەیان ئەم ئاسەوارەی دەبێت یان ئەگـەر

---

٥- ماددەی ١٨ لە یاسای پەیماننامەکان

سەلمێندرا ئـەم دەوڵەتانـە ڕێککـەوتوون لەسـەر ئـەوەی گۆڕینـەوەی ئـەم دۆکومێنتانـە ئـەم ئاسەوارەی دەبێ.

## ٢- پەسندکردن ( التصديق Ratification )

لە ڕەورەوەی مێژوودا ئـەو ڕێگەیـەی دەسـەڵاتە پێوەندیـدارەکانی دەوڵـەت دەیگرنەبـەر سەبارەت بە پەسەندکردنی پەیمان جێگیربوو بە مەبەستی دڵنیابوون، کە نوێنەری دەوڵەت ئـەو دەسەڵات و ڕێنماییانەی دراوەتێ دەرباری بەستنی ڕێککەوتننامەیەکی دیاریکراو، نابـەزێنی. ئەگەرچی پەسندکردنی پەیماننامە یان قبووڵکردنی لە رابوردوودا، ئەرکێك بووە لە ئەرکەکانی سەروەری، بەڵام لەم سەردەمەدا بۆتـە شـێوازێك لـە شـێوازەکانی چاوەدێری دەسـتووری لـە دەوڵەتدا.

هەم لە ئاستی ناوەخۆیی و نێودەوڵەتیشدا ئەو ماوەیەی، کە دەوڵەت چاوەڕێ دەکات بـەر لەوەی پـەیمان پەسـندبکات و ببێتـە بەڵگەنامەیـەکی مـولزەم زیـادیکردووە. دەبیـنین دوای تـەواوبوونی پرۆسێسـی وتووێـژکردن، مـاوەی نێـوان ئیمزاکردنـی پـەیمان و پەسـندکردنی، بەکاردەهێنرێ بۆ هەڵسەنگاندنی ئەوەی لەسەری ڕێککەوتوون. ئەم شێوازە رەچـاوکراوە بۆتـە پرسێکی گرینگ نەخاسمە لە (١٥٠) ساڵی دواییدا پاش ئەوەی گۆڕانکارییە سیاسییەکان لـەو ماوەیە کاریگەرییان کردۆتە سەر پەرەسەندنی رۆڵی تاکەکان لە کاروبارە گشتییەکاندا.

لە هەنـدێ بـاردا، رای گشـتی نـاوەخۆیی دژ بـە نـاوەڕۆکی پـەیمانی ئیمزاکـراو لەلایـەن نوێنەرانی دەوڵەتەوە، کاردەکاتە سەر هەڵوێستی نەرێنیی دەوڵەت بەرامبەر بـە پەسـندکردنی پەیمانی پێوەندیدار. واتە پەسندکردنی رەتدەکاتەوە، ئەویش بـە تـەماحی ئـەوەی رای گشـتی نێوەخۆیی بۆ بەرژەوەندی خۆی راکێشێ.

بنەماکانی پەسندکردنی پەیماننامەی نێودەوڵەتی بەپێی دەوڵەتەکان جیاوازییـان لەنێوانـدا هەیە. بۆ نموونە لەبەریتانیادا ئەگەرچی دەسەڵاتی پەسندکردنی پەیمانی نێودەوڵـەتی یەکێکـە لەو مافانەی، کە تەنیا دەسەڵاتی شاژنە، بە پراکتیك وا پیادەکراوە ئەو پەیواتانەی دەبنە هۆی گۆڕینی یاسای نێوەخۆیی یان ئیلتیزامی دارایی حکوومەت زیاد دەکەن یان کاریگەرییان دەبێ بەسەر مافی هاووڵاتیانی بەریتانیادا، پێش پەسندکردنیان دەبێ هەواڵەی پەرلەمان بکرێن. لـە بەریتانیا نۆرمێك هەیە پیێ دەڵێن Ponsonby Rule وا دەخوازی ئەو پەیمانەی دەخرێنە بەر پەسندکردن لە پەرلەماندا بەلانی کەم بۆ مـاوەی ٢١ رۆژ بمێننـەوە بـەر لـەوەی بـە کردەیـی

پەسندبکرێن. بە گشتیی پرسی چۆنێتی پەسندکردنی پەیمانی نێودەوڵەتی و ئەو لایەنەی دەیکات، پرسێکی ناوەخۆییە و لە دەسەڵاتی یاسای ناوەخۆیی هەر دەوڵەتێکە و یاسای نێودەوڵەتی کاری پێوەی نییە.

مادەی (١٤)ی رێککەوتننامەی ڤیەننای تایبەت بە یاسای پەیمان بۆساڵی **١٩٦٩** لە دەقەکەیدا جەختی کردووە، کە دەوڵەت گوزارشت دەکات لە رازیبوونی ئیلتیزامی بە پەیمان بە پەسندکردنی لە حاڵێکدا ئەگەر پەیمانەکە خۆی بڵێت پەسندکردن شێوازی دەربڕینە لە رازیبوون یان ئەگەر بەشێوازێکی تر دەرکەوت، کە دەوڵەتی وتووێژکار رێککەوتبوو لەسەر مەرجی پەسندکردن یان ئەگەر نوێنەری دەوڵەت ئیمزای پەیمانەکەی کردبێ لەگەڵ رزێرڤ بە مەرجی پەسندکردن، یان ئەگەر وا دیاربوو نیازی دەوڵەتی پێوەندیدار ئیمزاکردنی بە مەرجی پەسندکردنی دواتر بێت لە بەڵگەنامەی تەفویزی نوێنەرەکەی، یانیش ئەگەر لەکاتی وتووێژدا ئەوە دەربڕی[٦].

لەم چوارچێوەیەدا جیاوازییەك هەیە لەبارەی جۆری ئەو پەیواتانەی پێویستیان بە پەسندکردن هەیە. هەندێ لە یاساناسان پێیان وایە، پەسندکردن تەنیا لە حاڵەتێکدا پێویستە، کە لایەنەکانی پەیمان بە راشکاوی نیازیان پەسندکردن بێت. بەریتانیا ئەم هەڵوێستە پیادەدەکات لە پەسندکردنی پەیماننامەدا، بەڵام لایەنی دیکەش هەن پێیانوایە پەسندکردن پێویستە ئەگەر دەقی پەیمانەکە جەخت نەکاتە سەر پێچەوانەی ئەوە[٧]. بۆ نموونە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تەنیا جۆرێك لە جۆری پەیماننامەکان لە پەسندکردن دەردێنێ، ئەویش رێککەوتننامەی جێبەجێکارییە executive agreements.

پاش تەواوبوونی پەسندکردن، پەڕاوی پەسندکردن، لە پەیماننامە دووقۆڵییەکاندا، دەگۆردرێنەوە، بەڵام لە پەیماننامەی بەکۆمەڵدا لایەنێك لە لایەنەکانی پەیماننامەکە رادەسپێردرێت، لە لایەن هەموو لایەنەکانی ترەوە، بۆ وەرگرتنی پەڕاوی پەسندکردن و راگەیاندنی بە هەموو لایەنەکانی تر. بۆیە پێویستە لەسەر لایەنەکان پەڕاوە پەسندکراوەکان

---

6- Sinclair I، The Vienna Convention on The Law of Treaties, 2end ed , Manchester.1984 , P.40 and D. P. O'Connell, Intentional Law 2ed, VOL 1.London,1970, p.222

7- A. D McNair ،the Law of Treaties، Oxford. 1961 p.133

بدەن بەو لایەنەی رایانسپاردووە، بەڵام ئێستە بە پراکتیك وا باوە پەڕاوی پەسندکردن لای سکرتاریەتی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دابنرێن.

دەربڕینی رازیبوون بە ئیلتیزامکردن بە پەیمانەوە دەکرێ لە رێگەی قبوولکردن یان قایلبوون لە چەند حاڵەتێکی هاوشێوەی حاڵەتی پەسندکردن بێت. دەبینین هەردوو دەستەواژە، کە لە مادەی (١١) و برگە(٢)ی مادەی(١٤) هاتوون، زۆر نیزیکن لە دەستەواژەی پەسندکردن، بۆیە ئەو ئەحکامانەی لەو حاڵەتانەدا پراکتیزەدەکرێن بە حاڵەتی پەسندکردن دەچن. بۆیە دەکرێ بلێین ئەو قبووڵ و رازیبوونەی لە رێککەوتننامەکەدا هاتوون سادەترین جۆری پەسندکردنن.

### ٣- هاتنەڕیز (الانضمام):

دەربڕینی رازیبوون بە ئیلتیزامکردن بە پەیمان دەکرێ بە هاتنەریزەوەش بێت. ئەمە شێوازێکی ئاساییە بۆ هاتنی لایەنێك بۆ ریزی پەیمان، کە ئیمزای لەسەر نەکردبێ. دەبینین دەقی مادەی (١٥) لە رێککەوتننامەی یاسای پەیماننامەکان دەڵێت، دەکرێ دەربڕینی رازیبوون لە رێگەی هاتنەڕیزی پەیماننامەوە بێ، لە حاڵێکدا ئەگەر دەقی پەیماننامەکە جەخت بکاتە سەر ئەوەی کە دەربڕینی رازایبوونی ئەم دەوڵەتە لە رێگەی هاتنەریزەوە بێت، یان ئەگەر دەرکەوت بەشێوازێکی تر دەوڵەتی خاوەن وتووێژکار پێشتر رێککەوتووە لەسەر مەرجی هاتنەڕیز سەبارەت ئەم دەوڵەتە وەك شێوازێکی دەربڕین لە رازیبوونی ئیلتیزامی بە پەیماننامەکەوە، یان ئەگەر هەموو لایەنەکان دواتر رێکبکەون لەسەر ئەوەی، کە دەربڕین لە رازیبوونی ئەم دەوڵەتە بەئیلتیزامکردن بە پەیماننامەوە لە رێگەی هاتنەریزەوە بێت.

پەیماننامە گرینگە هەمەلایەنەکان، زۆر جار رێگە بەهەندێ قەوارەی دیاریکراو دەدەن دواتر بێنە ریزی پەیماننامەوە. بۆ نموونە پەیمانەکانی جنێڤ سەبارەت بە دەریا بۆ ساڵی ١٩٥٨، رێیداوە بە دەوڵەتە ئەندامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئاژانسە پسپۆرییەکانی بێنە ریزییەوە.

### ٣- رزێرڤکردن " التحفظ " Reservation

برگەی (د) ی مادەی(٢) لە رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ یاسای پەیمانەکان دەڵێت: ((رزێرڤ راگەیاندنێکە یەکلایەنە دەوڵەتێك بە هەر شێوازێك یان ناوێك بێت دەریدەکات لە کاتی

ئیمزاکردنی پەیماننامەیەك یان پەسەندکردنی یان قبوولکردنی و رازیبوون لەسەری یان چوونەریزی، لە پێناو هەموارکردنی یان دوورخستنەوەی کاریگەریی یاسایی هەندێ ئەحکامی دیاریکراوی ئەم پەیماننامەیە، لە رووی جێبەجێکردنییەوە بە سەر ئەم دەوڵەتەدا. واتە دەوڵەت لەسەر زۆرینەی پەیمانەکە رازی دەبێ تەنیا حوکمێك یان چەند حوکمێ نەبێ، لەبەر چەند هۆیەکی دیاریکراو، نایەوێ ئیلتیزامیان پێوە بکات، بەلام ئەودوای پەیماننامەکە قبوول دەکات. بەم شێوەیە دەوڵەت بەدەرکردنی هەندێك لە ئەحکامەکان، دەتوانێ قبوولی ئیلتیزام بکات بەپەیمانێکەوە، بەلام ئەگەر ئەم شێوازە نە بوایە، ئەوا دەبوایە دەوڵەت تێکڕای پەیماننامەکەی رەتبکردایەوە.

ئەم شێوازە، سوودێکی گەورەی هەیە، نەخاسمە لە پەیمانی هەمەلایەندا، چونکە ژمارەیەکی زۆرتر لە دەوڵەتەکان رازی دەکات بۆ قبوولکردنی پەیمانی پێشنیارکراو. بۆیە دەکرێ بڵێین ئەوە وەك شێوازێکە بۆ هاندانی هەماهەنگی و گونجان لەنێوان دەوڵەتە خاوەن سیستەمە کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسییە جییاوازەکاندا و وەك یارمەتییەکیشە بۆیان بۆ تەرکیزکردن لەسەر ئەو مەسەلە گەوهەرییانەی لەسەریان رێکدەکەون و بەلاوەنانی ناکۆکی لەمەڕ ئەوکێشانەی لەسەریان جیاوازن.

مافی دەوڵەتەکان لە رزێرڤ بەرامبەر بە پەیمانی نێودەوڵەتی لە پرەنسیپی سەروەریی دەوڵەتەوە سەرچاوەی گرتووە، بۆیە دەوڵەتەکان دەتوانن رەزامەندی نەدەن لەسەر هەندێ ئەحکام بە شێوەیەك مولزەم نەبن بەرامبەریان. رێگەدان بە داڕوخانی پەیمان لە رێگەی پیادەکردنی رزێرڤ لە لایەن کۆمەڵێکی زۆر لە دەوڵەتەکانەوە، تێکڕای پیادەکردنی رزێرڤ دەخاتە مەترسییەوە و رەنگە مەبەست لە گرێدانی پەیمانەکە پووچەڵ بکاتەوە و ببێتە هۆی وروژاندنی هەندێ کێشە لە پێوەندیی نێوان دەوڵەتەکاندا.

لە حاڵەتی پەیمانە دووقۆڵییەکاندا، ئەو جۆرە کێشانە سەرهەڵنادەن. چونکە رزێرڤی یەکێك لەو دوولایەنە بەرامبەر بە پڕۆژەی پەیمانەکە وا دەخوازێ دووبارە بگەڕێنەوە بۆ وتووێژ، چونکە ناکرێ وێنای بوونی رێککەوتننامەیەك لەنێوان دوولایەن بکرێ لە کاتێکدا یەك لەو دوولایەنە نایەوێ لەسەر هەندێ لە ئەحکامی پەیمانەکە رازی بێ. ئەو حاڵەتە لە پەیمانە بە کۆمەڵییەکاندا، بەم شێوەیە نییە. لێرەدا هەر دەوڵەتێك بۆی هەیە بە تەنیا بەرهەڵستی هەندێ ئەحکامی دیاریکراو بکات لە رێگەی دەرخستنی ئارەزووی بۆ دوورخستنەوەی تێکڕای یان تێگەیشتنی خۆی بۆی بە شێوازێکی دیاریکراو بخاتەڕوو.

دەبێ جیاوازی بکرێ لەنێوان رزێرڤ و هەندێ لەو هەڵوێستانەی دەگیرێنەبەر بەرامبەر بە پەیمانێك بەبێ ئەوەی مەبەست ئەو ئەسەرانە بێت، کە لە رزێرڤ دەکەونەوە، وەك یاداشتی لێکحاڵیبوون و لێدوانی سیاسی، یان ئەو راگەیاندن شرۆڤە ئامێزانەی، کە مەبەست لێیان خولڦاندنی ئەسەری مولزەم نییە بەرامبەر بە پەیماننامەی پێوەندیدار، بگرە بە زۆری گرتنەبەری هەڵوێستێکی سیاسییە بەرامبەر کێشە ناوەخۆییەکان.

لەم حاڵەتانەدا دەوڵەت ناکرێ رزێرڤ بەرامبەر بە پەیمان بنوێنێ:

١- ئەگەر رزێرڤکردن لە پەیمانی پێوەندیداردا قەدەخەبێ.

٢- ئەگەر پەیمانی پێوەندیدار رێ بەچەند رزێرڤێکی دیاریکراو بدات و ئەو رزێرڤە تێیاندا نەبێ.

٣- ئەگەر رزێرڤەکە پێچەوانەی بابەت و مەبەستی پەیمانەکە بێت.

رزێرڤ و قبوولکردنی راشکاوانەی و بەرهەڵستیکردنی، دەبێ بە نووسین بکرێ و بنێردرێ بۆ دەوڵەتە لایەنەکان و دەوڵەتەکانی تر، کە مافیان هەیە ببنە لایەن لە پەیماننامەکەدا. ئەگەر لە کاتی ئیمزاکردنی پەیمان رزێرڤکرا بەمەرجی پەسندکردن یان قبوولکردن یان قایلبوون، ئەوە پێویستە لەسەر دەوڵەتی خاوەن رزێرڤ بە فەرمی جەخت بکاتە سەری لە کاتی دەربڕینی رەزامەندی ئیلتیزامکردن بە پەیماننامەکە. رزێرڤ لەم حاڵەتەدا وا دادەنرێ، کە لە مێژووی دەرچوونی ئەم جەختکردنەوەوە تەواوبووە (بڕگەی ١ و ٢ لە مادەی (٢٣)ی رێککەوتننامەی ڤیەننای تایبەت بە یاسای پەیماننامەکان بۆ ساڵی ١٩٦٩.

ئەو رزێرڤەی پەیمان بە راشکاوی رێی دەدات، پێویست بە هیچ قبوولکردنێکی دواتر ناکا لەلایەن دەوڵەتە لایەنەکانی ترەوە، ئەگەر پەیمانەکە دەقێکی پێچەوانەی ئەوەی تیا نەبێ. ئەگەر لە ژمارەی سنوورداری دەوڵەتە وتووێژکارەکان و لە بابەتی پەیمانەکە و مەبەستەکەی دەرکەوت، کە کارپێکردنی تێکڕای بڕگەکانی پەیماننامەکە لە لایەن تێکڕای لایەنەکانەوە مەرجی بنەڕەتییە بۆ رازیبوونی هەر یەکەیان بە ئیلتیزامکردن بە پەیماننامەکەوە، ئەوا هەر رزێرڤێك پێویستی بە قبوولکردنی هەموو لایەنەکانە، بەڵام ئەگەر پەیماننامەکە ئامرازێکی پێکهێنەر بێت بۆ رێکخراوێکی نێودەوڵەتی، ئەوە رزێرڤەکە پێویستی بە قبوولکردنی لقە تایبەتەکە هەیە لەم رێکخراوەدا، ئەگەر پەیماننامەکە دەقێکی تیا نەبێ پێچەوانەی ئەوە بێت.

رزێرڤ هەندێ بەرئەنجامی یاسایی گرینگیان لێ دەکەوێتەوە. دەبینین رزێرڤ لە روانگەی دەوڵەتە رزێرڤکارەکانەوە لە پێوەندییەکانیاندا لەگەڵ لایەنەکەی تر، ئەو پەیماننامەیە هەموار

دەكات، كە رزێرڤەكە لەبارەیەوە هاتووە و لە سنووری هاتنی تیایدا، هەروا ئەم دەقانە لە هەمان سنوور سەبارەت بە لایەنەكەی تر لە بەرامبەر دەوڵەتی رزێرڤكار هەمواردەكات، بەڵام رزێرڤ هەمواركردنی دەقەكانی پەیماننامەی لێ ناكەوێتەوە بەرامبەر لایەنەكانی تری پەیماننامەكە لە پێوەندییەكانیاندا لەگەڵ یەكتر، بەڵام ئەگەر دەوڵەتێك بەرهەڵستی بكات لە رزێرڤێك، كە لە لایەن دەوڵەتێكی ترەوە كرابێ و بەرهەڵستی نەكات لەسەر كارپێكردنی پەیماننامەكە لەنێوانی خۆی و دەوڵەتی خاوەن رزێرڤ، ئەوا دەقەكانی كە رزێرڤیان لەسەرە لە سنووری ئەم رزێرڤە پیادەنابێ لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا.

ئەو دەوڵەتەی رزێرڤی پێشانداوە دەكرێ رزێرڤەكەی بكێشێتەوە، لەهەر كاتێكدا بێ. بۆ تەواوبوونی كێشانەوەكەش رەزامەندی ئەو دەوڵەتەی رزێرڤی قبووڵكردووە، مەرج نییە، هەروا ئەو دەوڵەتانەی بەرهەڵستییان كردووە لەسەر رزێرڤ، دەكرێ هەركاتێك بیانەوێ بەرهەڵستی خۆیان بكێشنەوە. كێشانەوەی رزێرڤ و كێشانەوەی بەرهەڵستیش لەسەری، ئاسەواریان نابێ ئەگەر دەوڵەتی پێوەندیدار لەم بارەیەوە ئاگەدارنەكرێتەوە.

### ٤- سپاردن و تۆماركردنی پەیماننامە:

**(Deposit and registration of treaties إيداع وتسجيل المعاهدات)**

دەوڵەتە وتووێژكارەكان دەقێكی ئەو پەیماننامەیەی گرێیدەدەن دەسپێرن بە لایەنێك، كە خۆیان دەستنیشانی دەكەن و دەكرێ ئەویش یەك دەوڵەت بێ یان زیاتر، یان رێكخراوێكی نێودەوڵەتی یان سەرۆكە كارگێڕییەكەی بێت. مەبەستیش لە دەسنیشانكردنی ئەوەیە كە وێنە ئەسڵەكەی پەیمانە نێودەوڵەتییەكە و هەموو دۆكومێنتە پێوەندیدارەكانی دی وەك بەیاننامە و رزێرڤ و یاداشتی پەسندكردن و پەراوی قبووڵكردن و هاتنەڕیزی لەلا هەڵگیرێت.

كاتێ لایەنی سپاردن چەند دەوڵەتێك بێت، وەك ئەوەی لە پەیماننامەی قەدەخەكردنی چەكی ئەتۆمیدا لە ئاسمان و بۆشایی دەرەوە و لەژێر ئاوی ساڵی ١٩٦٣ دایە. ئەم پەیماننامەیە ٣ دەوڵەتی دەسنیشان كرد بۆ وەرگرتنی پەراوەكانی سپاردن. برێتیبوون لە ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا و بەریتانیا ویەكیەتیی سۆڤێت. لەم حاڵەتە دەكرێ پەراوە پێوەندیدارەكان بە یەكێك لەو دەوڵەتانە بسپێردرێن.

لە حاڵەتێكدا ئەگەر پەیمانەكە یان دەوڵەتانی لایەن، ئەركی لایەنی سپاردنیان بە روونی و راشكاوی دیاری نەكردبێ ئەوە دەبێ بگەڕێنەوە بۆ رێككەوتننامەی ڤیەننای ١٩٦٩، كە

ئەرکەکانی لایەنەکانی سپاردنی پەیمانی نێودەوڵەتی دیاریکردووە. ئەو ئەرکانەش ئەمانەن:

١- هەڵگرتنی وێنە ئەسڵەکەی پەیمانەکە و ئەو پەڕاوە تەفویزانەی پێیان دراوە.
٢- گرتنەوەی وێنەی دەقاودەقی باوەڕپێکراو لە وێنە ئەسڵەکە و وەرگێڕانی بۆ بەزمانی تر و ناردنیان بۆ لایەنەکان و ئەو دەوڵەتانەی، کە مافیان هەیە ببنە لایەن لە پەیمانەکەدا.
٣- وەرگرتنی هەرچ ئیمزایەك، کە دێ لەسەر پەیماننامەکە و وەرگرتن و هەڵگرتنی هەرچ راگەیاندن و نامە و دۆکومێنتێکی پێوەندیدار هەیە.
٤- نۆڕینی ئەو ئیمزا یان دۆکومێنت یان ئاگەدارکردنەوە یان راگەیاندن و نامانەی پێوەندیدارن بە پەیماننامەکەوە بۆ دڵنیابوون لە تەواوی و دروستییان و سەرنجڕاکێشانی دەوڵەتی پێوەندیدار بۆ ئەو مەسەلەیە ئەگەر پێویستی کرد.
٥- ناردنی زانیاری لەبارەی ئەو رەفتار و بەیاننامە ئاڵوگۆڕکراوانەی پێوەندییان هەیە بە پەیمانەکەوە بۆ ئەو دەوڵەتانەی، کە مافیان هەیە ببنە لایەن لە پەیمانەکە.
٦- زانیاری دەداتە ئەو دەوڵەتانەی کە مافیان هەیە ببنە لایەن لە پەیماننامەکە لەبارەی ژمارەی ئیمزاکان یان دۆکومێنتی پەسندکردن یان قبووڵکردن یان ڕەزامەندیکردن یان هاتنەریز، کە پێویستن بۆ ئەوەی پەیماننامەکە بچێتە واری کارپێکردنەوە.
٧- تۆماکردنی پەیماننامە لای سکرتاریەتی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان.

### ٥- زمانی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان:

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بۆ بەستنی پەیمانی نێودەوڵەتی، زمانی لاتینی بەکاردەهێنرا، بەڵام لەسەدەی هەحدەمینەوە زمانی فەرەنسی جێی زمانی لاتینی گرتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، زمانی ئینگلیزی هەڵکشایە ئاستی زمانی فەرەنسی. بەمەش ئەو نەریتە نێودەوڵەتییە وەلاوە نرا، کە وای دەخواست پەیمانی نێودەوڵەتی بە زمانێکی قبووڵکراوی نێودەوڵەتییانە دابڕێژرێت.

یاسای نێودەوڵەتی هاوچەرخ نۆرمی مولزەمی تێدا نییە لەبارەی بەکارهێنانی چەند زمانێکی دیاریکراو بۆ بەستنی پەیمانی نێودەوڵەتی. دەبینین زۆر جار پەیمانی دووقۆڵی بە هەردوو زمانی هەردوو لایەنی گرێبەست دادەڕێژرێ لەگەڵ جەختکردن لەسەر ئەوەی، کە هەردوو دەقەکە بە هەردوو زمانەکان ئەسڵن و هەمان توانای یاساییان هەیە.

پەیمانە نێودەوڵەتییە هەمەلایەنەکان، دەکرێ بەیەکێك لە زمانە فەرمییەکانی نەتەوە

یەکگرتووەکان یان بە هەموو زمانەکانی لایەنەکانی خاوەن گرێبەست دابڕێـژرێن. بـۆ نموونـە ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە پاراستنی باڵندەی ساڵی ۱۹۵۰ بە زمانی فەرەنسـی داڕێژراوە، کەچی سیستەمی نێوەخۆیی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی بە زمانەکانی فەرەنسی وئینگلیزی و رووسی و ئیسپانی و چینی دانراوە.

مەسەلەیەکی تریش هەیە هاوبەندە بە زمانی پەیمانی نێودەوڵەتییەوە. ئەویش برێتییە لـە ریزبەند کردنی دەوڵەتەکان لـە پەیماننامـەدا. دەبیـنین لـە کـاتی ژمـاردنی دەوڵەتـەکان یـان نوێنەرەکانیان یان پایتەختەکانیان ئەو دەوڵەتەی، کە دانە ئەسڵەکە بە زمانەکـەی نووسـراوە، بە پلە یەك دێت لە ژماردنەکەدا. ئەمەش بەرجەستە لە یەکسـانی لایەنـە گرێبەسـتکارەکان دەکات. هەروەها لە کاتی بەستنی پەیماننامـەی نێودەوڵەتیـدا، ئیمـزای نوێنـەرانی دەوڵەتـە گرێبەستکارەکان بەشێوەی ستوونی یەك لە دوای یەك دەنووسرێن بەپێی پیتەکانی ئەلف و بێی ناوی دەوڵەتە خاوەن گرێبەستەکان، ئەویش بە زمانی ئینگلیزی یان فەرەنسی یان هـەر پیتـە ئەلف و بێیەکی تر، کە لەسەریان ڕێکدەکەون.

## باسی سێیەم

# کارپێکردنی پەیمانی نێودەوڵەتی
# APPLICATION OF TREATIES

پەیمانی نێودەوڵەتی بەپێی ئەو شێوازەی لە دەقەکەیدا هاتووە یان بەپێی ئەو ڕێککەوتنەی لەنێوان دەوڵەتە وتووێژکارەکاندا دەکرێ دەچێتە واری کارپێکردنەوە، بەڵام دەکرێ دەوڵەتە پێوەندیدارەکان دواتر رازی بن لەسەر ئیلتیزامکردن بە پەیماننامەکە بۆ هاتنەواری کارپێکردن ئەگەر پەیماننامەکە لە دەقێکیدا تاکید لەسەر شتێکی تر جگە لەوە نەکات.

پەیماننامەکان زۆر جار لە دەقەکانیاندا دەردەخەن، کە هاتنەواری کارکردن لە مێژوویێکی دیاریکراودا دەبێ یان پاش تێپەڕبوونی کاتێکی دیاریکراو بەسەر پەسندکردنیاندا. مەبەستیش لەمە ئەوەیە، کە ڕێگەنەدرێ بە دەوڵەتێك یان چەند دەوڵەتێکی دیاریکراوی بەشداربوو لە وتووێژدا، پەیمانەکە لەم قۆناخەدا هەڵوەشێننەوە. ڕێککەوتننامە بەکۆمەڵەکان لەدەقەکانیاندا جەختیان کردۆتە سەر چوونەواری کارکردن دوای پەسندکردنیان لە لایەن چەند دەوڵەتێکی دیاریکراوەوە. بۆ نموونە ئەگەر پەیماننامەیەکی بەستراو لە لایەن سەد دەوڵەتەوە مەرجی دانابێ، کە دەبێ گشت لایەنەکان پەسندی بکەن ئەوسا دەچێتە واری جێبەجێکردنەوە، ئەوە لەم حاڵەتەدا دەوڵەتێك دەتوانێ، لە ڕێگەی پەسەندنەکردنی پەیماننامەکەوە، هەموو ئەو هەولانە کە دراون بۆ بەستنی ئەو پەیماننامەیە پەك بخات. ڕێککەوتننامەی جنێڤ تایبەت بە دەریا ئازادەکانی ساڵی ١٩٥٨ لە دەقێکیدا، جەختی کردۆتە سەر کارپێکردنی پەیماننامەکە دوای تێپەڕبوونی مانگێك بەسەر دانانی بیست و دووەمین دەوڵەت پەڕاوەکانی پەسندکردنی پەیماننامەکە لای سکرتاریەتی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەڵام ڕێککەوتننامەی جنێڤ لەبارەی یاسای پەیماننامەکان چووەتە واری کارپێکردنەوە پاش تێپەڕبوونی مانگێك دوای سپاردنی پەڕاوی پەسندکردنی ڕێککەوتننامەکە لە لایەن دەوڵەتی سی و پێنجەمینەوە.

لێرەدا دەبێ وەبیرمان بێت، پەیمان لەم قۆناخەدا تەنیا لە بەرامبەر ئەو دەوڵەتانەی بە کردەوە پەسندیان کردووە مولزەم دەبێت، ئەگەرچی ژمارەی تەواوی پەڕاوەکانی پەسندکردنیش

لەسەری نەگەیشتبێ. دەوڵەتەکان تەنیا بە ئیمزاکردنی رێککەوتننامەکە مولزەم نابن، ئەگەر ئیمزاکردنەکە لە بارودۆخێکی دیاریکراودا بەس نەبێ بۆ رازیبوونی دەوڵەتی پێوەندیدار بە پابەندبوونی بە رێککەوتننامەکەوە.

مادەی (١٠٢)ی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان، ئیلتیزامێکی نێودەوڵەتی سەپاندۆتە سەر دەوڵەتەکانی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان، کە هەر پەیماننامەیەك یان رێککەوتننامەیێك دەبەستن، دەبێ لە سکرتاریەتی گشتیی تۆماری بکەن و بە زووترین کات بڵاوی بکەنەوە.

بەپێی مادەی(٨٠)ی یاسای پەیماننامەکان دەبێ پەیماننامەکان دوای چوونە واری کارپێکردنییان بنێردرێن بۆ سکرتاریەتی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ تۆمارکردن و هەڵگرتنیان و بڵاوکردنەوەیان. مەبەست لەم ئەحکامانە، کۆتایی پێهێنانی پەنابردنی هەندێك لەدەوڵەتەکانە بۆ بەستنی پەیماننامەی نهێنی، وەك ئەوانەی دەوڵەتە کۆڵۆنیالییەکان دەیانکرد لە پێش و لە سەروبەندی یەکەمین جەنگی جیهاندا.

## باسی چوارەم

## پراكتیزەكردنی پەیمانی نێودەوڵەتی

پـەیمان پـاش ئـەوەی دەچـێتە واری كارپێكردنـەوە، ئینجـا نـۆرە دێتـە سـەر قۆنـاخی پراكتیزەكردنی. ئەگەر مەبەستێكی پێچەوانە نەیسەلماند، كـە پەیماننامەكـە بـە ئەسـەرێكی پێشوو پراكتیزەدەبێ، ئەوا ئەحكامەكانی لایەنەكانی مولزەم ناكات لـەبارەی هـەر رەفتارێـك یان رووداوێك هەبووبێ یـان هـەر پلەیـەك كۆتـایی پێهـاتبێ پـێش رازیبـوونی دەوڵـەت بـە پەیماننامەكە.

بەپێی مادەی (٢٩) ی یاسای پەیمانەكان، پەیماننامە مولزەمە بۆ هەر لایەنێك و تێكـڕای هەرێمەكەی (خاكەكەی)، ئەگەر مەبەستێكی پێچەوانە لەپەیماننامەكـە بەدیارنەكـەوت، یـان بەشێوازێكی تر ئەوە بسەلمێنێ، بەڵام بەدەر لەم نۆرمە گشـتییە، دەكـرێ رێكبكـەون لەسـەر پراكتیزەكردنی پەیمانێكی دیاریكراو تەنیا لە بەشێكی هـەرێمی دەوڵـەتـدا. دەبیـنین دەوڵەتـە كۆلۆنیالییەكان پێشتر هەندێ بابەتیان لە پەیمانی نێودەوڵەتیدا دادەنا لەبارەی پیادەكردنی یان پیادەنەكردنی لە هەندێ كۆلۆنیان، بە شێوەیەك كە خزمەتی بەرژەوەندی خۆیان بكات.

سەبارەت بە مافی دەوڵەتە لایەنەكان و ئیلتیزامیشیان لە پەیمانە یەك لە دوای یەكەكاندا، كە تایبەتن بە یەك بابەت، مادەی (٣٠) بە رەچاوكردنی مادەی(١٠٣)ی دەسـتووری نەتـەوە یەكگرتووەكان دەڵێت:"

١- ئەگەر دەقی پەیمانێك بڵێت ملكەچە بۆ ئەحكامی پەیمانێكی پێشتری خۆی، یان دواتـری، یانیش لەگەڵیدا ناكۆك نییە، ئەوا ئەحكامی ئەم پەیمانەی تر باڵادەست دەبێ.

٢- ئەگـەر هـەموو لایەنـەكانی پـەیمانی پێشـوو دیسـان لایـەن بـن لـە پـەیمانی دواتـر و رێكنەكەوتبێتن لەسەر كۆتایی پێهێنانی پەیمانەكـە، یـان راگـرتنی كـارپێكردنی بـەپێی مادەی(٥٩)، ئەوا پەیمانی یەكەم تەنیا لەو سنوورە پراكتیزەدەبێ، كە دەقـەكانی نـاكۆك نین لەگەڵ دەقەكانی پەیمانی دواتر.

٣- ئەگەر هەموو لایەنەكانی پەیماننامەی دواتر لایەن نەبوون لە پەیمانی پێشوو ئەم نۆرمانەی لای خوارەوە پراكتیزەدەكرێن.

أ- له پێوەندیی نێوان دەوڵەتە لایەنەکانی هەردوو پەیماندا هەمان ئەو نۆرمە پیادەدەکرێ، کە لە بڕگەی(٢)دا هاتووە.

ب- لەپێوەندیی نێوان دەوڵەتێکی لایەن لە دوو پەیماننامەدا و لەنێوان دەوڵەتێکی تر، تەنیا لە یەکێك لەو دوو پەیماننامانەدا لایەنە، ئەوا ئەو پەیماننامەیەی کە هەر یەك لەو دوو دەوڵەتە تیادا لایەنن ماف و ئیلتیزامە هاوبەشەکانیان ڕێکدەخات.

٤- لە حوکمی بڕگە (٣)دا شتێك نییە سەرپێچی بێ بۆ حوکمی مادەی(٤١) یان هەر مەسەلەیەك پێوەست بێت بە کۆتایی پێهێنانی پەیمان یان ڕاگرتنی کارپێکردنی بە گوێرەی مادەی (٦٠) یان هەر مەسەلەیەك پێوەست بێ بەو لێپرسراوێتییەی، کە لەوانەیە بکەوێتەوە بەرامبەر دەوڵەتەکان لە بەرئەنجامی بەستنی یان پراکتیزەکردنیان بۆ پەیماننامەیەك، کە دەقەکانی ناکۆکبن لەگەڵ ئیلتیزاماتی ئەم دەوڵەتە بەرامبەر دەوڵەتێکی تر بەپێی پەیماننامەیەکی تر)).

کێشەکە لەوەدا بەدیارکەوت کاتێك پەیماننامە یەك لەدوایەکەکان بوونە مەسەلەیەکی جدیانە، لە بەرئەنجامی زیادبوونی ژمارەی دەوڵەتەکان و ئەو پەیواتانەی دەچنە پاڵیان و هەروا پەرەسەندنی پێوەندییەکان لەسەر ئاستی هەرێمیدا. ئەوەش وایکردووە دەوڵەتەکان زۆر جار خۆیان، بە تایبەتی لەگەلێك باردا، کێشەکانی خۆیان چارەسەربکەن، لە کاتێکدا پێیان وایە ئەو ئەحکامانەی لە مادەی(٣٠)دا هاتوون وەك ڕێنماییەکی گشتین، تەنیا لە کاتی پێویستدا بە گوێرەیان ڕەفتاردەکەن.

مەسەلەیەکی دیکەی گرینگ هەیە بایەخی ناوەندە نێودەوڵەتییەکان دەورووژێنێ، ئەویش ئەو پەیواتانەیە، کە نۆرمی یاسایی مولزەم لە رووی کارپێکردن و پراکتیزەکردنەوە دادەنێن بەرامبەر لایەنەکانی سێیەم، واتا دەوڵەتی بەشدارنەبوو لە پەیمانی پێوەندیداردا.

بنەمای گشتی یاسای نێودەوڵەتییە، کە ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتی تەنیا بۆ لایەنەکانیان مولزەم بن. ئەم نۆرمەش لە هەردوو پرەنسیپی سەرەکی، سەروەری دەوڵەت و سەربەخۆییەوە هەڵقوڵاوە، کە ڕێگەنادەن دەوڵەت بەبێ ڕازیبوونی خۆی مولزەم بکرێت، بەلام ئەمە وا ناگەیەنێ، کە ئەم نۆرمە بە زەروورەت دەبێ لە هەموو بارێکدا پیادەبکرێ. دەبینین مادەی(٣٤)ی ڕێککەوتننامەکە لە دەقەکەیدا دەڵێت: "پەیمان ئیلتیزام یان ماف بۆ دەوڵەتانی تر دانانێت بەبێ ڕەزامەندیی خۆیان)).

لەمەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە پەیمان بۆی نییە ئیلتیزام بخاتە ئەستۆی دەوڵەتانی سێیەم.

ئەمەش لێژنەی یاسای نێودەوڵەتی لە لێکۆڵینەوەکانیدا، بەر لە بەستنی کۆنگرەی ڤیەننا و بەستنی ڕێککەوتننامەکە جەختی لەسەر کردەوە، بەڵام حاڵەتێکی بەدەر هەیە لەم نۆرمە. ئەویش ئەوەیە ئەگەر ئەو ئەحکامانەی لە پەیمانی پێوەندیداردا هاتوون بەشێك بن لە یاسای نەریتی. لەم حاڵەشدا ئەو ئەحکامانە ئیلزامی هەموو دەوڵەتەکان دەکەن، چ لایەن بن لە پەیمانە ئەسڵەکە یان لایەن نەبن. نموونەی ئەمەش ئەو نۆرمانەن، کە تایبەت بە جەنگن و کە ڕێکخراوی کۆمەڵەی گەلان لە سەرەتای سەدەی پێشوو پەسندی کردوون و ئێستەش بەشێکن لە یاسای نەریتی نێودەوڵەتی.

بڕگە (٦) لە مادەی(٢)ی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان لەم بارەیەوە دەڵێ: (( ڕێکخراوەکە کاردەکات ئەو دەوڵەتانەی ئەندام نین تیایدا، لەسەر ئەم پرەنسیپانە بڕۆن بەقەد ئەوەی زەرورەتی پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی ئەوە دەخوازێت)).

هەندێك پێیان وایە، ئەم مادەیە چەند پابەندبوونێکی مولزەم دروستدەکات بۆ دەوڵەتە نائەندامەکان لەنەتەوە یەکگرتووەکاندا و ناکرێ وا دابنرێ تەنیا گوزارشت لە هەڵوێستێك دەکات.[9]

ئەمەش بۆچوونێکی راستە ئەگەر پێمانوابێ ئەو پرەنسیپانەی لە مادەی (٢)ی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتوون بەشێکن لە یاسای نەریتی نێودەوڵەتی. ئەوەی ئەم بۆچوونەش دەچەسپێنی ئەوەیە، کە دەکرێ پەیمانی نێودەوڵەتی جۆرە سزاگەلێکی تێدا بێت، کە بسەپێنرێ بەسەر ئەو دەوڵەتانەی کاری دوژمنکارانە دەکەن. دەبینین مادەی (٧٥)ی ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ یاسای پەیماننامەکان دەڵێت: ((ئەحکامەکانی ئەم ڕێککەوتننامەیە کارناکەنە سەر هیچ ئیلتیزامێك، کە پێوەندی هەیە بە ڕێکەوتننامەیەکەوە و دەکەوێتە ئەستۆی دەوڵەتێکی دەستدرێژکار بەرئەنجامی کردەکاریگەلێك، بەپێی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان، وەرگیرێت لەبارەی دەستدرێژی ئەم دەوڵەتە)).

مادەی(٣٥)ی ڕێککەوتننامەکە سەبارەت بەو پەیماننامانەی ئیلتیزام دەخەنە سەر دەوڵەتەکانی تر، ئاماژەدەکات، کە دەبێ ئیلتیزام بخرێتە سەر دەوڵەتەکانی تر لە بەرئەنجامی دەقێك لەناو پەیماننامەکەدا، ئەگەر مەبەستی لایەنەکانی پەیمانەکە لەم دەقە ئەوە بێ ببێتە شێوازێك بۆ ئیلتیزام دانان و دەوڵەتەکانی تریش بە راشکاوی و بە نووسین ئەم ئیلتیزامەیان

9- H. kelsen , The Law of the united Nations , London, 1950,PP.106-110

قبوولکرد، بەڵام ئەم مەسەلەیە کەمێك جیاوازی هەیە سەبارەت بەو مافانەی، کە پەیمان بۆ دەوڵەتێکی سێیەم رێکی دەخات. لەم بارەیەوە دادگەی دادی نێودەوڵەتی هەمیشەیی سەبارەت بە کێشەی ناوچە ئازادەکانەوە Free Zones Case دەڵێت: (( مەسەلەی بوونی مافی وەدەسهاتوو " الحق المکتسب" لە رێککەوتننامەیەك، کە لەنێوان دەوڵەتەکانی تر بەسترابێ، مەسەلەیەکە بڕیاردان لەسەری جیاوازە بەپێی هەر حاڵەتێکی تایبەت، بۆیە دەبێ وردەکاری بکرێ لەوەی ئایا ئەو دەوڵەتانەی ئیمتیازاتیان بە دەوڵەتی سێیەم داوە، مەبەستیان وابووە مافێکی کردەیی بۆ دروست بکەن و ئەو دەوڵەتەش قبوولی کردووە بەم شێوەیەی)) [10].

مادەی(٣٦)ی رێککەوتننامەکە سەبارەت بەو پەیماننامانەی ماف دەدەن بە دەوڵەتی سێیەم دەڵێت، مافی دەوڵەتی سێیەم دەکرێ لە دەقێکدا بێت لە پەیماننامەکەدا، ئەگەر مەبەستی لایەنەکانی پەیماننامەکە بەم دەقە بەخشینی ماف بێ بە دەوڵەتی سێیەم یان کۆمەڵێك دەوڵەتان و ئەم دەوڵەتەش سەر بە ئەوان بێ یان بە تێکڕای دەوڵەتان و دەوڵەتی سێیەمیش بەوە رازی بێت.

نموونەی ئەو پەیماننامانەی ئیمتیازات دەبەخشنە دەوڵەتانی سێیەم ئەوانەن، کە سیستەمی یاساییان بۆ کەناڵی سوێس و کەناڵی کییل Kiel داناوە. ئەوەبوو دادگەی دادی نێودەوڵەتی هەمیشەیی لە کێشەی ویمبڵدن Wimbledon Case ئاماژەیکردووە، کە ((رێگەی ئاویی نێودەوڵەتی... بۆ بەرژەوەندیی تێکڕای نەتەوەکانی جیهان بونیادنراوە)). بە واتایەکی تر مەسەلەی چەسپاندنی ئیلتیزام، بەپێی پەیمانێك، بەسەر دەوڵەتێکی سێیەمدا قایلبوونێکی نووسراوی راشکاوانە دەخوازێ لە لایەن ئەو دەوڵەتەوە، بەڵام لە باری بەخشینی ئیمتیاز بۆ دەوڵەتی سێیەم گریمانەی قایلبوونی دەوێ ئەگەر مەبەستێکی پێچەوانە نەسەلمێنرا لە لایەن ئەو دەوڵەتەوە. چونکە یاسای نێودەوڵەتی نەریتی مافی وەدەسهێنراوی دەوڵەتانی سێیەم دەپارێزی، بەڵام رێگەنادا ئیلتیزام بسەپێنرێ بەسەر دەوڵەتانی سێیەمدا بەپێی پرەنسیپەکانی سەروەری دەوڵەت و یەکسانی نێوانیان و دەستێوەرنەدان لە کاروباری نێوەخۆییدا.

---

10- 6 ILR , PP.362 , 364

# باسی پێنجەم

## شرۆڤەکردنی پەیمانی نێودەوڵەتی
## INTERPRETATION OF TREATIES

شرۆڤەکردنی پەیمان، واتە روونکردنەوەی واتا و نێوەڕۆکی بە شـێوەیەکی ورد. لـەم چـەند بڕگانەی خوارەوە باسی لێوە دەکەین:

### ١- جۆرەکانی شرۆڤەکردن:

شرۆڤەکردن دەبێتە دوو بەشەوە، یەکێکیان فەرمییە و ئەوی تریان نافەرمییە.

شرۆڤەکردن بە فەرمی دادەنرێ کاتێك لە لایەن ئەو دەوڵەتانەوە، کە پەیمانەکەیان بەستووە ئەنجام بدرێ، یان ئەو دەزگە نێودەوڵەتییەی کـە پەیمانەکـە بـۆ ئـەو مەبەسـتە دیـاریکردووە. دەکرێ ئەم دەزگەیە لـە چوارچێوەی پێکهاتـەی نەتـەوە یەکگرتووەکانـدا بـێ، یـاخود ئـەو پێکهاتانەی خودی پەیمانەکە دیاریکردووە بە مەبەسـتی ئاسـانکاری بـۆ جێبـەجێکردن، وەك: کۆمیتەی بنەبڕکردنی جیاوازیی رەگەزی کە رێککەوتننامەی بنەبڕکردنی جیاوازی رەگەزی لە ساڵی ١٩٦٥ دروستیکردووە.

شرۆڤەی پەیمانی نێودەوڵەتی بە رێککەوتنی راشکاوانەی دەوڵەتەکانیش دەکرێت لە رێگەی پرۆتۆکۆلێکی پاشکۆوە یانیش بە ئاڵوگۆڕکردنی یاداشت لـەنێوان دەوڵەتـە پێوەندیدارەکانـەوە بێت. لەم بارەدا شرۆڤەکردن بۆ هەموو دەوڵەتانی لایەن لە پەیماندا، مولزەم دەبێ.

ئەگەر دەوڵەتانی پێوەندیـدار نەگەیشـتنە رێککـەوتنێك لـەبارەی شـرۆڤەکردنی پـەیمانی نێودەوڵەتییەوە، دەکرێ مەسەلەی شرۆڤەکردنی، هەواڵـەی دادگـەی دادی نێودەوڵـەتی، یـان نێوبژیوانی نێودەوڵەتی بکرێ لەگەڵ رازیبوون بەوەی کە ئەو شرۆڤەکردنەی لێـوەی دەردەچـێت مولزەم دەبێت بۆیان. هەندێك جاریش پەیمانە نێودەوڵەتییە بەکۆمەڵـەکان یـان دووقۆڵییـەکان جەختیان کردۆتە سەر ئەم جۆرە شرۆڤەکردنە.

هەرچی شرۆڤەکردنی نافەرمیشە، برێتییە لەو شرۆڤەکردنانەی، کە بۆ دەقەکانی پەیماننامە دەکرێن لە لایەن یاساناسەکان و کارمەندانی بواری نێودەوڵەتی وەك مافناسان و مێژووناسان و

ڕۆژنامەوانان، بەڵام ئەم جۆرە شرۆڤەکردنە، بە مولزەم دانانرێ، بۆ لایەنەکانی پەیمانی نێودەوڵەتی.

هەروا دەوڵەت لە ئاستی نێوەخۆییدا بە شێوەیەکی یەکلایەنە لە ڕێگەی دەزگە جێبەجێکاری یان دادوەرییەکانی خۆیەوە، شرۆڤەی پەیماننامە دەکات. زۆر جار لە شێوەی لێدوان "تصريح" دەبێت و دەکرێتە پاشکۆی پەیماننامەکە، بە ناوی ئەو دەوڵەتەی دەریکردووە، بەڵام ئەم جۆرە شرۆڤەکردنە تەنیا بۆ ئەو لایەنەی دەریچواندووە مولزەم دەبێت.

## ٢- شێوازەکانی شرۆڤەکردنی پەیمانی نێودەوڵەتی:

شرۆڤەکردنی پەیمانی نێودەوڵەتی بە یەکێك لەو گرفتانە دەژمێردرێت، کە ڕووبەڕووی دادگە و دادوەران دەبێتەوە لەسەر هەردوو ئاستی نێوەخۆیی و دەرەوەدا وەك یەك. بۆیە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی هەندێ نۆرم و شێوازی بۆ دەزگە دادوەرییەکان دارشتووە لە پێناو چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە. دەبینین لەسەر ئاستی یاسای نێودەوڵەتی سێ شێوازی بنەڕەتی هەن بۆ شرۆڤەکردنی پەیمانی نێودەوڵەتی. **شێوازی یەکەم**، جەختی کردۆتە سەر دەقە ئەسڵەکەی ڕێککەوتننامەکە و پاشان لەسەر شیکردنەوەی وشەکان و ئەو دەستەواژانە لە میانەیاندا هاتوون. ئەمەش پێی دەگوترێ شێوازی بابەتییانە لە شرۆڤەکردندا. **شێوازی دووەم** بایەخ دەدات بە نیازی ئەو لایەنانەی پەیمانیان گرێداوە، وەك چارەسەرێك بۆ ئەحکامە ناڕوونانە، ئەمەش پێی دەگوترێ شێوازی کەسی Subjective approch. **سێیەمین شێوازیش** ئاسۆی بەرفرەوانترە لە دوو شێوازەکەی پێشوو، ئەمیان بابەتی پەیمان و مەبەست لە پەیمان لە یەك چوارچێوەدا بەهەند وەردەگرێ، چونکە دەقەکانی پەیمان تەواوکەری یەکترن، ئەمەش وا دەسەپێنێ شرۆڤەکردن بازنەی پەیمان نەبەزێنێ، ئەگینا بەو شێوەیە نابێت، کە گوزارشت لە واتای ڕاستەقینە بکات.

ئەم دواین شێوازە ڕووبەڕووی ڕەخنە بۆتەوە بە بیانووی ئەوە، کە هانی دادوەران و نێوبژیوانان دەدات، کە لە ڕێگەی شرۆڤەکردنەوە نۆرمی یاسایی دابڕێژن، کەچی ڕۆڵی ئەوان دەبێ دەرخستنی بابەتی پەیمان و مەبەست و ئامانجی پەیمان بێت.

ئەوی ڕاستی بێ، لە هەر شرۆڤەکردنێکی ڕاستەقینە بۆ پەیمانی نێودەوڵەتی، پێویستە هەموو لایەنەکانی لە بەر چاو بگیرێ. هەر لە وشە و دەستەواژە بەکارهێنراوەکانەوە، بگرە تاوەکو نیازی لایەنەکان و ئامانج لە هەرچ دۆکومێنتێك. چونکە ناکرێ بە ڕەها دەست لە هیچ توخمێك لەم توخمانە هەڵبگیرێ.

مادەکانی (٣١-٣٣) لە ڕێککەوتننامەی ڤیەننا هەماهەنگییان کردووە لەنێوان هەر سێ لایەنەکانی شرۆڤەکردن. مادەی (٣١) باس لە نۆرمی گشتی دەکات لە شرۆڤەکردندا، بەمەش نۆرمە یاساییە نەریتییەکان لەم بوارەدا تۆمارکران. بڕگەی یەکەمیان جەختی کردووە، کە پەیماننامە ((بە نیازپاکی بە گوێرەی واتا سادەکەی دەستەواژەکانی پەیمان، لە چوارچێوە تایبەتەکەی و لەبەر ڕۆشنایی بابەتەکەی و مەبەست لێی، شرۆڤەدەکرێ)). بۆیە دادگەی دادی نێودەوڵەتی سەبارەت بە دەسەلاتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ وەرگرتنی دەوڵەتەکان لەو ڕێکخراوە جیهانییەدا، ئاماژەدەدات، کە: ((یەکەمین ئەرکی دادگە دەسەلاتپێدراوەکە بۆ شرۆڤەکردن و پراکتیزەکردنی ئەحکامەکانی پەیمانێکی نێودەوڵەتی ئەوەیە، کە هەوڵ بدرێ بۆ کاراکردنی لە چوارچێوەی واتا سرووشتی و ئاساییەکەی و لەو ڕەوتەی کە هاتووە)) [11] . هەر لەسەر بناخەی ئەم نۆرمەشدا، دادگەی ئەورووپی بۆ مافی مرۆڤ لەکێشەی Lithgow Case ئاماژەی داوە، کە بەکارهێنانی دەستەواژەی " بەپێی ئەو مەرجانەی هاتوون... لە پرەنسیپە گشتییەکانی یاسای نێودەوڵەتی، کە لە مادەی یەکی پرۆتۆکۆڵی یەکەمی ڕێککەوتننامەی ئەورووپی لە بواری قەرەبووکردن بەرامبەر بە پێشێلکردنی مافی موڵکدارێتی هاتووە، ناکرێ شرۆڤەگەلێك بکرێ بە شێوەیەك، کە ببێتە هۆی فرەوانبوونی پرەنسیپە گشتییەکانی یاسای نێودەوڵەتی و دانانی نۆرمی تایبەت لەم بوارەدا بۆ قەرەبووکردنەوە لەسەر خۆماڵیکردنی موڵك و ماڵی هاووڵاتیان" [12] . دەستەواژەی ((چوارچێوەی تایبەت بە پەیمان" بە مەبەستی شرۆڤەکردن وێڕای دەقی پەیماننامەکە، بە دیباجەکەی و پوختەکارییەکانیشییەوە، ئەمانەش دەگرێتەوە: هەر ڕێککەوتنێك پێوەندی بە پەیماننامەکەوە هەبێ و لەنێوان هەموو لایەنەکاندا بەسترابێ بە بۆنەی بەستنی ئەم پەیمانەوە، هەروا هەر دۆکومێنتێك دەگرێتەوە، کە لە لایەنێك یان زیاترەوە دەرچووبێ و لایەنەکانی دی وەك دۆکومێنتێکی پێوەندیدار بە پەیمانەکەوە و هەر نۆرمێك لە یاسای نێودەوڵەتی، کە پێوەندی هەیە بە بابەتەکەوە و دەکرێ لە پێوەندیی نێوان لایەنەکاندا پراکتیزەبکرێ.

دادگەی سکاڵای ئێرانی–ئەمەریکایی Iran-USA Claims Tribunal بە بایەخەوە

---

11- 82 ILR , PP . 590, 620.

12- 75 ILR، PP .397 , 423.

روانیویەتییە ئەحکامەکانی پێشوو و ئەحکامە هاوشێوەکانی یاسای نێودەوڵەتی، کە دەکرێ لــە پێوەندییــەکانی نێــوان دوو لایەنــدا پیــادەبکرێن لــە شــرۆڤەکردنی رێککەوتننامــەی چارەسەرکردنی سکالآکان بۆ ساڵی ۱۹۸۱ نەخاسمە مەسەلەی ئــەوەی ئایــا ئــەو کەســانەی خاوەنی دوو رەگەزنامەی ئێرانی و ئەمەریکایین پێیان دەکرێ سکالا لە دژی ئێران لە بەردەم دادگەکە بەرزبکەنەوە[13] . دادگەکە بڕیاری دا کە هەر کەسێك هەڵگری هەردوو رەگەزنامەی ئێرانی و ئەمەریکایی، لەکاتی سکالا بەرزکردنەوە لە دژی ئێران لــەژێر ســایەی ویلایــەتی یاسایی ئەمەریکایە بە کردەیی، بە هەڵگری رەگەزنامەی ئەمەریکایی دەناســرێ، واتــا بــە هاوولاتییەکی ئەمەریکایی دادەنرێ بۆ ئــەم مەبەســتە. بــۆ پاڵپشــتی ئــەم بڕیــارە دادگــە ئاماژەی بە بڕگە(۳)ی مادەی(۳۱)ی رێککەوتننامــەی ڤیــەننای ســاڵی ۱۹٦۹ داوە، کــە بانگەشە بۆ ئەوە دەکات، کە سەرەڕای لە بەرچاوگرتنی چوارچێوەی تایبەتی پەیماننامە، هەر رێککەوتنێکی دواتر لەنێوان لایەنەکان، لەبارەی شرۆڤەکردنی پەیماننامە یــان پیــادەکردنی ئەحکامەکانی لەبەر چاوبگیرێت.

بەپێی مادەی (۳۱)ی ئاماژەپێکراو، کاتێك شرۆڤەکردن وابکات واتاکە بەنادیاری یان ناڕوون بمێنێتەوە، یانیش بگاتە بەرئەنجامێکی نالۆجیکییانە یــان نامــاقووڵ، ئــەوا مــادەی (۳۲) رێیــداوە پــەنا ببردرێتــە بــەر چــەند شــێوازێکی تــەواوکاری لــە شــرۆڤەکردندا وەك ئامادەکارییەکانی پەیماننامەکە و ئەو بارودۆخەی تێیدا بەستراوە بۆ قایلبوون لەو واتایەی، کە لە بەرئەنجامی پراکتیزەکردنی مادەی(۳۱)ـەوە وەدەست دێ یان بۆ دیاریکردنی واتاکە.

شێوازی سەلماندنی دیکەی زۆر هەن بــۆ نەهێشــتنی کــەموکوڕی یــان نــاڕوونی واتــای ئاسایی دەستەواژەکە. دەبیــنین بڕگــە(٤)ی مــادەی (۳۱) رێیــداوە واتایــەکی تایبــەت بــە وشەیەکی دیاریکراو بدرێت لە حاڵێکدا ئەگەر سەلمێنرا، کە نیــازی لایەنــەکان بــەرەو ئــەو ئاراستەیەیە. بە گوێرەی مادەی(۳۳)ی تایبەت بە شرۆڤەکردنی پەیماننامە سپێردراوەکان بە دوو زمان یان زیاتر، هەر دەقێك لە دەقەکانی پەیماننامەی سپێردراو بە دوو زمان یان زیاتر هەمان هێزیان هەیە لە شرۆڤەکردندا ئەگەر لە پەیماننامەکەدا دەقێك نەبێ یــان لایەنــەکان رێکنەکەوتبێتن، کە دەقێکی دیاریکراو بالادەستە لە کــاتی ناکۆکیــدا و کاتێــك بــەراوردی نێوان دەقەکان روونی دەکەنەوە، کە جیاوازی لە واتا هەیە، ئەو واتایە وەردەگیرێ کە لەگەڵ

---

13- 75 ILR، PP .175 , 188

بابەتی پەیماننامەکە و مەبەستیدا دەگونجێ و بەپێی توانا دەقە جیاوازەکان لەگەڵ یەکتردا دەگونجێنرێن، تەنیا لە کاتێکدا نەبێ، کە یەکێك لە دەقەکان باڵادەستە. واش گریمانە دەکرێ، کە دەستەواژەکانی ئەم جۆرە پەیماننامانە لە هەر دەقێك لە دەقە سپێردراوەکانی، هەمان واتایان هەیە، بە هەموو زمانەکان.

## باسی شەشەم

# پووچەڵکردنەوەی پەیمان و کۆتایی پێهێنانی و راگرتنی کارپێکردنی

مادەی (٤٢) لە رێککەوتننامەی یاسای پەیمانەکان بۆ ساڵی ١٩٦٩، رێگەنادات بە یەکێك لەلایەنەکانی پەیمان کۆتایی بهێنێ بە پەیمانەکە یان هەڵیبوەشێنێتەوە، یان لێی بکشێتەوە ئەگەر بەپێی ئەحکامی یاسای پەیمانی ساڵی ١٩٦٩ نەبێ. مادەی (٤٤) رێگە بەهیچ لایەنێك نادات پەیمان هەڵبوەشێنێتەوە یان لێی بکشێتەوە یان لەکاریبخات، ئەگەر دەقێکی رێگە بەوە نەدات یان لایەنەکان رێکنەکەوتبێتن لەسەر شێوەیەکی تر. جا ئەگەر هۆی هەڵوەشاندنەوە یان کشانەوە یان راگرتنی کارکردن پێوەندییان بە تەنیا چەند بەندێکی دیاریکراوەوە هەبێت دەکرێ پشتییان پێ ببەسترێ تەنیا سەبارەت بەم بەندانە لە حاڵەتێکدا:

١- ئەگەر بکرێ ئەم بەندانە لەودوای پەیماننامەکە جیابکرێنەوە لە رووی پراکتیزەکردنەوە.

٢- ئەگەر لە پەیماننامەکە دەرکەوت یان بە شێوازێکی تر سەلمێندرا، کە قبوولکردنی ئەم بەندانە بنەمایەکی زەروورنەبووە بۆ رازیبوونی لایەنەکە یان لایەنەکانی تر بە ئیلیتزامکردن بە تێکڕای پەیماننامەکەوە.

٣ - ئەگەر لە بەردەوامبوونی جێبەجێکردنی پاشماوەی پەیماننامەکە غەدرێك نەبێ.

مادەی (٤٥) دەڵێ ناکرێ دەوڵەت، دوای ئاشکرابوونی رووداوەکان لە لای، سووربێ لەسەر هۆیەك لە هۆیەکانی هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەکە یان کۆتایی پێهێنانی یان کشانەوە لێی یان لەکارخستنی ئەگەر بە راشکاوی رازیبوو، کە پەیماننامەکە تەواوە یان دەبێ بە کارپێکراوی بمێنێتەوە یان بە بەردەوامی کار بۆ مانەوەی بکرێ، یان بەردەوام کاری پێ بکرێ بەپێی هەر حاڵەتێك.

### ١ - پووچەڵکردنەوەی پەیمانی نێودەوڵەتی
### INVALIDITY OF TREATIES

چەند هۆیەك هەن دەکرێ لایەنێك لە لایەنەکانی پەیمان پەنای بۆ ببەن بۆ پووچەڵکردنەوەی:

### ١- ناكۆكی لەگەڵ نۆرمی فەرماندەر " قاعده امره":

پەیمانی دروست ئەوەیە، کە هەمووی یان بەشێکی ناکۆك نەبێت لەگەڵ پرەنسیپە سەرەکییەکانی یاسای نێودەوڵەتی یان لەگەڵ نۆرمە فەرماندەرەکانی.

مادەی (٥٣)جەختی کردووە، کە "پەیمان بە رەها بە پووچەڵ دەژمێردرێ، ئەگەر لەکاتی بەستنیدا ناکۆکی هەبێت لەگەڵ نۆرمێکی فەرماندەر لە نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی گشتی. بۆ ئامانجەکانی ئەم رێککەوتننامەیە، ئەو نۆرمە بە نۆرمی فەرماندەر دادەنرێت، کە تێکڕای کۆمەڵی نێودەوڵەتی قبووڵی بکات و دانی پێدا بنێت وەك نۆرمێك، کە نابێ دەسکاری بکرێ و نابێ هەمواربکرێ ئەگەر بە نۆرمێکی دواتر نەبێ لەو نۆرمانەی یاسای نێودەوڵەتی گشتی کە هەمان سیفەتیان هەیە. مادەی (٦٤) تاکیددەکاتە سەر ئەوەی ((ئەگەر نۆرمێکی فەرماندەری نوێ لە نۆرمە گشتییەکانی یاسای نێودەوڵەتی بەدیارکەوت، ئەوا هەر پەیمانێکی کارپێکراو، کە ناکۆکی هەیە لەگەڵ ئەم نۆرمە بە باتڵ دادەنرێ و کارپێکردنی بەکۆتایی دێ)).

بیرۆکەی نۆرمە یاساییە فەرماندەرەکانی یاسای نێودەوڵەتی وەك تیۆرییەکی پەسەندکراوی چەسپاوە، وێڕای بوونی جیاوازی لەبارەی ناوەڕۆکیان و شێوازی دروستبوونیان، بەڵام پەسندکردنی چەند مادەیەك لە رێککەوتننامەکە سەبارەت بە نۆرمی فەرماندەر، بەڵگەیە کە ئەم نۆرمانە بنەڕەتین لەبارەی پەیماننامەکە.

### ٢- ناکۆکی لەگەڵ یاسای نێوەخۆییدا:

دەوڵەت بۆی هەیە تانە لە رەوایی ئەو پەیمانە نێودەوڵەتییانە بدات، کە بە ئاشکرا نۆرمێکی پڕ بایەخی بنەڕەتی لە نۆرمەکانی یاسای نێوەخۆیی پێشێلدەکەن، بەڵام ناتوانێ ناکۆکیی پەیمان لەگەڵ دەقە دەستوورییەکانی بکاتە بیانوو بۆ پووچەڵکردنی. لە زانستی یاسای نێودەوڵەتیدا بۆ ساڵانێکی دوورودرێژ جیاوازییەك هەبوو لەسەر ئەوەی ئایا ئەو پەیواتانەی سەرۆکی دەوڵەت دەیانبەستێت لە دەرەوەی ئەو دەسەڵاتانەی بە یاسای نێوەخۆیی پێیدراوە بۆ بەستنی پەیماننامە دروستن یان پووچەڵن. رێککەوتننامەی ڤیەننا جەخت دەکاتەوە، کە ناکرێ ئەم پەیواتانە بە شێوەیەکی گشتی بە پووچەڵ دانرێن، لە چەند حاڵەتێکی تایبەتدا نەبێ. مادەی(٤٦) لە رێککەوتننامەکە دەڵێت: " ١ - ناکرێ دەوڵەتێك سوور بێ لەسەر ئەوەی، کە دەربڕینی رەزامەندیی ئیلتیزامکردنی بە پەیمانێکەوە بە شێوەیەك کراوە، کە سەرپێچییە لە حوکمێکی یاسای نێوەخۆیی تایبەت بە دەسەڵاتی بەستنی پەیماننامەوە، ئەمەش وەك هۆیەك دابنێ بۆ بەتاڵکردنەوەی رەزامەندییەکەی، جگە لەو حاڵەتەی کە

ئەمە دەبێتە سەرپێچی روونی نۆرمێکی گەوهەری لە نۆرمەکانی یاسای ناوەخۆی ئەو دەوڵەتە."

سەرپێچی" اخلال" بەگوێرەی بڕگەی پێشــوو بــە روون دەژمێــردرێ، ئەگــەر هــەر دەوڵــەتێك لــە توانایدا بێ، لە ڕەوتی ئاسایی و بە نیازپاکی خۆی، بیدۆزێتــەوە بەشــێوەیەکی بابەتییانــە. بــۆ نموونــە ئەگەر نوێنەری دەوڵەت ئەو کۆتانەی لەیاسای نێوەخۆییدا هاتوون لەسەر دەســەڵاتی بــۆ رازیبــوون بــە ئیلتیزام بە ناوی دەوڵەتەکەیەوە پشتگوێخست، ئەوا دەوڵەتەکەی ئیلتیزام بەو رازیبوونە دەکات ئەگــەر وتووێژکارانی تر بــەو کۆتبەندییانــەیان نــەزانیبێت، کــە کراونەتــە ســەر دەســەڵاتی پــێش دەربــڕینی رازیبوون. حوکمی پێشوو هــەموو ئــەو کەســانە دەگرێتــەوە، کــە بــەپێی ئەرکــەکانیان نوێنەرایــەتی دەوڵەتەکانیان دەکەن بەبێ ئەوەی پێویست بکات پەڕاوی راسپاردن پێشکێش بکەن، ئەوانیش ســەرۆك دەوڵەتەکانن و وەزیرەکانی دەرەوە و سەرۆکی شاندە دیپلوماتییەکان و شــاندی راســپێنراو لــە کــۆنگرە نێودەوڵەتییــەکان و رێکخــراوە نێودەوڵەتییــەکان و ئــەو کەســانەش، کــە لــە رێگــەی بەڵگەنامــەی دەسەڵاتپێدانەوە ڕێیان پێدراوە.

### ٣- هەڵە Error :

هەڵە، بە پێچــەوانەی رۆڵــی لــە یاســای نێوەخۆییــدا، رۆڵێکــی ســنووورداری هەیــە لــە یاســای نێودەوڵەتیدا، بەو پێیە عەیبێکە لە عەیبەکانی رازیبوون، چونکە هەڵەکردن لــە یاســای نێودەوڵەتیــدا زەحمەتە چ هەڵەی تاك بێ یان بەکۆمەڵی، لەبەرئەوەی ژمارەیەکی زۆر لــە کەســەکان وتووێژدەکــەن و پەیماننامە دەبەستن، سەرباری جیاوازی سرووشتی دەوڵەت لەگەڵ تاکە ئاساییەکان.

دەکرێ دەوڵەت، لە پەیماننامەیەکــدا، پــەنا بباتــە بــەر هەڵــە وەك هۆیــەك بــۆ هەڵوەشــاندنەوەی رازیبوونی ئیلتیزامکردنی پێیەوە، ئەگەر هەڵەکە پێوەست بێت بــە رووداوێــك یــان بارێــك، دەوڵــەتی پێوەندیدار وایزانیبێ هەن، لە کاتی بەستنی پەیماننامەکــە و ئەمــەش هۆیــەکی بنــەڕەتی بــووبێ بــۆ رازیبوونی ئیلتیزامکردنی پێیەوە، بەڵام ئەگەر دەوڵەتی پێوەندیدار بە رەوشتی خۆی بەشــداری کردبــێ لە هەڵەکە یان سرووشتی بارودۆخەکە وای کردبێ دەوڵەت ئاگەداربێ لە ئەگەری روودانی هەڵــە، ئــەوە دەوڵەتی پێوەندیدار بۆی نییە لەو ئیلتیزامانەی لە پەیماننامەکەدا هاتوون خۆی بدزێتــەوە بــە بیــانووی ئەو هەڵەیەوە.

دادگەی نێودەوڵەتی چەندین جار جــەختی لەســەر ئــەم نۆرمــە کــردووە. بــۆ نموونــە لەکێشــەی پەرستگەی (بریــاە فیهیــار)دا دادگــەی دادی نێودەوڵــەتی لەســاڵی (١٩٦٢)دا بیــانووی (تایلانــد)ی رەتکردەوە سەبارەت بەوەی، کە نەخشە پەیوەوندیدارەکە هەڵەیەکی گەوهەری تێدایــە، بۆیــە ئیلتیــزام

ناکات پێوەی. ئەوە بوو دادگەکە بڕیاری دا ((نابێ دەوڵەت داوای هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامــە بکــات، پاڵپشت بە بوونی هەڵە وەك عەیبێك لە عەیبەکانی رازیبوون، ئەگەر ئەو دەوڵەتە بــە رەوشــتی خــۆی بەشداری کردبێ لە بوونی هەڵەکە، یــان ئەگــەر توانــای هــەبووبێ خــۆی لــەم هەڵەیــە بپــارێزێ دوای روودانی، یانیش ئاگەدار کرابێ بە ئەگەری گلانی بە هەڵەکە "[14]. دادگە پێی وابوو ئەگەر کەســێتی و پسپوریی ئەو کەسانەی لەگەڵ تایلاندا بەشدارییان کردووە لە نۆڕینی نەخشەکە لەبەرچــاوبگیرێ، ئــەوا تایلاند بۆی نییە دەست بە هەڵەکەوە بگرێ.

بەڵام ئەگەر هەڵە لە داڕشتنی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکاندا هەبێ، پاش ئەوەی دەبێتــە فــەرمی، دەدۆزرێتەوە، ئەوا لایەنەکان بە گوێرەی ئەو رێکارییانەی لە مادەی (٢٧)ی رێککەوتننامــەی ڤیــەننا سەبارەت بەیاسای پەیماننامەکان هاتوون، راستی دەکەنەوە.

## ٤– فێڵ و گەندەڵاندنی نوێنەری دەوڵەت

کاتێك دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکان رازی دەبێ لەسەر پەیمانێکی نێودەوڵەتی بــەپێی چــەند زانیــاری و بەڵگەنامەیەکی درۆ، کە لایــەنی ســێیەم پێشکێشــی کــردوون، ئــەمیان هــەتاوەکو کــاتی بەســتنی پەیمانەکە بەو شتەی نەزانیوە، ئەوە بۆی هەیە لەبەر ئەم فێڵە داوای پووچەڵکردنەوەی پەیمانەکە بکــات. مادەی(٤٩)ی رێککەوتننامەی ڤیەنناش سەبارەت بە یاســای پەیماننامــەکان، بــەم شــێوەیە جــەختی لەسەر ئەم مەسەلەیە کردۆتەوە: (( ئەو دەوڵەتەی کە رەوشــتی فــێڵاوی دەوڵــەتێکی وتووێــژکاری دی پاڵی پێوە دەنێ بۆ بەستنی پەیمانێك، بۆی هەیە فێڵ بکاتە بەڵگە بۆ هەڵوەشــاندنەوەی رازیبــوونی بــە ئیلتیزامکردن بە پەیماننامەکەوە)).

هــەروەها گەندەڵانــدنی راســتەوخۆ، یــان ناڕاســتەوخۆی نوێنــەری دەوڵــەت بــەهۆی دەوڵــەتێکی وتووێژکاری ترەوە، بە هۆکارێك دادەنرێ بۆ پووچەڵکردنی رازیبوونی بــە ئیلتیزامکــردن بــە پەیمانــەوە ئەگەر رازیبوونی ئیلتیزامکردنی پێوەی بەرئەنجامی ئەو گەندەڵییە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆیەی سەر نوێنەرەکەی بووبێت.

## ٥- ناچارکردنی نوێنەری دەوڵەت Coecion :

کاتێك دەوڵەت رازیبوونی ئیلتیزامکردنی بە پەیمانێکەوە دەردەبــڕێ لــە بەرئــەنجامی ناچــارکردنی

---

14- 33 ILR، P .65

نوێنەرەکـەی چ بـە کـردەوە یـان هەڕەشـەی راسـتەوخۆ لـە دژی، ئـەوا بـەپێی مـادەی (٥١)ی ڕێککەوتننامەی ڤیەننای سەبارەت بە یاسای پەیماننامەکان، ئەو رازیبوونەی هیچ ئەسەرێکی یاسـایی نابێت.

بەڵام ئەو مەسەلەیە جیاواز دەبێ کاتێك ناچارکردنی دەوڵەت بە هەڕەشـە، یـان بـە بـەکارهێنانی هێز بۆ رازیبوونی ئیلتیزامکردنی بە پەیماننامەیەکـەوە بـێ. دەبیـنین پـێش دامەزرانـدنی کۆمەڵـەی گەلان، یاسای نێودەوڵەتی ڕیێ دەدا پشت ببەسترێ بە بەکارهێنانی هێز یان هەڕەشـەکردن بـەهێز لـە دژی یەکێك لە لایەنەکان وەك هۆیـەك بـۆ پووچـەڵکردنی پـەیمان، بـەڵام لـە دوای بەسـتنی پـەیمانی کۆمەڵەی گەلان ساڵی ١٩١٩ و بەستنی پەیماننامەی کیلوج_بریاند لە سـاڵی ١٩٢٨ کـە قەدەخـەی کرد پەنا ببردرێتە بەر جەنگ بۆ چارەسەرکردنی کێشە نێودەوڵەتییەکان، هەڵوێستێکی نوێ وەرگیرا لە بەرامبەر رەوایـەتیی بـەکارهێنانی هێـز لـە پێوەندییـە نێودەوڵەتییەکانـدا. لـە پـاش پەسـندکردنی پرەنسـیپەکانی نوێرنبـۆرگ و دەسـتووری نەتـەوە یـەکگرتووەکان دوای دووەمـین شـەڕی جیهـان، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بە راشـکاوی بـەکارهێنانی کـردەوەی ناچـارکردن و دوژمنکـاریی لـە لایـەن دەوڵەتەکانـەوە ریسـواکرد. دەبیـنین لـە دەقـی بڕگـە چـواری مـادەی(٢) لـە دەسـتووری نەتـەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە دەڵێت: (( ئەندامانی ئەنجومەن بە تێکڕا، لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانیانـدا، نابێ هەڕەشەبکەن بە بەکارهێنانی هێز یانیش بەکاریبێنن لە دژی ئاسایشی خاك یان سـەروەریی هـیچ دەوڵەتێك یان بە شێوەیەکی تر، کە نەگونجێ لەگەڵ ئامانجەکانی نەتـەوە یەکگرتووەکانـدا)). ئەمـەش واتا ئەو پەیماننامەیەی لە بەرئەنجامی بەکارهێنانی زۆرلێکـردن لـە دژی دەوڵـەت دەبەسـترێ، بـەپێی یاسای نێودەوڵەتی سەردەم بـە بـەتاڵ دادەنـرێ. بۆیـە لـە مـادەی (٥٢)ی ڕێککەوتننامـەی یاسـای پەیماننامەکاندا هاتووە: ((پەیمان بەشێوەیەکی رەهـا بـە باتـڵ دادەنـرێ، ئەگـەر هـاتوو لـە ئاکـامی هەڕەشەکردن بە بەکارهێنانی هێز، یان بە بەکارهێنانی هێـز بەسـترا، بـە پێچـەوانەی ئـەو پرەنسـیپە یاساییە نێودەوڵەتییانەی، کە لە دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتوون)).

ئـەم مادەیـە بـووە مایـەی مشـتومڕێکی زۆر لـە کـۆنگرەی ڤیـەننادا، کـە بـۆ پەسـندکردنی ڕێککەوتننامەکە بەسترا. دەبینین دەوڵەتە سۆشیالیسـتەکان و ژمارەیـەك لـە دەوڵەتـەکانی جیهـانی سێیەم ئاماژەیان دا، کە نەك تەنیا هەڕەشەی بەکارهێنانی هێز، یان بەکارهێنانی بەشێوەی راسـتەوخۆ ناچارکردنە، بگرە فشاری ئـابووری و رامیـاریش بـە ناچـارکردن دادەنـرێ [15]، بـەڵام لێژنـەی یاسـای

15- See Sinclair " Vinna Convention " P.177

نێودەوڵەتی هەڵوێستێکی توندی سەبارەت بـە کێشـەکە وەرنـەگرت، بگـرە مەسـەلەی دیـاریکردنی وردەکاری ئەو کردەوانەی، کە بە زۆرلێکردن دادەنرێن بەجێهێشت بۆ پیادەکردن لە کاتی شـرۆڤەکردنی ئەو جۆرە ئەحکامانەی لە دەستوورەکەدا هاتوون[١٦].

کۆنگرەی ڤیەننا لە پەسندکردنی هەڵوێستی دەوڵەتانی سۆشیالیست و دەوڵەتانی جیهـانی سـێیەم نێزیك بووەوە، کاتێك بەیاننامـەی قەدەخـەکردنی زۆرلێکردنـی سـەربازی و رامیـاری و ئـابووری لـە بەستنی پەیمان پەسـەندکرد. راگەیاندنەکـە نـارەزایی دەربـڕی بەرامبـەر بـە پیـادەکردنی ئـەو جـۆرە ناچارکردنە سەبارەت گەیشتن بە بەستنی پەیماننامە، بەڵام لەنێو رێککەوتننامەکەدا ئـەم ئەحکامانـە دانەنران. ئەمەش وادەکا مرۆ بگاتە بەرئەنجامی ئەوەی، کە پیادەکردنی فشاری رامیاری و ئابووری بـۆ وەرگرتنی رەزامەندی دەوڵەتێك لەدەوڵەتـەکان بـۆ بەسـتنی پەیماننامەیـەك لەوانەیـە سەرپێچـیکردن پێکنەهێنێ بەرامبەر بە یاسای نێودەوڵەتی، بەڵام ئاشکرایە مەسـەلەکە بەسـتراوە بـەو بارودۆخانـەی ئالاون بە هەر حاڵەتێکەوە.

لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا شێوازگەلێکی زۆر هەن دەوڵەتـە بـەهێزەکان بـەکاریان دێـنن بـۆ پیادەکردنی فشار بە سەر ئەو دەوڵەتانەی، کە لە خۆیان لاوازترن وەك پێڕەوکردنـی جـۆرە سیاسـەتێك یان دەربڕینی نارەزایی مەکراوییانە. وردەکارییەکانی هەر حاڵەتێك بەستراون بـە چـەند فاکتەرێکـەوە، ئەوەش هەڵەیە ئەگەر وا باوڕ بکرێ هەر شێوەیەکی لەو جـۆرە لـە شـێوەکانی فشـار بەپێشـێلکردنی یاسای نێودەوڵەتی دادەنرێ.

دادوەر پادیلا نێرڤۆ Padilla Nervo لە کێشەی راوەماسیدا ئامـاژەی داوە و دەڵـێ: ((هەنـدێ فشاری مانەوی و سیاسی هەن بە بەڵگەنامـەی حاشـاهەڵنەگر ناسـەلمێندرێن، بـەڵام لـە واقیعـدا بـە فشاری کردەیی دادەنرێن و بە رەوتی مێژوو وایانکردووە پـەیمان و رێککەوتننامـە مـۆربکرێن و وایـان بڵاوکردۆتەوە گوایا بە ئازادی و بەپێی پرەنسیپی پیرۆزیی گرێبەست و جێبـەجێکردنی (( Pact Sunt servanda)) بەستراون[١٧]. دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکرێ، کە دەستەواژەی ((بە سەرپێچـیکردن لـە پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی کە لە دەستوورەکە دا هاتوون))، بەشـێوەیەك بـەکارهێنراوە، مـرۆڤ وای لێتێناگات، کە مادەی (٥٢) جگە لە دەوڵەتە ئەندامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بەسـەر ئـەوانی تردا جێبەجێ ناکرێ، بگرە دەبێ بەو پێیە مامەڵەی لەگەڵ بکرێ کە نۆرمێکی گشتییە.

---

16- Yearbook of the ILC، 1966, VOL .11 ،P.246

17- 55ILR .P227

## ٢- كۆتایی پێهێنانی پەیماننامە و راگرتنی کارپێکردنی:

کۆتایی پێهێنانی کارپێکردن بە پـەیمانی نێودەوڵـەتی یـانی نـەمانی سـیفەتە ئیلزامییەکـەی لـە پێوەندیی نێوان لایەنەکان و نە خولڤاندنی ماف و ئیلتیزام لە بەرامبەریاندا. دەکرێ کۆتایی بـە پـەیمان بهێنرێ یان لایەنێك لە لایەنەکانی لێی بکشێتەوە: ١- بەپێی حوکمەکانی پەیماننامەکـە یـان ٢- لـە هەرکاتێکدا بە رێککەوتنی هەموو لایەنەکان پاش راوێژکردن لەگەڵ ئەودوای دەوڵەتـە هاوپەیمانـەکان، بەڵام پەیمانی فرەلایەن کۆتایی پێ نایەت تەنانەت لەبەر کەمبوونەوەی ژمارەی لایەنـەکانی زیـاتر لـەو رادەیەی کە پێویستە تاوەکو بچێتە واری کارپێکردن، ئەگەر دەقێکـی پەیماننامەکـە رێگەیـەکی تـری دانەنابێ.

ئەمانەی لای خوارەوە، چەند شێوازێکی کۆتـایی پێهێنـانی یـان راگـرتنی کـارپێکردنی پـەیمانی نێودەوڵەتین:

### ١- رێککەوتنی لایەنەکان:

لە دەقی زۆرینـەی پەیماننامەکانـدا تاکیدکراوەتـە سـەر راگـرتنی کارپێکردنیـان بـەپێی چـەند کردەکارییەکی دیاریکراو و لەم حاڵەتـەدا دەکـرێ کارپێکردنیـان رابگـیرێ بەرامبـەر لایەنـەکان یـان بەرامبەر لایەنێکی دیاریکراو بەپێی ئەو دەقەی تێیاندا هاتووە و هەروا بە گوێرەی ئـەو رێوشـوێنانەی دایانڕشتووە. هەروا دەکرێ کارپێکردن بە پەیماننامە ڕابگیرێ، لەهەر کاتێکدا و بە رەزامەندی هـەموو لایەنەکان، دوای راوێژکردن لەگەڵ ئەودوای دەوڵەتە هاوپەیمانەکاندا.

ئەو پەیماننامەیەی دەقێکی تێدا نییە سەبارەت بە کۆتایی پێهێنـانی و باسـی ئـەوە ناکـات، کـە دەتوانرێت هەڵبوەشێتەوە یان لێی بکشێنرێتەوە ئەوە دەکرێ تەنیا لە حاڵێکدا هەڵبوەشێتەوە یان لێـی بکشێنرێتەوە، ئەویش ئەگەر دەرکەوت، کە نیازی لایەنەکانی بەرەو ئەوەیە، کە بکـرێ هەڵبوەشـێتەوە یان لێی بکشێنرێتەوە یان ئەگەر بکرێ مافی هەڵوەشانەوە یان کشـانەوە لـە سرووشـتی پەیماننامەکـە وەدەربخرێ هەستی پێ بکرێ، بە مەرجێك ئەو لایەنەی ئـارەزووی کۆتـایی پێهێنـان یـان کشـانەوەی هەیە، دەبێ بە لایەنی کەم دوانزە مانگ پێشتر لایەنەکەی تر بەنیازی خـۆی ئاگـەداربکات. (مـادەی "٥٦" لە یاسای پەیماننامەکان).

بێگومان پەیمانی نێودەوڵەتی کۆتـایی پێـدێت، بـە جێبـەجێکردنی ئامـانج ومەبەسـتەکانی یـان تەواوبوونی ئەو ماوەیەی بۆ کارپێکردنی دیاریکراوە تیایدا.

لە پەیمانێکی فرەلایەندا دوو لایەن یان زیاتر دەکرێ لەنێوەخۆیاندا رێککەون لەسەر گـۆڕینی چـەند

دەقێکی دیاریکراوی پەیماننامەکە یان راگرتنی کارکردن بە ئەحکامەکانی ئەگەر پەیمانەکە رێگەبدات و قەدەخەی نەکردبێت، بەمەرجێکیش کاریگەریی نەبێت بەسەر بوونی مافی ئەوانی تر یان جێبەجێکردنی ئیلتیزامەکانیان بەپێی پەیمانەکە و لاریشی نەبێت لەگەڵ بابەت و مەبەست لە پەیمانەکە (بڕوانە مادەی "٥٨"ی یاسای پەیماننامەکان).

هەروا پەیمان کۆتایی دێت کاتێك لایەنەکانی پەیمانێکی دواتر دەبەستن سەبارەت بە هەمان بابەت ئەگەر لە پەیمانە نوێکە دەرکەوت یان بە شێوازێکی تر سەلمێنرا، کە لایەنەکان مەبەستیانە پەیمانە نوێکە، بابەتەکە رێکبخات یان ئەگەر دەقەکانی پەیمانە نوێکە بە تەواوی ناکۆك بێت لەگەڵ دەقەکانی پەیمانی پێشوو بە شێوەیەك نەکرێ لەهەمان کاتدا هەردوو پەیماننامەکە پیادەبکرێن. (بڕوانە مادەی "٥٩" لە یاسای پەیماننامەکان).

## ٢- تێکدانی بنەڕەتی:

سەبارەت بە تێکدانی بنەڕەتی پەیماننامە وەك هۆیەك لە هۆیەکانی کۆتایی پێهێنانی، دوو بۆچوون هەیە، بۆچوونی یەکەمیان رێگە بە دەوڵەتەکانی لایەن دەدات وا دابنێن پەیماننامەکە کۆتایی پێهاتووە، ئەگەر یەکێك لە لایەنەکانی دەسکاری یەکێك لە دەقە گرینگەکانی بکات، بەڵام لەم بارەدا دوور نییە لایەنەکانی تر پەنا ببەنە بەر تۆڵەسەندنەوە لەو دەوڵەتەی پەیماننامەکەی تێکداوە، یانیش لە دژی چەند رێوشوێنێك تەنانەت، نادۆستانەش بگرنە بەر لە پێناو زامنکردنی جێبەجێبوونی پەیماننامەکە. کۆتایی پێهێنانی پەیماننامە لەبەر پێشێلی دەقێکی گرینگی لە لایەن یەکێك لە لایەنەکانییەوە دەبێتە رێگر لەپێش ئەو دەوڵەتەکانی تر، کە بیانەوێ دەقێك لە دەقەکانی پێشێل بکەن، لە هەمان کاتیشدا سوود لە دەقەکانی تری وەربگرن. لەلایەکی دیکەوە رێگەدان بە هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامە بە هۆی سەرپێچیکردنی یەکێك لە لایەنەکانی لە تاکە دەقێکی گەوهەری تیایدا، ئەوە دەگەیەنێ، کە جێبەجێکردنی پەیماننامە لە لایەن دەوڵەتە لایەنەکانەوە ئارەزومەندانەیە. بۆیە لەم جۆرە حاڵەتانەدا نەرمی و بڕوا و متمانە پێویستن.

بۆچوونێك هەیە لە یاسای نێودەوڵەتی نەریتیدا کە تەنیا سەرپێچیکردن لە دەقێك لە دەقەکانی پەیماننامە بە هۆیەك دانانرێ تاوەکو دەوڵەتە لایەنەکانی تر پشتی پێ ببەستن بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەکە، بگرە پێویستە سەرەڕای ئەوەش چەند هۆیەکی جدییانەی تر هەبن. بۆ نموونە لە کێشەی ناوبژیوانی Tacna-Arica نێوان چیلی و پیرۆدا هاتووە، کە بەپێی ئەو رێککەوتننامەیەی تایبەتە بە پیادەکردنی ریفراندۆم لەسەر هەرێمی پیرۆڤیان کە پێشتر لە لایەن چیلییەوە داگیر کرابوو

((وادەردەکەویٚ ئەگەر بەکارهێنانی نادروستی کارگێڕیمان وەك هۆیەك دانـا بـۆ هەڵوەشـاندنەوەی ئـەو جۆرە ڕێککەوتننامەیە، ئەوا پێویستە لـە ئـەنجامی پێشـێلکارییە کارگێڕییەکانـدا هۆکـاری جدیانـە کەوتبێتەوە بۆ هەڵوەشاندنەوەی مەبەست لە ڕێککەوتننامەکە))[18] .

بڕگە ٣ی مادەی (٦٠) لە یاسای پەیمانەکان وادادەنێت، کە ڕەتکردنەوەی کارکردن بە پەیماننامـە، لەو حاڵەتانەی کە یاسای پەیماننامەکان ڕێگەی پیێ نادات، یان پێشـێلکردنی دەقێکـی پێویسـت بـۆ وەدیهێنانی بابەتی پەیماننامەکە یان مەبەست لێی، پێشێلکردنێکی گەوهەریانەی وایە، کە ڕێگـە بـە لایەنەکانی تر دەدات وەك بنەمایەك بەکاری بێنن بۆ کۆتـایی پێهێنـانی پەیماننامەکـە یـان ڕاگـرتنی کارپێکردنی بە شێوەیەکی گشتی یان بەشی.

ئەوەبوو بەشی دووەمی بڕگە ٣ لە کێشەی Rinbow warrior ، کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێـدا، پراکتیزەکـرا سـەبارەت بـە ڕێککەوتننامـەی نیۆزیلانـدی – فەرەنسـی بـۆ سـاڵی ١٩٨٦، کـە جەختیکردۆتە سەر ئیلزامکردنی فەرەنسا بە هێشتنەوەی دوو کارمەندی لە دورگەی هـاو (Hao) بـۆ ماوەیەك لە سیٚ ساڵ کەمتر نەبیٚ.

دادگەی ناوبژیوانی تایبەت، کە سەیری کێشەکەی دەکرد بەم شـێوەیە بڕیـاری دا، کـە ڕێگـەدانی فەرەنسا بە ڕۆیشتنی دوو کارمەندەکە بەبیٚ ڕەزامەندی نیوزیلاند و پێش تێپەڕبوونی ئەو سـیٚ سـاڵەی لە ڕێککەوتننامەکە دیاریکراوە بە پێشێلکارییەکی گەوهەری دادەنریٚ بۆ ڕێککەوتننامەکـە، چـونکە مانەوەیان بابەتی ڕێککەوتننامەکە بووە.[19]

کاتێك تێکدانی بنەڕەتی بۆ ئەحکامی پەیماننامەیەکی دووقۆڵی لەلایەن یـەك لـەو دوو لایەنـەی دەکریٚ، لایەنی دووەم مافی هەیـە وەك بنەمایـەك ئـەو تێکدانـە بکاتـە هـۆ بـۆ کۆتـایی پێهێنـانی پەیماننامەکە یان وەستانی کارکردن بـە هـەمووی یـان بەشـێکی، بـەڵام مەسـەلەکە لـە پەیماننامـە فرەلایەنەکاندا جیاوازە، چونکە لەوانەیە هەندیٚ لایەنی پابەند بە پەیماننامەکـە نەیـەویٚ پەیماننامەکـە

---

18- RIAA , P.921 (1925)

19- 82. ILR (1990) 499

کێشەکە ئەوە بوو کە لە ساڵی ١٩٨٦دوو کارمەندی فەرەنسی هێرشیان بردە سەر کەشتی Rainbow warrior ی سەر بە ڕێکخراوی ئاشتی سەوز، کە تایبەتمەندە بە ژینگە، لەکاتێکدا لە ئاوی نەرویجی بوو. ئەم کێشەیە نێردرا بۆ سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان و بە یارمەتی ئەو گەیشتنە ڕێککەوتنی ساڵی ١٩٨٦ لە نێوان هەردوو وڵاتدا. بە پێی ڕێککەوتننامەکە دەبوایە کارمەندەکان بنێردرێن بۆ ئەو بینا سەربازییە فەرەنسسیانەی لە سەر دوورگەی "هاو" "Hao" ن، بۆ ماوەیەك لە سیٚ ساڵ کەمتر نەبیٚ، ئەگەر لایەنەکان لە سەر شتێکی تر ڕێکنەکەون.

هەڵبوەشێنێتەوە لەبەر تێکدانی دەوڵـەتێکی تـر. بـۆ چارەسـەرکردنی ئـەم مەسـەلەیە بڕگـە (٢)ی مادەی(٦٠) دەڵێ: ((تێکدانی بنەڕەتی ئەحکامی پەیماننامەیەکی هەمەلایەن لـە لایـەن یـەکێك لـە لایەنەکانییەوە ئەمانەی خوارەوەی لێ دەکەوێتەوە:

أ- ئەم تێکدانە رێ بەلایەنەکانی تر دەدات بە کۆمەڵی رێکبکەون لەسەر وەستانی کـارپێکردن بە تێکرای پەیماننامەکە یان بە بەشێکی، یان:

١- لەپێوەندیی نێوانیان و نێوان ئەو دەوڵەتەی ئەحکامەکانی تێکداوە.

٢- یانیش لە پێوەندیی نێوان هەموو لایەنەکان.

ب- ئەو لایەنەی بەتایبەت لە ئاکامی ئەم تێکدانە کاریگەریی کراوەتە سەر، رێـی دەدرێ ئـەو تێکدانە بکاتە هۆ وەك بنەمایەك بۆ راگرتنی کارپێکردن بە پەیماننامەکە بە گشتی یـان بـە بەشـێکی لە پێوەندیی نێوانی خۆی و نێوان ئەو دەوڵەتەی پەیماننامەکەی تێکداوە.

ج- رێدەدرێ بە هەر لایەنێکی تر جگە لـەو لایەنـەی پەیماننامەکـەی تێکـداوە، وەك بنەمایـەك بیکاتە هۆ بۆ راگرتنی کارپێکردن بە تێکڕای یان بە بەشێکی بەرامبەر خۆی، ئەگـەر سرووشـتی ئـەم پەیماننامەیە وا بکات تێکدانی بنەڕەتی لـە ئەحکامـەکانی لەلایـەنی یـەکێك لـە لایەنەکانـەوە، بـە شێوەیەکی بنەڕەتی رەوشی هەر لایەنێك بگۆڕێ لە رووی ئەدای ئیلتیزامە داهاتووەکـانی بـە گـوێرەی پەیماننامەکە)).

پێویستە ئاماژە بەوە بدەین، کە ئەو دەقانەی لە مادەی (٦٠)دا لەبارەی پێناسـەکردنی تێکـدانی بنەڕەتی و بەرئەنجامەکانییەوە هاتوون بەپێی بڕگە(٥)ی مادەی(٦٠) ئـەو ئەحکامانـە ناگرنـەوە، کـە تایبەتن بە پاراستنی ئەو کەسانەی لە پەیماننامەگەلێکی بە سرووشت مرۆییدا هاتوون، نەخاسـمە ئـەو ئەحکامانەی پێوەستن بە قەدەغەکردنی هەر جۆرە تۆڵەسەندنەوەیەك لە دژی ئەو کەسانەی ئـەم جـۆرە پەیواتانە دەیانپارێزن.

**١- ئەستەمیی جێبەجێکردن:**

هەندێ جار پەیماننامە قابلی جێبەجێکردن نییە، یاخود مەحاڵە جێبـەجێ بکـرێ، وەك بزربـوونی دوورگەیەك کە بابەتی پەیمانێکی نێودەوڵەتییـە بـە هـۆی نوقمبـوونی لـەنێو ئـاودا یـان وشـکبوونی رووبارێك. بەرئەنجامەکانی ئەم جۆرە رووداوانە وا دەکەن جێبەجێکردنی پەیمان ئەسـتەم بێـت. دەبیـنین بەپێی مادەی(٦١)ی یاسای پەیماننامەکان دەکرێ لایـەنێك لـە پەیماننامەیەکـدا پشـت ببەسـتێ بـە نەکردەیی جێبەجێکردنی وەك بنەمایەك بۆ کۆتایی پێهێنانی یان کشانەوە لێی ئەگەر ئـەم نەکردەییـە

له بەرئەنجامی بزربوون یان لە ئاکامی فەوتانی شتیکی زەروور بێ بۆ جێبەجێکردن، بەڵام ئەگەر ئەو نەکردەییە لە بەرئەنجامی تێکدانێکی گەوهەرییەوە بێ لەلایەن یەکێك لە لایەنەکان بە ئیلتیزاماتەکەی بەپێی پەیماننامەکە یان بە هەر ئیلتیزامێکی نێودەوڵەتی، کە دەبێ ئیلتیزامی پێوە بکات لە بەرامبەر هەر لایەنێکی تر لە پەیماننامەکە، ئەوا ئەم لایەنە بۆی نییە پشت ببەستی بە نەکردەیی جێبەجێکردن وەك بنەمایەك بۆ کۆتایی پێهێنانی پەیماننامەکە یان کشانەوە لێی یان راگرتنی کارپێکردنی.

**٢- گۆڕانکاریی بنەڕەتی بارودۆخ:**

یاسای نەریتی نێودەوڵەتی، گوڕانی بنەڕەتی بارودۆخ لە پاش بەستنی پەیماننامەی نێودەوڵەتی بە هۆیەك دەژمێرێت، کە دەکرێ لایەنەکانی پەیماننامە پشتی پێ ببەستن بۆ کشانەوە لێی یان بۆ پووچەڵکردنی. ئەویش لەبەرئەوەی هەندێ لە پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان تاوەکو ماوەیەکی زۆر دەمێننەوە و کاریان پێدەکرێ، لەو ماوە دوورودرێژەشدا گۆڕینی گەوهەری لە بارودۆخ روودەدات بە جۆرێك لەوانەیە ئەم گۆڕانە یەکێك لە لایەنەکان هانبدات، کە رێوشوێنی توند بگرێتە بەر بەرامبەر بە هەموارکردنی دەقەکانی پەیماننامەکە.

ئەم تیۆرییە لەسەر ئەو بنەمایە رەخنەی لێ دەگیرێ، ئەگەر وادابنرێ کە هیچ سستێمێك نییە بۆ مەودای دەسەڵاتی یاسایی ئیلزامی لە یاسای نێودەوڵەتیدا، ئەوە رەنگە ئەم نۆرمە کاریگەرییەکی نەرێنیی هەبێ بەسەر هێزی یاسایی ئەو ئیلتیزامانەی دەوڵەتەکان گرتوویانەتە ئەستۆ. چونکە دەکرێ وەك بیانوو بەکاربهێنرێ بۆ کشانەوە لە پەیماننامەکان تەنانەت لەو حاڵەتانەش کە پشت دەبەسترێ بەبنەمای لاوازەوە.[٢٠]

بۆچوونی نوێ لە یاسای نێودەوڵەتیدا، دانیناوە بە بوونی ئەو تیۆرییەدا، بەڵام چەند کۆتبەندییەك دەخاتە پێش پراکتیزەکردنی. دەبینین دادگەی نێودەوڵەتی لە کێشەی (( Fisheries Jursdiction Case)) جەختیکردووە، کە ((یاسای نێودەوڵەتی دانیپێدادەنێت، کە گۆڕانی بنەڕەتی لەو بارودۆخانەی پاڵی بە لایەنەکانەوە ناوە بۆ قبوولکردنی پەیمان، ئەگەر بووە هۆی زیادبوونی ئەو ئیلتیزامانەی بەشێوەیەکی بەرفرەوان لە بارودۆخێکی تایبەتدا سەپاندوویانە، بەڵگە دەداتە لایەنی

20- 1. Sinclair, TheViena Convention on the Law of Treaties, 2 nd edn, Manchester, 1984 , P.193

زەرەرمەند داوابكات پەیماننامەكە پووچەڵ بكرێ یان لە كارپێكردنی رابگیرێ)).[21] هەروا دادگە جەختی كردۆتە سەر پەنانەبردن بۆ پراكتیزەكردنی تیۆرییەكە تەنیا پاش ئەوەی ((لە ئاكامی ئەو گۆڕانكارییانەدا ئەركی ئیلتیزام زیادبكات بە رادەیەك كە پێویستە شتێ جێبەجێ بكرێ، كە جیاوازبێ لەگەڵ ئەوەی لەسەری رێككەوتبوون.[22] مادەی(٦٢)ی یاسای پەیماننامەكان كە دادگەی دادی نێودەوڵەتی لە چەندین بۆنەدا بە تۆماركردنێكی یاسای نەریتی باوی داناوە دەڵێ:"

١- ناكرێ پشت ببەسترێ بە گۆڕانی بنەڕەتی پێشبینی نەكراو لەو بارودۆخانەی باڵادەست بوونە لەكاتی بەستنی پەیماننامەدا وەك هۆیەك بۆ كۆتایی پێهێنانی پەیماننامە یان كشانەوە لێی، تەنیا بە بوونی ئەم دوو مەرجەی لای خوارەوە نەبێ:

أ-ئەگەر بوونی ئەم بارودۆخانە بناخەیەكی گرینگی هەبووبێ بۆ ئەوەی لایەنەكان رازیبن تاوەكو بە پەیماننامەكەوە پابەندبن.

ب- ئەگەر گۆڕانكارییەكە ببێتە هۆی گۆڕانكارییەكی بنەڕەتی لە مەودای ئەو ئیلتیزامانەی كە پێویستە لە داهاتوو بەپێی پەیماننامەكە جێبەجێ بكرێن.

٢- ناكرێ پشت بە گۆڕانی گەوهەری ببەسترێ لە بارودۆخەكاندا وەك هۆیەك بۆ كۆتایی پێهێنانی پەیماننامە یان كشانەوە لێی لەم حاڵەتانەدا:

أ-ئەگەر پەیماننامەكە دروستكەری سنوور بێ.

ب- ئەگەر گۆڕانە بنەڕەتییەكە لە ئاكامی سەرپێچی لایەنەكە بێ لە ئیلتیزامێكی پەیماننامەیی یان هەر ئیلتیزامێكی نێودەوڵەتی تری هەر لایەنێكی دیكەی پەیماننامەكە))[23].

مادەكە دیسان جەختدەكاتە سەر ئەوەی، كە یەكێك لە لایەنەكان مافی هەیە پشت ببەستێ بە هەمان هۆ، لەو حاڵەتانەی باس كران، بۆ راگرتنی كارپێكردن بە پەیماننامەكە لە جیاتی كۆتایی پێهێنانی یان كشانەوە لێی.

---

21- 55 ILR , P200

22- Ibid.

23- Ibid

## باسی یەکەم

# چەمکی کەسایەتیی یاسایی نێودەوڵەتی

هەر سیستەمێکی یاسایی کەسانی یاسایی خۆی هەیە و خۆیشی ئەو مەرج و پێداویستییانە دیاریدەکات، کە پێویستە لە کەسەکەدا (تاك یان مانەوی) هەبێت، تاوەکو بە کەسێك لە کەسەکانی بژمێردرێ. کەسەکانی یاساش بەپێی جیاوازی سیستەمە یاساییەکان، دەگۆڕێن و دەکرێت دابەش بکرێن بۆ چەند جۆرێك، هەندێکیان سەرەکین و هەندێکیشیان لاوەکین. لەبەر ئەمە پێویستە چەند تایبەتمەندییەکی گشتیی هاوبەشی سەرەکی لە کەسەکانی یاسادا هەبن بە جۆرێك کە رێکبن لەگەڵ ئەو پێداویستییانەی هەر سیستەمێکی یاسایی دایان دەنێت تاوەکو ببن بە خاوەن ماف و ئیلتیزام.

هەندێ لە یاساناسەکان چەند مەرجێکی گشتییان دیاریکردووە و پێیان وایە پێویستە لە کەسە یاساییەکانی هەر سیستەمە یاساییەکدا هەبن، ئەوانەش برێتین لە:

١- کەسی یاسایی دەبێ بەشداری لە پێوەندییەکی یاسایی دیاریکراودا بکات، واتا ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتییانەی کە نۆرمی یاسایی سیستەمێکی یاسایی دیاریکراو رێکیان دەخەن.

٢- کەسە یاساییەکان خاوەن ئیرادەیەکی ئازادی سەربەخۆن، چونکە هەموو پێوەندییە یاساییەکان برێتین لەو پێوەندییانەی لەسەر ویستی ئازاد بونیادنراون.

٣- کەسە یاساییەکان ماف و ئیلتیزام لەبەرامبەر کەسەکانی تر دەگرنەخۆ لە چوارچێوەی سیستەمێکی یاسایی دیاریکراودا واتا مەرج و ئەهلییەتی پێویستیان هەر لەکاتی لە دایکبوونیانەوە هەیە. (١)

ئەم پێوەرانە ناکرێ دەقاودەق بەسەر کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتیدا پراکتیزەبکرێن، چونکە یاسای نێودەوڵەتی جیاوازی هەیە لەگەڵ یاساکانی تردا لە رووی سەرچاوە و ئەو بابەتەی رێکیدەخات. سەرەڕای ئەمەش کەسەکانی جیاوازییان هەیە لەگەڵ کەسەکانی تردا.

---

(١) - د. ب . لیفین: هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣١

دەبینین ئەو پەرەسەندنەی لە دەیەکانی دواییدا لە پێوەندیی نێودەوڵەتی روویدا، وایکرد جۆراوجۆرییەکی قەبارەیی و چەشنیٚ لە کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتیدا هەبن. چونکە هەموو قۆناخێکی مێژوویی مرۆڤایەتی مۆرکی تایبەتی خۆی بەجێدێلیٚ بەسەر ئەو کەسانەی بەشدارن لەپێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا. کەسەکانی پێوەندیی نێودەوڵەتی بریتین لە گەل و نەتەوە و تەکەتولی نێودەوڵەتی و هەرێمیی و بزووتنەوەی جۆراوجۆر و حیزب و سەندیکا نێودەوڵەتییەکان و نیشتمانی و دەزگە ئابووری و دارایی و کشتوکاڵی و تەنانەت تاکەکانیش وەك سەرۆکی دەوڵەتەکان و سەرۆکی شاندە دیپلۆماتییەکان، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنیٚ هەموو ئەوانە کەسانی یاسای نێودەوڵەتین، چونکە چەمکی کەسی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان دەقاودەق نییە لەگەڵ چەمکی کەسی یاسای نێودەوڵەتی.[٢]

بەپێی بۆچوونێکی تر، تایبەتمەندییەکانی کەسی یاسایی نێودەوڵەتی جگە لە دەوڵەت لە لای لایەنێکی تر نابینرین. لایەنگرانی ئەم رایە پێیان وایە دەبیٚ کەسی یاسایی نێودەوڵەتی ببێتە خاوەن ماف و ئیلتیزاماتی تایبەت و توانای دانانی نۆرمی یاسای نێودەوڵەتی هەبێت و رێوشوێنی زەروور بگرێتەبەر بۆ زامنکردنی پراکتیزەکردنی ئەم نۆرمانە. دواییش چەمکی کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی توندوتۆڵ هاوبەندە بە دانیشتووان و هەرێم(خاك) و بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی بەرامبەر پێشێلکردنی ئیلتیزاماتی نێودەوڵەتی.[٣]

یاساناس د. ب لیڤین وەڵامی ئەم بۆچوونە وا دەداتەوە: لە واقیعی کردەییدا، لە یاسای نێودەوڵەتی جگە لەو دەوڵەتانەی ئەو سیفاتانەیان هەیە، کە لەسەرەوە باسمان کردن لەبارەی کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتییەوە، کەسانی تر هەن ئەو سیفاتانەیان تێدا نییە، بەڵام کەسایەتییەکی یاسایی تایبەتی سنووردارییان هەیە بە بەراورد لەگەڵ کەسایەتی یاسایی دەوڵەتدا.[٤]

ئەهلیەتی یاسایی پرسێکی یاسایی تەنیا نییە، کە دابڕابێت لە پێوەندیی کۆمەڵایەتی بابەتی، بگرە توانایەکە سیستەمێکی یاسایی دیاریکراو دەیبەخشێتە کەسەکانی خۆی تاوەکو ماف و ئیلتیزامیان هەبێت. بۆیە بەدەر لە هەبوونی هەندیٚ لە ماف و ئیلتیزامی دیاریکراو،

---

2- Т. Ядкар, Нацията Като Субект на Международното право София.1977

٣– ب. ی. شورشالُف: پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان. مۆسکۆ ١٩٧١ ل ٥٣ – ٥٥.

٤- د. ب . لیفین: هەمان سەرچاوە ل ٤٩.

ناكرێ باس لە ئەهلییەتی یاسایی بكرێ. پێزانین بە كەسێك كە ماف و ئیلتیزاماتی هەیە، واتا پێزانین بە ئەهلییەتە یاساییەكەی، بەڵام ناكرێ باس لە كەسێك بكرێ كە ماف و ئیلتیزاماتی دیاریكراوی هەیە، بەبێ پێزانین بە ئەهلییەتە یاساییەكەی. بەم واتایە ئەهلییەتی یاسایی، كە بریتییە لە كۆمەڵێك ماف و ئیلتیزاماتی تایبەت كە سیستەمێكی یاسایی دیاریكراو بەكەسێك دەیبەخشێ، بریتییە لەو توانا گشتییەی، كە سیستەم پێی دەبەخشێ بۆ ئەوەی بیكاتە كەسێكی یاسایی. لەم روانگەشەوە چەمكی ئەهلییەتی یاسایی لەگەڵ كەسایەتی یاساییدا دەقاودەق دەبێ. ئەگەر دان بە ئەهلییەتی كەسێكدا نرا وەك خاوەنی ماف و ئیلتیزامات، واتا ناسینی وەك كەسێكی یاسایی، لە هەمان كاتدا واتا داننانیش بە ئەهلییەتە یاساییە تایبەتییەكەیدا. بەم جۆرەش هەردوو چەمك لە رووی گرینگیی یاساییەوە یەكتر تەواودەكەن. ئەمەش هەموو ئەوە دەگەیەنێ، كە سنووورداركردن یان لە دەستدانی توانای ئەنجامدان (اهليه الاداو)، ئەهلییەتی یاسایی سنووردارناكات.

لە كاتێكدا سیستەمی یاسایی نێوەخۆیی پێوەری كۆمەڵایەتی و سیاسی و یاسای پێویست دادەنێت بۆ پێزانین بە تاك یان بە كەسی مانەوی، وەك كەسانی یاساكان، دەبینین سیستەمی یاسایی نێودەوڵەتی ئەو جۆرە پێوەرانەی نییە تاوەكو مەرجی گشتی پێویست دابرێژێت و بە گوێرەیان دان بنرێ بە كەسەكاندا وەك كەسی یاسای نێودەوڵەتی. ئەم هۆیە وایكردووە یاساناسەكان بۆچوونی باشتریان هەبێ لەبارەی كەسایەتی یاسایی لە یاسای نێودەوڵەتی هاوچەرخدا. كەسی یاسای نێودەوڵەتی لە هەمان كاتدا كەسی پێوەندیی نێودەوڵەتییە. ئەو بریتییە لە توخمێك لە هەردوو توخمەكانی یاسای نێودەوڵەتی و پێوەندیی نێودەوڵەتی و ئەو قەوارەیەشە، كە بەشداری دەكات یان دەتوانێ بەشداری لە پێوەندییە یاساییە نێودەوڵەتییەكان و بەستنی پەیماننامەی نێودەوڵەتی كارپێكراو، بكات. ئەمە وا لە تاكەكەس دەكات ببێتە خاوەن ماف و ئیلتیزاماتی یاسایی و بتوانێ مافە نێودەوڵەتییەكانی بپارێزێت. ئەو پێوەندییانەش تێیاندا بەشداردەبێ یان تێیاندا دەتوانێ بەشداری بكات بریتین لەو پێوەندییە نێودەوڵەتییانەی، كە نۆرم و پرەنسیپەكانی یاسای نێودەوڵەتی رێكیان دەخەن.[٥]

ئەهلییەتی یاسایی نێودەوڵەتی توانای وەرگرتنی ماف و پابەندبوون بە ئیلتیزاماتە نێودەوڵەتییەكان دەداتە كەسی یاسایی نێودەوڵەتی، كە تەنیا كەسەكانی یاسای نێودەوڵەتی

5- А. Шишков. Международно публично право. Пловдив 2000. ,ctp١٦٣

هەیانە بەبێ ئەوەی قەبارەکانیان لەبەرچاوبگیرێت، کـە نـۆرمی یاسـای نێودەوڵـەتی دیاریـان دەکەن. ئەم ماف و ئیلتیزاماتانەش لە لایەکەوە دابەش دەبنە سەر ماف و ئیلتیزاماتی گشتی و تێکڕایی وا، کە لە پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتییەوە هەڵقوڵاون و پێوەندییان هەیـە بـە هەموو کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتییـەوە و لەولاشـەوە مـاف و ئیلتیزامـاتی تایبـەتی واتـا تاکانەی پێوەست بە کەسێکی دیاریکراو بەپێی ئیلتیزامـاتێکی بـەڵێنی ئیلتیزامـی پێوەیـان کردووە. گرینگترین تایبەتمەنـدیش لـە تایبەتمەندییـەکانی ئەهلییـەتی یاسـایی نێودەوڵـەتی، ئەهلییەتی بەڵێنییە واتا کەسـی یاسـای نێودەوڵـەتی مـافی هەیـە پەیماننامـەی نێودەوڵـەتی ببەستێت. (٦)

ئەهلییەتی ئەنجامـدان لـە یاسـایی نێودەوڵەتیـدا ئـەوە دەگەیـەنێ، کـە کەسـی یاسـای نێودەوڵەتی، هەر لە هەبوونی ئەو ئەهلییەتەوە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی توانـای هەیـە بـە کاری ئارەزوومەندانەی خۆی ماف و ئیلتیزاماتـەکانی خـۆی بـەکاربێنێ. دوای دروسـتبوونی کەسی یاسایی نێودەوڵـەتی، ئەهلییـەتی یاسـایی نێودەوڵـەتی بـە شـێوەیەکی ئۆتۆمـاتیکی دەبەسترێتە هاودەقبوونی (تطابق) ئەهلییەتی بـوون (وجـوب) لەگـەڵ ئەهلییـەتی ئەنجامـدان (اداء) لە هەمان کاتدا(٧). ئەم ئەهلییەتە یاساییە نێودەوڵەتییـە پێشـی هـەموو شـتێك لـە بەشداربوونی هاوبەشی کەسی یاسـای نێودەوڵـەتی بـە شـێوەیەکی سـەربەخۆ لـە پێوەندییـە نێودەوڵەتییەکان و توانای لە ئەستۆگرتنی ئیلتیزام و شادبوون بە ماف بەدیاردەکەوێ. ئەویش لە میانەی بەستنی ئەو پەیماننامە نێودەوڵەتییانـەی، کـە سـتوونن لەسـەر نۆرمـە یاسـاییە عورفییە نێودەوڵەتییەکان. توانای کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی لـە دانـانی نـۆرمی یاسـایی نێودەوڵەتی وەك یەك نییە، واتا جۆری کەسی یاسـایی توانایەکـەی دیاریـدەکات لـە دانـانی نۆرمی یاساییدا. دەبینین دەوڵەت گەورەترین توانای هەیە بۆ دانانی ئـەو نۆرمـە یاسـاییانەی ئەو بابەتانە لەخۆدەگرن، کـە پێوەسـتن بـە پێوەندییـە نێودەوڵەتییەکانـەوە، وەك: پێوەنـدیی ئابووری و رامیاری و کۆمەڵایەتی و کولتووری و وەرزشی... هتد. ئەم پێوەندییانە بابەتن بـۆ چارەسەرکردنی یاسـاییانەی نێودەوڵـەتی بـە رێگـەی بەسـتنی پەیماننامـەی نێودەوڵـەتی بـۆ چارەسـەرکردنی نێودەوڵـەتی. جگـە لـەو بابەتانـەی بـە رێگـەی پرەنسـیپەکانی یاسـایە نێودەوڵەتییەکانەوە چارەسەردەکرێن، کێشەی تر هەن بە زۆری پێوەستن بە هـەرێمێ "خـاکی"

6- Орлин Борисов. Международно публично право, София. 2003, стр 67
7- И. Владимиров;  Международно публично право, Софиял 2001,ctp.32

نیشتمانی و نێودەوڵەتی و تێکەڵاو و...هتد یان ئەنجامدانی کارێك یان رازینەبوون بە ئەنجامدانی، بە مەرجێك رەوابێت بەپێی یاسای نێودەوڵەتی.

پاش ئەوەی زانیمان کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی برێتین لەو کەسانەی بەشداری دەکەن لەو پێوەندییە نێودەوڵەتییانەی، کە لایەنەکانیان ماف و ئیلتیزامیان هەیە و یاسای نێودەوڵەتی بڕیاریان لەسەر دەدا، ئەوە دەکرێ بگەینە ئەم بەرئەنجامانەی لای خوارەوە:

١- کەسی یاسایی نێودەوڵەتی بەشداری دەکات لەو پێوەندییە نێودەوڵەتییانەی، کە سرووشتێکی ئابووری و رامیاری و کولتوورییان هەیە و چواچێوەی ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتییانە دەبەزێنن، کە لەناو دەوڵەتدا دروستدەبن و ملکەچی یاساکانین.

٢- گەرەکە کەسی یاسایی نێودەوڵەتی توانای وەدەستهێنانی ماف و لە ئەستۆگرتنی ئیلتیزامی هەبێ و بشتوانێ وەدییان بێنێ.

٣- پێویستە یاسای نێودەوڵەتی سەرچاوەی ئەو ماف و ئیلتیزاماتانە بێت، کە لە ئەستۆی کەسی نێودەوڵەتیدان.

## باسی دووەم

# جۆرەکانی کەسی یاسای نێودەوڵەتی

نێزیکەی هەموو یاساناسە نێودەوڵەتییەکان پێیان وایە، کە جگە دەوڵەت، ئەم قەوارانـەی لای خوارەوەش توانای یاسایی نێودەوڵەتییان هەیە:

١- ئەو رێکخراوە نێودەوڵەتییانەی دەوڵەتەکان دایاندەمەزرێنن.

٢- تاکەکان تا رادەیەك.

٣- هەندێ قەوارەی شێوە دەوڵەت.

٤- نەتەوە و گەلانی خەباتگێڕ لە پێناوی مافی چارەنووسدا.

## تەوەری یەکەم

## کەسانی یاسای نێودەوڵەتیی جگە لە دەوڵەتان

### ١- کەسایەتی نێودەوڵەتیی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی:

ئەو پەیمانەی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی دادەمەزرێنێ، لە تەك ئەو بابەتانەی باسی دەکات باسی ئەو ئەهلییەتەش دەکات، کە ڕێکخراوەکە هەیەتی وەك کەسێکی یاسای نێودەوڵەتی. مادەی (١٠٤) لە دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان دەڵێت: (دەزگە لە وڵاتەکانی هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی، ئەو توانا یاساییەی هەیە، کە بۆ بەدیهێنانی فەرمانەکانی و جێبەجێکردنی ئامانجەکانی پێویستی پێیەتی). مادەیی(١٠٥)یش لە دەستوورەکە دەڵێت: (دەزگەکە لە خاکی هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی ئەو تایبەتمەندی و ئیعفائاتانەی هەیە، کە وەدیهێنانی ئامانجەکانی دەیانخوازێت). هەروەها دۆکومێنتی دامەزراندنەکە وردەکارییەکانی ئەندامێتی لە ڕێکخراوەکە و ئامانجەکانی و شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ دەوڵەتانی ئەندام و دەوڵەتەکانی تر و وەرگرتنی بڕیار لە لایەن دەزگە جۆراوجۆرەکانییەوە، دیاریدەکات.

ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان هۆکارێکی گرینگ بوو بۆ تۆژینەوە لە ئەهلیەتی یاسایی نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی چڕوپڕ. دەبینین بە سەرهەڵدانی ژمارەیەکی زۆر لە ڕێکخراوی نێودەوڵەتی لە سەدەی نۆزدەمینەوە، مەسەلەی کەسایەتی یاسایی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان خرانە بەر باس و لێکۆڵینەوە تاوەکو لەم سەردەمەدا دان پێدانانی گشتیی بە کەسایەتی یاسایی بابەتییانەی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، کرا. بۆ زانینی ئەوەی ئایا ڕێکخراوی نێودەوڵەتی کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتی هەیە یان نە؟ دەبێ بگەڕێینەوە سەر ئەو دۆکومێنتە، کە پێکیهێناوە و توانای کردەییی دیاری دەکات بۆ ئەوەی لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی تر بەشداربێت و مافی بەستنی پەیماننامەی نێودەوڵەتی هەبێت لەگەڵیاندا. ئەم توخمانە لە یاسای نێودەوڵەتیدا لە نیشانەکانی کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتین.

ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان کەسایەتی یاسایی وەرناگرن ئەگەر بە ڕەزامەندیی ئەو

دەوڵەتانە نەبێ، کە کەسی سەرەکین. ئەویش لە ڕێگەی بەستنی پەیماننامەی نێودەوڵەتی، کە بریتییە لە دۆکومێنتی دامەزراندن بۆیان. بۆیە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان کەسایەتییەکی یاسایی تایبەتییان هەیە، کە دەوڵەتەکان لە دۆکومێنتی دامەزراندنیاندا دیاریدەکەن. لەبەرئەوەی دەوڵەتەکان وەك کەسی سەرەکیی یاسای نێودەوڵەتی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان پێکدێنن، ئەوا کەسایەتی یاسایی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان بریتییە لە کەسایەتییەکی دارێژراو و بەڵێنی و دووەکی و سنووردار. [٨]

سیفەتی سەرەکیی کەسایەتیی یاسایی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان ئەوەیە، ئەو سەروەرییەیان نییە، کە تەنیا دەوڵەتە سەربەخۆیەکان هەیانە. لەبەر ئەمە ماف و دەسەڵاتی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و دەزگەکانیان جیاوازن لەگەڵ مافی سەروەریی دەوڵەتەکان، بە تایبەتی لەڕووی سرووشتە یاساییەکەیانەوە. چونکە دەوڵەتەکان بریتین لە قەوارەی سەروەردار، بەڵام ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان لە بەرئەنجامی هاوگونجانی دەوڵەتەکان پێکدێن، بۆیە سرووشتی یاساییان بەڵێنییە، هەروا ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان هەندێ لەو پێوەرانەیان نییە، کە دەوڵەتە سەروەرەکان هەیانە وەك هەرێم و دانیشتووان.

ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان ئیرادەیەکی یاسایی تایبەتیان هەیە. تایبەتمەندییەکەی لەوەیە کە ڕەنگدانەوەی ئیرادی یاسایی هاوبەشی دەوڵەتە ئەندامەکانە، لە هەمان کاتیشدا ئەم ئیرادە هاوبەشە لەگەڵ ئیرادەی هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتە ئەندامەکان جیاوازە. لەبەر ئەمە بریتییە لە ئیرادەیەکی یاسایی کە لە ئیرادەی یەکلایەنەی هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتانی ئەندام تیادا، سەربەخۆیە.

ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان وەك کەسێك لە کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی هەڵدەگرن. ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان وەك کەسێکی یاسایی داتاشراو بەرپرسیارێتی سنووردار هەڵدەگرن بە پێچەوانەی بەرپرسیارێتی دەوڵەتەکان. ئەم بەرپرسیارێیەتییەش لە شێوەی بەرپرسیارێتی ڕامیاری هەروەها بەرپرسیارێتی مادییانە دەبێ بەپێی یاسای نێودەوڵەتی.

ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان گرینگترین تایبەتمەندییەکانی کەسی یاسایی نێونەتەوییان هەیە، ئەویش برتییە لەو ئەهلییەتە یاساییەی ڕێیان دەداتێ پەیمانی نێودەوڵەتی ببەستن. ئەم

---

8- Орлин Борисов. Международно публично право, София. 2003, стр.73

ئەهلییەتە یاساییە بەڵێنییەش لە بناخە یاساییەکەیدا لەسەر رێککەوتننامەی ڤیەننای ساڵی ١٩٨٦سەبارەت بە یاسای پەیمانی نێوان دەوڵەتەکان و رێکخراوی نێودەوڵەتی و نێوان رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان دارێژراوە. ژمارەی زۆری ئەو دەوڵەتانەی نەتەوە یەکگرتووەکانیان پێکهێناوە و ئەو ئامانجە بەرزانەی لە دەستوورەکەیدا هەن و دەسەڵاتە بەرفرەوانەکانی وایانکردووە ئەم رێکخراوە ئێستە ببێتە گەورەترین رێکخراوی نێودەوڵەتی خاوەن فرەوانترین و بە هێزترین کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتی. وێڕای ئەوەش کەسایەتییەکی نێودەوڵەتی تایبەتە و جیاوازی هەیە لە کەسایەتی گشتی و فرەوانی دەوڵەت، کە بە کەسی سەرەکی دادەنرێ لە یاسای نێودەوڵەتیدا. [٩]

## ٢- کەسایەتیی نێودەوڵەتی تاك:

جیاوازی هەیە لەنێوان تیۆرییەکانی یاسای نێودەوڵەتیی لەبارەی تێگەیشتنیان بۆ کەسایەتیی یاسایی نێودەوڵەتی تاك. بەشداریکردنی کاریگەرییانەی تاك لە پەرەسەندنی پێوەندییە نێودەوڵەتییە هاوچەرخەکاندا وێنایەکی گشتیی دەدات، کە کەسێکە لە کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی. ئەوی راستی بێ تاك بۆتە هێزی بزوێنەری بنەڕەتی بۆ بونیادنانی هاوکاری نێودەوڵەتی، بەڵام لەم بوارەدا بەناوی خۆیەوە هەڵناسوڕێت، بگرە وەك نوێنەرێ بەناوی دەوڵەتەکانەوە یان رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانەوە هەڵدەسوڕێت.

تیۆریی بابەتی پێی وایە تاکەکان تەنیا بابەتێك پێکدێنن، یان جێگەیەك بۆ رێکخستنی یاسایی نێودەوڵەتی. هەروەها دەوڵەتەکانیش و رەنگە رێکخراوەکانیش کەسەکانی یاسابن، بەڵام بازنەی ئەم تیۆرییە زۆر بەرتەسك بوو. دیارە گەوهەری یاسای نێودەوڵەتی هەمیشە زۆر گرینگیی داوەتە مرۆڤ، ئەمەش لەوەدا دەردەکەوێ، کە ریشەی یاسای نێودەوڵەتی کلاسیك دەگەڕێتەوە بۆ یاسای سرووشتی. گەشەکردنی تیۆرییە بابەتییەکانیش نەخاسمە لە سەدەی نۆزدەمدا ئەمەیان پۆشیوە لەم رووەوە و جەختیان کردۆتە سەر ناوەندێتی دەوڵەت و بگرە تایبەتمەندییەکەشی. وێڕای ئەوەش مامەڵەی نێودەوڵەتی هاوچەرخ جەخت دەکاتە سەر پێزانینی زیاتر بە رۆڵی تاکەکان وەك بەشداربوو لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان و هەروا وەك

٩- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

N .A Maryan Green: International Law .3ed London 1987 p.58-60

کەسی یاسای نێودەوڵەتی. ئەمەش بە شێوەیەکی سەرەکی لە ڕێگەی یاسای مافی مرۆڤەوە، روویدا.

تاك ئەهلییەتێکی یاسایی سنووردار و تایبەتی هەیە. بەپێی ئەو ئەهلییەتە دەتوانێت بچێتە نێو پێوەندیی نێودەوڵەتی دیاریکراوەوە لەگەڵ هەندێ دەزگەی نێودەوڵەتی تایبەتدا، بەڵام ئەم پێوەندییە پێوەندییەکی نێودەوڵەتی راستەوخۆ نییە لەگەڵ دەوڵەتی سەرپێچیکەردا لە مافە پێشێلکراوەکەی. ئەگەر دەزگە نێودەوڵەتییە پێوەندیدارەکە بینی، کە دەوڵەتەکە بەڕاستی مافی تاکەکەی پێشێلکردووە، ئەوە پێوەندییێکی یاسایی لەنێوان دەزگەکە و دەوڵەتە پێشێلکارەکە دروست دەبێت. بناخەی ئەم پێوەندییەش دەگەڕێتەوە بۆ یاسای نێودەوڵەتی، چونکە بەپێی ئەم یاسایە دەوڵەتەکە ئیلتیزامی کردووە، کە نەك هەر هەندێ ماف بۆ تاك دابین بکات، بگرە جێبەجێکردنیشی مسۆگەربکات. یەکێکیش لە ڕێگەکانی مسۆگەرکردنەکە ئەوەیە کە ڕێگەنەدات بە دەزگە حکوومەتییەکانی ناوەخۆی خۆی بە هیچ جۆرێك ئەو مافانە پێشێل بکەن. ئەگینا بۆ ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە پێوەندیدارەکە هەیە بەرپرسیارێتی ئاراستەی ئەو دوڵەتە بکات لەسەر پێشێلکردنی ئەو یاسا ناوەخۆیانەی، کە ماف و ئازادییە بنەڕەتییەکانی تێکڕای تاکەکانی ناو وڵاتەکەی خۆی دابینکردووە●.

کەواتا جێبەجێنەکردنی ئیلتیزامێکی نێودەوڵەتی پەسەندکراو هۆکارێکە بۆ دروستبوونی پێوەندیی نێودەوڵەتی لەنێوان دەوڵەتی پێشێلکار و دەزگەی نێودەوڵەتی چاودێر. ئەم پێوەندییە نێودەوڵەتییەش پێوەندییەکی یاسایی نێودەوڵەتی تایبەتە لە رووی جۆرەکەیەوە.

بەپێی رەوتی مێژوو، چەمکی هاووڵاتیبوون بە هاوبەندییەکی بنەڕەتی دادەنرێ لەنێوان دەوڵەت و تاکەکان بۆ مەبەستی یاسای نێودەوڵەتی. ئەوە پێشتر و لە داهاتوویش بە گرینگترین لایەن دەمێنێتەوە بەتایبەتی لە بواری ویلایەتی یاسایی و پاراستنی نێودەوڵەتی بەرامبەر بە تاکەکان لە لایەنی دەوڵەتەوە. هەمیشە تاکیدکراوە، کە ئەو سکاڵایەی تاك لە دژی دەوڵەتێکی بیانی دەیکات بۆ نموونە وەك سکاڵانامەیەك دادەنرێ، کە دەوڵەتی تاکی پێوەندیدار لە دژی ئەو دەوڵەتە بیانییە ئاراستەی دەکات.[١٠]

● د .طالب رەشید یادگار: هەندێ لایەنی تیۆری پاراستنی مافی مرۆڤ، گۆڤاری تەرازوو، ژمارە: ٢٧-٢٨، ساڵی ٢٠٠٦، لاپەرە: ١٩٠.

10- 2 ILR, p.2

هەر دەوڵەتێك دەسەڵاتی هەیە ئەو کەسانە دیاری بکات، کە مەرجی هاووڵاتیبوون هەیە و هاووڵاتییەکانی کێن و پێویستە لەسەر دەوڵەتەکانی تریش دان بەوەدا بنێن ئەگەر ئـەوە لـە چوارچێوەی داخوازییەکانی یاسای نێودەوڵـەتی بێـت، دوایـیش پێوەنـدیی لـەنێوان دەوڵـەتی پێوەندیدار و تاکی پێوەندیدار پێوەندییەکی رەسەن دەبێت.(11)

تاك، لە دەرەوەی یاسای نێوەخۆییدا وەك نۆرمێکی گشتی توانای وەستانی نییـە لـە دژی پێشێلکردنی پەیماننامەی نێودەوڵـەتی لـە دۆخـی دەرنـەبڕینی نـاڕەزایی ئـەو دەوڵەتـە، کـە رەگەزنامەکەی هەڵگرتووە، بگرە ئەمە تەنیا بەپێی یاسای نێودەوڵـەتی دێتـەدی، ئەگەرچـی دەوڵەتەکان رازین مافی تایبەتی پێ ببەخشن. دەبینین بڕگەی (ب) لە مادەی(٣٠٤)ی پـەیمانی ڤێرسای ساڵی ١٩١٩ مافی داوە بە هاووڵاتییانی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان داوای قەرەبووکردنەوە بە ناوی خۆیانەوە بەرزبکەنەوە بۆ دادگەی نێوبـژیوانی تێکـەڵاو لـە دژی ئـەڵمانیا. هـەروەها پەیماننامەی ساڵی ١٩٠٧ یـش، کـە لـەنێوان (٥) دەوڵـەتی ئەمـەریکای ناوەڕاسـت بەسـترا دادگەی دادی ئەمەریکای ناوەڕاستی دامەزراند بـۆ تەماشـاکردنی ئـەو داوایانـەی تاکـەکان بەشێوەی راستەوخۆ بۆی بەرزی دەکەنەوە لە دژی دەوڵەتەکانیان.

مەسەلەکە دیسان دووپات بووەوە لەکێشەی کارمەندانی هێڵی ئاسنین لە دانزك Danzig Railway official Case لەلایەن دادگەی دادی هەمیشـەیی نێودەوڵەتییـەوە. ئـەوە بـوو رێککەوتننامەیەك لەنێوان پۆڵەندا و دانزك بەسترا سەبارەت بە مەرجەکانی کاری کارمەندانی سەر بە هێڵی ئاسنینی دانزك، کە لە تۆڕی هێڵی ئاسنینی پۆڵەندا کاریان دەکرد. لەبەرئـەوەی پولەندا پێی زانیبوو، کە ئەو رێککەوتننامەیـە پەیماننامەیـەکی نێودەوڵەتییـە و ئـەو مافـە تایبەتانەی بە گوێرەی دراون لارییان نییە لەگەڵ یاسـا نێوەخۆییەکەیـدا، رازی بـوو کـە هـەر سەرپێچییەك بەرامبەر وەدیهێنانی ئەو مافانە، مەسەلەیەکە تەنیا لەنێوان خۆی و دانزك دایە و تاکە پێوەندیدارەکان مافیان هەیە لە دژی هەردوولا سکاڵانامە بەرزبکەنەوە، بـەڵام دادگـە ئەم بیانووەی رەتکردەوە لەبەر بارودۆخی تایبەتی پەیماننامەکە و مەبەستی هەردوولا لـەکاتی بەستنی رێککەوتننامەکە. ئەمەش واتا مەسەلەی ئەوەی ئایا پەیماننامە مـاف و ئیلتیزامـی لێدەکەوێتەوە بۆ تاکەکان بەم سیفەتەیان دەوەسـتێتە سـەر بـارودۆخی کێشـەکە و مەبەسـتی لایەنەکان.

---

11- 22 ILR, p.349

هەروا ڕێککەوتننامەکانی ئاشتی ساڵی ١٩١٩ لەو دەقانەی پێوەستن بە پاراستنی کەمایەتییەکان، ڕێگەی بەتاکەکان دا، لە چەند بارێکی تایبەتدا، سکاڵانامە بەرزبکەنەوە بۆ دادگەیەکی نێودەوڵەتی. لەم بارەیەوە ئەو دادگەیەی، بەپێی ڕێککەوتننامەی سیلیزیای باڵا Upper Silesia ساڵی ١٩٢٢ پێکهات، بڕیاری دا ئەرکی تایبەتی ئەوەیە، کە سەیری ئەو سکاڵانامانەی هاووڵاتییەکان لە دژی دەوڵەتەکانیان دەیکەن بکات.

**لەوکاتەوە چەندین پەیماننامەی نێودەوڵەتی لە دەقەکانیاندا جەختیان کردۆتە سەر بەخشینی مافی پەنابردنە بەر دادگە نێودەوڵەتییەکان و سکاڵاکردنی ڕاستەوخۆ لەپێشیاندا. بۆ نموونە دەکرێ لەم ڕووەوە ئاماژەبدەین بە ڕێککەوتننامەی ئەورووپایی ساڵی ١٩٥٧ و ڕێککەوتننامەی دەوڵەتە ئەمەریکاییەکان سەبارەت بە مافی مرۆڤ ساڵی ١٩٦٩ و هەروا پرۆتۆکۆلی زیادەی پاشکۆی ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتی سەبارەت بە مافی شارستانی و رامیاری ساڵی ١٩٦٦ و ڕێککەوتننامەی بنەبڕکردنی هەموو جۆرە جیاوازییەکی ڕەگەزی ساڵی ١٩٦٥ و ڕێککەوتننامەی یەکلاکردنەوەی کێشەکانی سەرمایەگوزاری ساڵی ١٩٦٥ و پرۆتۆکولی زیادەی پاشکۆی جیاوازی لە دژی ئافرەتان ساڵی ٢٠٠٠ و ڕێککەوتننامەی مافی منداڵ ساڵی ١٩٨٩ و ڕێککەوتننامەی نەهێشتنی ئەشکەنجە و ئەودوای مامەڵە توندوتیژییە نامرۆییەکان و سزادان ساڵی ١٩٨٧.**

دەکرێت لە سەرەنجامدا بوترێت، کە یاسای نێودەوڵەتی، لە ڕێگەی هەندێ ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتییەوە، مافی داوە بە تاك سکاڵا بەرزبکاتەوە لە بەردەم هەندێ دەزگەی نێونەتەوەی دژی ئەو دەوڵەتەی ئەو مافانەی پێشێلکردووە، کە بە یاساکانی خۆی پێی داون (*).

---

(*) تاك دەتوانێت دژی دەوڵەت سکاڵا بەرزبکاتەوە لە پێش ئەم دەزگە نێودەوڵەتییانە، بەمەرجێك دەوڵەتە پێوەندیدارەکە ئەو پەیماننامەیەی ئیمزاکردبێت، کە دەزگەکەی دروستکردووە:

١- لیژنەی مافی مرۆڤ بە پێی لائیحەی نێودەوڵەتی بۆ مافی شارستانی و سیاسی و پرۆتۆکۆڵی ئیختیاری. بڕوانە:

G.A. res. 2200A (XXI), 21 U.N. GAOR Supp. (No. 16) at 52, U.N. Doc. A/6316 (1966), 999 U.N.T.S. 171, *entered into force* Mar. 23, 1976.و

٢- لیژنەی لەناوبردنی ئەشکەنجە. بڕوانە:

G.A. res. 39/46, annex, 39 U.N. GAOR Supp. (No. 51) at 197, U.N. Doc. A/39/51 (1984), *entered into force* June 26, 1987.

**بەرپرسیارێتی تاوانکاریی تاك:**

یاسای نێودەوڵەتی لە چەند بارێکی دیاریکراودا بەرپرسیارێتی راستەوخۆی ئاراستەی تاکی مرۆڤ کردۆتەوە. بۆ نموونە لە حاڵەتی تاوانی جەردەیی نێو دەریا یان بازرگانیکردن بە کۆیلە تومەتی تاوان ئاراستەی ئەنجامدەرانییان دەکرێت، بەو پێیەی ئەمانە تاوانن دەرهەق بە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی. بۆیە دەبێ لە لایەن دادگەیەکی نێودەوڵەتییەوە یان دادگەی نێوەخۆییەوە دادگەیی بکرێن. ویلایەتی یاسایی بۆ سەیرکردنی ئەم جۆرە تاوانە هەر تایبەت نەبووە بەو دەوڵەتەی تاوانەکە لە هەرێمەکەیدا روویداوە یان ئەو دەوڵەتەی تاوانکار رەگەزنامەکەی هەڵگرتووە.

پەیماننامەی ڤێرسای ساڵی ١٩١٩ لە دەقەکەیدا هاتووە: حکوومەتی ئەڵمانیا دان بە مافی هاوپەیمانەکان و دەوڵەتەکانی لایەنیان دەنێت بۆ هەواڵەکردنی تۆمەتباران بە کردەوەی تاوانی دژ بە نۆرم و نەریتەکانی جەنگ بۆ دادگەیەکی سەربازی (مادەی:٢٢٨) و ئاراستەکردنی بەرپرسیارێتی تاك بۆ قەیسەر (مادەی:٢٧٧). ئەوە بوو لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە چەند داوایەك بۆ دادگەی ئەلمان لە لایبزیك بەرزکرایەوە.

دوای شەڕی دووەمی جیهانی رێککەوتننامەی دادگەییکردن و سزادانی گەورە تاوانبارانی جەنگ لە ساڵی ١٩٤٥ (رێککەوتننامەی لەندەن) لەگەڵ پێڕەوی دادگە سەربازییە نێودەوڵەتییەکە بوونە پێشینەیەك بۆ بەرپرسیارێتی تاك لەسەر ئەنجامدانی تاوان لە دژی ئاشتی و تاوانی جەنگ و تاوانی دژە مرۆڤایەتی[١٢]. هەر سەبارەت بەم بابەتە دادگەی

---

٣- لێژنە لەناوبردنی جیاوازیی دژی ژن. بڕوانە: G.A. res. 54/4, annex, 54 U.N. GAOR Supp. (No. 49) at 5, U.N. Doc. A/54/49 (Vol. I) (2000), *entered into force* Dec. 22, 2000.

٤- لێژنە لەناوبردنی جیاوازیی رەگەزی. بڕوانە: **G.A. res. 2106 (XX), Annex, 20 U.N. GAOR** Supp. (No. 14) at 47, U.N. Doc. A/6014 (1966), 660 U.N.T.S. 195, entered into force Jan. 4, 1969.

١٢- بڕوانە ماددەی شەشەمی رێککەوتننامەی دادگاییکردن و سزادانی گەورە تاوانبارانی جەنگ ساڵی ١٩٤٥:

"Nothing in this Agreement shall prejudice the jurisdiction or the powers of any national or occupation court established or to be established in an allied territory or in Germany for the trial of war criminals." See 39 AJIL 1945 at supp258s http://www.jus.uio.no/english/services/library/treaties/04/4-06/london-agreement.xml

نوێرنبێرگ Nürnberg ئاماژەیداوە، کە ((یاسای نێودەوڵەتی ئەرك و بەرپرسیارێتی دەخاتـە ئەستۆی تاکەکان و دەوڵەتەکان وەك یەك"، چونکە " تاوان دەرهەق بە یاسای نێودەوڵەتی لـە لایـەن مرۆڤـەوە ئەنجامـدەدرێ، نـەك لەلایـەن چـەند کۆمـەڵێکی دیـاریکراو و بـە تـەنیا ئەحکامەکانی یاسای نێودەوڵەتیش دەکرێ تەنیا لە رێگەی سزادانی ئەو تاکانەوە پیادەبکرێن، کە ئەم جۆرە تاوانەیان کردووە)) واتا ئـەو تاوانانـەی دژ بـە ئاشـتین و تـاوانی جـەنگ و دژە مرۆڤایەتین.

ئێستە دەکرێ ئەو ئەحکامانەی لە دۆکومێنتی نوێرنبێرگ دا هاتوون بە بەشێك لە یاسای نێودەوڵەتی دابنرێن، بەتایبەتی پاش ئـەوەی نەتـەوە یـەکگرتووەکان لـە سـاڵی ١٩٤٦ ئـەو پرەنسـیپانەی تیـا هـاتبوون و هـەروا بڕیارەکـانی هـەمان دادگـەی، پەسـندکرد[١٣]. دادگـە هەمیسان جـەختی کـردووە، کـە لـەناوبردنی بـە کۆمـەڵ Genocide بەرپرسـیارێتی تـاك دەورووژێنێ[١٤]. هەر ئەم مەسەلەیەش لە رێککەوتننامەی قەدەغـەکردنی جینۆسـاید سـاڵی ١٩٤٨ جەختی لەسەر کرا. دیسان رێککەوتننامەی نێودەوڵەتی سەبارەت بـە قەدەغـەکردن و سزادانی تاوانی جیاوازی رەگەزی "ئەپارتاید" سـاڵی ١٩٧٤ جـەختی کردۆتـە سـەر دانـانی تاوانی ئەپارتاید بە تاوانێکی نێودەوڵەتی، کە بەرپرسیارێتی تاوانی نێودەوڵـەتی راسـتەوخۆی لێ دەکەوێتەوە. هەروەها پێشێلکاریی زەقی رێککەوتننامەکانی خاچی سووری نێودەوڵەتی لە جنێڤ ساڵی ١٩٤٩ و پرۆتۆکۆلی یەك و دووی ساڵی ١٩٧٧ی تایبـەت بـە دامـاڵینی چـەك، بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتییان لـێ دەکەونـەوە. ئـەو دۆکومێنتانـە، ئـەم تاوانانـە بـە تـاوانی نێودەوڵەتی زەق دادەنێن، کە تاکـەکان ئـەنجامیان دەدەن: کوشـتنی رەمـەکی و ئەشـکەنجە و رەفتاری نامرۆڤایەتی و تێکدان و وێرانکردنی موڵـك و سـامان بـە ئانقەسـت و بـە شـێوەی نایاسایی و نازەرووری و بـە بارمتـەگرتنی کەسـەکان و هێرشـبردنە سـەر خـەڵکی سـێڤیل و هێرشبردنە سەر کارگە و ئەو دامودەزگەیانەی مادەیی ترسناکیان تێدایە، کە پێشەکی دەزانرێ

---

١٣- بڕوانە: بڕیاری ژمارە ٩٥ (١) و هەروەها ڕاپۆرتی لیژنەی یاسای نێودەوڵەتیی لەبارەی پرەنسیپەکانی دادگەی نوێرنبورگ:

Principles of International Law recognized in the Charter of the Nürnberg Tribunal and in the Judgment of the Tribunal, with commentaries 1950 see http://untreaty.un.org/ilc/texts/instruments/english/commentaries/7_1_1950.pdf

١٤- بڕیاری ژمارە ٩٦(١)

ئەو جۆرە هێرشبردنە دەبنە هۆی گیان لەدەستدانی ژیـانی زۆر لـە خـەڵکی و مەدەنییـەکان و موڵك و سامانیان دەخەنە بەر مەترسی، هەروا تاوانی کۆچپێکردنی خەڵکی سیڤیل لە خـاکی خۆیانەوە بەرەو خاکی داگیرکەر یان ڕەوپێکردنی خەڵکی لەو خاکەی داگیرکـراوە و جیـاوازیی ڕەگەزی و هێرشبردنە سەر ئاسـەوارە مێژوویـیـەکان و کـاری پشـکنین و شـوێنەوار و شـوێنە پیرۆزەکان. جا هەر کەسێك پلە و پێگەی حکومی لەهەر ئاستێکدا بێت، یەکێك لەو تاوانانـە ئەنجام بدات، خۆی ڕووبەڕووی بەرپرسیارێتی تاوانی نێودەوڵەتی دەکـات. هـەر زەروورەتێکـی سەربازییانە یان هەرچ بیانوویێك سەبارەت بە فـەرمان وەرگـرتنی تاوانبـاران لـە سەرچـاوەی سەرووتریان لە بەرپرسیارێتی تاوان ڕزگاریان ناکات.

### دادگەی تاوانی نێودەوڵەتی:

ڕووداوەکانی یۆگۆسلاڤیای پێشوو لە سەرەتای نەوەتەکانی سەدەی بیستەم، سەر لە نـوێ ئەو بایەخ و گرینگیپێدانەی ورووژاند بۆ ئەوەی دادگەیەکی نێودەوڵەتی بۆ تـاوان دابمـەزرێت. ئەمە هەوڵ وتەقەلاکانی ساڵی ١٩٤٨ی زیندووکردەوە بۆ تۆژینـەوە لـە ئەگـەری پێکهێنـانی دادگەیەکی نێودەوڵەتی بۆ دادگەییکردنی ئەو تاوانانەی بە تاوانی نێودەوڵەتی، دادەنرێن.

ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٩٤ کۆمیتـەی یاسـای نێودەوڵـەتی پـرۆژەی پێـڕەوە ناوەخۆیەکـەی دادگەی تاوانە نێودەوڵەتییەکەی پەسندکرد.

پاش ئەوەی پێڕەوی ناوەخۆ هەواڵەی کۆمەڵـەی گشـتی نەتـەوە یـەکگرتووەکان کـرا، لـە ١٩٩٨/٧/١٧ لە ڕۆما پەسندی کرد.

پێڕەوە ناوەخۆییەکەی دادگەی تاوانی نێودەوڵەتی جەختی کردۆتە سـەر دەسـەڵاتی دادگـە لەو تاوانانەی تاکەکان دەیانکەن و بریتین لەوانەی، کـە بـەها مرۆڤایەتییـە هاوبەشـەکان لـە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی پێشێل دەکەن، ئەمانەش بریتین لە تـاوانی جینۆسـاید و تـاوانی دژی مرۆڤایەتی و تاوانی جەنگ و دەستدرێژی کردن"Aggression العـدوان". واتـا: دەسـەڵاتی دادگەی تاوانی نێودەوڵەتی دادگەییکردنی دەوڵەت ناگرێتەوە وەك کەسێکی یاسایی مانـەوی، چونکە دەوڵەت بەرپرسیارێتی بەپێی یاسای نێودەوڵەتی ئاراستە دەکرێت، بەڵام بەرپرسیارێتی تاوانی تاك ئەو پرەنسیپەیە، کە دادگەی تاوانی نێودەوڵەتی لەسەری بونیادنراوە.

## دادگەی تاوانی نێودەوڵەتیی تایبەت:

پراکتیکی نێودەوڵەتی چەند حاڵەتێکی بەخۆوەبینیوە، لە میانەیاندا دادگەگەلێکی تاوانی نێودەوڵەتی خاوەن دەسەڵاتی سنووردار لە ڕووی کاتی ئەنجامدانی تـاوان و شـوێنەکەی و ئـەو کەسانەی ئەنجامی دەدەن دامەزراون.

بە ناوبانگترین دادگەی تاوانی نێودەوڵەتی تایبەت، دادگەی نـوێرنبرگ بـوو سـەبارەت بـە دادگـەییکردنی گـەورە تاوانبـارانی جـەنگ لـە ئەڵمانـەکان و هـەروا دادگـەی تۆکیـۆ بـۆ دادگەییکردنی گەورە تاوانبارانی جـەنگ لـە ژاپۆنییـەکان لـە سـەروبەندی دووەمـین شـەڕی جیهاندا.

لە نەوەتەکانی سەدەی پێشوودا بینیمان دوو دادگەی تاوان لەلایەن ئەنجومـەنی ئاسایشـی نێودەوڵەتییەوە پێکهات، ئەویش کاتێ دەسەڵاتی خۆی بەکارهێنا بۆ وەرگرتنی بڕیاری مولزەم بۆ هەموو دەوڵەتەکانی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا. بەو جۆرە ئەم شـێوازە لـە هـەردوو حاڵەتەکەدا بەکارهێنرا بۆ ئەوەی هەردوو دادگەکە بە زووترین کات دەست بە کارەکانیان بکەن و هەروا بۆ زامنکردنی پابەندبوونی لایەنە تێگلاوەکان لە تاوانی جەنگ بەبێ ڕەزامەنـدییان و لە ڕێگەی پێکهاتنی هەردوو دادگە بەپێی ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتی.

## دادگەی نێودەوڵەتی تاوانی تایبەت بە یۆگۆسلاڤیا:

ئەنجومـەنی ئاسایشـی نێودەوڵـەتی لـە ١٩٩٣/٢/٢٢، بڕیـاری ژمـارە (١٩٩٣) ٨٠٨ی پەسندکرد، کە جەختی کردۆتە سەر ((پێکهێنانی دادگەیەکی نێودەوڵەتی بـۆ دادگـەییکردنی ئەوانەی بەرپرسیارن لە پێشێلکاریی تەواوی یاسای مرۆیی نێودەوڵەتی لە خاکی یۆگوسلاڤیای پێشوو لە سـاڵی ١٩٩١ەوە)) [١٥]. لەبـەر ئـەمـە سـکرتێری گشـتی نەتـەوە یـەکگرتووەکان ڕاپۆرتێکی بڵاوکردەوە، پرۆژەی سیستەمە نێوەخۆییەکە و هۆیەکانی پێویسـتی لـەخۆگرتبوو. دواتر بەپێی بەشی (٧)ی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان ،کە ڕێگە بە ئەنجومـەنی ئاسـایش دەدات بڕیاری مولزەم وەربگرێت بۆ ئەندامانی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکە، ئەنجومەنی ئاسایش بە بڕیاری (١٩٩٣) ٨٢٧ ڕاپۆرتەکەی پەسندکرد.

---

١٥- لەم رووەوە بڕوانە: ئەم بڕیارانەی ئەنجومەنی ئاسایش:

764 (1992) , 771 (1992) , 820 ( 1993 )

دادگەکە پێکهاتووە لە دوو دەستە و یەك دەستەی تەمییز و داواکارێکی گشتی و بڕیاردەر بۆ بەڕێخستنی کارەکانی هەردوو دەستەکە و داواکاری گشتی. مادەکانی (٢-٥)ی سیستەمی نێوەخۆییەکە ئەو تاوانانە دیاریدەکەن، کە دادگە دەسەڵاتی هەیە تەماشایان بکات، تاوانەکانیش ئەوانەن، کە پێشێلکارییەکی زەق پێکدێنن بۆ ڕێککەوتننامەکانی جنێڤ ساڵی ١٩٤٩ (مادەی:٢) هەروا پێشێلکارییەکانی یاسا و نەریتەکانی جەنگ بە بەکارهێنانی ئەو چەکانەشەوە، کە دەبنە هۆی دەردەسەریی بێواتا و کاولکاری ڕەمەکییانەی شار و گوند و وێرانکردنی موڵك و سامانی گشتی یان تایبەت، (مادەی:٣ و ٥) جینۆساید و ئاوارەکردن و ئەشکەنجەدانی دانیشتووانی سیڤیل. (مادەی:٤ و ٥).

(مادەی:٦) ئاماژەدەکات، کە دەسەڵاتی دادگە تەنیا کەسە سرووشتییەکان دەگرێتەوە، بەڵام (مادەی:٧) دەڵێت: ((ئەو کەسانەی هەڵساون بە پیلاندانان و هاندان و فەرماندان یان بە شێوەیەکی تر هاوکار و هاندەربوون بۆ پیلاندانان یان ڕێخۆشکردن یان جێبەجێکردنی ئەو تاوانانەی لە مادەکانی (٢-٥) هاتوون، ئەوانە خودی خۆیان بەرپرسیارن لەو تاوانانە)).

ئەم مادەیە جەخت دەکات، کە پلەی فەرمی کەسە تۆمەتبارەکە نابێتە پاساو بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتی کەسێتی لەسەر لابدرێ و سزاشی لەسەر سووك بکرێتەوە، چونکە تاوانکردنی فەرمانبەری پلە نزمتر بەرپرسێتی کەسی لانادات لەسەر فەرمانبەری پلە بەرزتری لێپرسراوی ئەگەر هات و ئەم فەرمانبەرە پلە بەرزە ئاگەداربێ یان هۆیەکی وا هەبووبێت، کە وای لێبکات ئاگای لێ بێت کە فەرمانبەرە پلە نزمترەکە خەریکە تاوان بکات یان کردوویەتی و فەرمانبەرە پلە بەرزە لێپرسراوەکە ڕێ و شوێنی پێویست و ماقووڵی نەگرتۆتە بەر بۆ ڕوونەدانی ئەو تاوانانە یان سزادانی ئەوانەی کە خەریکی ئامادەکارییەکەی بوونە. هەروا ئاماژەیش دەکات، کە کەسی تۆمەتبار ئەگەر هات و بەپێی فەرمانی دەسەڵاتێکی حکومی یان فەرمانبەرێکی پلە بەرزتر ڕەفتاری کردووە، ئەوە ئەم کارە لە بەرپرسێتی تاوانکاری ناپارێزێت، بەڵام دەکرێ ببنە هۆ بۆ سووککردنەوەی حوکمدانی ئەگەر دادگە لەو بڕوایەدا بێت، کە دادوەری پێویست بەوە دەکات. دەستەی دادگەی پێداچوونەوە لە کەیسی (Tadic)دا جەختی کرد، کە یاسای نێودەوڵەتی نەریتی (عورفی) بەرپرسیارێتی تاوانکاری خستۆتە ئەستۆی ئەو کەسانەی لەژێر فشاردا پێشێلی یاسای نێودەوڵەتی مرۆییان کردووە[١٦].

---

16- IT – 94 – 1 AR72، 2 /10/1995. p. 70

**دادگەی تاوانی تایبەت لەبارەی رواندا:**

لە پاش کۆمەڵکوژییەکەی ساڵی ١٩٩٤ لە رواندا، ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بڕیاری ژمارە (١٩٩٤) ٩٩٥ی دەرکرد بۆ پێکهێنانی دادگەیەکی نێودەوڵەتی تایبەت بە رواندا. ئەم دادگەیە دەسەڵاتی دراوەتێ سەیری ئەو تاوان وپێشێلکارییە جدییانەی یاسای نێودەوڵەتی مرۆڤی بکات، کە لەلایەن هاووڵاتیانی رواندواوە ئەنجامدراون لەسەر خاکی رواندا و دەوڵەتەکانی دراوسێ لە ماوەی نێوان ١٩٩٤/١/١ و ١٩٩٤/١٢/٣١.

ئەم دادگەیە لە ڕووی پێکهاتەکەیەوە لە دادگەی تاوانی تایبەت بە یۆگۆسلاڤیا دەچێ، کە لە (٢) دەستە و دەستەیەکی تەمییز و دادوەرێکی گشتی و بڕیاردەری هەردوو دەستەکە پێکدێ (مادەی:١٠). مادەکانی ٢-٤ ئەو تاوانانەیان دیاریکردووە، کە لە چوارچێوەی دەسەڵاتی تایبەتی دادگەکەن، ئەویش جینۆسایدە (مادەی:٢) و تاوانی دژە مرۆڤایەتی (مادەی:٣) و پێشێلکارییەکانی مادەی:٣ی ڕێککەوتننامەی جنێڤ ساڵی ١٩٩٤ و پرۆتۆکوڵی دووەم (مادەی:٤).

بەرپرسیارێتی تاوانی تاك ئاراستەی ئەوانە کرا، کە پلانڕێژیان کردووە و فەرمانیان داوە یان تاوانیان جێبەجێکردووە یان هانی ئەو جۆرە تاوانەیان داوە. هەرچی پێوەستیشە بە پلەی فەرمانبەران و بەرپرسیارێتییان، ئەوا ئەحکامەکانی هەمان ئەو ئەحکامانەن، کە باسمان کردن و لە سیستەمە ناوەخۆییەکەی دادگەی تاوانی تایبەت بە یۆگۆسلاڤیا هاتوون (مادەی:٦).

**٣- کەسایەتیی قەوارەی شێوە دەوڵەت:**

سرووشتی یاساییی قەوارە شێوە دەوڵەتەکان، سرووشتێکی لاوەکیی تایبەتە ستوون نییە لەسەر سەروەری، بگرە بەو پەیواتانەوە پاڵی داوە، کە دەوڵەتەکان لەنێوان خۆیاندا دەیانبەستن. ئەم پەیواتانە خۆیان ماف و ئیلتیزاماتی ئەو قەوارانە دیاری دەکەن، پاشان دان دەنێن بە ئەهلییەتە یاساییە نێودەوڵەتییە بەڵێنییە سنووردارییەکەیاندا.

هەندێ جار، هەندێ شاری ئازاد یان هەرێمی ئازاد، یان ناوچەی ئازاد سیفەتی کەسایەتی یاسایی وەردەگرن لەبەر چەند بارودۆخێکی نێودەوڵەتی تایبەت، بۆیە دەستووریان بۆ دادەنرێ یان دۆکومێنتێکی دانراو و ڕەگەزنامەیەکی تایبەت دەدرێتە هاووڵاتیانی. پاشانیش بەپێی ئەو دەستوورەی بۆیان دادەڕێژرێ دەزگەی جێبەجێکاری و دادوەری و یاساکارییان بۆ دادەمەزرێ بۆ پاراستنی سنوور و ئاسایشی ناوەخۆییان. وێڕای ئەم کەسایەتییە یاساییەش،

ئەو کەسانە بە شێوەیەکی سەربەخۆ بەشداری ناکەن لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان، بگـرە لـە ڕێگەی لایەنی سێیەمەوە لەوەدا بەشداری دەکەن، ئەمەش یـان دەوڵەتـە یـانیش ڕێکخـراوی نێودەوڵەتییە.

دەبینین شاری (کەراکۆف) لە ساڵی ١٨١٥ تـاکو سـاڵی ١٨٤٦ سـیفەتی شـاری ئـازادی وەرگرت بەپێی پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی، کە لەنێوان رووسیا و نەمسا و پرووسـیا بەسـترا. هەروا هەندێ لە ئەحکامە کۆتاییەکانی کـۆنگرەی ڤییـەنا لـە سـاڵی ١٩١٥ جـاڕی دا، کـە کەراکۆف شارێکی ئازاد و سەربەخۆ و بێلایەنە. ئەوە بوو ئەم پێگە یاساییە لە پاش ڕاپەڕینی دانیشتووانی شارەکە، لە ساڵی ١٨٤٦ کۆتایی پێهات و چووە پاڵ نەمسا.

هەروا شاری (گدانسك)یش پێگەی شاری ئازادی وەرگرت بەپێی پـەیمانی ڤێرسـای سـاڵی ١٩١٩. ئەوە بوو مسۆگەرکردنی پێگە یاساییەکەی ئەم شارە لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی گواسترایەوە بۆ کۆمەڵەی گەلان بەپێی دوو پەیمان لەنێوان گدانسك و پۆڵۆنیا بەسـتران لـە سـاڵی ١٩٢٠ و سـاڵی ١٩٢١. ئـەو دوو پەیمانـە ئـەرکی نوێنەرایـەتی (گدانسك)ی لە پێوەندیی نێونەتەوایەتی سپارد بە پۆڵۆنیا و ئەنجومـەنی دامەزرێنـەری شـارە ئازادەکە دەستووری خۆی پەسەندکرد بە بەشداری نوێنـەری کۆمەڵـەی گـەلان. کاتێـك هێـزە سەربازییەکانی ئەڵمانیا شاری (گدانسك)یان لە ساڵی ١٩٣٩ داگیرکـرد ئـەم پێگـە یاسـاییە کۆتایی پێهات.

لەپاش دووەمین شەڕی جیهـان (هـەرێمی ترسـت) بـە هـەرێمێکی ئـازاد جـاڕدرا بـەپێی سیستەمی نێوەخۆیی، کە لە پاشکۆی پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ ئیتاڵیـا دانـرا، ئـەویش لـە ساڵی ١٩٤٧. ئەوە بوو هەرێمەکە بەپێی ئەم پێگە یاساییە بـووە ناوچـەیەکی بێلایـەن و لـە چەك دامالڕاو. پاشان ئەم پێگە یاساییە بە دابەشکردنی هەرێمەکە لە سـاڵی ١٩٥٤ لـەنێوان هەر یەك لە ئیتاڵیا و یۆگۆسلاڤیا، بە کۆتایی هات.

چونکە (ڤاتیکان)یش بارەگـەی سـەرۆکایەتیی کڵێسـای کاسـۆلیکە پێگەیـەکی یاسـایی نێودەوڵەتیی تایبەتی هەیە وەکو شار- دەوڵەتێك.

ئەم دەوڵەتە بەسەر ڕووبەرێکەوەیە لە نیو کیلۆمەتری چوارگۆشە زیاتر نییـە لـە گـەڕەکی مـۆنتی ڤاتیکـانۆ لـە ڕۆمـای پایتـەختی ئیتاڵیـا. ڤاتیکـان لـە سـاڵی ١٩٢٩ بـەپێی ڕێککەوتننامـەی لاتـران، کـە لـەنێوان پاپـا و ئیتاڵیـا مـۆرکرا، دامـەزرا. بـەپێی ئـەم ڕێککەوتننامەیـە هـەموو پێـوەرێکی دەوڵـەتی هەیـە لـە هـەرێم و دەسـەڵاتی حـوکمڕان و

دانیشتووان و خۆیان بەرپرسیارن لە بەڕێوەبردنی کلێسای کاسۆلیك.

ڤاتیکان وەك کەسێك لە کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی، دانی پێدانراوە. دەسەڵاتی بەستنی پەیماننامە و پێوەندیی دیپلۆماتی هەیە لەگەڵ دەوڵەتەکان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان. هەروا ڤاتیکان چۆتە ڕیزی چەندین ڕێکخراوی نێودەوڵەتی وەك یەکیەتیی پۆستەی جیهانی و یەکیەتیی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان و چاوەدێری هەمیشەییشی هەیە لە نەتەوە یەکگرتووەکان و یۆنسکۆ و گەلێك ڕێکخراوی نێودەوڵەتی دی.

### ٤- کەسایەتی گەلان و نەتەوە خەباتگێڕەکان لە پێناو بەدیهێنانی مافی چارەنووس:

سرووشتی یاسایی کەسایەتی یاسایی گەل و نەتەوەکان بونیادنراوە لەسەر پرەنسیپی مافی گەلان لە دیاریکردنی چارەنووس و یەکسانی، کە لە بڕگە ٢ی مادەی یەکی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان هاتووە و جاڕنامەی دانی سەربەخۆیی بە وڵاتان و گەلانی ژێردەست، کە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لەساڵی ١٩٦٠ پەسندی کرد و هەردوو بەڵگەنامەی مافی مرۆڤ ساڵی ١٩٦٦ و جاڕنامەی پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی پێوەست بە پێوەندی دۆستایەتی نێوان دەوڵەتەکان بەپێی دەستووری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ساڵی ١٩٧١ و چەندین بەڵگەنامەی تری نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخراوە پسپۆرییەکانی.

دان پێدانان بە مافی بڕیاردانی چارەنووسی هەموو گەل و نەتەوەکان واتای وا نییە هەموویان بە کەسانی یاسایی نێودەوڵەتی دادەنرێن. سەروەری نەتەوەیی گەل و نەتەوەکان بنەمای سیاسی یاسایی ئەهلییەتە یاساییە نێودەوڵەتییەکەیانە. بەم پێیەش ئەو نەتەوە و گەلانەی خەباتدەکەن بۆ جێبەجێکردنی مافی چارەنووس تەنیا ئەوانەن لە واقیعدا، کە هێشتا قەوارەیەکی سەربەخۆیان نییە و بە مافی چارەنووسیان شادنەبوونە لە ڕێگەی پێکەوەنانی دەوڵەتی سەربەخۆ یان چوونە پاڵ دەوڵەتێکی سەربەخۆ یان بونیادنانی قەوارەی فیدراڵی یان کۆنفیدراڵی لەناو دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و فرەپێکهاتە.

گەلان و نەتەوەکان لە سەرەتای خەباتیانەوە لە پێناو جێبەجێکردنی مافی چارەنووس هەوڵدەدەن بۆ ئەوەی بچنە ناو پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە ڕێگەی بەکارهێنانی چەندین شێواز بە پیادەکردنی خەباتی چەکداریشەوە. دەبینین لە قۆناخی خەبات و تاوەکو پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی خاوەن کەسایەتی یاسایی تەواویش لە ئاستی نێودەوڵەتییەوە داندەنرێت بە گەل و نەتەوەی خەباتگێڕ لە پێناوی مافی چارەنووس لە ڕێگەی دانان بەو ڕێکخراوە سیاسییانەی پێکیان دێنن بۆ ئەوەی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و نێوەخۆیی نوێنەرایەتییان بکەن.

## تەوەری دووەم
## دەوڵەت وەك كەسێكی سەرەكیی یاسای نێودەوڵەتی گشتی

دەوڵەت لە ڕووی ڕامیارییەوە برێتییە لە كۆمەڵە دەزگەیەكی ڕێكخراو، كە لە میانەیاندا كۆمەڵە كەسانێك لە خەڵكی پیادەی دەسەڵات دەكەن لەسەر هەرێمێكی دیاریكراو و لە پێناو بەدیهێنانی سوود و بەرژەوەندی گشتی، بەڵام لە ڕووی یاسای نێودەوڵەتییەوە دەوڵەت برێتییە لە قەوارەیەك پێكهاتووە لە كۆمەڵێك لەو تاكانەی، كە ژیانی خۆیان ڕێكدەخەن و سەر بە ڕژێمێكی دەسەڵاتداری سەروەرن و بە شێوەیەكی بەردەوام لە هەرێمێكی"خاكێكی " دیاریكراودا دەژین. بەم واتایەش دەوڵەت بە كەسی سەرەكیی تەقلیدی یاسای نێودەوڵەتی دەژمێردرێ. دەبینین هەموو دەوڵەتە سەربەخۆیەكان یەك قەبارە ئەهلییەتی یاسایی نێودەوڵەتییان هەیە، كە بە شێوەیەكی ئۆتۆماتیكی لەوەتی دروستبوون ئەو ئەهلییەتە وەردەگرن چ دانیان پێدا بنرێ یان نا. چونكە گرینگی دانپێدانان ئەو كاتە دەردەكەوێ، كە ئەهلییەتە یاساییەكە لە پراكتیكدا بەكاردەهێنرێ.

### ١- مافەكانی دەوڵەت:

یاساناسان لەو بڕوایەدان دەوڵەتەكان مافی یەكسانیان هەیە، ئەویش لە ئەهلییەتە (توانا) یاساییە نێودەوڵەتییەكەیانەوە هەڵقوڵاوە. سەرچاوەی ماف و ئیلتیزامە سەرەكییەكانی دەوڵەت (كە گشتین و لە لایەن هەمووانەوە دانیان پێدانراوە) پرەنسیپە فەرماندەرەكانن لە یاسای نێودەوڵەتی گشتیدا، بەڵام تاوەكو ئێستە دۆكومێنتێكی نێودەوڵەتی گشتی پەسندنەكراوە ئەم ماف و ئیلتیزاماتانە بگرێتەخۆ، ئەگەرچی لیژنەی یاسای نێودەوڵەتی هەر لە ساڵی (١٩٤٩)وە بەیاننامەی ماف و ئەركی دەوڵەتەكانی ئامادەی كردووە و كۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەكگرتووەكانیش ئەو ماف و ئەركانەی بۆ دەوڵەتەكانی ئەندام بە بڕیاری (١٧) ٣٧٥ خستۆتەڕوو تاوەكو ڕاو بۆچوونی خۆیانی لەسەر دەربڕن، بەڵام لە ساڵی ١٩٥١ كۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەكگرتووەكان لێكۆڵینەوەی لەسەر ئەو پرۆژە بڕیارە دواخست و تا ئێستەش هەروا ماوە [١٧].

---

١٧- بڕوانە دەقی پرۆژەكە لە:

لە پراکتیکی نێودەوڵەتیدا کۆمەڵێك ماف و ئەرکی بنەڕەتی چەسپاون، وەك: مافی دەوڵەت لە پیادەکردنی سەروەریی بەسەر هەرێم و دانیشتووانی و موڵك و سامانەکانییەوە و هەروا مافی بەرگری تاکی و کۆمەڵی و یەکسانی لەگەڵ نەتەوەکانی تردا، بەڵام دەکرێ لە چوارچێوەی ئەرکەکانیدا ئاماژەبدرێ بە دەستێوەرنەدان لە کاروباری دەوڵەتەکانی تر و ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانی و یەکلاکردنەوەی کێشە نێودەوڵەتییەکان بە ئاشتی و بە پەنانەبردنە بەر بەکارهێنانی هێز یان هەڕەشەکردن بە بەکارهێنانی لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان و دراوسێیەتی باش و جێبەجێکردنی ئیلتیزاماتەکان بە نیاز پاکی.

لە چوارچێوەی مافە سەرەکییەکانی دەوڵەت جەخت دەکەینە سەر دوو جۆرە ماف ، ئەوانیش مافی سەربەخۆیی و مافی یەکسانین، کە ئەو دوانەش کۆمەڵێك مافی تریان لێ دەکەونەوە:

**١- مافی سەربەخۆیی:**

سەربەخۆیی گرینگترین تایبەتمەندە لە تایبەتمەندییەکانی دەوڵەت. ئەم مافە لە پرۆژەی جاڕنامەی ماف و ئەرکەکانی دەوڵەت وا پێناسە کراوە، کە برێتییە لە توانای دەوڵەت بۆ گەشەکردنی خۆشگوزەرانی خۆی و پەرەپێدانی بەشێوەیەکی ئازاد و دوور لەژێردەستەیی دەوڵەتەکانی تر و زیان نەگەیاندن بە مافی دەوڵەتەکانی تر یان پێشێلکردنیان.

سەربەخۆیی بەم واتایە یەکێکە لەو بابەتانەی یاسای نێودەوڵەتی لێیان دەکۆڵێتەوە. هەر کلکایەتییەکی سیاسی یان ئابووری کردەیی کارناکاتە سەر سەربەخۆیی یاسایی دەوڵەت ئەگەر ئەو دەوڵەتە ناچارنەکرێ ملکەچبێ بۆ داخوازییەکانی دەوڵەتی زاڵ. بۆ نموونە لە کێشەی گومرکی نەمسا- ئەڵمانیادا دادوەر ئینزلیوتی لە ساڵی ١٩٣١ لە میانەی دانیشتنەکانی دادگەی نێوبژیوانی نێودەوڵەتی هەمیشەیی، کە لەو کێشەیەی دەکۆڵییەوە، ئاماژەی دا، کە کۆتبەندی لەسەر ئازادیی دەوڵەت چ سەرچاوەکەی یاسای نەریتی بێ یان ئیلتیزامی بەڵێنی کارناکاتە سەر سەربەخۆییەکەی، بەڵام بە مەرجێ نەخرێتە ژێر دەسەڵاتی یاسایی دەوڵەتێکی ترەوە(١٨). هەروەها دادگەی دادی نێودەوڵەتی لە کێشەی ڕەوایەتی بەکارهێنانی چەکی

---

Draft Declaration on Rights and Duties of States 1949 Available on 3/1/2010at: http://www.un.org/law/ilc/

18- 6 ILR, P.30

ئۆتۆمی یان هەڕەشەکردن بەو چەکە ئاماژەدەدات، کە پراکتیکی دەوڵەتەکان دەریدەخات، کە ناڕەوایەتی بەکارهێنانی هەندێ چەك ناگەڕێتەوە بۆ نەبوونی مۆڵەت بۆ بەکارهێنانی یان هەڕەشەکردن بە بەکارهێنانی، بگرە پاڵی داوە بە نۆرمی قەدەخەکردنی ئەم جۆرە چەکانە یان هەڕەشەکردن پێی[19]. چونکە یاسای نێودەوڵەتی ئازادی کارکردن بۆ دەوڵەت فەراهەم دەکات ئەگەر ئەحکامی تر کۆتبەندی نەکات. بە هەرحاڵ دەبێ تاکید لەسەر ئەوە بکرێ، کە ئەم جۆرە ئازادییە لە چوارچێوەی سیستەمی یاسای نێودەوڵەتیدا هەن نەك لە دەرەوەیدا، بۆیە یاسای نێودەوڵەتی خۆی ڕادە و نێوەڕۆکی سەربەخۆیی دەوڵەتەکان دەسەپێنێ، نەك دەوڵەتەکان بە تاك یان بە کۆمەڵی.

چەمکی سەربەخۆیی لە یاسای نێودەوڵەتیدا چەند ماف و ئەرکێك لەخۆدەگرێ، وەك: مافی دەوڵەت لە پیادەکردنی دەسەڵاتی بەسەر هەرێمەکەی و دانیشتووانی و مافی لە خۆ بەرگریکردن لە چەند حاڵەتێکی دیاریکراو و ئەرکی دەستێوەرنەدان لە کاروباری نێوەخۆیی دەوڵەتەکانی تر، بەڵام مەسەلەی دیاریکردنی کاروباری ناوەخۆیی دەوڵەت بە وردی هێشتا مەسەلەیەکە قابیل بە گفتوگۆیە و پێوەری دیاریکردنی لە گۆڕانکاری بەردەوامدایە. دەبینین دەوڵەتە ئەورووپاییەکان بە درێژای چەندەها ساڵ هەر هەنگاوێك نەتەوە یەکگرتووەکان دەیگرتە بەر سەبارەت بە کۆلۆنەکانیان بە کارێکی پێچەوانەی نۆرمی یاسای نێونەتەوەیان، دادەنا. وێڕای ئەوەش نەتەوە یەکگرتووەکان لە لەناوبردنی کۆلۆنیالیزم دەستی وەردا و دەوڵەتە کۆلۆنیالییەکانی ناچارکرد ملکەچ بن بەرامبەر بە نۆرمە یاساییە نوێیەکان لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا. بۆ نموونە ئەو کێشانەی تایبەتن بە مافی مرۆڤ و جیاوازی ڕەگەزی چیتر یەکێك نین لەو کێشە تایبەتانەی ملکەچی دەسەڵاتی ناوەخۆ دەبن، بگرە یاسای نێودەوڵەتی وایکردووە بخرێنە ژێر چاوەدێری دەرەکییەوە. بۆیە جاڕنامەی ئەنجومەنی ئەورووپی بڵاوی کردەوە، کە ((پاراستنی مافی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان لە هیچ بارێکدا ناکرێ بە دەستێوەردان دابنرێ لە کاروباری نێوەخۆیی دەوڵەت)) جەختیش کرا، کە ((دەوڵەتەکان مافێکی ڕەوشتمەندیان هەیە بۆ دەستێوەردان لەهەر کوێیەك مافی مرۆڤ پێشێل بکرێ)) [20].

سەبارەت بە دەستێوەرنەدان لە کاروباری نێوەخۆیی دەوڵەتەکانیش، جاڕنامەی پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی تایبەت بە پێوەندی دۆستایەتی و هاوکاری نێوان

19- ICJ Reports, 1996, para.52.
20- Ukmil, 62 BYIL. 1991. P.556.

دەوڵەتەکان، کە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٧٠ پەسندی کرد، دەڵێت: ((هیچ دەوڵەتێك یان کۆمەڵە دەوڵەتێك مافی ئەوەیان نییە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەبەر هیچ هۆیەك دەستبخەنە کاروباری ناوەخۆیی یان دەرەکی هیچ دەوڵەتێکی ترەوە. دوایەش دەستێوەردانی چەکداری و هەر شێوە دەستێوەردانێکی تر یان هەڕەشەکردن دژی کەسایەتی دەوڵەت یان دژی بنەما سیاسی و ئابووری و کولتوورییەکانی بە پێشێلکردنی یاسای نێودەوڵەتی دادەنرێ)) [٢١].

دەستێوەرنەدان ئەوەش دەگرێتەوە، کە وڵات یان لایەنێك یارمەتی کۆمەڵە تێکدەرێك بدات بە مەبەستی ڕوخاندنی حکوومەتی دەوڵەتێکی تر لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێز، بەڵام بەکارهێنانی هێز بە ئامانجی بێبەشکردنی گەلان لە پێناسەی نەتەوەییان جیاوازی هەیە لەگەڵ پرەنسیپی دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوەخۆ.

پرەنسیپەکانی پێوەست بە سەروەری وەك دەستنەخستنە کاروباری ناوەخۆوە، پێویستن بۆ درێژەدان بە سیستەمێکی سەقامگیری قبوولکراو لەنێوان دەوڵەتە ڕکابەرەکاندا. دانانی کۆتبەندی لەسەر دەسەڵاتی دەوڵەتەکان بەرامبەر یەکتر، تا رادەیەك بەشداری دەکات بۆ سەقامگیربوون و جێگیربوونی سیستەمی نێودەوڵەتی. دەبینین دادگەی دادی نێودەوڵەتی لە کێشەی کەناڵی کۆرفی (Curfu Channel) ساڵی ١٩٤٩ جەختی کرد، کە ((ڕێزگرتن لە سەروەری نێوەخۆیی دەوڵەتە سەربەخۆکان یەکێکە لە بنەما زەرورەکان بۆ بونیادنانی پێوەندیی نێودەوڵەتی)).

لەبەر هەمان هۆیش دەوڵەت ناتوانێ یاساکانی خۆی لە هەرێمی دەوڵەتێکی تر پیادەبکات یان پۆلیس و کەسانی فەرمی تر بەبێ ڕەزامەندی دەوڵەتی پێوەندیدار بنێرێ بۆ گرتنی ئەو تاوانبارانەی لە دەرەوە نیشتەجێن. هەروەها بوونی هێزی بیانی بەسەر هەرێمی دەوڵەتێکی خاوەن سەروەرییەوە، پێویستی بە ڕەزامەندی دەوڵەتی پێوەندیدار هەیە.

### ٢- مافی یەکسانی:

یەکسانی یاسایی دەوڵەتەکان یەکێکە لە گرینگترین پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی. مافی یەکسانی چەمکێکی یاساییە، پێویستە لەگەڵ چەمکی یەکسانی سیاسی تێکەڵ نەکرێ.

---

21- bICJ Reports, 1949, PP.4, 35

ئەم جۆرە یەکسانییە واتای یەکسانی دێت لە ماف و ئەرکە یاساییەکان. بۆ نموونە مالتّا ئەویش وەکو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەوڵەتێکی خاوەن سەروەرییە، هەمان کەسایەتی یاسایی و ئەرکی یاسایی هەیە و خاوەن دەنگێکە لە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، واتا مالتّا و ئەمەریکا یەکسانن. دەبینین لە گەلێك باردا تیۆری یەکسانی یاسایی دەوڵەتەکان بە چەمکێکی گشتی دادەنرێ، کە ئەو ئیلتیزام و مافانە لەخۆدەگرێ، کە هەموو دەوڵەتەکان دەگرنەوە. لە جاڕنامەی پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی ساڵی ١٩٧٠دا هاتووە: ((هەموو دەوڵەتەکان بەپێی یەکسانیان لە رووی سەروەرییەوە ماف و ئەرکی یەکسانیان هەیە و هەمووشیان ئەندامی یەکسانن لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا، هەرچەندە جیاوازی هەیە لەنێوانیاندا لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕامیارییەوە)).

**یەکسانی یاسایی ئەم توخمانە دەگرێتەوە:**

ا- یەکسانی دەوڵەتەکان لە ڕووی یاساییەوە.

ب- تێکڕای دەوڵەتەکان ئەو مافانەیان هەیە، کە لە سەروەریی تەواوەوە هەڵ دەقوولێت.

ت- دەوڵەتان پێویستە ڕێز لەیەکدیی بگرن.

پ- پیرۆزیی یەکیەتیی خاك" هەرێم "و سەربەخۆیی سیاسی دەوڵەتەکان.

ج- مافی دەوڵەت لە هەڵبژاردن و پەرەپێدانی سیستەمە ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابووری و کولتوورییەکەی بە شێوەیەکی ئازاد.

ح- پێویستە لەسەر هەموو دەوڵەتێك ئەرکی ئیلتیزامە نێودەوڵەتییەکانی بە تەواوی و بە نیاز پاکی جێبەجێ بکات و بە ئاشتی لەگەڵ دەوڵەتەکانی تر، هەڵبکات.

ناکرێ پارێزگاری لە سیستەمی نێودەوڵەتی بکرێ بەبێ زامنکردنی ڕێزگرتن لە یەکسانی یاسایی نێوان بەشداربووانی. بۆیە پێویستە لەسەر دەوڵەت پابەندبێت بە ڕێزگرتنی سەروەری بەشداربووانی تر لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا. ئەمەش یانی مافیان هەیە لە پیادەکردنی دەسەڵاتی یاساکاری و جێبەجێکاری و کارگێڕی و دادوەرییان بە شێوەیەکی ئازاد بەسەر هەرێمەکەیانەوە و پیادەکردنی سیاسەتی دەرەوەیان بەبێ هیچ دەستێوەردانێك لەلایەن دەوڵەتەکانی ترەوە. [٢٢]

---

٢٢- ب. م. ئەمینکۆ :یاسای نێودەوڵەتی، مۆسکۆ ١٩٩٤، ل ٢٨.

یەکسانی یاسایی لەنێوان دەوڵەتەکاندا بنەمایەکی گرینگە لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا لەم سەردەمەدا، چونکە بە شێوەیەکی بەربڵاو لە مادەی (٢-١)ی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکاندا ڕەنگی داوەتەوە، تێیدا هاتووە، کە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکە (لەسەر پرەنسیپی یەکسانی سەروەری لەنێوان هەموو ئەندامەکانی، بونیادنراوە). دەبینین لە کۆمەڵەی گشتیی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا یەکسانی یاسایی لە نۆرمێك بەرجەستەبووە، ئەویش ئەوەیە هەر دەوڵەتێك یەك دەنگی هەیە بە بێ ئەوەی هێزە کردەییەکەی لە واقیعدا لەبەرچاو بگیرێت. ئەمەش مایەی ڕەخنەیە بەتایبەتی لەلایەن دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکانەوە پاش ئەوەی بەرەی ئاسیا و ئەریقیای عەرەبی بە شێوەیەکی ڕوون زاڵ بوو دوای فرەوانبوونی شمولییەتی ئەندامێتی[٢٣].

یاسای نێودەوڵەتی لە چەند بارێکی تایبەتدا و وەك رەنگدانەوەیەك بۆ واقیعی بابەتییانە، ڕێگەی داوە بە نایەکسانی لەنێوان دەوڵەتەکاندا، لە ئەنجامی کەمی یان زۆری ئەو ماف و ئیلتیزامانەی هەیانە. باشترین نموونە بۆ ئەوە سیستەمی بە ئەندامبوونە لە ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتیدا. وەك ئاشکرایە هەر پێنج دەوڵەتە گەورەکە تیایدا ئەندامێتی هەمیشەییان هەیە[٢٤].

## ٢- پێوەرەکانی دەوڵەت:

بڕگەی دووی مادەی یەکی دەستووری کۆمەڵەی گەلان ڕێگەی داوە بەو دەوڵەتانەی بەتەواوی خۆیان دەبەنەڕێوە، واتا دەوڵەتە سەروەرەکان و ئەو قەوارانەی پێیان دەگوترا "dominions" و ئەو کۆلۆنانەی ناویان لەو لیستە نەهاتووە، کە پاشکۆی دەستووری کۆمەڵەی گەلانە ببنە ئەندام لە کۆمەڵەی گەلان دوای وەرگرتنی ٢\٣ ی دەنگەکانی ئەندامانی ئەنجومەنی گشتی کۆمەڵە و بە مەرجێك گرەنتییەکی کارا پێشکێش بکەن، کە ئارەزووی راستەقینەیان هەیە، کە ملکەچی ئیلتیزامە نێودەوڵەتییەکانیان دەبن. بەپێی ئەم بنەمایە هیندستان بووە ئەندام لە کۆمەڵەی گەلان، ئەگەرچی دۆمینیۆنێکی سەر بە بەریتانیا بوو و دەوڵەتێکی سەروەری تەواونەبوو. بەم جۆرە پێوەری بە دەوڵەتبوون مەرجێکی پێشەکی نەبوو بۆ ئەندامێتی لە کۆمەڵەی گەلان.

---

23- L.Sohn, World Peace Through world Law 3rd end. New york.1966, P.399-402
24- И . И.Лукашук. международное право.Москва.1997 ctp. 268.

وەرگـرتنی ئەنـدامـی نـویێ لـە کۆمەڵـەی گـەلان، بـەپێی بڕگـەی دووی مـادەی یـەکی دەستوورەکەی کردەوەیەکی فرەوان نەبوو لە ژیانی کۆمەڵەدا. وێـڕای ئەمـەش، لـە مەیـدانی نێودەوڵەتیدا، بە شێوەیەکی بەرتەسك لـە روانگـەی بەرژەوەنـدی دەوڵەتـە باڵادەسـتەکانەوە، شرۆڤەی ئەو پێوەرانە دەکرا، کە پێویستن بۆ پێکهێنانی دەوڵەت. بۆ نموونە کۆمەڵـەی گـەلان داواکاریی ئەندامێتی هەندێ قەوارەی رەتکردەوە وەك ئەرمینیا و گورجستان و ئۆکرانیا، کـە لە ئیمپراتۆریای رووسیا جیاببوونەوە، بە بیانووی ئەوە، کە ئاسایش تێیاندا بەرقـەرار نییـە و توانای بەردەوامبوونیان نییە. لە لایەکی ترەوە داواکاری هەندێ قـەوارەی دیکـەی دواخسـت وەك لاتڤیا و لیتوانیا و ئەستۆنیا، گوایە تاوەکو بەردەوامێتی خۆیان دەسەلمێنن. لە حاڵەتێکی تردا داواکاری بە ئەندامبوونی Liechtensteinی رەتکردەوە بە بیانووی ئەوەوە، کە قەبارەی بچووکە بە رادەیەك توانای جێبەجێکردنی ئیلتیزامەکانی خۆی نییە بـە گـوێرەی دەسـتووری کۆمەڵە.

لێرە دەگەینە ئەو ئەنجامەی، کە بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان لەسەر بەرژەوەنـدی سیاسـی بونیاددەنران، نەوەك لەسەر نۆرمی یاسای نێودەوڵەتی.

رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر ((بنەمای یەکسـانی سـەروەری لـەنێوان هـەموو ئەندامەکانیدا، بونیادنراوە)). (مادەی:٢بڕگە:١). مافی ئەندامێتی تیایدا دراوە بە ((هـەموو دەوڵەتە ئاشتیخوازەکان، کە خۆیان پابەندکردووە بەو ئیلتیزامانەی لە دەستوورەکەدا هاتوون و رێکخراوە نێودەوڵەتییەکە لەو بڕوایەدایە، کە توانا و ئارەزوویان هەیە بـۆ جێبـەجێکردنیان)) (مادەی:٤ بڕگە:١ لە دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان). ئەمەش وا ناگەیەنێ، کە ئەندامێتی لە نەتەوە یەکگرتووەکان یەکێکـە لـە مەرجـەکانی پێکهـاتنی دەوڵـەت. کـەواتا داواکـاری هاتنەریز لە مەرجەکانی پێکهاتنی دەوڵەت نییە. چونکە دەسـتوورەکە ئامـاژەی نـەداوە بـە پێوەری پێکهاتنی دەوڵەت و مەرجیشـی بـۆ ئـەوە دانـەناوە. کـاتێ نەتـەوە یـەکگرتووەکان داواکاری هاتنەڕیزی دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکان رەتدەکاتەوە، هەندێ جار هەندێ مەسەلەی تـر، کە دوورە لە مەسەلەی مەرجەکانی بە دەوڵـەتبوون لەبەرچـاودەگرێ. بـا بڕیـاری ئەنجومـەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی ژمارە (١٩٩٢)٧٧٧ لـە ١٩٩٢/١٢/٢٢ سـەبارەت بـە یۆگۆسـلاڤیای پێشوو بە نموونە وەربگرین.

پاش لێکترازانی کۆماری یۆگۆسلاڤیای سۆشیالیستی فیدراڵی لـە سـەرەتای نەوەتەکانـدا چوار دەوڵەت پێکهات لەو شەش کۆمارە فیدراڵیانەی، کە کۆماری فیـدراڵی یوگوسـلاڤیایان

پێکهێنابوو، ئەوانیش ئەمانەن: کەرواتیا و سلۆڤینیا و بۆسنە- هیرسۆگۆڤینا و مەکەدۆنیا. ئەم دەوڵەتانە هاتنەڕیزی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، وەك دەوڵەتی سەربەخۆ، کەچی هەر یەك لە سربیا و مۆنتینیگرۆ و کۆماری یۆگۆسلاڤیای فیدراڵییان پێکهێنا، کە داوای کرد شوێنی یۆگۆسلاڤیای سۆشیالیستی جاران بگرێتەوە لە ئەندامێتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا.

لەو بڕیارەدا هاتبوو، کە ئەنجومەنی ئاسایش ئەوە لەبەرچاودەگرێ، کە ئەو دەوڵەتەی جاران بە کۆماری یۆگۆسلاڤیای سۆشیالیستی فیدراڵی ناسرابوو ئێستە چیتر نەماوە و بە تایبەتی بڕیاری (١٩٩٢) ٧٥٧ وەبیردێنێتەوە، کە دەڵێت: ((داواکاری کۆماری یۆگۆسلاڤیای فیدراڵی (سربیا و مۆنتینیگرۆ) بۆ بەردەوامبوونی ئەندامێتی کۆماری یۆگۆسلاڤیای سۆشیالیستی فیدراڵی کۆن بە شێوەی ئۆتۆماتیکییانە لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بە گشتی پەسندنەکراوە، پێی وایە کۆماری یۆگۆسلاڤیای فیدراڵی (سربیا و مۆنتینیگرۆ) ناکرێ ئەندامێتی کۆماری یۆگۆسلاڤیای سۆشیالیستی بە شێوەی ئۆتۆماتیکی لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەردەوام بێت، بۆیە کۆمەڵەی گشتی رادەسپێرێ، کە پێویستە لەسەر کۆماری یۆگۆسلاڤیای فیدراڵی (سربیا و مۆنتینیگرۆ) داوای ئەندامێتی پێشکێش بە نەتەوە یەکگرتووەکان بکات و رێ نەدرێ بەشداری لە کارەکانی کۆمەڵەی گشتی بکات(( •.

پێمان وایە ئەم بڕیارە باس لە پێوەرەکانی پێکهاتنی دەوڵەت ناکات، بگرە تەنیا باس لە مەسەلەی بەردەوامبوونی ئەندامێتی یۆگۆسلاڤیای نوێ دەکات وەك درێژەپێدانێك بۆ دەوڵەتی یۆگۆسلاڤیای پێشوو. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بە داواکارییەك دانانرێ بۆ پێکهاتنی دەوڵەتێکی نوێ. دەبینین ئەو نامەیەی راوێژکاری یاسایی نەتەوە یەکگرتووەکان لە **١٩٩٢/٩/٢٩** ناردوویەتی بۆ نێردراوە هەمیشەییەکانی بۆسنا- هیرزۆگۆڤینیا و کراواتیا لە نەتەوە یەکگرتووەکان جەختی کردەوە، کە بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش، کە پێشتر ئاماژەی پێدرا، ئەندامێتی دەوڵەتی یۆگۆسلاڤیای پێشووی لە نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵنەوەشاندۆتەوە، بگرە رێی گرتووە لە قەوارەی یۆگۆسلاڤیای نوێ نوێنەرایەتی دەوڵەتە کۆنەکە بکات لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا.

یاسای نێودەوڵەتی نەریتی زەرووڕەتی بوونی هەندێ توخمی پێویستی پەسندکردووە بۆ

---

• S/RES/777 (1992 )

پەیدابوونی دەوڵەت. دەبینین دادگەی نێوبژیوانی نێوان ئەڵمانیا و پۆڵۆنیا سەبارەت بە سیلیزیای باڵا لە ساڵی ١٩٢٨ لە بڕیارەکەیدا سێ مەرجی داناوە بۆ پەیدابوونی دەوڵەت ئەوانیش: دانیشتووان، هەرێم، دەسەڵاتیکی گشتیش، کە کاروباری دانیشتووان لە هەرێمدا ڕێك بخات. کەچی مادەی: (١) لە ڕێککەوتننامەی مۆنتیڤیدیۆی نێوان دەوڵەتە ئەمریکییەکان سەبارەت بە ماف و ئەرکی دەوڵەت ساڵی ١٩٣٣ دەڵێت: ((پێویستە دەوڵەت بۆ ئەوەی بە کەسێك دابنرێ بۆ یاسای نێودەوڵەتی ئەم تایبەتمەندییانەی تیا بێت ١- دانیشتووانی هەمیشەیی. ٢-هەرێمێکی دیاریکراو. ٣-حکوومەتێك. ٤-توانای چوونە نێو پێوەندیگەلێکی هەبێ لەگەڵ دەوڵەتەکانی تردا.[٢٥]

ڕوونە ئەو پێوەرانەی ڕێککەوتننامەی مۆنتیفیدیۆ دیاریکردوون پەسەندکران، وەك بەڵگە بۆ پێکهاتنی دەوڵەت و ئێستە گواستراونەتەوە بۆ یاسای نەریتی، بەڵام مەسەلەیەکی تر هێشتا ماوە ئەویش ئەوەیە ئایا تەنیا ئەم پێوەرانە تەواو و پێویستن بۆ پێکهاتنی دەوڵەتێك.

هەندێ لە یاساناسان پێیان وایە، دەکرێ هەندێ مەرجی تریش لەبەرچاوبگیرێ، وەك ((بەردەوامبوون)) و (( ئارەزووی پابەندبوون بە یاسای نێودەوڵەتی و دەرەقەتهاتنی)) و ((تارادەیەك شارستانیبوون)) و ((پێزانین)) و ((بوونی سیستەمێکی یاسایی لە دەوڵەت)) و ((شەرعییەت)). ئەوانە پێیان وایە پەیدابوونی دەوڵەت برێتییە لە پێوەندییەکی یاسایی ئاڵۆزتر لەوەی، کە ڕێککەوتننامەی مۆنتیڤیدیۆ وای دەبینێ)).

ئەنجومەنی ئەورووپایش لە ڕێنماییەکاندا سەبارەت بە پێزانین بە دەوڵەتە نوێیەکان لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات و یەکیەتیی سۆڤێتی پێشوو و جارنامەکەی لەمەڕ یۆگۆسلاڤیا چەند پێوەرێکی نوێی بۆ دەوڵەت زیادکردووە، یان بە لایەنی کەم، چەند پێوەرێکی نوێ بۆ پێزانین بە دەوڵەت زیادکردووە.

لەلایەکی دیکەوە، پێوەندیی نێوان پێوەری واقیعی و پێوەری یاسایی بۆ پەیدابوونی دەوڵەت پێوەندییەکی زۆر تێکئاڵاوە. چونکە کێشەی ئایا لەدایکبوونی دەوڵەتی نوێ لە سەرەتادا کارێکی واقیعیانەیە یان یاساییە و چۆنێتی تێکەڵبوونی نێوان پێوەری دەسەڵاتی کردەیی و پرەنسیپە یاساییە دیاریکراوەکان دەگونجێن یان نە، مەسەلەیەکی ئاڵۆز و زۆر گرینگە. دەبینین دوای لەناوبردنی کۆڵۆنیالیزم و شادبوونی هەموو ئەو وڵاتانەی لەژێر ڕکێفی

---

25- Montevideo Convention on the Rights and Duties of States. 1933. 135 LNTS (1936) 19

کۆلۆنیالیزمدا بوون بە مافی خۆیان لە دیاریکردنی چارەنووسیان و پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆیان، ئەوا پێکهێنانی دەوڵەتەکان لەم سەردەمەدا لە ڕێگەی لێکترازان و هەرەسهێنانی دەوڵەتێکەوە دەبێت، ئەوەش وا پێویست دەکات بارودۆخەکان لەسەر بنەمای نوێ ڕێك بخرێنەوە. ڕووداوە هاوچەرخەکانی وەك هەرەسهێنانی یەکیەتیی سۆڤێت و یۆگۆسلاڤیای سۆشیالیستی و چیکوسلۆڤاکیا باشترین نموونەن بۆ ئەوە.

کۆمیتەی نێوبژیوانی ئەنجومەنی ئەوروپی سەبارەت بە یۆگۆسلاڤیا، لەبارەی بۆچوونی ژمارە(١) ئاماژەی داوە، کە دەکرێ دەوڵەت لەلایەن هەمووانەوە بەو پێیە پێناسە بکرێ، کە: ((قەوارەیەکی خاوەن سەروەرییە، کە پێکهاتووە لە هەرێمێك و دانیشتووانێك، کە سەر بە دەسەڵاتێکی سیاسی ڕێکخراون.......)) دیسان جەختی کردووە، کە شێوەی ڕێکخستنی سیاسی نێوەخۆیی و ئەحکامە دەستوورییە نێوەخۆییەکان تەنیا چەند هەقیقەتێکن، کە پێویستە بە هەند وەربگیرێن بۆ دیاریکردنی توانای دەسەڵات بۆ بەڕێوەبردنی دانیشتووان و هەرێم[٢٦]. ئەمەش واتا یاسای نێودەوڵەتی گشتی ڕێگر نییە لە پێش دەوڵەتەکان، کە دان بە دەوڵەتێکدا بنێن هەر لەبەرئەوەی سیستەمە سیاسییەکەی بە سرووشت دیموکراتی نییە. ئەگەر ئەو مەرجەی دانابایە، ئەوا دەبوو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی پەنای بېردایە بەر دەستێوەردانی چەکداری بۆ دانانی حکوومەتی دیموکراتییانە لە وڵاتە نادیموکراتییەکاندا، بەڵام کاتێك سیستەمێکی نادیموکراسی دێت و دەسەڵات لە حکوومەتێك زەوت دەکات، کە بە شێوەی هەڵبژاردن پێکهێنراوە، ئەوا کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بۆی هەیە پێزانین بەو حکوومەتە ڕەتبکاتەوە و سزای ئابووری گشتی بەسەردا بسەپێنێ بە مەبەستی ملکەچبوونی و گەڕانەوەی بەرەو سیستەمی دیموکراسی.

دوای ئەم باسە خێرایە لەمەڕ هەندێ لە بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکان و چەمکی یاساناسییەوە دەگەینە ئەو بەرئەنجامەی، کە یاسای نێودەوڵەتی و یاساناسیی کۆکن لەسەر ئەوەی پێوەری سەرەکیی بۆ پێکهێنانی دەوڵەت بریتییە لە خاك و دانیشتووان و سیستەمی دەسەڵاتدار و توانای چوونە نێو پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە، لەم ڕوانگەیەوە دواتر لە هەر توخمێك لەو توخمانەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێدان، دەپێچینەوە بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی گرینگییەکەی و ڕۆڵی و کاریگەری لەسەر سەرهەڵدانی دەوڵەت و بەردەوامبوونی.

---

26- 92 ILR. PP. 162, 165

### ٣- پێوەری دانیشتووان:

### ١- چەمکی دانیشتووان لە یاسای نێودەوڵەتیدا:

شتێکی سرووشتییە دامەزراندنی دەوڵەت، کە بخوازێ دانیشتووانێك هەبێ بە شـێوەیەکی هەمیشەیی و جێگیر لە هەرێمەکەیدا بژین و ملکەچی ڕژێمێکی دەسەڵاتدار بن. پێوەرێك نییە بۆ دیاریکردنی ژمارەی دانیشتووان، تاوەکو بگوترێ ئەم پێوەرەی دەوڵـەت هاتۆتـەدی. چـۆن دەوڵەت برێتییە لـە قەوارەیـەکی هـەرێمی، ئـاواش برێتییـە لـە کۆمەڵـە کەسـانێك. بۆیـە بونیادنـانی دەوڵـەت پێویسـتی بـە دانیشـتووانی بـەردەوام هەیـە بـێ ئـەوەی ژمارەیـان لەبەرچاوبگیرێت. هیچ راژەیەك نییە کە دەبێ ژمارەی دانیشتووان بیگاتێ بە هــەمان شـێوەی رووبەری هەرێمی دەوڵەت. هەر ئەوە بەسە ژمارەیان ئەوەنـدە بێـت، کـە بتـوانن خۆیـان لـە هەرێمەکەیاندا ڕێکبخەن بۆ پیادەکردنی مافیان لە بڕیاردانی چارەنووسدا.*

دانیشتووان برێتییە لە کۆی ئەو تاکانەی کە لەسەر هەرێمی دەوڵەتەکە دەژین. دەکرێ لـە ڕووی پێگەی یاساییەوە دانیشتووان بکرێ بە دوو بەشی سەرەکییەوە: هاووڵاتیان کە زۆرینـەی

---

*. ئێستا لە جیهاندا دە دەوڵەت هەن، کە ژمارەی دانشتوانیان لە سەرووی سەت هەزار کەسەوە نییە، ئەوانیش ئەمانەن:

- ڤاتیکان ٧٦٨ کەس
- Tuvalu تیڤالیو ٩.٧٤٣ کەس
- Nauru ناورو ١١.٢١٨ کەس
- 21.092 Polau کەس
- 30.472 San marino کەس
- 33.084 Monaco کەس
- 34.927 Liechtenstein کەس
- 39601 st. kitties Nevis کەس
- 54.313 Marshal Islauds کەس
- 68.584 Andorra کەس

بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

James Crawford, The Creation of States In International Law, 2Edn Clarendon Press. Oxford 2006, P.52.

دانیشـــتووانی دەوڵـــەت پێکـــدێنن و لـــە ڕێگـــەی پێوەنـــدیی ڕەگەزنامـــەوە بەســـتراون بـــە دەوڵەتەکەیانەوە، کە ماف و ئیلتیزامیان لە بەرامبەریدا دیاریدەکات.

کۆمەڵی دووەمیش بریتین لە بیانییەکان و ئەوانـەی خـاوەنی دوو ڕەگەزنامـەن یـان بـەبێ ڕەگەزنامەن و کۆچبەرن. هەندێ لە مافی هاووڵاتیان جیاوازی هەیە لەگەڵ مـافی بیانییـەکان. دەبینین بۆ نموونە لـە هـەر دەوڵەتێکـدا تـەنیا هاووڵاتیـان مافیـان هەیـە دەسـەڵاتی گشـتی بگرنەدەست و بەشداریش بن لە هەڵبژاردنی دەزگە نوێنەرایەتییەکان و سەرۆکی دەوڵەتدا.

یاسای نێوەخۆیی هەر دەوڵەتێك پێگەی یاسایی دانیشتووان دیاریدەکات، بۆیە ئەم پێگەیە بە گوێرەی دەوڵەتەکان دەگۆڕێـت، بـەڵام هەنـدێ کێشـەی دانیشـتووان هـەن لـە پێوەندییـە نێودەوڵەتییەکاندا سەرهەڵدەدەن و وا دەکەن پیـادەکردنی یاسـای نێوەخـۆیی ببێتـە کـارێکی زەحمەت. بۆیە پەنادەبردرێتە بەر ئیلتیزامە نێودەوڵەتییە بەڵێنییـەکان بـۆ چارەسـەرکردنیان، لەگـەڵ لەبەرچـاوگرتنی یاسـای نێوەخـۆیی وەك مەسـەلەکانی پێوەسـت بـە مـافی مـرۆڤ و سەربەستییە بنەڕەتییـەکانی و پاراسـتنی کەمایەتییـە نەتەوایەتییـەکان و ئـاینی و پێگـەی یاسایی ئەوانەی هەڵگری دوو ڕەگەزنامەن یان بەبێ ڕەگەزنامەن و هەروا بیانییەکانیش.

شان بە شانی پەرەسەندنی زانستە تەکنیکییەکان، پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانیش لە بوارە ئابووری و بازرگانی و ڕامیـاری و گەشـتوگوزارییەکاندا چـڕوپڕی و فرەوانیـان بـە خۆیانـەوە دەبینی. ئەمە بووە هۆی گواستنەوەی خێرای خەڵکی چ بە کۆمەڵ یان تاك و چـەند هۆیـەکی جیاوازی دیکەش، وەك گەڕان بۆ کار و سەرمایەگوزاری و گەشتوگوزار و هەڵاتن لـە دەسـتی ڕژێمە سەرکوتکارەکان. هەموو ئەمانە وایانکرد پەیماننامەگەلی دووقۆڵی و بە کۆمەڵی گـرێ بدرێن بۆ چارەسەرکردنی کاروباری یاسایی ئەم جۆرە لایەنانەی ژیانی تاکەکان و دانیشتووانیش بە گشتی. دەبینین ڕێکخراوی نەتەوە یـەکگرتووەکان و ڕێکخـراوە پێوەندیـدارەکانی و هـەروا ڕێکخراوە هەرێمییەکان ڕۆڵی گرینگیان لەم ڕووەوە گێڕاوە و دەگێڕن.

ئەم جووڵان و تێکەڵبوونی دانیشتووانە ئەوەی سەپاندە سەر کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا، کـە لە هەموو دەوڵەتێکدا یاسا دابڕێژرێ بۆ پاراستنی مافی سیاسـی و ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و کولتووری تاك بەپێی ئەو ئیلتیزاماتانەی لە پەیماننامە نێودەوڵەتییە بە کۆمەڵی و دووقۆڵییە کارپێکراوەکانەوە هەڵقوڵاون.

یاساکانی زۆرینەی دەوڵەتەکان، یەکسانی تەواو لەنێوان هاووڵاتیاندا فەراهەم دەکەن بـەبێ ڕەچاوکردنی رەچەڵەك و ڕەگەز و زمان و ڕەنگی پێست و ئاین و بیروباوەڕ و نەتەوە و پێناسەی

کۆمەڵایەتی و باری دارایی و یاسا هاوچەرخەکانیش ڕێ نادەن تایبەتمەندی بدرێ بە کۆمەڵێك لەو کۆمەڵانەی باسکران و کۆمەڵێکی تر لەو تایبەتمەندییە بێبەش بکرێ.

جیاوازی هەیە لەنێوان گەلی" الشعب People"دەوڵەت و نەتەوە "الامە "nationدا.

گەل لە هەر دەوڵەتێکدا بریتییە لە کۆمەڵێك تاك، کە هاوبەندی سیاسی و یاسایی و ملکەچبوونی هاوبەش بەرامبەر بە دەوڵەت و یاساکانی بە یەکیانەوە دەبەستێت و لە بەرامبەر ئەوەشدا دەوڵەتەکە خۆیان و مافیان دەپارێزێ.

هەرچەندە یاسای نێودەوڵەتی زاراوەی " گەل"ی پێناسە نەکردووە، بەڵام چەندەها دۆکومێنتی گرینگ هەن دان بە مافیدا دەنێن لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی. زەحمەتیی پێناسەکردنی لەوەوە دێت، کە یاسای نیونەتەوەیی پێوەری دیاریکراوی تێدا نییە، کە جێبەجێ بکرێ بە سەر کۆمەڵە خەڵکانێکدا تاوەکو بزانرێت ئایا گەل پێکدەهێنن یان نا. وێڕای ئەمەش یاساناسیی و مومارەسەی نێودەوڵەتی رووی کردە دانانی کۆمەڵە کەسانێکی ئەتەنی نیشتەجێبوو لە هەرێمێکی دیاریکراو وەك گەل.

براونلی Brownlie لەمیانەی لێکۆڵینەوەی لە مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەلان دەڕوانێتە گەل بەزۆری لە روانگەی پێوەری ئەتنییەوە و دەڵێت: "دیارە پرەنسیپی مافی بڕیاردانی چارەنوس راستیگەلێکی ماقووڵ دەگرێتەخۆ، کە ناوەڕۆکەکەی بریتییە لە مافی ئەو کۆمەڵە کەسانەی تایبەتمەندیی جیاوازیان هەیە و دەیانەوێت ئەم تایبەتمەندییە جیاوازەیان لە دەزگەکانی ئەو حکوومەتەی سەربەون رەنگ بداتەوە. چەمکی" تایبەتمەندی جیاواز"دەوەستێتە سەر چەند پێوەرێك، کە دەبێ بەیەکەوە وەدەربکەون. رەگەز (رەچەڵەکی نەتەوەیی)یەکێك لە گرینگترین پێوەرەکانە لەم رووەوە، بەڵام ناتوانرێت پشت بە پێوەری رەگەز ببەسترێت لە رووی زانیارییەوە تەنیا لە میانەی پێوەندییەکی توندوتۆڵدا نەبێ لەگەڵ کۆمەڵە تایبەتمەندییەکی تر وەك کولتوور و زمان و ئاین و سایکۆلۆجیای گشتی هاوشێوە"[27].

یورام دینستینYoram Dinstein پێی وایە دەکرێت چەند گەلێك لەناو یەك دەوڵەتدا بن و بە گوێرەی پێوەری ئەتەنی گەل پێناسەدەکات و دەڵێت: "پێکهاتەی گەل لەسەر دوو رایەڵەی جیاواز بەندە، یەکێکیان بابەتییە و ئەوی تریان خۆییە. رایەڵەی بابەتی بریتییە لە بوونی کۆمەڵە کەسانێکی ئەتەنی، کە بە مێژوویێکی هاوبەشەوە لەنێو خۆیاندا بەستراون،

---

27- Brownlie, Ian, the Rights of People in Modern International Law, In James Crawford (ed) The Rights of Peoples, Oxford: Clarendon Press, 1988. P. 5

بەڵام دەبێت ئەم کۆمەڵە ئەتەنییە هەستێك و ئارەزوویێکی هاوبەشی هەبێت بۆ دامەزراندنی دەوڵەت[٢٨]."

لێژنەی نێودەوڵەتی یاساناسانInternational Commission of Jurists ، کە لە ساڵی ١٩٧٢ لە رووداوەکانی بەنگلادێش" پاکستانی رۆژهەڵاتی جاران"ی دەکۆڵییەوە هاتە سەر پێناسەکردنی گەل"People" لە رووی پێوەری رەگەزەوە و ئاماژەی دا، کە "دانیشتووانی پاکستانی رۆژهەڵات لە ساڵی ١٩٧٠ بریتی بوون لە گەلێکی جیاواز " و لەبارەی شرۆڤەکردنی زاراوەی "گەل" لەسەری چوو و وتی: "ئەگەر بڕوانینە ئەو کۆمەڵە مرۆڤانەی دانیان پێدانراوە وەك گەل، دەبینین ئەندامەکانی هەندێك تایبەتمەندیی هاوبەشیان هەیە، کە بریتییە لە ئامرازێك بە یەکیانەوە دەبەستێت، وەك: "

- توخمی مێژووی هاوبەش
- توخمی رەگەزی یان ئەتنی هاوبەش
- توخمی کولتووری و زمانەوانی هاوبەش
- توخمی ئاینی و ئایدیۆلۆجی
- توخمی جوگرافیایی و هەرێمی
- توخمی ئابووری
- توخمی چەندێتی quantitative

ئەم لیستە، کە دوورە لەوەی بە گشتگیر دابنرێت، پێشنیاردەکات، کە هیچ توخمێك لەوانەی ئاماژەیان پێکرا رێگری گەوهەری نییە، کە بسەلمێنرێت کۆمەڵە کەسانێك گەل پێکدەهێنن یان پێکناهێنن... دەبێت بزانین، کە ئەو وێنەیەی دەیکێشین تایبەتمەندییەکی سەرەکی پێویستی کەمە، ئەویش تایبەتمەندێتی ئایدیۆلۆجی و مێژوویە. گەل بوونی تەنیا ئەوکاتە دەست پێدەکات، کە کەسایەتی خۆی دەناسێتەوە و ویستی مانەوەی دەچەسپێنێت."[٢٩]

لە ئاستی کاری نێودەوڵەتیدا کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانە لە زۆر حاڵەتدا، کۆمەڵە رەگەزییەکی بە گەل ناسیوە. لە برگە یەکی بڕیاری ژمارە (441 (V

28- Dinstein, Yoram, Collective Human Rights of Peoples and minorities, (1976) 25 International and Comparative Law Quarterly 102, Oxford University Press, P. 104
29- International Commission of Jwists "East Pakstan staff Study" (1972) 49 International Commission of Jurists Review 23 p.47.

لە۱۹۵۰/۱۲/۲لەبارەی مافی خێڵی ئێوا Ewe لە ڕۆژئاوای ئەفریقیا تاکیدی کردە سەر" گرینگی گەورەی کێشەی ئێوا " و هانی ئەنجومەنی چاوەدێری و دەسەڵاتی کارگێڕی پێوەندیداری دا، کە هەوڵێکی زۆر بدەن "بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی خێرا و ماقووڵ و گونجاو لەگەڵ ویست و بەرژەوەندیی تەواوی گەلی پێوەندیدار".

کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە چەند بڕیارێکدا داوای کرد، کە مافی گەلی تیبیت ((Tibetan People)) مسۆگەربکرێت، وەك بڕیاری ژمارە (1353 (XIV) لە ساڵی ۱۹۵۹ و بڕیاری ژمارە (XVI 1723) لە ساڵی ۱۹٦۱ و بڕیاری ژمارە (XX 2079) لە ساڵی ۱۹٦٥.

لە بڕیاری ژمارە (XXV 2672) لە ساڵی ۱۹۷۰ کۆمەڵەی گشتی دانیپێدانا، کە " گەلی فەلەستین مافی یەکسانی و بڕیاردانی چارەنووسی هەیە بەپێی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان". هەروەها کاتێك بەنگلادێش لە نەتەوە یەکگرتووەکان وەرگیرا ساڵی ۱۹۷٤ بە بڕیاری ژمارە(XXIX 3203) کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بە ئاشکرا دانی بە کۆمەڵە ئەتنیکێکی ناو دەوڵەتێکی سەربەخۆی فرەنەتەوەدا نا وەك گەل.

دەزانین کە زۆرینەی زۆری دانیشتووانی هەرێمی ڕۆژهەڵاتی پاکستان، واتا بەنگلادێش لە ڕەگەزی بەنگالن. ئەم کۆمەڵە ڕەگەزییە توانیان جیاببنەوە لە دەوڵەتی پاکستان و دەوڵەتی نەتەوەیی سەربەخۆی خۆیان دامەزرێنن. کەواتا وەرگرتنی بەنگلادێش لە نەتەوە یەکگرتووەکان وەك دەوڵەتێکی سەروەری سەربەخۆ بە دانپێدانانێکی ئاشکرای نەتەوە یەکگرتووەکان دادەنرێت، کە بەنگالەکان پێش دامەزراندنی دەوڵەتی بەنگلادێش برێتی بوون لە گەل، چونکە تەنیا گەلان مافیان هەیە بە ئازادی پێگەی یاسایی و سیاسی خۆیان دیاری بکەن.

دادگەی باڵا لە کەنەدا پێی وایە، کە گەل ڕەنگە گشت دانیشتووانی هەرێمێکی فیدراڵی یان کۆمەڵە کەسانێکی ئەتنی دیاریکراو تێیدا بگرێتەوە. وتی: " زاراوەی "گەل" روون نییە و... دەکرێت بەشێکیش لە دانیشتووانی دەوڵەت بگرێتەوە و زەرور نییە زاراوەکە گشت دانیشتووانی دەوڵەت بگرێتەوە"[۳۰]

لە ڕووی یاساییەوە، یەکەمین دۆکومێنتی نێودەوڵەتی ئاماژەی بە پێناسەکردنی گەل دابێت ڕاپۆرتی کۆتایی و ڕاسپاردەکانی کۆبوونەوەی پسپۆڕانە سەبارەت بە تۆژینەوەی زیاتر

---

30- ( 1998) 161 DLR ( 4th) 433

لەبارەی چەمکی مافی گـەل، کـە لەسـەر داواکـاری یۆنسـکۆ ڕێکخرابـوو[٣١]. دۆکومێنتەکـە ئاماژەدەدات، کە گەل لە ڕوانگەی مافی گەلەوە بە مـافی بڕیـاردانی چارەنووسیشـەوە بـەپێی یاسای نێودەوڵەتی ئەم تایبەتمەندییانەی هەیە.

١- بریتییە لە کۆمەڵە تاکێك، بەشێك یان هەموو ئەم تایبەتمەندییە هاوبەشانەی تێدایە:

ا- داب و نەریتی مێژوویی هاوبەش.

ب- پێناسەی ڕەگەزی یان نەتەوەیی هاوبەش.

ج- کولتووری هاوڕەگەز (Cultral homogeneity).

و- زمانی هاوبەش.

ه- پێوەندیی ئاینی یان ئایدیۆلۆژی لەنێوانیاندا.

و- پێوەندیی هەرێمی.

ز- ژیانی ئابووری هاوبەش.

٢- دەبێ ئەو کۆمەڵەیە لە ژمارەیەکی دیاریکراو لە تاکەکان پێك بێت و پێویستیش نییە ژمارەکـە یـەکجار زۆر بێـت، بـەڵام پێویسـتە لـەوە زیـاتر بێـت، کـە تـەنیا کۆمەڵەیـەك" ڕێکخراوێك" بێت لەنێوان تاکەکان لە چوارچێوەی دەوڵەتدا.

٣- دەبێ ئەو کۆمەڵە کەسانە هۆشیارییان هەبێت، کە گەلێکن و ئارەزوویان هەیە خـاوەن پێناسەیەکی تایبەت بە خۆیان بن.

٤- ئەو کۆمەڵە کەسانە لە توانایاندا بێت دامودەزگەی خۆیان دامـەزرێنن یـان شـێوازی دەربڕینی تریان هەبێت تاوەکو لە ڕێگەیەوە بتوانن تایبەتمەندیی و ویستی هاوبەشیان دەربخـەن بۆ ناساندنی پێناسەی خۆیان.

یاساناسی دیکە هەن پێیان وایە "گەل" بریتییە لە کۆی دانیشتووانی یەکەیەکی هەرێمیی دیـاریکراو واتـا دەوڵـەت[٣٢]... ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێ، کـە پرەنسـیپی مـافی بڕیـاردانی چارەنووسی گەلان و پرەنسیپی یەکیەتیی هەرێمی جێبەجێـدەکرێن تـەنیا بـە سـەر دەوڵـەتی

31- Final Report and Recommendations of an International Meeting of Experts on the further study of the concept of Right of people for UNESCQ, 22 February, 1990 SNS – 89 / CONF , 602/ 7

32- Vita Gudeleviciute, Does The Princciple of Self-Determination Prevail over The Principle of Territorial Integrity? International Prevail over The Principle of Territorial Integrity? International Journal of Baltic Lawi volume2, No,2 (April 2005) P.64

سەربەخۆدا و بەم شێوەیە سەروەرییەکەی و تێکڕایی خاکەکەی دەپارێزن. ئەگەر بەم بیرۆکەیە رازیبین ئەوە هەوڵدانی هەر کۆمەڵە خەڵکانێکی جیاواز لەناو دەوڵەتێکی فرەنەتەوەییدا لە پێناو گۆڕانکاری هەرێمی تێیدا وەك جیابوونەوە یان چوونەپاڵ دەوڵەتێکی تر رەزامەندی تێکڕای دانیشتووانی دەوڵەتەکەی گەرەکە. بۆ نموونە ئەگەر کورد لە عێراقدا داوای جیابوونەوە لە عێراق بکات ئەوە دەبێت بەپێی ئەم بیرۆکەیە تێکڕای گەلی عێراق لە راپرسییەکی گشتیدا رەزامەنی بدات. ئەمەش ئەستەمە وەدی بێت و دژی پرەنسیپی مافی چارەنووسی گەلانە. لە لایەکی ترەوە بەپێی ئەم بیرۆکەیە ئەگەر بەشێك لە دانیشتووان لەناو دەوڵەتێکدا داوای گۆڕانکاری هەرێمی بکات لەسەر بناخەی مافی چارەنووس ئەوە دانپێدانانی نێودەوڵەتی بەم مافە پرەنسیپی پاراستنی یەکیەتیی هەرێم "خاك" بە پێشێلکردن دەژمێردرێ، چونکە ئەم پرەنسیپە پێوەندیی نێوان دەوڵەتان دەگرێتەوە و دەوڵەتانی تر پابەنددەکات رێز لە سەروەری و یەکیەتیی هەرێمی ئەو دەوڵەتە بگرن بەرامبەر رێزگرتنی ئەم بۆ ئەوان.

دەرئەنجامی ئەوەی گوترا ئەوەیە، کە گەل برێتییە لە کۆمەڵە خەڵکانێك لەسەر هەرێمێکی دیاریکراو دەژین و توخمی هاوبەش پێکەوەیان دەبەستێت وەك زمان و کولتوور و مێژوو و رەچەڵەکی نەتەوایەتی هاوبەش ، بێ ئەوەی لەبەرچاوبگیرێت ئایا هەرێمەکەیان یەك یەکەی سیاسی یان ئیداری یاسایی پێکهێناوە یان نا. رایەڵەی سەرەکی کامڵی گەل بوونی هەستی هاوبەشە وەك یەك گەل و یەك ئیرادەی سیاسی، کە پێکەوە بژین لەسەر هەرێمێکی دیاریکراو بە ناوی خۆیانەوە، بەڵام دەبێت ئەم هەست و ئیرادە هاوبەشە لە ئەنجامی هاوکاریگەری و تێکەڵاوبوونی پێوەری کولتوور و مێژوو و رەچەڵەکی نەتەوایەتی هاوبەش بێت و بەرجەستەی پێشکەوتنێکی دوورودرێژ بێت.

بەم جۆرە دەتوانین بڵێین ئەو توخمانە لە لایەنێکەوە خەڵکانێك، کە سەر بە یەك گەلن پێکەوە دەبەستێت و لەولاشەوە لە گەلانی دیکەیان جیادەکاتەوە. ئەگەر ئەم بیرۆکەیە لەبەرچاوبگرین، ئەوە گەل بەپێی یاسای نێودەوڵەتی سەردەم ئەم واتانەی هەیە:

١- تێکڕای دانیشتووانی ئەو دەوڵەتەی پێڕەوی حوکمی دیموکراتی دەکات بەجۆرێك دەسەڵاتەکانی نوێنەرایەتی تێکڕای دانیشتووان بکەن بەبێ جیاوازی.
٢- تێکڕای دانیشتووانی ئەو هەرێمانەی خۆیان خۆیان بەڕێوەنابەن.
٣- تێکڕای دانیشتووانی یەکەیەکی هەرێمیی داگیرکراو، کە لەژێر داگیرکاری سەربازی بیانیدا دەژی.

٤- تێکڕای یان بەشێکی دانیشتووانی یەکەیەکی هەرێمیی دیاریکراوی داگیرنەکراو یان نەچەوساوە لەناو دەوڵەتێکی فرەنەتەوەییدا.

بۆمان دەردەکەوێت، لەوەی گوترا تائێرە، کە پێوەندیی گەوهەری نێوان خاك و دانیشتووان، یەکێکە لە پێوەرە سەرەکییەکانی بوونی گەل.

ئەوەی پێوەست بێت بە زاراوەی "میللەت" ئاسان نییە پێناسەیەکی وردی بۆ دابنرێت لە روانگەی یاسای نیونەتەوەییەوە. سەرەڕای ئەمەش توخمگەلێکی هاوبەش هەن لەنێوان چەمکی "گەل" و چەمکی " میللەت" تا رادەی هاودەقی لە هەندێ جاردا، بەڵام ناکرێت بە یەك شت دابنرێن لە هەموو جارەکاندا.

یاسای نێودەوڵەتی هاوچەرخ بە ئەنقەست مافی بڕیاردانی چارەنووسی داوە بە گەل، نەوەك بە میللەتان و دەوڵەتان. سەرەڕای ئەمەش کاتێك گەل و میللەت لە یەك پێکهاتە بەرجەستەدەبن و ئەو پێکهاتەیە بونیادی قەوارەی تایبەتی خۆی دەنێت، ئەوسا چەمکی گەل و چەمکی میللەت هاودەق دەبن وەك دیاردەیەك لە دیاردەکانی خودی گەل، بەمەش دەبێتە شایستەی مافی بڕیاردانی چارەنووس بەپێی یاسای نێودەوڵەتیی.

پێکهاتە فرە ئتەنییە جیاوازەکان لەناو دەوڵەتێکدا، زۆر جار، خۆیان بە بەشێك لە گەلی ئەو دەوڵەتە نازانن و بە جۆرێك رەفتار ناکەن، کە رەفتارەکەیان گوزارشتبێ لە ئیرادەی زۆرینەی زۆری دانیشتووان. بگرە بە پێچەوانەی ئەوەوە، ئەوان خۆیان بە پێکهاتەی جیاواز دەزانن لەناو دەوڵەتەکە. هەر لەبەر ئەمەش داوای بڕیاردانی پێگەی سیاسی تایبەتی خۆیان دەکەن بەپێی ئەو پرەنسیپە دەستووریانە و دیموکراتیانەی لە وڵاتدا پێڕەودەکرێن.

**٢- مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەل و نەتەوەکان:**

**١- هەوڵ و کۆششی نێودەوڵەتی بۆ چەسپاندنی مافی بڕیاردانی چارەنووس**

بیرۆکەی مافی بڕیاردانی چارەنووس، نێزیکەی سەدەیەك دەبێ، یەکێکە لەو مەسەلە گرینگانەی کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی خستویەتی بەرباس و مشتومڕی لەسەر دەکات. لە ساڵی ١٩١٨ پرەنسیپەکانی سەرۆکی ئەمەریکا ویلسن سەبارەت بە مافی بڕیاردانی چارەنووس دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا، چونکە هیوایەکی نایە بەر گەلانی ستەمدیدە.

ئەو دۆکومێنتە بە ڕاشکاوی جەختی کردۆتە سەر بەدیهێنانی ئازادی گەلانی ژێر

دەسـەڵاتی دەوڵـەتی عوسمـانی و (( مسـۆگەرکردنی سـەروەری تـەواو و ئاشـتی بـۆ بەشـە تورکییەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و ئەو دوای گەلانی تری نەتـەوەکانی تـر، کـە ئێسـتە لەچوارچێوەی دەوڵـەتی عوسمانیـدا دەژیـن، مافیـان پێـدەدرێت خۆیـان بـەئارەزووی خۆیـان سیستەمی حوکمڕانی ئۆتۆنـۆمی خۆیـان هـەبێت)) و ((گـەلان و هەرێمـەکان وەك کالآیـەك بەکارنەهێنرێن بە دەست دەوڵەتە گەورەکانەوە مامەڵەیان پێوە بکەن و هەروەك گەمەیەك لـە دەوڵەتێکەوە بۆ ئەوی تر ئاڵوگۆڕ بکرێن)) و ((لە کـاتی دیـاریکردن و رێکخسـتنی سـنووری دەوڵەتەکان پێویستە ڕەچاوی بەرژەوەندی دانیشتووان بکرێت و وەك شێوازێك بەکارنـەهێنرێن بۆ یەکلاکردنـەوەی کێشـەی نێـوان دەوڵەتـەکان و رێککـەوتن لـەنێوان رکابەرانـدا)) هـەروا ((پێویستیشە هەموو ئامانجە نەتەوەییەکان تا ئەوپەڕی ڕادە وەدی بێن تاوەکو هۆکاری کینەو ڕقی کۆن سەرهەڵنەدەنەوە، کە پێشتر لە ئەورووپا و جیهاندا بوونە هۆی وەفیرۆدانی ئاشتی)).

مافی بڕیاردانی چارەنووس دوای سـەرکەوتنی شۆڕشـی سۆشیالیسـتی لـە ڕووسـیا سـاڵی ١٩١٧ بەرجەستەبوو لە پێکهێنانی یەکیەتیی کۆمارە سۆشیالیستەکانی سۆڤێت و لە هەمان کاتدا لە دەستووری یەکیەتیی سۆڤێت و دەستوورەکانی کۆمارە فیدراڵییەکاندا دانرا.

ئەوە بوو مادەی(١٤) و(١٥) لە دەستووری یەکیەتیی سۆڤێت دانی بە سەروەریی کۆمـارە فیدراڵییەکاندا نا لە چوارچێوەی یەکیەتیی سۆڤێت. مادەی (١٧)ەیش مافی بە هەر کۆمارێك داوە لەو یەکیەتییە جیابێتەوە. ئەنجومـەنی بـاڵای سـۆڤێت پێکهـاتبوو لـە دوو ئەنجومـەن: ئەنجومەنی سۆڤێت و ئەنجومەنی نەتەوەکان (مادەی:٣٣ی دەستوور) هەردوو ئەنجومەنیش لـە مافەکاندا یەکسان بوون (مادەی:٣٧).

پرەنسیپی مافی گەلان لە بڕیاردانی چارەنووسیاندا یەکێکە لـەو پرەنسـیپە سـەرەکییانەی پێڕەوکران لە کاتی دامەزراندنی یەکیەتیی سۆڤێت لە سەرەتاکانی سـەدەی بیسـتەم و پاشـان لێکترزانی لە ئاخر و ئۆخری تەمەنیدا و ئەنجاش جیابوونەوە و پێکهاتنی دەوڵەتە سەربەخۆکان و دوایەش یەکیەتیی کۆنفیدراڵی.

ڕاستەوخۆ لە سەروبەند و لە پاش دووەمین شەڕی جیهـان بۆچـوونێك لـەلای یاساناسـانی نێودەوڵەتییەوە سەریهەڵدا سەبارەت بە دانانی بڕیاردانی چارەنوس لە دۆکومێنتی نێودەوڵەتی گرینگتر لەو دۆکومێنت و بەڵێنانەی، کە لەلایەن وڵاتەکانەوە ناوبەناو یەکلایەنـە دەردەچـوو. دوایەش پێیان وابوو وەك پرەنسیپێکی سەرەکی یاسای نێودەوڵەتی هاوچەرخ دەبێ بچەسپێت.

دەبینین هەر لە سەرەتای دووەمین شەڕی جیهانەوە بەریتانیا و ئەمەریکا تا ڕادەیەك دانیان

نا بە مافی ئەو گەلانەی لەژێر ركێفی داگیركاری ژاپۆن، ئەڵمانیا و ئیتالیا دەیانناڵاند. ئەوە بوو لە دەستووری ئەتڵەسیدا لە رۆژی ١٤/٨/١٩٤١ هاتبوو، كە بەریتانیا ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا ((رێز لە مافی هەموو گەلان دەگرن بۆ هەڵبژاردنی ئەو سیستەمە دەسەڵاتەی ئارەزوودەكەن لە سایەیدا بژین و هەردوو دەوڵەت ئارەزوودەكەن لە گەڕانەوەی سەروەری بۆ ئەو گەلانەی لێیان زەوتكراوە)). وێڕای گرینگی ئەم جاڕنامەیە، كە جەختی كردۆتە سەر پرەنسیپی مافی بڕیاردانی چارەنووس بەڵام تەنیا بۆ چەند ولاتێك بوو، ئەویش ئەو هەرێمانەی لەژێر ركێفی دەسەڵاتی ئەلمان و هاوپەیمانەكانی بوون، بەڵام لە پاش هاتنەپاڵی یەكیەتیی سۆڤێت لە وتووێژەكانی كریم ((قرم))دا لەگەڵ ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا و بەریتانیا لە بەیاننامە كۆتاییەكەدا دەقێك هات بۆ ئەوەی ئەو ئیستیسنایە لابەرێت، كە لە بەیاننامەی پێشوودا هاتبوو، ئەو دەقەش ئەمە بوو: ((بەپێی ئەو دەقەی لە دەستووری ئەتڵەسیدا هاتووە سەبارەت بە مافی گەلان لە هەڵبژاردنی ئەو شێوە حوكمەی ئارەزووی دەكەن، پێویستە گێڕانەوەی دەسەڵات و ئەو خودموختارییەی گەلان، كە گەلانی شەڕانگێڕ، بە هێز لێیان بێبەشی كردوون، مسۆگەربكرێ)).[٣٣]

لە بەیاننامەی (تاران)یشدا هەر سێ دەوڵەتەكە جارێكی تر تاكیدی ویستی خۆیان كردووە لەسەر ئارەزوویان بۆ ((لابردنی زۆرداری و كۆیلەتی و ستەم)).[٣٤]

سەرەڕای ململانێی نێوان هەر سێ دەوڵەتەكە سەبارەت بە پاراستنی بەرژەوەندییەكانیان دوای ئەو شەڕە كاولكارە، ئەوا لە سەروبەندی گفتوگۆكانی دامەزراندنی رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكاندا پرەنسیپی مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەلان وەك پرەنسیپێكی یاسای نێودەوڵەتی لە دەستووری رێكخراوە جیهانییەكە چەسپێنرا.

ئەو دەوڵەتانەی لەسەر دەستیان رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان دامەزرێندرا، تاكیدیان كردۆتە سەر پەرەسەندنی پێوەندی دۆستایەتی نێوان نەتەوەكان لەسەر بنەمای رێزگرتنی پرەنسیپی یەكسانی نێوان گەلان و پرەنسیپی مافی بڕیاردانی چارەنووسی هەر یەكەیان و گرتنە

---

٣٣- سیاسەتی دەرەوەی یەكێتی سۆڤێت لە كاتی شەڕی نیشتمانیدا، بەرگی یەكەم، مۆسكۆ، ١٩٤٦، ل ١٠٢.

٣٤- مامۆستای كۆچكردوومان پرۆفیسۆر فلادیمیر كوتیكۆف:كۆمەڵێك لە دۆكومێنت و پەیماننامەی نێودەوڵەتی. سۆفیا، ١٩٤٨.

بەری ڕێ و شوێنی گونجاوی تر بۆ چەسپاندنی ئاشتی لە جیهاندا" مادەی(١) بڕگە(٢) لە دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان" و لە ڕوانگەی ئەم ئارەزووانەوە بۆ ئامادەکردنی هۆکاری سەقامگیری و خۆشگوزەرانی پێویست بۆ پەیدابوونی پێوەندی ئاشتییانەی دۆستایەتی نێوان نەتەوەکان لەسەر بنەمای ڕێزگرتن، کە وا دەخوازێ مافی گەلان چارەسەربکرێ و هەر یەکەیان مافیان هەبێ بۆ بڕیاردان لەسەر چارەنووسیان، نەتەوە یەکگرتووەکان هەوڵدەدات بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی گەلان و پێشکەوتنیان لە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتی و تەندروستیدا و چارەسەرکردنی گیروگرفتی پێوەندیدار پێیانەوە و چەسپاندنی هاوکاری نێودەوڵەتی لە ڕووی کولتووری و فێرکردنەوە، هەروا پرەنسیپی ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ لە جیهاندا بڵاوبێتەوە و مافە سەرەکییەکان بۆ هەمووان فەراهەم بێت بەبێ جیاوازی ڕەگەزی یان زمان یان ئاین و جیاوازیش نییە لەنێوان پیاو و ژندا و بە کردەیی ئەو مافانە ڕەچاوبکرێن.

دەستوورەکە هەر بەوە نەوەستاوە ماف و ئەرك بۆ ئەندامانی ڕێکخراوەکە بەجێ بێلێ، بگرە ئیلتیزام دەخاتە ئەستۆیان بۆ گرتنەبەری ڕێ و شوێنی کاریگەر لە پێناو پشتگیری و هاوکاری گەلانی چەوساوە بۆ ڕزگاری و سەربەخۆییان.

دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان بریتییە لە پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی بە مۆرکێکی گشتییانە. لەبەر ئەمە چەسپاندنی پرەنسیپی مافی بڕیاردانی چارەنووسی تیادا گرینگییەکی زۆری هەیە و وا دەکات ببێتە پرەنسیپێکی یاسایی دانپێدانراو بە گشتی لە یاسای نێودەوڵەتی هاوچەرخدا.

دەستوورەکە دوو سیستەمی بۆ گەلانی ناسەربەخۆ پێکهێناوە: یەکەمیان ئەوەی لە بەشی یانزدەهەمی هاتووە، کە پێوەستە بە هەرێمە نائۆتۆنۆمییەکان. دووەمیشیان لە بەشی سیانزەهەمدا هاتووە لەبارەی سیستەمی چاوەدێری "ویسایە". ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ڕوانگەی ئەو پرەنسیپەی، کە بەرجەستەیە لەوەی کە بەرژەوەندییەکانی دانیشتووانی ئەم هەرێمانە بە پلەی یەکەم دێن و ئەمانەتیان لە ئەستۆی خۆیان وەرگرتووە داندەنێن بە ئیلتیزامی کارکردن لە پێناو خۆشگوزەرانی ئەم هەرێمانە بەپێی توانا لە سیستەمی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتیدا. بۆ ئەم مەبەستەش پێشکەوتنی ئەم گەلانە دەگرنە ئەستۆ لە کاروباری سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵناسی و فێرکردندا، هەروا مامەڵەکردنی بە ئینساف لەگەڵیاندا و پاراستنیان لە هەموو خراپییەك و ڕەچاوکردنی ڕێزگرتن لە کولتووریان و پەرەپێدانی سیستەمی ئۆتۆنۆمی و بەرزڕاگرتنی ئامانجە

سیاسییەکانیان و هاوکاریکردنیان بۆ پێشخستنی سیستەمی سیاسی ئازادیان بە باشترین شێوە بەپێی بارودۆخی هەر هەرێم و گەلێکیان و چەسپاندنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی.

نەتەوە یەکگرتووەکان سیستەمی چاوەدێری لەژێر سەرپەرشتی خۆی داناوە لە پێناو وەدەستهێنانی ئەم ئامانجە گرینگانەی لای خوارەوە:

ا- چەسپاندنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی.

ب- کارکردن لە پێناو پێشخستنی دانیشتووانی ئەو هەرێمانەی ویسایە دەیانگرێتەوە لە بوارەکانی ڕامیاری و کۆمەڵگەیی و ئابووری و فێرکردندا و پەرەپێدانیان بەرەو ئۆتۆنۆمی یان سەربەخۆیی بەپێی هەلومەرجی گونجاو و تایبەتی هەر هەرێم و گەلێکیان، کە بگونجێ لەگەڵ ئامانج و ویستی ئەم گەلانە بەوپەڕی ئازادی و بەپێی دەقی مەرجەکانی هەر ڕێککەوتننامەیەك لە ڕێککەوتننامەکانی سیستەمی ویسایە.

ج- هاندان بۆ ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ و سەربەستییە بنەڕەتییەکانی هەمووان بەبێ جیاوازی بەهۆی ڕەگەز یان زمان یان ئاین و جیاوازیش نییە لەنێوان پیاو و ژن و هاندان بۆ تێگەیشتن لەو پێوەندییانەی لەنێوان گەلانی جیهاندا هەن و پابەندبوونیان بەرامبەر یەکدی.

د- زامنکردنی یەکسانی لە مامەڵەکردندا لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی، ئابووری و بازرگانیی بۆ هەموو ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان و خەڵکی و یەکسانی نێوان ئەو خەڵکانەش لە ڕووی ڕێوشوێنی دادوەرییەوە.

هەردوو سیستەمە تایبەتەکان بەو گەلانەی سەربەخۆییان بەدەستنەهێناوە، دوو سیستەمی کاتی بوون، ئامانجیان هاوکاریکردنی ئەم گەلانە بوو لە پێناو پەرەسەندن و گەشەپێدانی سیستەمی سیاسیی ئازادیان بە بەردەوامی بەرەو سەربەخۆیی تەواو. هەروەها جاڕنامەی لەناوبردنی کۆلۆنیالیزمیش جەختی کردۆتە سەر سیفەتە کاتییەکەی ئەم دوو سیستەمە. چونکە تاکیددەکاتە سەر گرتنەبەری ڕێ و شوێنی بە پەلە لەو هەرێمانەی سیستەمی وسایە دەیانگرێتەوە، یان ئۆتۆنۆمییان نییە و هەروا هەموو ئەو هەرێمانەی تر، کە هێشتا سەربەخۆییان وەدەستنەهێناوە بۆ گواستنەوەی دەسەلات بە تەواوی بۆ گەلانی ئەم هەرێمانە بەبێ هیچ مەرج و تەحەفوزێك[35].

ئەم دوو سیستەمە بە تەواوی دەگەڕێتەوە بۆ سیستەمی بڕیاردانی چارەنووسی گەلان، کە

35- A/Res/1514 (XV)

له ماده‌ی(١)ی ده‌ستووری نه‌ته‌وه‌ یككگرتووه‌كاندا هاتووه‌. دانپێدانان به‌ پره‌نسیپی بڕیاردانی چاره‌نووس وه‌ك یه‌كێك له‌ پره‌نسیپه‌ سه‌ره‌كییه‌كانی یاسای نێوده‌وڵه‌تی، كێشه‌ نه‌ته‌وایه‌تییه‌كان و چاره‌سه‌ركردنیانی له‌ چوارچێوه‌ی ئه‌ركی نێوه‌خۆیی ده‌وڵه‌ته‌كان هێناوه‌ته‌ده‌ر و كردوویه‌تییه‌ به‌ كێشه‌یه‌كی نێوده‌وڵه‌تی پێوه‌ست به‌ ئاشتی و ئاسایشی نێوده‌وڵه‌تییه‌وه‌ هه‌روه‌ها داگیركاری و كۆیلایه‌تی و هه‌ر جۆره‌ چه‌وسانه‌وه‌یه‌كی نه‌ته‌وه‌یی و جیاوازییه‌كی ڕه‌گه‌زی و جینۆساید و هه‌موو ڕواڵه‌ته‌ ناشیرینه‌كانی تری قه‌ده‌خه‌كردووه‌. چه‌سپاندنی ئه‌م پره‌نسیپه‌ له‌ ده‌ستووره‌كه‌دا وه‌ك كۆمه‌كێكی به‌هێزه‌ بۆ بزووتنه‌وه‌ی ڕزگاریخوازی نیشتمانی به‌ گشتی و گواستنه‌وه‌یه‌كی خێرایشه‌ به‌ره‌و وه‌ده‌ستهێنانی سه‌ربه‌خۆیی. چونكه‌ به‌ گشتی بۆته‌ پره‌نسیپێكی یاسایی دان پێدانراو له‌ یاسای نێوده‌وڵه‌تی هاوچه‌رخ و گوزارشت له‌ سه‌روه‌ری گه‌لان ده‌كات، بۆیه‌ هه‌ر سه‌رپێچیكردنێك له‌م پره‌نسیپه‌ به‌ پێشێلكارییه‌ك داده‌نرێ بۆ ده‌ستووری نه‌ته‌وه‌ یه‌ككگرتووه‌كان، كه‌ په‌یماننامه‌یه‌كی گشتگیره‌ و پاشان له‌و سه‌رپێچییه‌ش به‌رپرسیارێتی نێوده‌وڵه‌تی ده‌كه‌ونه‌وه‌.

ئه‌حكامه‌كانی نێو ده‌ستووره‌كه‌ ئه‌و بنه‌ما یاساییه‌ پێكدێنن، كه‌ ڕێكخراوه‌ جیهانییه‌كه‌ پێڕه‌ویان ده‌كات له‌ هه‌وڵ و كۆششیدا له‌ ڕووی نه‌هێشتنی چه‌وسانه‌وه‌ی نه‌ته‌وه‌یی و بۆ دانی مافی سه‌ربه‌خۆیی به‌ گه‌لانی سته‌م لێكراو. چونكه‌ هه‌ر حاشاكردنێك له‌ مافی چاره‌نووسی گه‌لان هاودژه‌ له‌گه‌ڵ پره‌نسیپی یه‌كسانی له‌نێوان گه‌لان و ناشرینترین ڕواڵه‌ته‌ له‌ ڕواڵه‌ته‌كانی جیاوازی ڕه‌گه‌زی و ئه‌تنی. ئه‌مه‌ش وا ده‌كات ئه‌ركێكی قورس بخاته‌ ئه‌ستۆی ڕێكخراوی نه‌ته‌وه‌ یه‌ككگرتووه‌كان بۆ كاركردن له‌ پێناو وه‌دیهێنانی ئه‌م مافه‌.

كۆمه‌ڵه‌ی گشتیی نه‌ته‌وه‌ یه‌ككگرتووه‌كان و هه‌ندێ له‌ ده‌زگه‌كانی تری جه‌خت ده‌كه‌نه‌ سه‌ر مافی بڕیاردانی چاره‌نووس له‌ بڕیاره‌كانیاندا، ئه‌مه‌ش ڕه‌نگدانه‌وه‌یه‌كه‌ بۆ ئه‌و سه‌ركه‌وتنه‌ مێژووییانه‌ی بزووتنه‌وه‌ی ڕزگاریخوازی گه‌لان به‌ ده‌ستیان هێنا له‌لایه‌ك و هه‌روا بوونی پره‌نسیپی مافی بڕیاردانی چاره‌نووسی به‌ نۆرمێكی یاسایی گشتی یاسای نێوده‌وڵه‌تی هاوچه‌رخ له‌لایه‌كی تره‌وه‌.[٣٦]

---

٣٦ بڕوانه‌ ئه‌م بڕیارانه‌ی ئه‌نجومه‌نی گشتی نه‌ته‌وه‌ یه‌ككگرتووه‌كان:

VIII(738) ,VIII (637 C) VIII (637 A) ، VII( 545) ، V (421) ، XVII(1807)

VI(1702 ) ، XVI(1654) ، XV (1514) ، XI (837) XIXX(3236) ، XXI ( 2189 ،

XXI(2160) ، XX(2105) ، XVII(1810)

کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان چەندەها جار سەرنجی جیهانی راکێشاوە بۆ دۆزینەوەی رێگە و شێوازی گونجاو بۆ زامنکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووس و پاراستنی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا.

لەم ڕوانگەیەوە کۆمەڵەی گشتی پێشنیازی داوە بە لیژنەی ئابووری و کۆمەڵایەتی ((بۆ ئەوەی داوا لە کۆمیتەی مافی مرۆڤ بکەن ڕاسپاردە دابڕێژن سەبارەت بە پاراستنی مافی بڕیاردانی چارەنووس لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، بەتایبەتی ئەو ڕاسپاردانەی پێوەستن بە ڕێ و شوێنی کردەیی تر لە چوارچێوەی دەزگە جۆراوجۆرەکانی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکە بۆ ڕەچاوکردنی مافی چارەنووس لەسەر ئاستێکی فرەوانتر)).[٣٧]

ئەوە بوو ئەم بڕیارە ڕێ و شێوازی تەواوی تایبەت بەکارکردن داڕشت بۆ ئەوەی پرەنسیپی مافی بڕیاردانی چارەنووس ببێتە پرەنسیپێکی یاسایی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان و دەزگەکانی پێڕەوی بکەن لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە هانی دەوڵەتە ئەندامەکانی بدات بۆ پیادەکردنی. لەم ڕوانگەیەشەوە کۆمەڵەی گشتی و هەندێ لە دەزگەکانی چەند بڕیارێکی گرینگیان دەرکرد، کە لەگەڵ نێوەڕۆکی دەستوورەکەدا بگونجێ سەبارەت بە جێبەجێکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووس.

کۆمەڵەی گشتی لە خولی(١٥) هەمینیدا لە ١٩٦٠/٢/١٤ جاڕنامە مێژووییەکەی لەمەڕ دانی سەربەخۆیی بە گەلان و وڵاتان، پەسندکرد. جاڕنامەکە گرینگییەکی زۆری دا بە پرۆسێسی مافی بڕیاردانی چارەنووس و بەمەش متمانەی نوێ کردەوە بە مافی گەلان بە گەورە و بچووکیانەوە لە بڕیاردانی چارەنووس و سەربەخۆیی و زەرووڕەتی دانانی کۆتاییەکی بە پەلە بۆ کۆلۆنیالیزم بە هەموو شێوە و دیاردەکانییەوە و جەختی کرد، کە هەموو گەلێك مافی بڕیاردانی چارەنووسی هەیە لە هەڵبژاردنی سیستەمە سیاسییەکەیەوە و بە وەدیهێنانی پەرەسەندنی ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتووریشەوە.[٣٨]

پێشێلکردنی ئەم مافە بە واتای نکۆلیکردن دێت لە مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ و لارییە لەگەڵ ئەحکامەکانی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆسپ دەخاتە پێش پەرەسەندنی پێوەندی هاوکاری دۆستانەی نێوان ئەندامان و بڵاوکردنەوەی ئاشتی لە سەرجەم جیهاندا. بۆیە

---

٣٧- هەمان سەرچاوە

38- U.N General Assembly official Records: fifteenth Session supplement No. 16 A- 4684) Res. 1514 (XV) P. 66

پێویستە لەو هەرێمانەی لەژێر ویسایەن و ئەوانەی بە ئۆتۆنۆمی نەگەیشتوون و هەروا لە هەموو ئەو هەرێمانەی تر، کە هێشتا سەربەخۆییان وەرنەگرتووە ڕێ و شوێن بگیرێنە بەر بۆ گواستنەوەی دەسەڵات بە تەواوی بۆ گەلانی ئەم هەرێمانە بە ئازادی و بەگوێرەی ویست و ئیرادەی بەرجەستەکراویان بەبێ هیچ مەرج و تەحەفوزێك و بەبێ ڕوانینە ڕەگەز یان جیاوازی ڕەنگی پێست تاوەکو توانای وەرگرتنی سەربەخۆیی و سەربەستی تەواویان فەراهەم بکرێ)).[٣٩]

ئەم جاڕنامەیە بە گرینگترین دۆکومێنتی مێژوویی دادەنرێ، کە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەریکردووە. چونکە گرینگییە سیاسی و ڕەوشتمەندییەکەی وەك ریسواکردنێکی تەواوی کۆلۆنیالیزم، بازنەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەبەزێنێ. بەڕاستیش دەسپێکی قۆناخێکی نوێی داڕشتووە بۆ پەرەپێدانی پێوەندیی نێودەوڵەتی هاوچەرخ. هەروا بە بەرجەستەبوونێکی ڕاستگۆیانەش دادەنرێ بۆ ویست و ئارەزووی گەلانی ژێردەستە و ئەوانەی موستەعمەرەن.

جاڕنامەکە ئەو نۆرمە یاساییە ئیلزامییە نێودەوڵەتییانەی چەسپاند، کە پێشتر لەلایەن دەوڵەتە ئیمپریالیزمەکان و هاوشێوەیان پێشێلدەکران لەبارەی وەدیهێنانی مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەلان. بەم سیفەتەشی شرۆڤەیەك پێکدێنێ بۆ ئەو ئەحکامانەی لە دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان هاتوون، کە هەر ڕەفتارێکی نێودەوڵەتی کۆسپ بخاتە پێش وەدیهێنانی مافی چارەنووس بە تەواوی بە پێشێلکارییەکی زەق دادەنرێ بۆ یاسای نێودەوڵەتی.

پرەنسیپی مافی بڕیاردانی چارەنووس بۆ یەکەمین جار پێناسەیەکی وردی بۆ کرا لەم جاڕنامەیەدا و بە شێوەیەکی واقیعییانە داڕێژرا لەگەڵ ئەو ئەحکام و پرەنسیپانەی تر، کە لە دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان و دۆکومێنتە نێودەوڵەتییەکانی تر، هاتوون.

مافی بڕیاردانی چارەنووس دیسان لە جاڕنامەی گەردوونی مافی مرۆڤدا هاتووە، کە نەتەوە یەکگرتووەکان لە سێیەمین خولیدا ساڵی ١٩٤٨ پەسندیکرد. هەروا هەردوو لائیحەی مافی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووری و لائیحەی مافی شارستانی و سیاسی، کە نەتەوە یەکگرتووەکان لە بیست و یەکەمین خولیدا لە ساڵی ١٩٦٦ پەسندیانی کرد جەختیان لەسەر مافی بڕیاردانی چارەنووس کردووە. باسکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووس لەم لائیحە گرینگانەدا وای کردووە ببێتە بناخەیەکی پرەنسیپییانە بۆ مافی مرۆڤیش.

---

٣٩- هەمان سەرچاوە

دەبینین مادەی(٢) دەڵێت: ((نابێت هیچ جیاوازییەك بكرێت، كە بناخەكەی لەسەر ڕەوشی سیاسی یان یاسایی یان نێودەوڵەتی وڵاتێك دانرابێ یان ئەو شوێنەی تـاك ڕەگەزنامەكـەی هەڵگرتووە چ ئەو وڵاتە یان ئەو شوێنە سەربەخۆ بێ یان بە مـافی ئۆتۆنـۆمی نەگەیشـتبێ یان سەروەرییەكەی لەژێر هەر كۆتێكدا بێت)).

هەروا لە لائیحـەی مافـە ئـابووری و كۆمەڵایـەتی و كولتوورییـەكان و لائیحـەی مافـە شارسـتانی و سیاسـییەكاندا لـە مـادەی یەكـدا هـاتووە: ((هـەموو گـەلان مـافی چـارەی خۆنووسینیان هەیە، بە گوێرەی ئەم مافە بۆیان هەیە بـە ئـازادی بڕیاربـدەن لەسـەر پێگـەی سیاسییان و بە ئازادیش درێژەبدەن بە پەرەپێدانی ئابووری و كۆمەڵایەتی و كولتوورییان)).

دەبینین جاڕنامەی گـەردوونی مـافی مـرۆڤ و لائیحـەی مافـە ئـابووری و كۆمەڵایـەتی و كولتووری و هەروەها لائیحەی مافـە شارسـتانی و سیاسـییەكان بـە تـەواوی دان دەنـێن بـە یەكسانی گەلانی وڵات و هەرێمە ناسەربەخۆكان لەگەڵ گەلانی جیهان لە بەرامبەر نۆرمەكانی یاسای نێودەوڵەتی گشتی وەك مەرجێكی بنەڕەتی بۆ بونیادنانی پێوەنـدیی دۆسـتانە لـەنێوان گەل و نەتەوەكانی جیهان، كە ئەویش تاكە زامنی پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی گشـتییە لـە جیهانـدا. دوایـیش پێشـێلكردنی ئـەو پرەنسـیپە گرینگـە دانپێدانراوانـە بـە گشـتی واتـە پێشێلكردنی چەند مافێك، كە یاسای نێودەوڵەتی مسۆگەریكردوون و ئەمەش بەرپرسـیارێتی نێودەوڵەتی لێ دەكەوێتەوە و پاشانیش دەستێوەردانی نێودەوڵەتی بـۆ ڕاگـرتنی پێشـێلكاری، ئەمەش وادەكات ئاشتی و ئاسایش ڕووبەڕووی مەترسی ببێتەوە.[٤٠]

**٢- سرووشتی یاسایی نێودەوڵەتی پرەنسیپی مافی بڕیاردانی چارەنووس:**

لە یاسای نێودەوڵەتیدا چەندین شرۆڤەكاری هەیە بۆ مـافی بڕیـاردانی چـارەنووس، ب ەڵام ئێمە لێرەدا تـەنیا باس لە سێ جـۆری گـرینگ لـەو شـرۆڤانە دەكـەین، كـە ئـەوانیش چـەند

٤٠- كۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەكگرتووەكان لە ١٩٧٤/١١/٢٢ سەبارەت بە كێشەی فەڵەستین دانینا بە مافی گەلی فەڵەستیندا لە بڕیاردانی چارەنووس و سەربەخۆیی، سەروەری و كە فەڵەستین لایەنێكی سەرەكییە لە هەوڵی دابینكردنی ئاشتییەكی عادیلانە و هەمیشەیی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. هەروا بڕیارەكە دان بە مافی گەلی فەڵەستیندا دەنێ لە بەكارهێنانی هەموو شێوازە خەباتێك لە پێناو گەیشتن بە مافە نیشتمانییەكانی و داواش لە هەموو وڵات و ڕێكخراوە نێودەوڵەتییەكان دەكات بۆ پشتگیری كردن لەو خەباتە ڕەوایە.

شرۆڤەیەکی جیاجیان، کە کێشەی گرینگ دەخەنەڕوو سەبارەت بە پیادەکردنی دروستی وەك مافێکی ڕەوا لە یاسای نێودەوڵەتیدا.

١- مافی بڕیاردانی چارەنووس برێتییە لە لەناوبردنی کۆلۆنیالیزم لە هەرێمە نائۆتۆنۆمییەکان. بەپێی ئەم شرۆڤەیە مافی بڕیاردانی چارەنووس برێتی بوو لە لەناوبردنی کۆلۆنیالیزم لە هەرێمە نائۆتۆنۆمییەکان. ئەمەش دەقاودەق جێبەجێکرا لەسەر پرۆسێسی لەناوبردنی کۆلۆنیالیزم، کە پرۆسێسێك بوو لە چوارچێوەی یاسای نێودەوڵەتیدا بەڕێوەچوو.[٤١]

---

٤١- جێبەجێکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەلی تەیموری رۆژهەلات باشترین نموونەیە لەم بارەیەوە. تەیموری رۆژهەلات کۆلۆنێکی پورتوگالی بوو تاوەکو ساڵی ١٩٦٠ کاتێك کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاریدا کە تەیموری رۆژهەلات بە هەرێمێك دابنێت لەو هەرێمانەی دەکەونە ناو سیستمی هەرێمە بێ ئۆتۆنۆمییەکانەوە بە پێی فەسلی یانزەی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان. لە ئەنجامی ئەم بڕیارە هێزەکانی پورتوگالی لە ساڵی ١٩٧٥ لە تەیموری رۆژهەلات کشانەوە. ئەندەنووسیا ئەمەی بە هەل زانی و دوورگەکەی داگیرکرد بە هێزی چەك و خستییە پاڵ ئەندەنووسیا دژ بە ویست و ئارەزووی گەلی تەیموری رۆژهەلات. بەلام کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەمەی رەتکردەوە و دانیپیدا نەنا. بەم شێوەیە تەیموری رۆژهەلات لە ئەجیندای کۆمەڵەی گشتی مایەوە وەك هەرێمێکی بێ ئۆتۆنۆمی بە پێی فەسلی یازدەی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان.

کاتێك ئوستralیا ویستی پەیماننامەیەك ببەستێت لەگەڵ ئەندەنوسیا دەربارەی دیاریکردنی سنووری دەریای نێوانی و ئەندەنووسیا، کە بە پێی پرۆژەکەی تەیموری رۆژهەلات بە بەشێك لە ئەندەنوسیا دادەنرا پورتوگال پەنای بردە بەر دادگای دادی نێودەوڵەتی. پورتوگال داوای کرد بڕیار بدرێ کە ئوسترالیا مافی بەستنی ئەو شێوە پەیماننامەیەی نییە و داگیرکردنی چەکداریی تەیموری رۆژهەلات لەلایەن ئەندەنووسیاوە نارەوایە و بەربەستە لە رێگەی گەلی تەیموری رۆژهەلات کە مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆی جێبەجێ بکات. هەروەها پورتوگال ئاماژەی کرد کە بەستنی پەیماننامە لە نێوان ئوسترالیا و ئەندەنوسیا دەربارەی دیاریکردنی سنووری تەیموری رۆژهەلات بە دانپێدانان دادەنرێ بە سەروەری ئەندەنووسیا بە سەر تەیموری رۆژهەلاتدا. ئەمەش پێشێلکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووسە و ئەو مافانەشە، کە لە خۆی دەگرن وەك مافی گەلی تەیموری رۆژهەلات لە یەکیەتیی خاکەکەی و سەروەری هەمیشەیی بەسەر سامان و سەرچاوە سروشتییەکانیدا. هەروەها ئەمە بریتییە لە دەسدرێژی بۆ سەر پێگەی پورتوگال وەك دەوڵەتێك، کە بەڕێوەبردنی تەیموری رۆژهەلاتی پێسپێردراوە وەك هەرێمێکی بێ ئۆتۆنۆمی.

هەرچەندە دادگەکە بڕیاریدا، کە ناتوانێت بەردەوامبێت لە سەیرکردنی داواکە ، بەلام چەند رایەکی

مافی بڕیاردانی چارەنووس بە لایەنی ئەو هەرێمانەی ئۆتۆنۆمیان نییە راشکاوانە بـووە، وەك تەیموری رۆژهەلات، ئەویش سەربەخۆیی بوو، واتا پێکهێنانی دەوڵەتی ئازادی سـەربەخۆ بـۆ گـەلی هەرێمەکـە بـەپێی بڕیارەکـانی: (XV 1514) (XV 1415) (XXV 2625) کۆمەڵی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان.

٢- مافی بڕیـاردانی چـارەنووس مـافێکی دانیشـتووانی دەوڵەتـە بـۆ دەستنیشـانکردنی حکوومەتەکەیان بە ویست و ئیرادەی خۆیان.

مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەلان لە سەرەتای سەرهەڵدانیدا لە وەدیهێنانی مافی بڕیاردانی چارەنووسی سیاسی بەولاوە چیتری نەدەگرتەوە، بەڵام دواتر فرەوان بۆوە تاوەکو کێشە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانیش بگرێتەوە. ئەوە بوو ئەو بڕیارەی کۆمیتەی مافی مـرۆڤ لـە (٢٩)هەمین خولیدا دایڕشت جەختیکرد، کە چەمکی هاوچەرخی مافی بڕیـاردانی چـارەنووس لایەنە یاسایی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانیش دەگرێتەوە.[٤٢]

لە مادەی (١)ی لائیحەی مافی شارستانی و سیاسـی هـاتووە: (( هـەموو گـەلان مـافی چارەنووسیان هەیە و بەپێی ئەم مافە دەتوانن بە ئازادیی بڕیار لەسەر پێگەی سیاسـی خۆیـان بدەن و بە ئازادیش درێژە بە گەشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووری خۆیان بدەن)) ئەمـە

---

دەرخست کە تێیدا هاتبوو، کە مافی گەل لە بڕیاردانی چارەنووس یەکێکە لە پرەنسیپە سەرەکییەکانی یاسای نێودەوڵەتیی سەردەم و شێوەی erga omnes هەیە، واتا پرەنسیپێکی گشتیی مولزەمە بۆ گشت دەوڵەتەکان. ئاماژەشی کرد، کە تەیموری رۆژهەلات وەك هەرێمێکی بێ ئۆتۆنۆمی دەمێنیتەوە سەبارەت بە ئوستراليا و گەلەکەشی مافی بڕیاردانی چارەنووسی هەر دەمێنێ و کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بەردەوام دەبێت بە دانانی تەیموری رۆژهەلات بە هەرێمێك لەو هەرێمانەی دەکەونە ناو سیستمی هەرێمە بێ ئۆتۆنۆمییەکانەوە بە پێی فەسلی یانزەی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان.

لە ٢٧ / ١ / ١٩٩٩ حکومەتی ئەندەنووسیا ئاشکرای کرد، کە رازییە ریفەرەندوم بکرێت لە تەیموری رۆژهەلات تاوەکو تەیموری رۆژهەلات بڕیاربدات ئایا دەیەوێت لە چوارچێوەی ئەندەنووسیا بمێنێتەوە و ئۆتۆنۆمی هەبێ تێیدا یان دەیەوێ جیاببێتەوە و سەربەخۆ بێت لێی.

لە ٣٠ / ٨ / ١٩٩٩ گەلی تەیموری رۆژهەلات لە راپرسییەکی گشتیدا بە ٧٨،٥٠٪ دەنگی بۆ سەربەخۆیی دا. ئەمەش بریتییە لە باشترین شێوە بۆ جێبەجێکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووس بە پێی یاسای نێودەوڵەتی.

42- Official Records of the Economic and social council, 44th session, Supplement. No.6 ( E /5265)

واتا بەپێی هەردوو لائیحە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە مافی مرۆڤ مافی چارەی خۆنووسین بە زەروورەت ناوەڕۆکێکی سیاسی و یاسایی و کۆمەڵایەتی و کولتووری هەیە. هەمان ناوەڕۆکیش لە بڕگە(٢)ی بڕیاری ( ١٥١٤ XV ) ی کۆمەڵەی گشتیدا هاتووە. سەرەڕای ئەوەش زۆرێك لە بڕیارەکانی تری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان تاکیدی کردووە و دانیناوە بە فرەیی لایەنەکانی مافی گەلان لە بڕیاردانی چارەنووس و سرووشتە پێکهاتەکەی.

مافی بڕیاری چارەنووس تەنیا گەلانی نائۆتۆنۆمی و گەلانی ژێر دەسەڵاتی بیانی ناگرێتەوە، بگرە مافی هەموو گەلانیش دەگرێتەوە بۆ بونیادنانی قەوارەی سیاسی و دەستنیشانکردنی سیستەمی یاسایی و ئابووری و کۆمەڵاتی و کولتووری گونجاویان و پاراستن و زیان نەگەیاندن بە یەکیەتییە هەرێمی و نیشتمانییەکەی.

٣- مافی بڕیاردانی چارەنووس مافی ئەو کۆمەڵە ئەتنیکیانەش دەگرێتەوە، کە لەناو دەوڵەتێکی فرەنەتەوەدا دەژین بۆ بڕیاردان لەسەر پێگەی سیاسی خۆیان.

ڕەهەندە یاساییەکانی مافی بڕیاردانی چارەنووس لە رووی پیادەکردنییەوە لەلایەن کۆمەڵە ئەتنییەکانەوە لە دەوڵەتە سەربەخۆیە فرە نەتەوەکاندا، تایبەتمەندیی روونیان نییە. ئەوی زیاتر مەسەلەکەی ئاڵۆزکردووە، ئەوەیە کە تاوەکو ئێستە دوو مەسەلەی گرینگ بەبێ چارەسەر ماونەتەوە. ئەوانەش برێتین لە پێناسەکردنی گەل People لە روانگەی دەوڵەتە سەربەخۆکانەوە و ئایا پیادەکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووس لە دەوڵەتێکی سەربەخۆدا مافی جیابوونەوە دەگرێتەوە.

دادگەی باڵا لە کەنەدا ساڵی ١٩٩٨ لەم دوو لایەنەی مافی بڕیاردانی چارەنووسی لە کێشەی کیوبیك (Secession Quebec )، کۆلیوەتەوە. ئەوە بوو حکوومەتی فیدراڵی کەنەدا داوای لە دادگەی باڵا کرد رایەکی راوێژکاری بدات لەبارەی رەوایی هەر هەوڵێك حکوومەتی هەرێمی کیوبیك دەیدا بۆ جیابوونەوە لە کەنەدا بە شێوەی یەکلایەنە[٤٣]. ئەو

٤٣- کەنەدای فیدراڵ لە دە هەرێم پێکهاتووە. زۆرینەی دانشتوانی نۆ هەرێمیان ئینگلیزی زمانن. بەڵام دانشتوانی هەرێمی دەیەم، کە دووەم هەرێمە لە رووی گەورەییەوە فەرەنسی زمانن. ئەم هەرێمەش کیوبیکە. لە سەرەتای شەستەکانەوە بزووتنەوەیەکی نەتەوایەتی لەم هەرێمە سەریهەڵدا، دواتر لە پارتی کیوبیکویزی نەتەوەیی خۆی رێکخست. ئەم پارتە لە ١٩٧٦ لە هەرێمەکە دەسەڵاتی گرتەدەست و لە ساڵی ١٩٨٠ حکوومەتی هەرێمی کیوبیك راپرسییەکی کرد بۆ ئەوە گەلی هەرێمەکە دەسەڵاتی پێ بدات تاوەکو لەگەڵ

پرسیارەی حکوومەت ڕووبەڕووی دادگەی کردەوە ئەمە بوو: ((ئایا یاسای نێودەوڵەتی ماف دەداتە ئەنجومەنی نیشتمانی و دەسەڵاتی یاسادانان و حکوومەتی هەرێم لە کیوبیک، کە یەکلایەنانە کیوبیك لە کەنەدا جیابکەنەوە؟. لەم ڕوانگەیەشەوە ئایا مافێکی چارەنووس هەیە بەپێی یاسای نێودەوڵەتی، ئەو مافە بداتە ئەنجومەنی نیشتمانی و دەسەڵاتی یاسادانان و حکوومەتی کیوبیك، کیوبیك بەشێوەی یەکلایەنانە لەکەنەدا جیابێتەوە)) [٤٤]. بۆچوونی دادگەکە وابوو ((یاسای نێودەوڵەتی مافی یاسایی نادات بەو هەرێمانەی دەوڵەتە سەروەرییە فیدراڵییەکە پێکدەهێنن، کە بە شێوەی یەکلایەنە لە دەوڵەتی دایك جیاببنەوە)) [٤٥]، بەڵام دادگەکە هەندێ حاڵەتی بەدەر لەو نۆرمە گشتییانە هێناوەتەوە، کە بەڕای ئەو لە سایەیاندا، مافی یاسایی نادرێت بە هەرێمەکان، کە جیاببنەوە لە دەوڵەتە خاوەن سەروەرییەکان بەپێی یاسای نێودەوڵەتی. دادگەکە ئاماژەیداوە، کە جگە لە حاڵەتی لەناوبردنی کۆلۆنیالیزم، دوو حاڵەت هەن دەکرێ مافی بڕیاردانی چارەنووس، مافی جیابوونەوە لە خۆ بگرێ، ئەویش:

---

حکومەتی فیدراڵیدا وتووێژ بکات دەربارەی وەرگرتنی پێگەیەکی یاسایی نوێ بۆ کیوبیك بەناوی "یەکێتی سەروەری Sovereign Association ".

بە پێی ئەم پێگە یاساییە دەبوایە کیوبیك ببێتە دەوڵەتێکی سەروەر و تەنیا لە شێوەی یەکێتییەکی ئابووری توندا دەمایەوە لەگەڵ ئەو دوای کەنەدادا، بەڵام ئەم پرۆژەیە سەرینەگرت، چونکە ٦٠٪ دەنگدەران لە دژیبوون. ئەمەش بووە هۆی دۆڕاندنی پارتی کیوبیکویز لە هەڵبژادنەکانی ساڵی١٩٨٥.

لە ساڵی١٩٩٤ دووبارە هاتەوە سەر حوکم و ڕاپرسییەکی تری کرد لە ١٩٩٥ و دیسان دۆڕاندی، بەڵام بە ڕێژەیەکی زۆر کەم ئەویش ٥٠.٥٦٪ بوو بەرامبەر بە ٤٩.٤٤٪.

بڕیار وابوو ئەگەر ئەنجامی ڕاپرسییەکە لە بەرژەوەندی دەسەڵاتی هەرێم بوایە حکو،مەتی کیوبیك دەست بکات بە وتووێژ لەگەڵ حکومەتی ناوەندی بۆ دانانی پەیوەندییەکانی نێوانیان لەسەر بنەماگەلێکی یاسایی و سیاسی و ئابووری نوێ و لە حاڵەتی سەرنەکەوتنی ئەم وتووێژانە و نەگەیشتن بە ڕێککەوتن لە ماوەی یەك ساڵدا لە ڕۆژی ڕاپرسییەکەوە، ئەوە ئەنجومەنی نیشتمانی کیوبیك لە یەك لایەنەوە سەربەخۆیی کیوبیك ڕادەگەیەنێ وەك دەوڵەتێکی سەروەر. ئەمەش پاڵی بە حکومەتی ناوەندییەوە نا داوای ڕایەکی ڕاوێژکاری لە دادگای باڵا بکات دەربارەی ڕەوایەتی جیابوونەوەی یەك لایەنەی کیوبیك بە پێی یاسای کەنەدا و یاسای نێودەوڵەتی.

44- (1998) 161 DLR (4th) 385, 394.

٤٥- هەمان سەرچاوە ل ٤٣٣ — ٤٣٤

١- حاڵەتی ((چەوساندنەوەی گەل)).

٢- حاڵەتی ڕەتکردنەوەی بەشداربوونی کۆمەڵە خـەڵکێکی دیـاریکراو یـان نەتەوەیـەکی دیـاریکراو لـە بـەڕێوەبردنی دەوڵـەت بـۆ ئـەوەی درێـژە بـە گەشـەی سیاسـی و ئـابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووری خۆی بدات.

لە حاڵەتی کیوبیکدا بۆچوونی دادگەکە وابوو: دانیشـتووانی هەرێمەکـە نـاکرێ لـە هـیچ بارێکدا بە چەوساوە دابنرێن، یان لە بـەڕێوەبردنی دەوڵـەت نوێنـەر نـەبن، بۆیـە ئەنجومـەنی نیشتمانی بەپێی یاسای نێودەوڵەتی دەسەڵاتی پێ نەدراوە، کە کیوبیك لـە کەنـەدا بەشـێوەی تاکڕەوی و یەکلایەنە جیابکاتەوە.

بڕیاری ژمارە(2625 xxv )ی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕێگەی داوە بەو کۆمەڵـە دانیشتووانە، کە نوێنەرایەتییان نییە لە حوکمی دەوڵەتدا، لە دەوڵەتی سەربەخۆ جیاببنـەوە. بڕگە (٧) لە پرەنسیپی یەکسانی گەلان و مافیان لە بڕیاردانی چارەنووسیان، کە لە بڕیارەکـە هاتووە سەلامەتیی هەرێم و یەکیەتیی سیاسی دەوڵەتە سەربەخۆکان و لەت لەت نـەبوونیان و دەسکاری نەکردنی بەشێکیان یـان گشـتییان پێوەسـت کـردووە بـە بـوونی حکوومەتێکـەوە لەناویدا، کە نوێنەرایەتی هەموو گەلی هەرێمەکە بکات بەبێ جیاوازی بە هـۆی ڕەگـەز یـان بیروباوەڕ یان ڕەنگەوە.

مشتومڕێکی جدییانە هەیـە لـەبارەی شـرۆڤەکردنی بڕگـە(٧)ەوە. دەبیـنین هەنـدێ لـە یاساناسان لـە مافەکـە کـەم دەکەنـەوە بـە شـێوەیەك تـەنیا ئـەو کۆمەلانـە بگرێتـەوە کـە دەوڵەتەکانیان ڕێیان نادەن بەشداری لە دەسـەڵاتدا بکـەن لەبـەر جیـاوازی تـەنیا ڕەگـەزی و بیروباوەڕ و ڕەنگەوە، بەڵام یاساناسانی تر شرۆڤەکردنی زۆر لەوە فرەوانتریان پێیە و بڕگە(٧)بە بەشێك لە تیۆرییەکی فرەوان دادەنێن کە بانگەشە بۆ ڕەوایـەتیی جیابوونـەوە دەکـات لەسـەر بنەمای چەوساندنەوە (Oppression).

لەم بارەیەوە Buchheit دەڵێت: ((یاسای نێودەوڵەتی دان بە کۆمەڵە شـێوازێکی یاسـاییدا دەنێت، کە هـەر لـە پاراسـتنی مـافی تاکەکانـەوە بگـرە تـا مـافی کەمایەتییـەکان و دوایـەش جیابوونەوە، وەك دوایین شێواز...کاتێك ئەو هەڵسوکەوتە توندوتیژەی دەوڵـەت پیـادەی دەکـات بەرامبـەر بـە کەمایەتییـەکانی دەبێتـە جێگـەی گرینگیپێـدانی نێودەوڵـەتی. دەکـرێ ئـەم گرینگیپێدانـە ببێتـە هۆکارێـك بـۆ داواکردنـی نێودەوڵـەتی بـۆ مسـۆگەرکردنی مـافی کەمایەتییەکان... یان پێشنیاری ئۆتۆنۆمی هـەرێمی یـان سـەربەخۆیی ئـابووری و پرسـی لـەو

بابەتە، یانیش لە دواییدا پەنا ببەنە بەر بەکارهێنانی شەرعییەتی نێودەوڵەتی لە پێناو جێبەجێکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووسی جیابوونەوە، وەك شێوازێکی تایبەت کە کۆمەڵە چەوساوەکە پەنای بۆ دەبات بۆ فریاکەوتنی خۆی..))[٤٦]

دیارە، بڕگەی(٧) تەنیا یەك لایەنی هێناوەتەوە لە (( تیۆریی چەوساندنەوە))ی فرەوان. حاڵەتی تری وا هەیە ئەگەر هەموو پێوەرەکانی بڕگەی حەوتیش نەیەنەدی هەر دەکرێت جیابوونەوە بە ڕەوا دابنرێت. وەك پێشێلکاریی جدیانەی مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ. ئەم تیۆرییە بەربلاوە بەکارهێنرا وەك بەڵگە بۆ جیابوونەوەی بەنگلادێش لە پاکستان[٤٧] و بونیادنانی بناخەی یاسایی بۆپێکهێنانی دەوڵەتی بەنگلادێش و بەدەستهێنانی پێزانینی فرەوان و خێرا بە سەربەخۆییەکەی لە ساڵی ١٩٧١ و لە ساڵی ١٩٧٤ چوونە ریزی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە [٤٨]. دەکرێ بگوترێ ڕەهەندەکانی چەوساندنەوەی پێویست وەك هۆکاری

46- Lee C. Buchheit. Secession: The Legitimacy of Self-Determination. (New Haven, CT: Yale University Press, 1978). P.222

٤٧- هەمان سەرچاوە ل .٢١٣

٤٨- لەپێش جیابوونەوەی بەنگلادێش، پاکستان لە دوو کەرت پێکهاتبوو، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا. زۆربەی دانیشتوانی پاکستانی ڕۆژهەڵات کە ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی ٧٥ ملیۆن کەس دەبوو بریتیبوون لەو بەنگالانەی، کە لە ڕووی ئابووری و سیاسییەوە سەر بە پاکستانی ڕۆژئاوابوون. پارتی کۆمەڵەی عەوامی نەتەوەیی بەنگال چەندین جار داوای سیستمی فیدراڵی نامەرکەزی فراوانی دەکرد لە چوارچێوەی دەوڵەتی پاکستاندا. ئەو کۆمەڵەیە لە ساڵی ١٩٧٠ چووە هەڵبژاردنی گشتییەوە بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی پاکستان بە بەرنامەیەك لە (٦) خاڵ پێکهاتبوو، ئامانجی سەرەکی کۆمەڵە دامەزراندنی سیستمێکی فیدرالی نامەرکەزی بوو و پاکستانی ڕۆژهەڵاتیش بکرێ بەهەرێمێکی فیدراڵی و دەسەڵاتی فراوانی بدرێتێ. لە هەڵبژاردنەکاندا کۆمەڵە لە کۆی ٣١٣ کورسی ١٦٧ کورسی وەرگرت. بەڵام سەرکردایەتی رژێم لە پاکستانی ڕۆژئاوا لە ١ی ئاداری ساڵی ١٩٧١ بڕیاری دا بەستنی دانیشتنی پەرلەمان دوابخرێ، ئەمە وایکرد پشێوی و خۆپێشاندان هەموو سوچێکی پاکستانی ڕۆژهەڵات دابگرێ و کومەڵە داوای لە جەماوەر کرد یاخیبوونی شارستانی لە دژی دەسەڵاتدارانی پاکستان دەست پێ بکەن، بەڵام ئەو کارە لە لایەن حکوومەتەوە بە ئاگر و ئاسن وەڵامدرایەوە و سوپا لە پاکستانی ڕۆژئاواوە هێنرا بۆ سەرکوتکردنیان و زیانی ئەو کردەوانە نێزیکەی ملیۆنێك قوربانی بوو. کۆمەڵەی عەوامی لەو بەنگالانەی ئاوارەی هیندستان ببوون هێزی چەکداریی پێکهێنا و شەڕی پارتیزانی بە پشتیوانی هیندستان دژی هێزەکانی پاکستان بەرپا کرد. لە ١٩٧١/٤/١٠ کۆمەڵەی

جیاکردنەوە، هێشتا بە وردی دیاری نەکراون. وێڕای ئەوەش بێگومان ئەم ڕەهەندانە ئەو سنوورانە دەبەزێنن کە بڕگە (٧) لە بڕیاری ژمارە (XXV 2625) دایڕشتوون. سەرەڕای ئەمەش ڕەهەندەکانی تیۆریی چەوساندنەوە کێشەی قووڵی وایان تێدایە کە قابیلی لێکۆلینەوەن وەك: قەدەخەکردنی دەستێوەردانی چەکداری دەرەکی. دەبینین بڕگە(٨)ی بڕیارەکە داوا لە دەوڵەتەکان دەکات ((هیچ کارێکی وا نەکەن ئامانجی داڕوخانی بەشێك یان هەموو یەکیەتیی نیشتمانی و ئاسایشی هەرێمی هەر دەوڵەت و وڵاتێکی دیکە بێت))، بەڵام ئەگەری ئەوە نییە بەشێك لە دانیشتووانی وڵاتێك بەبێ دەستێوەردانی دەرەکی جیاببێتەوە، چونکە ئەستەمە سەرکەوتن وەدەست بێنن لە شەڕیاندا لەگەڵ هێزێك بەژمارە و بە چەك لە خۆیان زۆرتر و بەهێزترن. بۆ نموونە نەدەکرا بەنگلادێش سەربەخۆیی وەربگرێ بەبێ دەستێوەردانی هیندستان. بۆیە بڕگە (٨) بارێك دەخوڵقێنێ وا دەکات بەشێکی چەوساوە لە دانیشتووانی وڵات لە رووی یاساییەوە مافی جیابوونەوەیان هەبێ، بەڵام لە واقیعدا ناتوانن وەدەستی بێنن، چونکە ئەو هاوکارییە تایبەتییەی پێویستیانە بۆ جیابوونەوە، بە ناڕەوا دەژمێردرێ.

تیۆریی چەوساندنەوە لە رووی نە گونجانی لەگەڵ ویست و ئارەزووی کۆمەڵە ئەتنییەکان لە دەوڵەتە سەربەخۆکاندا بۆ پێکەوەنانی دەوڵەتەکانیان، مایەی رەخنە و مشتومڕ بووە، چونکە ئەم تیۆرییە لەسەر جیاوازی ئەتنی بونیادنەنراوە. بگرە لەسەر چەوساندنەوە. ئەوی بووە پاساو بۆ پێکهاتنی دەوڵەتی بەنگلادێشی سەربەخۆ زیاتر هەقیقەتی چەوساندنەوە بوو، نەوەك زمان و نەتەوایەتی و کولتووری جیاواز لەگەڵ بەشەکەی تری پاکستان.

سەرەڕای ئەوەش چەندین نەتەوە هەن ئەم بنەمایانە بە پاساو دانانێن بۆ جیابوونەوە. گەل بۆی هەیە چارەنووسی سیاسی خۆی دیاری بکات، نەك تەنیا لەو دەوڵەتانەی چەوساندنەوە لە دژی پیادەدەکرێ، بگرە لەو دەوڵەتە دیموکراتییانەش، کە چەوساندنەوە و جیاوازی تێدا نییە. کۆمەڵە ئەتنییەکان پێیان وایە مافی بڕیاردانی چارەنووس دەبێ لەسەر ئیرادە و ویست و

---

عەوامی جاڕی پێکهێنانی دەوڵەتی بەنگلادێشی دا. پاش ئەوەی فڕۆکەکانی پاکستان فڕگەکانی هیندستانیان بۆردومان کرد هیندستانیش چووە جەنگەوە. هیندستان دانی بەبەنگلادیشدا نا وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ و ئابلۆقەی لە زەوی و دەریاوە سەپاند بە سەر هێزەکانی پاکستاندا لە هەرێمی رۆژهەڵات و ناچاری کرد خۆی بە دەستەوە بدات.

داخـوازی کەسـانێك بونیادبنرێـت، کـە دەیانـەوێ ئـەو کەسـانە حوکمیـان بکـەن و خۆیـان هەڵیاندەبژێرن.[49]

(تیۆری نێوەخۆیی)یش "Ineternal theory" پاسـاو بـۆ جیابوونـەوە لەسـەر بنـەمای پێوەری نێوەخۆیی، دێنێتەوە، ئەم تیۆرییـە پێیوایـە جیابوونـەوە بابـەتێك نییـە بـۆ یاسـای نێودەوڵەتی، بگرە بە گشتیی کێشـەیەکی نێوەخۆییـە. دەبیـنین تیۆرییەکـە لەسـەر بنـەمای پرەنسیپی دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوەخۆ بونیادنراوە، کە لـە بڕگـە (٤) و (٧)ی مـادەی (٢)ی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە. بڕگە (٤) ڕێ نادات بە ((هەڕەشـەکردن بـە بەکارهێنانی هێز یان بەکارهێنانی لە دژی ئاسایشی خاکی وڵاتان یـان سـەربەخۆیی سیاسـی هەر دەوڵەتێك))، بڕگە (٧)یش ڕێ نادات بە نەتەوە یەکگرتووەکان ((دەسـت لـەو کاروبارانـە وەردات، کە لە گەوهەردا لە دەسەڵاتی نێوەخۆیی هەر دەوڵـەتێکن....)) گرینگیـی ئـەو دوو بڕگەیە لە دوو شتدا دەردەکەوێ. یـەکێکیان ئەوەیـە یاسـای نێونەتـەوەیی مـافی دەوڵەتـەکان مسۆگەردەکات لە پێشێل نـەکردنی یەکیـەتیی هەرێمەکـەیان لەلایـەن دەوڵەتـەکانی تـرەوە. دووەمیشیان پاراستن لە پێشێلکاری نێوەخۆیی خودی دەوڵەت مسۆگەر ناکات، چونکە ئەوە لە دەرەوەی دەسەڵاتی یاسای نێودەوڵەتییە. نۆرمێك نییە لە یاسای نێودەوڵەتیـدا ڕێنـەدات بـە دابەشبوونی هەرێمی دەوڵەت چ ئەو کارە لە بەرئـەنجامی گۆڕانکـاری و گونجـانی ئاشـتییەوە بێت، یان لە بەرئەنجامی کێشمەکێش و شەڕوشۆڕی نێوەخۆییەوە بێت.[50]

لە بەر ئەمانە هەموویان ئەو هەڵوێستانەی دژی جیابوونەوە وەردەگیرێن لەناو دۆکومێنتە نێودەوڵەتییەکاندا یان بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یـەکگرتووەکان، دەبـێ تـەنیا ئـەو دەستێوەردانە بگرنـەوە، کـە لـە لایـەن دەوڵـەتانی سـێیەمەوە دەکـرێن. نـاکرێ پشـت بـەو دۆکومێنتانە بۆ بڕیاردان ببەسترێت، کە جیابوونەوە لەناو دەوڵەتدا کـارێکی ناڕەوایـە بـەپێی یاسای نێودەوڵـەتی، چـونکە پرۆسـەی جیابوونـەوە کـارێکی نـاوەخۆیی کاروبـاری دەوڵـەتی پێوەندیدارە و ناچێتە خانەی ویلایەتی یاسای نێودەوڵەتییەوە. بەرئەنجام هەر دەستێوەردانێکی دەرەکی لە پێناو ڕێگرتن لە جیابوونەوە برێتییـە لـە کـارێکی دژە لۆجیـك، چـونکە قـەوارە

---

٤٩- هەمان سەرچاوە ل ٢٢٣

50- Crawford J. The creation of states in International law oxford: Clarendon Press 1979، P.266, Buchheit P.221

جیابووەوەکە کاتێك ئەو رێگرتنــە دەرەکییــەی، کــە لەســەرێتی پێشــێلدەکات، واتــا کاتێــك بەرەنگاری دەستێوەردانی دەرەکی دەبێتەوە، دەچێتە نــاو دانووســتاندی نێودەوڵەتییــەوە، کــە ئەمەش تەنیا لە دەسەڵاتی کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتییە. بەم شێوەیە وەك کەسێکی یاسای نێودەوڵــەتی رەفتاردەکــات. لەولاشــەوە ئەمــە بــە تــەواوی پێچــەوانەی خــودی ئامــانجی دەستێوەردانە دەرەکییەکەیە، چونکە وەك دەزانین، دەستێوەردانی دەرەکیی لە پێناوی رێگرتنە لە قەوارەی پێوەندیــدار، کــە ببێتــە دەوڵــەتێکی ســەربەخۆ کــە کەســێکی ســەرەکی یاســای نێودەوڵەتییە.[٥١]

تیۆریی پێزانینی دەرخــەر "کاشــف" بەســەر ئــەو واقیعــەدا جێبەجێــدەبێ، کــە جیابوونــەوە رەفتارێکی بێلایەنەیە لە یاسای نێودەوڵەتیدا، چونکە بەپێی تیۆری دروستکەر"المنشـيْ " رەفتــاری دانپێدانان پێگەی یاسایی قەوارە جیابووەوەکە بە تەواوی دیاری دەکات. واتا بەپێی ئــەم تیۆرییــە جیابوونەوە نابێتە رەفتارێکی بێلایەن لــە یاســای نێودەوڵەتیــدا، چــونکە دانپێــدانان لــە مەیــدانی نێودەوڵەتیدا پێش دروستبوونی دەوڵەت زەرووره، بگرە بە یەکێك لە کۆڵەکەکانی دادەنرێ، بەڵام لە لایەکی ترەوە رەفتاری دانپێدانان بە پێی تیۆری پێزانینی دەرخەر تەنیا راگەیاندنێکــە، کــە قــەوارە جیابووەکە دەوڵەتی داناوە، بۆیە بە دانەری ئەو پێگە یاساییە ناژمێردرێ. لە بەر ئەمە جیابوونــەوە رەفتارێکی بێلایەنە لە یاسای نێودەوڵەتیدا بەپێی تیــۆری دەرخــەر، چــونکە پێکهێنــانی دەوڵــەت پێویستی بە رەفتار نییە لە لایەن دەوڵەتەکانی ترەوە پێوەستیش نییە پێیانــەوە. پاشــان دانپێــدانان بە تیۆریی دروستکەر بە شێوەی نەگەتیف کاریگەری دەکاتە سەر تیۆری نێوەخۆیی، چونکە پێــزانین لە لایەن دەوڵەتەکانی ترەوە کارێکی بنەڕەتییە بۆ بونیادنانی دەوڵەت. پێچــەوانەی ئــەوەش تیــۆری نێوخۆیی بە تەواوی هەماهەنگە لەگەڵ تیۆری دەرخەر. لــەم بارەشــدا قــەوارە جیابووەکــە دەتــوانێ دەوڵەت دابنێ بەبێ پێزانینی نێونەتەوەیی.

### ٣- مافی جیابوونەوەی هەرێمی کوردستان:

هەرێمی کوردستان هەرێمێکی یاسایی و دەستوورییە، یاساییە چونکە پەرلەمانی کوردستان بە بڕیارێك ساڵی ١٩٩٢ سیستەمی فیدراڵی لە کوردستانی عێراق راگەیاند و

51- Crawford J. The creation of states in International law oxford: Clarendon Press 1979 P.268

دەستووریشە، چونکە دەستووری عێراق لە ٢٠٠٥ لە مادەی ١١٧ دا هەرێمی کوردستانی وەك هەرێمێکی فیدراڵی پەسەندکرد.

هەرێمی کوردستان قەوارەیەکی دەوڵەتانەیە، کە لەسەر هەرسێ رایەڵە سەرەکییەکانی دەوڵەت بونیادنراوە. دانیشتووان و هەرێم /خاك/ و حکوومەت.

هەموو ئەو پێوەرانەی پێویستن بۆ بوونی گەل، بێگومان لە **گەلی کوردستانی عێراقدا** هەن. گەلی کورد وەك کۆمەڵە کەسانێکی ئەتنی نیشتەجێبوو لە هەرێمی کوردستان خاوەن زمان، مێژوو، رەگەز، خاك، کولتوور، ژیانی ئابووری، داب و نەریتی هاوبەشی خۆیەتی.

گەلی کوردستان لەسەر **خاکی هەرێمی کوردستان** بە بەردەوامی دانیشتووە. سنوورەکانی **هەرێمی کوردستان** لەم قۆناخەدا بە مادەی ١٤٣ی دەستووری عێراقی و مادە ٥٣/ای یاسای بەڕێوەبردنی عێراقی بۆ قۆناخی گواستنەوە دیاریکراوە و ئەو ناوچانە دەگرێتەوە، کە دەکەوتنە باکووری هێڵی ٣٦ تاوەکو ١٩ئازاری ٢٠٠٣ لە پارێزگەکانی دهۆك، هەولێر، سلێمانی، کەرکوك، دیالە و نەینەوا. هەروەها بەشێك لە خاکی راستەقینەی هەرێمی کوردستان نەخراوەتە ناو ئەم سنوورەوە، بەڵام لە مادەی ١٤٠ی دەستووری عێراق شێوەی چارەسەرکردنی بۆ دیاریکراوە.

هەرێمی کوردستان خاوەن سیستەمێکی سیاسی پەرلەمانی کۆماری دیموکراتییە **لە سێ دەسەڵات پێکدێت:** دەسەڵاتی یاسادانان و دەسەڵاتی جێبەجێکاری و دەسەڵاتی دادوەری. هەر یەکە بەپێی ئەو دەسەڵاتانەی بە یاسا[٥٢] و دەستووری عێراق[٥٣] پێی دراوە ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ دەکات لە سنووری هەرێمی کوردستانی عێراقدا.

---

١- لەبەرئەوەی هەرێمی کوردستان دەستووری نییە تاوەکو ئێستە، ئەم یاسایانە دەسەڵاتەکانی هەر سێ دەزگەکان دیاریدەکەن:

١. یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان — عێراق ژمارە (١) ساڵی ١٩٩٢ی هەموارکراو.

٢. یاسای ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان — عێراق ژمارە (٣) ساڵی ١٩٩٢ی هەموارکراو.

٣. یاسای سەرۆکایەتیی هەرێمی کوردستان — عێراق ژمارە (١) ساڵی ٢٠٠٥ ی هەموارکراو.

٤- یاسای دەسەڵاتی دادوەری لە کوردستان ژمارە(٢٣) ساڵی ٢٠٠٧.

٥٣ دەستووری عێراق بە سێ جۆر دەسەڵاتی هەرێمی دیاریکردووە:

١. لە ماددەی١١٠ دا دەسەڵاتە سنووردارکراوەکانی(الاختصاصات الحصرية)ی دەسەڵاتی فیدرالی دیاریکردووە.

گەلێ لە دەوڵەتانی خاوەن پێگەی گرینگ لە جیهاندا، بە تایبەتی لە ئەورووپا دانیانناوە بەم قەوارە شێوە دەوڵەتییەی کورددا لە ڕێگەی کردنەوەی کونسوڵگەری لە هەولێری پایتەخت، کە کاری دیبلۆماسیش ئەنجامدەدەن یان بە پێشوازیکردن لە سەرۆکی هەرێمی کوردستان بەو ڕێوڕەسمانەی، کە پێشوازی سەرۆکی دەوڵەتی سەربەخۆی پێدەکرێت.

لەم بارەدا ئایا هەرێمی کوردستان بەپێی یاساکانی عێراق و یاسای نێودەوڵەتی بۆی هەیە بە یەکلایەنە لە عێراق جیاببێتەوە؟

تاوەکو مادەی ١٤٠ جێبەجێ نەکرێت بەو میکانیزمەی تێیدا هاتووە، واتا ئاساییکردنەوەی پاشماوەی سیاسەتی بە عەرەبکردن و پاکتاوی ڕەگەزی و سەرژمێری و ڕاپرسی ئازاد لەبارەی چارەنووسی ناوچە دابڕاوەکان یان چارەسەرکردنی بە شێوەیەکی پەسەندکراو لەلایەن گشت لایەنە پێوەندیدارەکانەوە، ناکرێ بگوترێت، کە گەلی کوردستانی عێراق مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆی جێبەجێکردووە.

بەپێی پرەنسیپی مافی مرۆڤ، لە یاسای نێودەوڵەتیدا، جێبەجێکردنی فیدراڵی بە جێبەجێکردنی مافی چارەنووس دەژمێردرێت، ئەگەر گەلی پێوەندیدار لە هەرێمەکەدا بە ئیرادەی ئازادی خۆی هەڵیبژێرێت و پێی ڕازیبێت، بەڵام پێموایە ڕازیبوونەکەی گەلی کوردستان بە سیستەمی فیدراڵی بۆ هەرێمی کوردستانی عێراق بەم سنوورەی ئێستەوە پێوەستە بە چەند مەرجێکەوە. گرینگترینیان چارەسەرکردنی ناوچە دابڕاوەکانە بە گوێرەی ئیرادەی ئازادی دانیشتووانەکانیان و پێڕەوکردنی دیموکراتییە لە عێراق و ئیلتیزامکردنە بە دەستووری عێراق، کە مافی فیدراڵی بۆ گەلی هەرێمی کوردستان دابینکردووە و نەخشە ڕێگەی داناوە بۆ گەڕانەوەی ناوچە دابڕاوەکان.

بەپێی مادەی ٢/٥٦ لە یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان عێراق ژمارە (١) ساڵی ١٩٩٢ی هەموارکراو لە دەسەڵاتی پەرلەمانی کوردستانی عێراقدایە بڕیار لەسەر پرسە

---

٢. لە ماددەی ١١٢ و ١١٣ و ١١٤دا ئەو دەسەڵاتانە دیاریکراون، کە دەسەڵاتی فیدراڵی و دەسەڵاتی هەرێم پێکەوە یان بە هەماهەنگی یان بەهاریکاری ئەنجامیان دەدەن.

لە مادەی ١٢٠ و ١٢١دا هەندێ لە ماف و دەسەڵاتی هەرێم دەسنیشان کراون و جەختکراوەتەوە، کە هەر دەسەڵاتێك لە دەسەڵاتە حەسرییەکانی دەسەڵاتی فیدراڵی نەبێ، ئەوە دەبێتە دەسەڵاتی هەرێم

چارەنووسسازەکانی کوردستانی عێراق بدات و پێوەندی یاسایی هەرێم لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندیدا دیاری بکات.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە پەرلەمانی کوردستان بۆی هەیە بە یەکلایەنە بڕیاربدات لەسەر جیابوونەوەی هەرێمی کوردستان لە عێراق و بە راپرسییەکی ئازاد بیخاتە پێشی گەلی کوردستان بۆ پەسەندکردنی، ئەگەر ئەم حاڵەتانە هاتنەکایەوە:

١- هەڵوەشانەوەی دەستووری عێراق یان راگرتنی کارپێکردنی یان هەمووارکردنی ئەو ئەحکامانەی، کە سیستەمی دیموکراتی و فیدراڵی و مافەکانی گەلی کوردیان دابینکردووە.

٢- جێبەجێ نەکردنی مادەی ١٤٠ ی دەستوور یان چارەسەرنەکردنی کێشەی ناوچە دابڕاوەکان بە گوێرەی ویستی ئازادی دانیشتووانەکەی.

٣- بڕینی تێکڕای یان بەشێکی پشکی کوردستان لە بودجەی عێراق بۆ هەر مەبەستێك بێت چ لاوازکردنی هەرێم یان فشارخستنە سەری بۆ قبووڵکردنی مەرجەکانی دەسەڵاتی ناوەند.

٤- هێرشی هێزی چەکدار لەلایەن دەسەڵاتی ناوەندەوە بۆ سەر هەرێمی کوردستان یان ناوچە دابڕاوەکان یان دانانی پلان بۆ هێرشی لەو جۆرە و یان هەڕەشەکردن لە هەرێمی کوردستان و ناوچە دابڕاوەکان بە بەکارهێنانی هێزی چەکدار.

هێرشی هێزی چەکداری یان هەڕەشەکردن پێی دژی هەرێمی کوردستان مەترسییەکی گەورەیە رەنگە تاوانی قەدەخەکراوی نێودەوڵەتی لێ بکەوێتەوە، چەشنی ئەو تاوانانەی، کە رژێمی پێشوو ئەنجامیانی داوە لە کوردستان وەك تاوانی جەنگ و دژی مرۆڤایەتی و جینۆساید.

ئەوەی ئەم بەڵگەیەی کورد بەهێزتر دەکات بۆ جیابوونەوە لەسەر چەوساندنەوەی گەلی کوردستان داننانی نێودەوڵەتی و ناوەخۆییە بە پێڕەوکردنی سیاسەتی چەوساندنەوە دەرهەق گەلی کوردستان و ئەنجامدانی تاوانی جەنگ و دژی مرۆڤایەتی و جینۆساید بەرامبەری.

١- ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان لە پێشەکی بڕیاری ٦٨٨ی دا ئاماژەدەکات، کە ئەنجومەنی ئاسایش ((هەست بە نائارامییەکی قووڵ دەکات بەرامبەر ئەو داپڵۆسینەی دانیشتووانی سیڤیلی عێراقی تووشی دەبن لە زۆر پارچەی عێراق و لەم دواییەدا ناوچە کوردنشینەکانیشی گرتەوە و بووە هۆی هەڵچمانی پەنابەرانی بە شێوەیەکی فرەوان

بەرەو سنووری نێودەوڵەتی و ئەنجامدانی بەردومان لە دەوروبەری سنوور بە جۆرێك ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی لەناوچەکەدا دەخاتە مەترسییەوە. لە کاتێکدا (ئەنجومەنی ئاسایش) هەست بە نارەحەتییەکی قووڵ دەکات بەرامبەر ئەو ئازارە سەختەی تووشی مرۆڤەکان بوونە لە ئەنجامی ئەوەدا...)) ئەنجومەنی ئاسایش ((١- ئیدانەی ئەو داپڵۆسینە دەکات، کە تووشی دانیشتووانی سیڤیلی عێراقی بوون لە زۆر ناوچەدا و کە لەم دواییەدا ناوچە کوردنشینەکانیشی گرتەوە، ئەنجامەکانیشی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی لەناوچەکەدا دەخەنە مەترسییەوە))[٥٤]

٢- ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق لە دانیشتنی ئاسایی خۆی ژمارە (٩) لە ٢٠٠٨/٤/١٤ بە بڕیارێك پرۆسەی ئەنفالی بەدناوی بە تاوانی کۆمەڵکوژی و تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی زانی. لەو بڕیارەدا هاتووە: ((بۆ جەختکردنەوە لەسەر بڕیاری دادگەی تاوانی عێراقی تایبەت سەبارەت بە گونجاندنی ئەو رووداوانەی لەگەڵ پرۆسەکانی ئەنفالی بەدناودا روویاندا، کە کۆمەڵکوژییە، ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بڕیاردەدات، کە ئەوەی تووشی گەلی کورد لە کوردستانی عێراق بوو لە سیاسەتی داپڵۆسین و چەوسانەوە و تاوانگەلێك، کە ئەم بڕیارە وێنەی رووداوەکانی خستەڕوو تاوانی کۆمەڵکوژی و تاوانی دژی مرۆڤایەتییە بە هەموو پێوەرێك)). ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق لە دانیشتنی ژمارە (٤٤) لە ٢٠١١/٣/١٧ لەبارەی تاوانی بەردومانکردنی هەڵەبجە بە چەکی کیمیایی بڕیارێکی دەرکرد، تێیدا هاتووە: ((پاڵپشت بە بڕیاری دادگەی باڵای تاوانی عێراقی لە ٢٠١٠/٢/٢٨ ئەوەی خەڵکی هەڵەبجە تووشی بوون لە ١٩٨٨/٣/١٦ بە تاوانی کۆمەڵکوژی دادەنرێ بە هەموو واتایەکی وشەکە.))[٥٥]

لە پێناو بەرگریکردن لەخۆ بەرامبەر هێرشی چەکداری یان هەڕەشەکردن بە بەکارهێنانی یان چەوساندنەوە و داپڵۆسین و رێگەگرتن لە گەشکردن و پێشکەوتنی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی ئاشتییانەی کوردستان لەسەر بناخەی ئاشتی و ئاسایش و دۆستایەتی و دراوسێتی باش لەگەڵ گەلە دراوسێکاندا، هەرێمی کوردستان بۆی هەیە بە بڕیاری پەرلەمانی هەرێمی کوردستان لە عێراق جیاببێتەوە و دەوڵەتی سەربەخۆی پێکبهێنێت.

---

54- S/RES/688 (1991)

٥٥- بڕوانە: بڕیار و راسپاردەکانی دانیشتنی چل و چوارەمینی ئەنجومەنی نوێنەران لە وەرزی تەشریعی یەکەم، ساڵی تەشریعی یەکەم.

هیچ دەوڵەتێکی دەرەکیی بۆی نییە بە کردەوە لە ناوەوەی عێراق و هەرێمی کوردستان دەست لە سەربەخۆیی هەرێمی کوردستان وەربدات. پرسی جیابوونەوەی هەرێمی کوردستان پرسێکی ناوەخۆییە لەنێوان عێراق و هەرێمی کوردستانە.

لە رووی یاسایی نێودەوڵەتییەوە پرسی جیابوونەوە لە دەوڵەتی ناوەندیی پرسێکی ناوەخۆییە و نێودەوڵەتی نییە. بۆیە هەر دەستێوەردانێکی دەرەکیی بە دەستێوەردان لە کاروباری دەوڵەتێکی سەربەخۆ دەزانرێت. چونکە دروستبوونی یەکیەتیی فیدراڵی و هەڵوەشاندنەوەی و جیابوونەوەی یەکەکانی بابەتێکە، کە دەستووری هەر وڵاتێك رێکی دەخات، نەوەك یاسای نێودەوڵەتی.

لە ٢٠٠٨/٢/١٧ پەرلەمانی کۆسۆڤۆ بە یەکلایەنە سەربەخۆیی کۆسۆڤۆی راگەیاند. تا ئێستە نێزیکەی ٩٠ دەوڵەت دانیناوە بە دەوڵەتی سەربەخۆیی کۆسۆڤۆدا.

دادگەی دادی نێودەوڵەتی لەم رووەوە ئاماژەیکرد، کە راگەیاندنی یەکلایەنەی سەربەخۆیی کۆسۆڤۆ لە ٢٠٠٨/٢/١٧ ((پێشێلکاری نییە بۆ یاسای نێودەوڵەتی گشتی، چونکە یاسای نێودەوڵەتی راگەیاندنی سەربەخۆیی قەدەخەنەکردووە))[٥٦].

ئەم بەڵگانەی لای خوارەوە داواکاری راگەیاندنی سەربەخۆیی و جیابوونەوەی کوردستان بەهێزتر دەکەن لە بەردەم کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا:

١- دەوڵەتێکی کوردی جۆرەکانی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ و ئەنجامدانی تاوانی جەنگ و تاوانی دژی مرۆڤایەتی و تاوانی جینۆساید، کە چەندەها جار لەم خاکەی کوردستان تووشی بەشێکی مرۆڤایەتی بوون دووردەخاتەوە و بنبڕیان دەکات. ئەمەش لە سوودی کومەڵگەی نێودەوڵەتییە، کە خەمی سەرەکی پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتییە.

٢- پرینسپی دەستنەخستنە کاروباری ناوەخۆوە و پاراستنی یەکیەتیی خاکی دەوڵەت لە یاسای نێودەوڵەتیدا تەنیا بۆ دەوڵەتە بیانییە دەرەکییەکانە و یەکە فیدراڵییەکان ناگرنەوە.

56- **ICJ**: Accordance with international law of the unilateral declaration of independence in respect of Kosovo: General List No.14/ 22 July 2010. see http://www.icj-cij.org/docket/files/141/15987.pdf

٣- پرەنسیپی مافی بڕیاردانی چارەنووس کە بووەتە پرەنسیپێکی نێودەوڵەتی مولزەم Jus cogens هەموو گەلان دەگرێتەوە، نەوەك هەر گەلانی کۆلۆنەکان[٥٧].

٤- بەپێی دیباجەی دەستووری عێراق یەکیەتیی نێوان پێکهاتەکانی عێراق ئازادانەیە، کەواتا دەکرێت بە ئازادیش پێکهاتەی کورد لە هەرێمی کوردستان لەو یەکیەتییە بکشێتەوە.

## ٤- پێوەری هەرێم/خاك/ (الاقلیم Territory)

### ١- چەمکی هەرێم:

هەرێمی دەوڵەت برێتییە لەو رووبەرە خاکە و ئـەوەی لـە بنیدایـە و ئاسمانەکـەی، کـە دەسەڵاتێك سەروەریی خۆی بـە شـێوەیەکی هەمیشـەیی و بـەردەوام بەسـەریاندا و بـە سـەر دانیشتووانەکەیدا پیادەدەکات.

**هەرێم لە سێ بەش پێکدێت:**

١- زەوی وشکایی و پێکهاتە سرووشتییەکەی وەك چیا و دەریاچە و رووبار.

٢- دەریای هەرێمی لە دەوڵەتە کەنارییەکان، کە ئەو بەشەی دەریایە دوای کـەنارەکانی دەوڵەت دێن بە مەودایەکی دیاری کراو بەرەو بەرزاییکانی دەریا.

٣- چینە ئاسمانییەکان کە بەسەر خاك و دەریای هەرێمی دەوڵەتەوەن تا ئـەو سـنوورەی تێیدا ئاسمان دەستپێدەکات بە بەرزایی ١٠٠- ١١٠ کیلۆمەتر لەسەر ئاستی رووی دەریاوە.

دەوڵەت بەپێی یاسـا و رێسـاکانی هەرێمەکـەی "خاکەکـەی" دەکاتـە چـەند یەکەیـەکی کارگێڕی ناوچەیی و بۆ هەر یەکێکیان سیستەمی یاسایی گونجاو دادەنێت.

دەوڵەت بەپێی پرەنسیپی سەروەری هەرێمی ئەرکی خۆی دەبینێ لە پیادەکردنی دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکاری و دادوەریی تەواو بەسـەر هەرێمەکەیـەوە و مـافی هەیـە بـۆ هـەر هـەرێمێك یـان بەشـێکی سیسـتەمێکی یاسـایی دابنـێ، بەشـێوەیەك بگـۆنجێ لـە کـەل

---

٥٧- دادگەی دادی نێودەوڵەتیی پرەنسیپی بڕیاردانی چارەنووسی گەلان بە پرەنسیپێکی مولزەمی دەزانێت سەبارەت بە هەموو گەلان. بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە:
ICJ: CASE CONCERNING EAST TIMOR(PORTUGAL *v.* AUSTRALIA): Judgment of 30 June 1995

بەرژەوەندییەکانی و بەرژوەندیی ئەو گەلەی لەسەری دەژی. ئەم مافەش هیچ شتێك کۆتبەندی ناکات تەنیا ئەو ئیلتیزاماتانە نەبن کە دەوڵەت دەیانگرێتە ئەستۆ بەپێی پەیمانی نێودەوڵەتی مۆرکراو و لەسەر بنەمای یەکسانی و ویستی ئازاد.

مەرج نییە هەرێمەکە بەیەکەوە لکاو بێت یان رووبەرێکی دیاریکراوی هەبێ. دەبینین دەوڵەت هەیە دەکەوێتە سەر دوورگەگەلێکی جیاجیا وەك ژاپۆن و فیلیپین و ئەندەنووسیا. دەوڵەتی دیکەش هەن رووبەری هەر یەکەیان چەند کیلۆمەترێکە وەك کۆماری سانمارینۆ و میرنشینی مۆناکۆ . مەبەست لە مەرجی بوونی رووبەرێکی دیار بۆ ئەوەیە بەکاربێت بۆ پیادەکردنی دەسەڵات بەسەر دانیشتوواندا. لە یاسای نێودەوڵەتیدا هیچ پێوەرێك نییە بۆ دیاریکردنی رووبەری هەرێمی دەوڵەت. دەبینین لە بارێکدا تەنانەت ئەگەر جیاوازییەکیش هەبێ لەنێوان دەوڵەت و دراوسێیەکانیدا سەبارەت بە دیاریکردنی سنوورەکەی دەکرێ دان بە دەوڵەتەکەدا بنرێ مادامێك لەوێ دەسەڵاتێك هەیە سەروەریی خۆی بەسەر دانیشتووان و هەرێمدا پیادەدەکات. بۆ نموونە ئەلبانیا پێش شەڕی یەکەمی جیهانی دەوڵەتێك بوو لە لایەن چەندین دەوڵەتەوە دانی پێدانرابوو، هەرچەندە کێشەی دیاریکردنی سنووری هەبوو لەگەڵ دراوسێکانیدا. ئەوە وای نەکرد کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی گومان لە تەواوکاری توخمەکانی دەوڵەت بکەن بەلایەوە. هەروا یاساناسانیش گومانیان لەوە نەکرد.

بوونی قەوارەیەکی سەقامگیر لەناوچەیەکی دیاریکراودا مەرجێکی زەروورە بۆ پێکهاتنی دەوڵەت، هەرچەند جیاوازیش هەبێ سەبارەت بە سنوورەکەی، بەڵام نەبوونی هەرێم رێگرێکی سەرەکییە بۆ پێکهاتنی دەوڵەت. بۆ نموونە دەوڵەتی فەڵەستین، کە لە جەزائیرساڵی ١٩٨٨ جاڕدرا دانی پێدانەنرا، چونکە رێکخراوی رزگاریخوازی فەڵەستین دەسەڵاتی نەبوو بە سەر هیچ بەشێك لەو بەشانەی کە بە خاکی فەڵەستین دایدەنا.

دادوەر هوبێر huber لە کێشەی دوورگەی پاڵماس lsland of Palmas Case ئاماژەیداوە، کە ئەو سەروەرییەی پێوەستە بە دابەشکردنی گۆی زەمین مەرجی یاسایی پێویستە بۆ لکاندنی بەشێك لەو رووبەرە بە هەرێمی هەر دەوڵەتێکی دیاریکراوەوە[٥٨]. ئەمەش واتە ئەگەر قەوارە بەبێ سەروەری بێت ناکرێ هیچ بەشێك لە هەرێمی دەوڵەتی بخرێتە پاڵ.

58- Island of Palmas Case (The Netherlands v United States) See United Nation Reports on International Arbitral Awards 2 (1920) 829, Huber Sole Arbitral.

### ٢- سرووشتی یاسایی هەرێم:

ئاشکرایە یاسای نێودەوڵەتی لەسەر بنەمای دەوڵەت بونیادنراوە. دەوڵەتیش بونیادە لەسەر نۆرمی سەروەری کە لە رووی نێوەخۆییەوە گوزارشت لە بالادەستی یاسا نێوەخۆییەکانی دەوڵەت دەکات و لە رووی دەرەکیشەوە گوزارشت لە سەربەخۆیی ئەو دەکات وەك کەسێکی یاسایی، بەڵام خودی سەروەریش و هەرچییەك ماف و ئەرکی یاسایی تیایە لەسەر هەقیقەتی هەرێم بونیادنراون. بۆیە بەبێ بوونی هەرێم کەسی یاسایی ناتوانێ ببێتە دەوڵەت. چونکە هەرێم ئەو بنەما مادییەی دەوڵەت پێکدێنێ، کە رەنگدانەوەیە لە سەروەری و سەربەخۆیی ئەو گەلەی خاوەنی هەرێمەکەیە و خۆی بە تەنیا مافی چەسپاوی هەیە مامەڵەی لەگەڵ بکات. بۆیە هەرێم بە تایبەتمەندیی سەرەکی دەوڵەت دادەنرێ. ئێستە لە جیهانی ئیمڕۆدا نێزیکەی ٢٠٠ یەکەی هەرێمی جیاجیا هەن، هەر یەکەیان خاوەن سەروەرییەکی هەرێمی و دەسەڵاتێکی یاسایی جیاوازن لەوی تر.[٥٩]

سەروەریی هەرێمی لایەنی ئەکتیڤ و نەگەتیڤیشی هەیە. لایەنە ئەکتیڤەکەی پێوەندی هەیە بە قەدەخەکاری (ممانعە) دەسەڵاتی دەوڵەت لەسەر هەرێمەکەی، بەڵام لایەنی دووەم خۆی متداوە لە ئیلتیزامی دەوڵەت بەرامبەر بە پاراستنی مافی دەوڵەتەکانی تر.

---

٥٩- جگە لەو ١٩٤ دەوڵەتەی، کە ئێستا ئەندامن لە نەتەوە یەکگرتووەکان ((٢٠١٢\٦\٢٦)) چەند قەوارەیەکی یاسایی هەیە دانیان پێدانەنراوە وەك دەوڵەت لە لایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە. یاساناسیی رۆژئاوایی ناوی لێناون" هەرێمە نێودەوڵەتییەکان International Territories". ئەم هەرێمانە هەر یەکە شێوە سیستەمێکی نێودەوڵەتی جیاوازی هەیە و پێوەری دروستبوونی هەر یەکێکیان لەوی تر جیایە. هەندێکیان بریتیین لە هەرێمی ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆدا وەك هۆنگ کۆنگ و هەندێکی دیکەیان قەوارەی سەربەخۆن وەك تایوان.

دەستەواژەی "هەرێمی نێودەوڵەتی" خۆی بۆ خۆی ناوەڕۆکێکی یاسایی نێودەوڵەتی نییە. سروشت و شایستەیی یاسایی هەر قەوارەیەکی لەم جۆرە دەوەستنە سەر ئەو بارودۆخەی، کە تێیدا پێکهاتوون و بەردەوام دەبن. دەبینین هەندێ لەم قەوارانە کەسایەتی یاسایی سەربەخۆییان هەیە و هەندێکی دیکەیان ئەو تایبەتمەندییە یاساییەیان وەدەست نەهێناوە.

بیجگە لە هۆنگ کۆنگ و تایوان وەك نموونە دەتوانین ئاماژە بە ئیدارەی قوبرسی تورکی و کۆماری سەحرای رۆژئاوا بکەین.

رەگوریشەکانی نۆرمە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بەسەروەریی هەرێمی دەچنەوە سەر ئەحکامەکانی یاسای رۆمانیی تایبەت بە خاوەنداریتی. ریزبەندیی جۆرەها شێوازیش بۆ وەرگرتنی موڵکداری درێژەپێدانێکە بۆ نۆرمەکانی ئەم یاسایە لەمەڕ بابەتەکە. ئەمەش هەندێ شلەژاندنی نایەوە لەناوەندە یاساییە هاوچەرخەکاندا، چونکە یاسا هاوبەندییەکی توندوتۆڵی هەیە بە ژیانی هاوچەرخەوە. بۆیە گواستنەوەی بۆ کۆمەڵگە خاوەن کولتوورییە جیاجیاکان کارێکی ئاسان نییە و پاشان شێوازە رۆمانییەکەی سەبارەت بە ریزبەندی شێوازەکانی وەرگرتنی هەرێم، لە کاتی پراکتیزەکردندا لە یاسای نێونەتەوەیی هاوچەرخ رووبەڕووی ئاستەنگ دەبێتەوە.

ئەو نۆرمانەی لە یاسا نێوەخۆییەکان و بڕیارە دادوەرییەکاندا هاتوون لەبارەی گواستنەوەی زەوی و بەڕێوەبردنی لە چوارچێوەی دەوڵەتێکدا زۆر بە وردی دادەڕێژرێن. چونکە لە یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکانی سامان لە کۆمەڵگە دەکۆڵێتەوە. بۆیە یاسای زەوی لە هەر دەوڵەتێکدا رەنگدانەوەیە بۆ هاوسەنگی هێز لەنێو کۆمەڵگەدا. دەبینین شێوازی خاوەنداریتی دەرەبەگایەتی لە هەندێ لە دەوڵەتەکاندا، بەتایبەتی لە دەوڵەتە ئەوروپاییەکاندا، پاشەکشەی کردووە و شوێنی چۆلکردووە بۆ ئەو شێوازە خاوەنداریتییە تایبەتەی، کە لەسەر ئابووریی ئازاد بونیادنراوە و چەندین لەو نۆرمە یاساییە گشتییەی داناوە، کە ماف و ئەرکی خاوەن سامان و کرێگرتەکانیان و گواستنەوەی خاوەنداریتی و وەرگرتنی زەوی رێکدەخات، بەڵام یاسای نێونەتەوەیی لە کێشەی خاك، واتا هەرێم بە هەمان ئەندازەی گشتگیری و وردی ناپێچێتەوە. لە ئاستی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا کۆمەڵە نۆرمێکی داناوە، کە لێ دەپێچێتەوە لە بارەکانی گۆڕینی سەروەری سەر هەرێم و شێوازەکانی بەڕێوەبردنی. ئەم نۆرمانە زۆرجار بە پێی سرووشتی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی رۆڵی پێدانی شەرعییەت دەگێڕێ بە بەرئەنجامەکانی پیادەکردنی دەسەڵات. بۆیە نەبوونی دەسەڵاتێکی ناوەندی بەهێز لە یاسای نێودەوڵەتیدا وایکردووە زیاتر لەوەی لە یاسای نێوەخۆییدا باوە، تەرکیز بخرێتە سەر ئەو شێوازانەی وا دەکەن یاسا بگونجێنرێت لەگەڵ دەسەڵات و هێز و دەستڕۆیی.

گۆڕینی خاوەنداریتیی هەرێم لە یاسای نێودەوڵەتیدا دەبێتە هۆی گۆڕینی سەروەری و گۆڕینی ئەو دەسەڵاتە یاساییەش، کە حوکمی هەرێم دەکات. پاشانیش لە بەرئەنجامی ئەوەدا دەبێت رەگەزنامەی دانیشتووانی ناوچەکە بۆ رەگەزنامەی سیستەمی یاسایی نوێ بگۆڕدرێت. پێوەندییەکانیان کە زۆرینەی لایەنەکانی ژیان دەگرنەوە گۆڕینیان بە سەردا دێت وەك کارکردن

و پـەروەردە و تەندروسـتی و هاتوچـۆ و ژنهێنـان، بـەڵام گـۆڕینی خـاوەن زەوی لـە یاسـای نێوەخۆییدا نابێتە هۆی ئەوجۆرە گۆڕانکارییانە، بۆیە یاسـای نێونەتـەوەیی لـە هـەموو ئـەو کاریگەرییانەش دەکۆڵێتەوە، کە لە ئاکامی گـۆڕینی سـەروەریی هـەرێمی دەبنـەوە و تـەنیا گرینگی نادات بە میکانیزمی وەرگرتنی خاوەندارێتی یان نەبوونی.

**٣- وەرگرتنی خاوەندارێتی هەرێم:**

یەکێك لـەو تایبەتمەندییـە گرینگانـەی پێویسـتە ئامـاژەی پـێ بـدرێ، کـە سـەرلەنوێ جەختدەکاتە سەر جیاوازی نێوان هەڵوێستی یاسای نێونەتەوەیی و هەڵوێستی یاسای نێوەخۆی سەبارەت بە هەرێم ئەوەیە، کە خاوەندارێتیی هەرێم بەپێی یاسای نێونەتـەوەیی زۆر جـار بـە رێژەیی دادەنرێ، کەچی لە یاسای نێوەخۆییدا بە رەها دادەنرێ. دەبینین دادگەی نێونەتـەوەیی کاتێك بیەوێ بڕیاربدات لەسەر ئـەوەی خاوەنـدارێتی پارچـە زەوییـەك، بـەپێی یاسـا، بـۆ چ دەوڵەتێك لە دوو دەوڵەتی خاوەن کێشەیەك دەگەڕێتەوە، دەبێ لە هـەموو ئـەو دۆکومێنتانـە بکۆڵێتەوە، کە دەخرێنە پێشی و پاشان لەبەر رۆشناییان بڕیار دەربکات و زەوییەکە بداتە ئەو دەوڵەتەی دۆکومێنتی باشتر دەخاتەڕوو[٦٠]، بەڵام لە یاسای نێوەخۆییدا قەواڵـەی خاوەنـدارێتی زەوی بەڵگەی یەکلاکەرەوەی هەر لایەنێکە کە ئەو مەرجانەی تیایە بۆ خاوەندارێتی زەوی یان خاوەندارێتی، کە یاسا دەیانخوازێ. لەم روانگەیەوە خاوەندارێتی لە یاسای نێوەخۆییدا بە رەها دادەنرێ. بۆیە لێرەدا مەسەلەکە ناخوازێ هەقیقەتەکان شرۆڤە بکـرێن بـۆ زانـینی ئـەوەی چ لایەنێك دۆکومێنتی باشتر دەخاتەڕوو بۆ سەلماندنی خاوەندارێتی.

---

٦٠- کەمبۆدیا بەو پێیەی جێگری فەرەنسا بوو لە رووی وەرگرتنی سەروەرییەوە بەسەر ناوچەیەکدا، کە پەرستگەی پریاه ڤیهاری Temple of Preah Vihear تێدا بوو داوای ئەو ناوچەیەی لە تایلاند کرد.
یەکێك لەو بەڵگانەی کەمبۆدیا پشتی پێ بەست لە بردنەوەی داواکەی لە پێش دادگەی دادی نێودەوڵەتی لە ساڵی ١٩٦٢ نەخشەیەکی کۆن بوو، کە لە ساڵی ١٩٠٧ دانرابوو. بە پێی ئەم نەخشەیە، کە کاتی خۆی نێردرابوو بۆ سیام "تایلاندی ئێستە" پەرستگەکە کەوتبووە نێو خاکی فەرەنساوە، کە کەمبۆدیا کۆلۆنیێکی بوو ئەو کاتە.
لە سەر ئەم بنەمایە دادگەکە بڕیاریدا، کە ئەو ناوچەیەی پەرستگەکەی لێیە بەشێکە لە خاکی کەمبۆدیا.
بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
M.Dixson & McCorquodale, Cases & Materials on International Law 3rd Eden, London.2000, P.263

پرسی وەرگرتنی خاوەندارێتیی هەرێم لە یاسای نێودەوڵەتیدا مەسەلەیەکی ئالۆزە. ئەمە وایکردووە یاساناسان بە پلەی یەکەم لە روانگەی یاسایی سیاسییەوە لێی بکۆڵنەوە[٦١]. بۆ نموونە ئەو دەوڵەتانەی لە مێژەوە دامەزراون دەکرێ لە پرسی وەرگرتنی هەرێمەکەیان لەسەر بنەمای پێزانینی فرەوان و وەرگرتنیان لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا چاوپۆشی لێ بکرێ، بەلام دەوڵەتە تازە پێکهاتووەکان لەم بارەیەوە ڕووبەڕووی کێشەیەکی جیددی دەبنەوە.

دەبینین بە پێی یاسای تەقلیدیی نێودەوڵەتی پێش پێکهاتنی دەوڵەت کەسێکی یاسایی نێونەتەوەیی کارامە نییە بۆ وەرگرتنی خاوەندارێتیی هەرێم. سەرەڕای ئەوەش شێوازە تەقلیدییەکانی خاوەندارێتیی هەرێم هەموو لایەنەکانی مەسەلەی وەرگرتنی ئەو هەرێمە نوێیانە ناگرنەوە، کە لە پاش دووەمین شەڕی جیهان سەریان هەڵدا لە بەرئەنجامی لەناوبردنی کۆلۆنیالیزم و هەرەسی یەکەتیی سۆڤیت و یۆگۆسلاڤیای پێشوو. کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی لەم سەردەمەدا دەڕوانێتە کێشەی دەوڵەتە تازەکان لە روانگەی پێزانینەوە پێیان لە جیاتی گۆشەنیگای وەرگرتنی خاوەندارێتیی هەرێمەوە. ئەمەش واتە دەوڵەتەکان پێش ئەوەی پێزانین بلاوبکەنەوە بە قەوارەی نوێ وەك کەسێکی یاسای نێودەوڵەتی لەو مەرجانە دەکۆڵنەوە، کە بەکردەیی لە قەوارە پێوەندیدارەکەدا هەن. بۆیە یاساناسەکان تەنیا کەمێك دەپێچنەوە لەو شێوازانەی، کە بەگوێرەیان قەوارەی نوێ مافی یاسایی خۆی وەردەگرێ لەسەر خاکەکەی.

---

٦١- ئێمە لێرەدا باس لە هۆکارەکانی وەرگرتنی هەرێم لە یاسای نێودەوڵەتی باودا ناکەین، کە کردوونی بە پێنج بەشەوە و بریتین لە دەستگرتن بە سەرداو بەسەرچوون لە رووی کاتەوە و سازشکردن و پێوەلکاندن و زیادەبوون.

لێکۆڵینەوەکەمان کێشەی خاوەندارێتی هەرێم "خاك" دەگرێتەوە لە لایەن ئەو دەوڵەتانەوە، کە تازە پێکدێن لە روانگەی یاسای نێودەوڵەتییەوە و لە میانەی هەڵسانی دەوڵەتی پێوەندیدار بە پیادەکردنی دەسەلاتە یاساییەکانی لە چوارچێوەی هەرێمەکەیدا، واتا پیادەکردنی سەروەری هەرێمی خۆی و رێگەنەدان بە دەوڵەتانی دی دەسکاری بکەن. بۆ زانیاری دەربارەی هۆکارەکانی وەرگرتنی هەرێم لە یاسای نێودەوڵەتیدا بڕوانە:

د. محمد طلعت الغنيمي: الاحكام العامة في قانون الامم ١ قانون السلام ــ منشاة المعارف بالإسكندرية: ص ٦٦٥.

Шишков: Международно публично право Софи.2000. .ctp.226
Rebecca M. Wallace, International Law 4th Eden, London .2002, P. 90

ئەوان لە جیاتی ئەوە تەرکیز دەکەنە سەر بوونی پێوەری کردەیی بۆ پێکهاتنی دەوڵەت شان بە شان پێزانینی دەوڵەتەکانی تر پێیان.[62]

لایەنگرانی تیۆریی پێزانینی دروستکەر (المنشي) پێیـان وایـە هـەرێم، پـاش پێـزانین بـە دەوڵەتی نوێ دەبێتە هەرێمێك بۆ کەسێك لە کەسەکانی یاسـای نێونەتـەوەیی بـەبێ روانینـە چۆنێتی وەرگرتنەکەی. ئەم تیۆرییە جەختی کردۆتە سەر پێـزانین بـە قـەوارە نوێیەکـە، نـەك جەختکردنە سەر شـێوازەکانی وەرگرتنـی مـاف بەسـەر هـەرێمێکی دیـاریکراودا بەشـێوەی یاسایی. بۆیە دەبینین ئەوە لەسەر ئاستێکی فرەوان بەربڵاو نییە.[63]

دوو رێگەی سەرەکی هەن بۆ ئەوەی قەوارەی نوێ سەربەخۆیی وەدەسبێنێ وەك دەوڵەتێکی تازە، پاشانیش خاوەندارێتیی هەرێمەکەی وەربگرێت. یەکەمیان رێگەی دەستوورییە، ئـەویش برێتییە لە رێککەوتن لەنێوان ئیدارەی پێشـوو و لـەنێوان قـەوارە نوێیەکـە بـۆ گواسـتنەوەی دەسەڵات لە هەرێمە پێوەندیدارەکەوە بە شـێوەیەکی ئاسـاییانە و ئاشـتییانە. لـەم حاڵەتـەدا قەوارەی نوێ بەپێی ئەحکامـە دەسـتوورییەکانی دەوڵـەتی پێشـوو سـەربەخۆیی وەردەگـرێ. ئەویش یان بە رێگەی بەستنی رێککەوتننامەیەك لەنێوان دەسەڵاتی پێشوو و ئەو دەسـەڵاتەی نوێنەرایەتی قەوارەی پێوەندیدار دەکات یانیش بە رێگـەی دەرکردنـی یاسـایەکی نێوەخـۆیی پەتی لەلایەن دەوڵەتی پێشووەوە سەبارەت بە راگەیاندنی سەربەخۆیی قەوارەی پێوەندیدار. لە گەلێك باریشدا هاوگونجان دەکرێ لەنێوان هەردوو جۆرەکە لە رێگەی گرتنەبەری هەنـدێ رێ و شوێن بۆ وەرگرتنی سەربەخۆیی. بۆ نموونە رێککەوتن کرا لەسـەر سـەربەخۆیی بۆرمـا بـەپێی رێککەوتننامە و پەیماننامەیەکی بۆرمی ـ بەریتانی لە هەردوو مانگی حـوزەیران و تشـرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٤. پاشانیش پەرلەمانی بەریتانیا دواتر لەهەمان ساڵدا یاسایەکی دەرکرد بۆسەربەخۆیی بۆرما و لە رێکەوتی٤/١/١٩٤٨ سەربەخۆیی درایە بۆرما.[64]

بەپێی شێوازی وەرگرتنی سەربەخۆیی بەگوێرەی ئەحکامی دەستووری لە دەوڵەتی پێشوودا پرۆسێسی وەرگرتنـی سـەربەخۆیی چ بـە رێککەوتننامەیـەك بـێ لـەنێوان هـەردوو لایـەنی

62- See Oppenheim s International Law 9th Eden 1992, by Sir R. Jennings and Sir A. Watts, P.677

63- J. G. Starke, "The Acquisition of Title to Territory by Newly Emerged States", 41 British Yearbook of International law, 1965 6, P. 413

64- M.N Shaw, the Title to Territory in Africa: International Legal Issues, Oxford, 1986, p.168

پێوەندیدار یان بە دەرکردنی یاسایەکی نێوەخۆیی تایبەت بێ وەك پرۆسەیەکە بۆ گواستنەوەی بێدەنگی خاوەندارێتیی هەرێمی پێوەندیدار لە دەوڵەتی پێشووەوە بۆ دەوڵەتی نوێ.

دووەمین شێوازیش بۆ وەرگرتنی سەربەخۆیی هاودژی شێوازی یەکەمە، واتا بەرجەستەیە لەوەی قەوارەی نوێ شێوازی نادەستووری بەکاربێنێ و زۆر جاریش هێز بۆ وەرگرتنی سەربەخۆیی و راگەیاندنی خۆی وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ دژ بە ئیرادەی دەوڵەتی پێشوو.

جا ئەگەر چەند دەوڵەتێکی تر دانیان بە قەوارەی نوێدا نا وەك دەوڵەتێك، کە تەواوی مەرجەکانی هەیە بە پێی یاسای نێونەتەوەیی، ئەوا لە گەلێ حاڵەتدا دەوڵەتە پێشووەکە، کە بەڕێوەبردنی هەرێمی پێوەندیداری لە ئەستۆبووە دواتر ناچاردەبێت رێککەوتننامەیەك لەگەڵ دەوڵەتە نوێیەکە ببەستێ بۆ پێزانین بە پێگە یاساییە تازەکەی چ ئەو سەربەخۆییەی ودەستهێنابێ لە رێی جیابوونەوەوە یان بە رێگەی شۆڕش و بەپێچەوانەی ئارەزووی دەسەڵاتی پێشوو.[٦٥]

لای گریمانەی دووەم، کە بەرجەستەیە لەوەدەستهێنانی دەوڵەتی نوێ بۆ سەربەخۆیی بە پێچەوانەی ویستی دەوڵەتی پێشوو چەند راستییەکی نوێ سەرهەڵدەدەن و وا دەکەن قەوارە تازەکە رازی بێت بە داخوازییە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە پێکهاتنی دەوڵەت وەك دانیشتووان و هەرێم و حکوومەت لەلایەك و گەرەکە دەوڵەتەکانی تر لەلایەکی دیکەوە بڕیاری ئەوە بدەن ئایا دان بەدەوڵەتە نوێیەکەدا دەنێن یان نا وئایا ئەو بەرئەنجامانە قبووڵ دەکەن، کە لەم پێگە یاساییە نوێیەوە کەوتۆتەوە یان قبووڵی ناکەن.

پرەنسیپیی مافی بڕیاردانی چارەنووس پێوەندییەکی توندوتۆڵی هەیە بەم مەسەلەیەوە. ئەم پرەنسیپە دوولایەنی هەیە: لایەنی دەرەکی، کە بەرجەستەیە لە مافی هەرگەلێك بچێتە پاڵ دەوڵەتێکی تر یان دەوڵەتێکی سەربەخۆ پێکبێنێ. لایەنە نێوەخۆییەکەش بەرجەستەیە لە هەڵبژاردنی سیستەمی حوکمڕانی خۆی بە ئارەزووی خۆی. ئەگەر ئێمە لە روانگەی هەرێمەوە بڕوانینە مەسەلەکە دەبینین لایەنی دەرەکی گرینگییەکی گەورەتر وەردەگرێ. دەبینین کاتێك گەلی پێوەندیدار بڕیاردەدات بچێتە پاڵ دەوڵەتێکی تر یان دەوڵەتەی سەربەخۆی جیای خۆی پێکبێنێ لە هەمان کات بڕیاریش لەسەر ئەو مەسەلەیە دەدات، کە هەرێمەکەی بخاتە پاڵ هەرێمی دەوڵەتێکی تر یانیش هەرێمەکەی بکاتە هەرێمی دەوڵەتێکی جیای تایبەت بەخۆی،

---

65- P. Greig lnternational law. 2nd ed, London 1967 p 156

بەڵام ئەمە ئەو زەروورەتە رەتناکاتەوە، کە هەندێ فاکتەری گرینگی تر هەبن جگە لە گەل بۆ پێکهێنانی دەوڵەت وەك هەرێمێکی دیاریکراو و توانای بەستنی پێوەندیی یاسایی بۆ ئەوەی قەوارە تازەکە بە دەوڵەت بژمێردرێ بەپێی یاسای نێونەتەوەیی هاوچەرخ.[٦٦]

بەپێی یاسای نێونەتەوەیی ناکرێ ئەو قەوارەیەی هێشتا نەبۆتە دەوڵەت موڵکییەتی هەرێم وەربگرێ، چونکە نەبۆتە کەسێکی یاسایی نێونەتەوەیی تاوەکو موڵکییەتی یاسایی هەرێمەکەی هەبێ. بۆیە ئەگەر ویسترا پرۆسێسی وەرگرتنی موڵکییەتی هەرێم بزانرێ پێویستە یەکەمجار ئاماژە بە بوونی دەوڵەتێکی پێکهاتوو بدرێ. لەم رووەوە چەند بۆچوونێك هەن لەبارەی شرۆڤەکردنی ئەو مەسەلەیە. یەکێك لە تیۆرییەکان جەختیان کردۆتە سەر دروستبوونی واقیعی(Factual Emergences )ی دەوڵەتی تازە و پێی وایە لەبەرئەوەی

---

٦٦ لەساڵی ١٩٤٥ ـەوە کۆمەڵە دەوڵەتێك پێکهاتوون، کە بەشەکانی ١١ و١٢ و١٣ ی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان نەیانیگرتۆتەوە. واتە پێشتر کۆڵۆن نەبوون، ئەمانەش ئەم دەوڵەتانەن: سینیگال ساڵی(١٩٦٠) و سەنگاپور ساڵی ١٩٦٥ و بەنگلادیش ساڵی ١٩٧١ و هەرسێ دەوڵەتەکانی بەڵتیق - لاتفیا و لیتوانیا و ئەستونیا ساڵی ١٩٩١ و ١١ دەوڵەت، کە لەیەکێتی سۆڤێتی پێشوو بوونەوە، ئەوانیش هەر یەکە لە ئەرمینیا و ئازەربایجان و بیلۆرووسیا و جۆرجیا و کازاخستان و قیرغستان و مولْدافیا و تاجاکستان و تورکمانستان و ئۆکرانیا و ئۆزبەکستان ساڵی ١٩٩١ هەروەها ٧ دەوڵەتیش لە یۆگۆسلاڤیای پێشوو بوونەوە، ئەوانیش ئەمانەن: سلۆڤینیا و مەکەدۆنیا و کەرواتیا و بۆسنا-هیرسۆکوگۆڤینا لە ساڵی ١٩٩١-١٩٩٢ و سربیا و مونتینیگرۆ ساڵی٢٠٠٦ کۆسۆڤۆ لە ٢٠٠٩ و کۆماری چیك و کۆماری سلۆفاکیا ساڵی ١٩٩٣ و ئەریتیریا ١٩٩٣ . لە هەمان ئەم ماوەیەدا هەوڵی یەکلایەنەی زۆرێك لە کۆمەڵە ئەتنییەکان یان هەرێمی ناو دەوڵەتە سەربەخۆکان سەرینەگرت بۆ جیابوونەوە و وەرگرتنی سەربەخۆیی. لەوانە: تیبیت لە چین و کاتەنگا لە کۆنگۆ و بیافرا لە نایجیریا. هەروا هەر یەك لە کەشمیر و رۆژهەڵاتی پەنجاب لە هیندستان و هەردوو ویلایەتی کارین و شلن لە بۆرما و دەوڵەتی فیدرالی تورکی لە قوبرس و تەمیل ئیلام لە سیریلانکا و باشووری سوودان لە سوودان و خاکی سۆماڵ و باوگاینفیل لە بابوا نیوگینیا و کوردستان لە عێراق و تورکیا و ریپوبلیکە سربسکە لە هیرسۆگۆڤینیا و شیشان لە یەکیەتیی رووسی و ئەبخازیا و باشووری ئوسینیا لە جۆرجیا و ئەنجوان لە کۆماری کۆمۆرووسی ئیسلامی و قەوقازیا لە مۆڵدافیا و نگۆرنا ـــ گاراباغ لە ئەزربایجان و کۆماری یەمەنی دیموکراتی لە یەمەن. بۆ زانیاری فرەتر بڕوانە:

James Crawford. the Creation of States in lnternational law .2 eden Oxford, 2006 . pp 391 , 403

دەوڵەتەكانی تر رازین بە پێكهاتنی دەوڵەتە تازەكە لەسەر رووبەرە خاكێكی دیاریكراودا، پێویستە یاسای نێودەوڵەتی لەوە دوورتر نەڕوانێ، بگرە پێویستە واقیعی خاوەنداریێتی پەسەندبكات هەر لەكاتی سەربەخۆییەوە وەك بەڵگەیەك بۆ خاوەنداریێتیی یاسایی. ئەگەرچی ئەم چەمكە لە زۆرینەی بارەكاندا وەدەنگەوە دێ لەگەڵ هەڵوێستی دەوڵەتانی پێوەندیدار بە مەسەلەكەوە، بەلام ئەگەری ئەوە هەیە هەندێ كێشە دروست بن كاتێك ئەو خاوەنداریێتییەی كێشەی لەسەرە پێوەست بێت بە ناوچەیەكی بێ خاوەن و دواجاریش ئەستەمە وەلامی روون پەیدا بێ بۆ زۆرێك لە پرسە یاساییە نێونەتەوەكانی، بۆ نموونە وەك سەروەریی هەرێمی. هەروا بۆچوونێكی تر هەیە داوادەكات تیۆریی پێزانینی دروستكەر وەربگیرێ، كە ئەویش پێی وایە پێزانین واناكات تەنیا ببێتە هۆی پێكهاتنی دەوڵەتی نوێ لە كۆمەڵگەی نێونەتەوەیی، بگرە بە تەواوی دان دەنێت بە خاوەنداریێتی ئەو هەرێمەدا، كە لەسەری بونیادنراوە[٦٧]. ئەم هەڵوێستە رەخنەی لێگیراوە بەوەی كە پێشوەخت گریمانەی كردووە بۆ قبوولكردنی تیۆریی پێزانینی دروستكەر لە لایەن دەوڵەتەكانەوە لەم جۆرە حاڵەتانەدا. ئەمەش پرسێكە لەنێوان یاساناساندا ناكۆكیی لەسەرە.

بۆچوونێكی نوێ هەیە بانگەشەدەكات بۆ وەلاوەنانی ئەو نۆرمە كۆنەی، كە بە گوێرەی تەنیا دەوڵەتەكان سەروەریی هەرێمیان هەیە و داوادەكەن نۆرمێك پەسندبكرێ، كە رێ بدات بەو گەلەی دەسپێشخەری كردووە بۆ پێكەوەنانی دەوڵەتە سەربەخۆیەكەی، سەروەریی وەربگرێ بە سەر هەرێمەكەیەوە. پێڕەوكردنی ئەم شێوازە وادەكات وازبهێنرێ لەو مەسەلە تیۆرییە ئاڵۆزانەی تایبەتن بە پێزانین. دەبینین لە جاڕنامەی یاسای نێونەتەوەیی تایبەت بە پێوەندی دۆستانەی نێوان دەوڵەتەكان بە پێی دەستووری نەتەوە یەكگرتووەكان ساڵی ١٩٧٠دەڵێت: (( هەرێمی كۆڵۆن "موستەعمەرە " یان ئەو هەرێمەی ئۆتۆنۆمیی نییە بەپێی دەستوورەكە پێگەیەكی دابڕاو و جیاوازی هەیە لە هەرێمی ئەو دەوڵەتەی بەڕێوەی دەبات. ئەم پێگە دابڕاو و جیاوازەش بەپێی دەستوورەكە دەمێنێ تاوەكو گەلی موستەعمەرەكە یان هەرێمە ئائۆتۆنۆمییەكە پیادەی مافی خۆی دەكات لە بڕیاردانی مافی چارەی خۆنووسینی بە پێی دەستوورەكە، بەتایبەتی بۆ ئامانجی دەستوور و پرەنسیپەكانی))[٦٨]. وێرای ئەوەش ئەم

---

67- J .G. Starke The Acquisition of Title to Territory by Newly Emerged States,41 British Yearbook of International Law,1965 6 p.413

68- See The Namibia Case, International Court of Justice Rep.1971 ,PP.16,31

گریمانەیە تەنیا مەسەلەیەکە، کە مایەی مشتومڕە و دەبێ بەبێ کۆتایی بمێنێتەوە[٦٩].

چەندین جۆر کێشە هەن لە بارەی خاوەندارێتیی هەرێم لە یاسای نێودەوڵەتیدا. دەبینین هەندێ جار ناکۆکی لەسەر رەوشتی یاسایی خودی وڵاتەکە خۆی دەبێت، واتا هەموو بەشەکانی هەرێمی دەوڵەتێك دەگرێتەوە وەك سکاڵاکانی پێشووی مەغریب بەرامبەر موریتانیا، یانیش پێوەست دەبێ بە بەشێکی دیاریکراو لە سنووری دوو دەوڵەت یان زیاتر وەك سکاڵاکانی سۆماڵ لەبارەی باکووری رۆژهەڵاتی کینیا و باشووری رۆژهەڵاتی ئەسیووپیا. زۆر جاریش هۆی ناکۆکی لە بارەی هەرێم دەگەڕێتەوە بۆداگیرکاری تەقلیدی، یان لە چەمکی نوێوە هەڵدەقوڵێ لە یاسای نێودەوڵەتیدا وەك مافی بڕیاردانی چارەنووس یان لە بەرئەنجامی فاکتەری سیاسی و یاساییەوە سەرهەڵدەدا، وەك ئیمتیدادی جوگرافی و رەچەڵەکی مێژوویی و پێوەندیی ئابووری.

## ٤- سنووری نێودەوڵەتی:

### ١- چەمکی سنووری نێودەوڵەتی

سنووری دەوڵەتەکان، بەپێی یاسای نێونەتەوەی دادەڕێژرێن، بەتایبەتی بەپێی پەیماننامەی نێودەوڵەتی. بۆیە هەر دەوڵەتێك مافی هەیە تەواوی دەسەڵاتی، لە چوارچێوەی سنووری هەرێمەکەیدا، پیادەبکات بەگوێرەی یاسا و رێسا نێوەخۆییەکانی لەگەڵ رەچاوکردنی ئەو پرەنسیپ و نۆرمانەی لە یاسای نێودەوڵەتیدا پەسندکراون.

هەموو دەسەڵاتە سیاسی و یاساییەکان رەهەندی مادییان هەیە واتا: ئەو سنوورەیان هەیە، کە ناتوانن بیبەزێنن. دەبینین کاتێك هەرێم ئەو ئەرکەی دیاری دەکرێ، کە خزمەتی دەکات سنوور گرینگییەکی تەواو وەردەگرێ، چونکە کاریگەریی کارا دەکاتە سەر ژیانی هەموو خەڵکی.

سنوورە تەقلیدییەکان تەنیا برێتینین لە هێڵی سەر نەخشە. لەو خاڵەوە کە لێیەوە دەسەڵاتی سیاسی و یاسایی دەوڵەتێك کۆتایی پێدێ، دەسەڵاتی سیاسی و یاسایی دەوڵەتێکی تر دەست پێدەکات. ئەمەش مەسەلەیەکی گرینگە بۆ زانینی هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگەکان لە رووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و جوگرافی و مێژوویی و کولتووری و

---

69- M.N .Shaw, the Title to Territory in Africa: International Legal Issues, Oxford, 1986, PP.171-173

یاساییەوە. ئەگەر بڕوانینە سنوور، لە رووی یاساییەوە، دەبینین رۆڵ و گرینگیی بە بەردەوامی لە زیادبووندایە، چونکە ژمارەیەکی زۆر لە کێشەکان پێوەی بەستراون وەك: هاونیشتمانێتی و ناسنامە و ئینتیمای سیاسی و کۆچپێکردنی کەسەکان و پێکهاتنی دەوڵەت و کۆتایی پێهێنانی.

هەڵگرانی بیرورِا نەتەوەییەکان لە سەرەتای سەرهەڵدانی نەتەوەکان و پێکهاتنی دەوڵەتە نەتەوەییەکان لە ئەورووپادا سنووریان قۆستەوە بۆ تیفتیفەدانی هۆشیاری نەتەوایەتی و پەرەپێدانی بە لای گەلەکانیانەوە. دەبینین لە سەدەی نۆزدەهەمدا بایەخدان بە سنوور گەیشتە ئەوپەڕی، ئەوە بوو سنووریان گرێدا بە هەستی نەتەوایەتی و بۆنە ئاینییەکانیشەوە، تەنانەت کردیانە سونبولی نەتەوەیی.

سنوور هەستی دەروونی و بە تایبەتیش هەست و سۆز بەلای مرۆڤەوە دەورووژێنێ، تەنانەت تاکی مرۆڤی ئاساییش لەبارەی شوێنە کەسییە تایبەتییە دیاریکراوەکەی خۆی، واتا ماڵەکەی چوارچێوەی وێنایەکی لە مێشکدایە. ئەگەر کەسێك پێشێلی پیرۆزیی ئەم شوێنە دیاریکراوەی بکات بەبێ داوا و رەزامەندیی ئەو، ئەوا کاردانەوەیەکی دەروونی بەهێز لەلای دروستدەبێت و رەنگە بە بێزاری و دژایەتیش دەریبخات. دەوڵەتەکانیش هەمان هەڵوێست وەردەگرن بەرامبەر ئەو کردەوانەی زیان بە سنووریان دەگەیەنێ یان هەڕەشەیەکی راستەقینە یان وەهمی پێکدێنێ بۆ یەکە هەرێمییەکانیان. دەبینین لە سەدەی نۆزدەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە چاخی زێڕینی دەوڵەتە نەتەوەییەکاندا لە ئەورووپا، ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووان و بزووتنەوە سیاسییەکان بەشداری دەوڵەتەکانیان دەکرد لەم هەڵوێستەدا بەرامبەر بە سنوور. هەندێ لە شێوە سرووشتییەکانی سنوور، وەك نەخشەی شێوە جزمەی ئیتاڵیایی و روخساری مرۆڤی فەرەنسایی و دوورگە بەریتانییەکان بوونە هێمایەك بۆ نواندنی هەڵوێستی نیشتمانپەروەریانە و بە هەستی گەرم و گوڕەوە بەستران و ئاراستە کران بەرەو ئینتیمای نەتەوەیی و هەستکردن، کە پێشێلکردنی ئەم وێنایەی سنووری نەتەوەیی هەڕەشەیەکە بۆ دابڕینی بەشێك لە خاکی نیشتمان.[70]

کاتێك بزووتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی لە دژی ئیمپریالیزم سەریهەڵدا ئەم هەست و شعوورە لە بەرامبەر نیشتمانی دیاریکراو گواسترایەوە بەرەو جیهانی سێیەمیش. ئەو

70- Malcolm Anderson, Frontiers – Territory and state formation in the modern world, Polity Press Cambridge .1996, P.3-4

سنوورانەی کە زۆرینەیان دەوڵەتە کۆڵۆنیالیزمییەکان دایانڕشتبوو بوونــە دیــوارێکی مــادی و دەروونی سەرەڕای ئەوەی هێڵێکی سیاسی و جوگرافی بوون، کە گــەلانی جیهــانی ســێیەمیان جیادەکردەوە و وای لێهات دەستکاریکردنیان کاردانەوەیەکی نەتەوایەتی بەهێزی دەورووژان.

ئــەو پیرۆزییــەی دەوڵەتــە نەتەوەییــەکان بەخشــیبوویانە ســنوور زەروورنییــە بــەردەوام هاوبەندبێت لەگەڵ ژیانی سیاســیدا. دەبیــنین هەڵوێســت لــە بەرامبــەر ســنوور لــە دەوڵەتــە پیشەسازییە گەورەکان و بەتایبەتی لە وڵاتــە ئەوروپاییەکانــدا جــارێکی تــر گــۆڕا. چــونکە گواستنەوەی زانیاری و تاکەکان بە بەردەوام لــە ســنوورەکانەوە لــە گرینگیــی فســیۆلۆژیی و زانیاریی چاودێری توندی سنوورەکانیان کەمکردۆتەوە. وێڕای ئەوەش سنوور هێشــتا گرینگــی خۆی هەیە بۆ پاراستنی تایبەتمەندی ئابووری و کولتووری و یاسایی ئەو گەلانە.

ئەوی پێوەستیشە بە چۆنێتی چاوەدێریکردنی سنوور، ئەوا دەوڵەتەکان لە هەندێ قۆناخــدا هەڵوێستێکیان وەرگرتووە زیاتر سیفەتی نەرمی لەخۆگرتووە تاوەك ئەوهەڵوێستەی راســتەوخۆ دوای دووەمین شەڕی جیهان و لەسەردەمی بلۆکی سۆشیالیســتیدا زاڵبــوو، بــەڵام هەنــدێ لــە تەنگژەی نێونەتەوەیی وەك هەرەسهێنانی بــەرەی سۆشیالیســتی و لێکترازانــی یۆگۆســلاڤیا و شەڕی کەندا و ئەمانە هەموو پاڵیان بە هەندێ دەوڵەتانەوە نا لە ئەنجومــەنی ئــەورووپی رێ و شوێنی پاسەوانێتی پۆلیسی لە سنوورە هاوبەشەکاندا پیادەبکەن.

## ٢- دیاریکردنی سنووری نێودەوڵەتی و داڕشتنی:

ئەو سنوورەی هەرێمی دەوڵەت دیاری دەکات پێکاتووە لە سنووری گەردوونی وەهمیی بــە گوێرەی هێڵەکانی درێژی و پانی وەك هێڵی ٣٨، کە نێوان کۆریای باکوور و کۆریــای باشــوور جیادەکاتەوە، یان دەسکردە و دەوڵەتەکان بۆ داڕشتنی سنووری جیاکــەرەوە لــەنێوان خۆیانــدا کێشاویانە، وەك دانانی نیشانە و بازگە و تەڵبەند و ســەنگەر و هێڵــی ئەنــدازیاری و رێگــەی ئاسنین و یانیش سرووشتییە وەك زنجیرە چیا و رووبار و کەناڵی ئاو ودەریاچە و دەریا.[٧١]

هەندێ پرەنسیپیی گرینگ هەن لێژنەکانی تایبەت بەکێشەکانی سنووری نێودەوڵەتــەکان پێڕەویان دەکەن لە کاتی تەواوکردنی کارەکانیاندا، کە ئەمانەن:

---

٧١- بروانە علی صادق ابو هیف :یاسای نێودەوڵەتیی گشتی، الاسکندریە. ل ٢٤٤ هەروەها عصام العطیة: یاسای نێونەتەوەی گشتی. چاپی شەشەم، بەغدا، ١٩٩٨، ل ٣١٢.

١- بەشبەشنەکردنی ڕێگەکانی هاتووچۆ و شوێنە ئاینییەکان و قوتابخانەکان.
٢- ڕێزگرتن لە یەکیەتیی شارەکان.
٣- ڕێزگرتن لە ڕەوشی خێڵە کۆچەرەکان.
٤- ڕێزگرتن لە ڕەوشی دانەوێڵەی ناوەخۆ و بەشبەشنەکردنی زەوی کشتوکاڵی.[٧٢]

دیاریکردنی سنووری نێودەوڵەتی وەك فاکتەرێك لە فاکتەرەکانی ئاشتی و سەقامگیری و هەروا وەك دیاردەیەکیش لە دیاردەکانی سەربەخۆیی، یەکێکە لە بابەتە گرینگەکانی یاسای نێودەوڵەتی. لەم ڕوانگەیەشەوە دەوڵەتەکان پێش هەموو شتێك سنوورە نێودەوڵەتییەکەیان لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێکانیاندا دیاریدەکەن.

دیاریکردنی سنوور بە چەند شێوازێك ئەنجام دەدرێت. سەرنج دەدەین هەندێ جار دەوڵەتەکانی پێوەندیدار ڕێك دەکەون بۆ چارەسەرکردنی کێشەی سنوور بە پەیمانی ئاشتەوایی، کە بۆ کۆتایی پێهێنانی شەڕ دەبەسترێ. وەك پەیماننامە ئاشتەواییە مۆرکراوەکانی پاش هەردوو شەڕی یەکەم و دووەمی جیهان یان بە ڕێککەوتننامەی ئاشتیخوازیانەی تایبەت، دەوڵەتەکانی پێوەندیدار بڕیاردەدەن یان بە هەموارکردنی ئەو سنوورەی دانراوە یان دووبارە تێڕوانینی سنوورە دانراوەکانی نێوانیان لە بەر هۆکار و پاڵنەری تایبەت و بە مەرجی دیاریکراو. زۆرینەی ئەو سنوورە نێودەوڵەتییانەی ئێستە لەسەر ئەرز داڕێژراون بە گوێرەی ئەو دۆکومێنتە نێودەوڵەتییانە دیاریکراون، کە پەیمانە ئاشتەواییە ناسراوەکان پەسەندیانی کردووە. بۆ نموونە پەیمانی وێستفالیا ساڵی ١٦٤٨ و ڕێککەوتننامەکانی ڤیەننا ساڵی ١٨١٥ و پەیماننامەکانی ئاشتی لە ساڵانی ١٩١٩ و ١٩٤٧ ڕۆڵی گرینگیان هەبووە بۆ دووبارە چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی سنوور لەنێوان دەوڵەتە ئەوروپاییەکان و داڕشتنی ئەو سنوورانە لەسەر بناخەیەکی کۆمەڵی و فرەلایەنە، بەڵام پەیماننامەی نێودەوڵەتی تر هەبوو لە ئەورووپا و ناوچەکانی تری جیهان هێڵی سنووری نوێیان داڕشت بەپێی بەرژەوەندی خۆیان، یان ئەو هێڵە کۆنانەی کە پێیان وابوو، کە ناعادیلانەن داڕشتەوە، ئەمەش کێشە و ململانێ و پێکدادان لەنێوان دەوڵەتان و گەلاندا ورووژاند و دەورووژێنێ و هەمیشە فاکتەرێکە بۆ نائارامی و

---

٧٢- لە بارەی ئەوەوە بڕوانە. سمحوحی فوق العادە یاسای نێودەوڵەتیی گشتی دمشق ١٩٦٠. ل ٣٥٧ هەروا بڕوانە د. جابر ابراهیم الراوی کێشەی سنووری عێراق و ئێران و ململانێی چەکداری، چاپی یەك بەغدا ١٩٨٩ ل: ١٧٥

گرژی.[73] بۆ نموونە، بەپێی ڕێکەوتننامەی سایکس بیکۆ، کە لە ساڵی ١٩١٦ لەنێوان بەریتانیا و فەرەنسا بەسترا، هیلالی خەسیب و عێراق، بە کوردستانی باشووریشەوە، کە سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوون پێشی یەکەمین شەڕی جیهانی، دابەشکران بەسەر ئەو دوو دەوڵەتەدا، دواتر لەسەر بناخەی مەندات چەسپێنرا.

لە ئەنجامی ئەم ڕێککەوتننامەیە و هەڵوەشانەوەی پەیمانی سیڤەر (لە ١٠ / ٨/ ١٩٢٠ بەسترا) بە پەیمانی لۆزان ( لە ٢٤ / ٧/ ١٩٢٣بەسترا) کوردستان خۆی بە دابەشکراوی لەنێوان چوار دەوڵەتدا: تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا دیتەوە. بێگومان نهامەتی و نائارامییە سیاسییەکانی گەلی کوردستان، لەوساوە تاوەکو ئێستە، سەرچاوەی لەو پەیماننامە ناعادیلانەوە گرتووە.

دیاریکردنی سنووری نێودەوڵەتی بابەتێکی گرینگ پێکدێنێ لەو بابەتانەی، کە پەیمان و ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان لێی دەپێچنەوە. لەسەر ئاستی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە پەیمانی تایبەت بە هەرێمەوە هەن، کە ماف و ئیلتیزاماتێکی زۆریان لێ دەکەوێتەوە راستەوخۆ لەبارەی هەرێمی پێوەندیدار. گرینگترین نموونە لەم لایەنەوە پەیمانەکانی تایبەت بە دارشتنی سنوورن. ((Sir Humphrey Waldock)) لە یەکەم راپۆرتیدا لەبارەی ڕێککەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکانی ساڵی ١٩٦٨ بۆ میراتگری دەوڵەتەکان و حکوومەتەکان لە پەیماندا دەڵێت: " دیارە سەنگی بۆچوونەکان و مومارەسەکردن پێکەوە لە بەرژەوەندی ئەو بیرۆکەیەیە، کە دەڵێت ئەو سنوورەی بە گوێرەی پەیمان داڕێژراوە قابیلی دەسکاری نییە لە کاتی میراتگریدا. دیارە بۆچوونی یاساناسەکانیش کتومت وایە لە بارەی ئەم خاڵەوە. هەروەها پراکتیکی دەوڵەتەکانیش لە بەرژەوەندی مانەوەی سنوورە کێشراوەکانە بەپێی پەیماننامە بە شێوەیەك دێت، کە دەکرێ مرۆ بگاتە ئەو بەرئەنجامەی، کە ئەم پراکتیکە بۆتە نۆرمێکی یاسایی"[74]، ئەمەش بە هۆی مەیلی دەوڵەتەکانەوە دێ بۆ پاراستنی سەقامگیری نێودەوڵەتی. ئەوە بوو سنوور لەسەر ئەم بناخەیە داڕێژرا بەلای ئەو دەوڵەتانەی لە ئەمەریکای لاتینی سەربەخۆییان وەرگرت، وەك: کۆڵۆمبیا و فەنزویللا، کەپێشتر لەبن دەستی کۆلۆنیالیزمی ئیسپانیدا بوون. ئەم مەسەلەیە دیسان لە

---

٧٣ جیردهارد ڤان گلان. یاسا لە نێوان نەتەوەکاندا. بەشی دووەم عەرەباندنی وفیق زیدی، بیروت، ١٩٧٠، ل.٤٠

74- Yearbook. Of the International law Commission. 1968

بڕیاری ژماره"١٦" ی سەرۆكانی دەوڵەت و حكوومەتەكانی ڕێكخراوی یەكێتیی ئەفریقیا ساڵی ١٩٦٤ ، ڕەنگی دایەوە و هەموویان بەڵێنیان دا ڕێز لە سنووره كۆلۆنیالییەكان بگرن. لە بۆچوونی سێیەمی لیژنەی نێوبژیوانی تایبەت بە یۆگۆسلاڤیا لەبارەی سنووری نێودەوڵەتی نێوان سربیا لەلایەك و كەرواتیا و بۆسنیا—هیرسۆگۆڤینیا لە لایەكی تر، دەڵێت: "ئەو سنوورانەی پێشتر دانرابوون دەبنە سنووری كێشراوی نێوان ئەو دەوڵەتانە بەپێی یاسای نێودەوڵەتی ئەگەر بە پێچەوانەی ئەوە ڕێككەوتن نەكرێت. ئەم بەرئەنجامە لە پرەنسیپی ڕێزگرتن لە پێگەی یاسایی هەرێمەوەquo هەڵقوڵاوە بەتایبەتی پرەنسیپی uti possidetis ((پاراستنی ئەوەی وەدەستهاتووە))، كە ئیمڕۆ بە پرەنسیپێكی گشتی دادەنرێ لە یاسای نێودەوڵەتی هاوچەرخدا. [٧٥]

فرەوانبوونی پرەنسیپی uti possidetis لە لەناوبردنی كۆلۆنیالیزمەوە decolonization بۆ ئەوەی ئەو دەوڵەتە تازانەش بگرێتەوە، كە لە دەوڵەتە سەربەخۆكان جیابوونەتەوە، لەلایەن پراكتیكی نێودەوڵەتییەوە پشتگیری لێ كرا. ئەم پرۆسێسە لە ڕێگەی بە نێودەوڵەتیكردنی سنووره ئیدارییە ناوەخۆییەكان بە شێوەیەكی گشتیی دێتە ئەنجام. واتە بە گوێرەی سنووری یەكە ئیدارییەكانی ناو دەوڵەتی پێشوو سنووری دەوڵەتە تازەكان دیاریدەكرێن. بۆ نموونە سنووری ئیداری نێوان چیك و سلۆڤاكیا — هەردوو كەرتی دەوڵەتی چیكوسلۆڤاكیای پێشوو_بووە سنووری نێودەوڵەتی لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتە تازەیە بەپێی ڕێككەوتننامەی دابەشكردنی سنووری هاوبەش، كە لە ١٩٩٢/١٠/٢٩بەسترا. بێگومان جێبەجێكردنی ئەم پرەنسیپە بەستراوە بە هەلومەرجی تایبەت بە هەر بارێكەوە وەك داواكارییە مێژووییەكانی لایەنە پێوەندیدارەكان و هەڵوێستی دەوڵەتانی سێیەم و ڕێكخراوە نێودەوڵەتییەكان، بەتایبەتی ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان.

ئەگەر پرەنسیپی ڕێزگرتن لە مانەوەی سنووره بونیادنراوەكان بە ڕێككەوتن پیادەنەكرێ لەوانەیە سنوور بە چەند پرەنسیپێكی تری یاسای نێودەوڵەتی بچەسپێت، وەك ئەو ئەحكامانەی لەبرگە"٢" ی مادەی ٦٢ ی پەیماننامەی ڤیەننای تایبەت بە یاسای

---

٧٥- ئەم لیژنەیە لە سەرۆكەكانی دادگە دەستوورییەكان پێكهات لە هەر یەك لە ئەڵمانیا و بەلچیكا و ئیسپانیا و فەرەنسا و ئیتاڵیا بەسەرۆكایەتی وەزیری دادی پێشووی فەرەنسا Robert Robinter لە ڕێكەوتی ١٩٩١/٨/٢٧.

پەیماننامەکانی ساڵی ١٩٦٩ هاتووە و تاکیددەکاتە سەر ئەوەی کە (( گۆڕانکاری بنەڕەتی لە بارودۆخ ناکرێ بە فاکتەرێك دابنرێ بە مەبەستی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی داڕشتنی سنوور یاخود کشانەوە لێی)). جگە لەوەش مادەی ١١ی رێککەوتننامەی ڤیەننا لەبارەی میراتگریی دەوڵەتەکان لە پەیماننامەکان ساڵی ١٩٧٨ ئاماژەیداوە، کە "میراتگریی دەوڵەتەکان کارناکاتە سەر:

أ- ئەو سنوورانەی بەرێگەی پەیماننامەوە داڕێژراون.

ب- ئەو ئیلتیزام و مافانەی لە دەقی پەیماننامەیەکدا هاتوون و پێوەستن بە سیستەمی سنوورەوە."

دادگەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مەسەلەی سنوور لە کاتی میراتگری کێشەی لیبیا و چاد ئاماژەی داوە، دەڵێ : (( کاتێك رێککەوتن لەسەر داڕشتنی سنوور دەکرێ، هەر کردەوەیەك پێچەوانەی ئەو رێککەوتنە بێت بە سەرپێچی دادەنرێ لە پرەنسیپی رێزلێنانی سنووری کێشراو)). چەندین جاریش جەختی کردۆتە سەر گرینگی ئەم پرەنسیپە بۆ سەقامگیریی نێودەوڵەتی. بەتایبەتیش ئاماژەی دا، کە (( ئەو سنوورەی بە پەیماننامەیەك دەکێشرێ تایبەتمەندیی هەمیشەیی وەردەگرێ، مەرجیش نییە پەیمان هەمان تایبەتمەندی وەربگرێ، چونکە پەیماننامە دەکرێ هێزی کارپێکردنی نەمێنێ بێ ئەوەی بەهیچ جۆرێك کاریگەری بکاتە سەر بەردەوامبوونی سنوور. کاتێك سنوور دەبێتە بابەتی پەیمانێك ئەوە مانەوەی بەردەوامبوونی سنوور نەبەستراوە بە مانەوەی ئەو پەیماننامەیەی، کە بە گوێرەی سنوورەکە داڕێژراوە. لێرە زۆر گرینگە جەخت بکرێ، کە لە کاتی میراتگریدا ئەوی دەبێتە بۆماوە پەیمانی داڕشتنی خودی سنوور نییە، بگرە ئەو سنوورەیە، کە پەیمانەکە دایڕشتووە)).[٧٦]

نابی مرۆڤ لە شرۆڤەکردن لەبارەی جێبەجێکردنی ئەم پرەنسیپانە بە شێوەیەکی ورد، ملی هەڵە بگرێ. چونکە بەهیچ جۆرێك ئەمە واتای وانییە ئەم سنوورانە هەر کە دانران ئیتر دەبنە سنووری قەدەخەکراو و نابێ گۆڕانکاریان بەسەردا بێت. بگرە دەکرێ هەمواربکرێن، بەلام تەنیا بە رێککەوتنی نێوان دەوڵەتە پێوەندداره‌کان. یەکگرتنی ئەڵمانیای رۆژئاوا و ئەڵمانیای رۆژهەلات باشترین نموونەیە بۆ ئەم مەسەلەیە. دەبینین وێرای هەردوو پرەنسیپی ئاسایشی هەرێمی و پیرۆزیی سنوور، کە بە تایبەت لە دۆکومێنتی کۆتایی هلسنکیدا جەختی لەسەر

76- International Court of Justice Reports, 1994, PP 6.37; 100 ILR PP. 1, 36

کراوە، کەسێك وەگومان نەبوو لە ڕەوایی یەکگرتنی ئەڵمانیا، کـە گـەلی ئـەڵمان و هـەردوو دەوڵەت ئارەزوویان لێبوو.[٧٧]

ئەو ڕێنماییانەی کۆبوونەوەی وەزاریی تایبەت بە دەوڵەتە ئەندامەکانی یەکەتیی ئەورووپا، کە لە ١٦\١٢\ ١٩٩١ [٧٨]دەریان کرد لەبارەی دانپێدانان بە دەوڵەتە نوێیەکان لە ئـەورووپای ڕۆژهەڵات و یەکەتیی سۆڤێت ئاماژەیان کرد، کە (( پابەندبوون بـە ڕێزگـرتنی ئـەو سـنوورە هەرێمییانەی، کە ناکرێ هەمواربکرێن تەنیا بە شێوەی ئاشتی و ڕێککەوتن نەبێ)) بە یەکێك لەو مەرجە گرینگانە دادەنرێ بۆ پێزانین بەو دەوڵەتانە، ئەمەش واتـا ئـەو مەرجـە مەترسـی بەکارهێنانی هێـز بـۆ گـۆڕینی سـنوورە کێشـراوەکان دووردەخاتـەوە و تاکیددەکاتـەوە، کـە ڕێککەوتنی ئاشتییانە باشترین شێوازی لێکحالێبوون و چارەسـەرە بـۆ هـەر گۆڕانکارییـەکی هەرێمی کە سەرهەڵدەدات.

پەرەسەندنی ڕۆڵی پەیمان و ڕێککەوتننامـە نێودەوڵەتییـەکان بـۆ دیـاریکردنی سـنوور و چارەسەرکردنی ئاشتیانەی ئەو کێشانەی پێوەی بەستراون دەگەڕێتەوە بۆ پێکهـاتنی دەوڵـەتی بەهێزی وا، کە توانایان هـەبێ پیـادەی سـەروەریی تـەواوی خۆیـان بکـەن بەسـەر هـەرێمی نیشتمانی خۆیاندا و ئەو پەرەسەندنەی بەسەر تیـۆریی دەوڵـەت و ڕێکخسـتنی نێوەخۆییانـدا هاتووە و پەرەسەندنی هەلومەرجی ئابووری و پێشکەوتنی هۆیەکانی گواستنەوە و هاتووچـۆو زیادبوونی ژمـارەی دانیشـتووان لـە جیهـان و پێشـکەوتنی یاسـای نێودەوڵـەتی لـە بـواری چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوان دەوڵەتەکان بـە ڕێگـەی ئاشـتی و بەکارنـەهێنانی هێـز یـان هەڕەشەکردن پێی لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا وایـان کـردووە، کـە هەلومـەرجی گونجـاو برەخسێ بۆ داڕشتنی زۆرێك لە سنووری نێودەوڵەتی بەوپەڕی وردییەوە، کـە پێشـتر دەبوونـە فاکتەری کێشە و ململانێ بـۆ چـەندین سـەدە. وێـڕای ئـەوەش هێشـتا گـەلێك لـەو کێشـە نێودەوڵەتییانەی کە هێزە کۆلۆنیالیزمییەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان دایان ڕشتبوون سەرچاوەی بەردەوامن بۆ کێشە و ململانێ و پێکدادانی نێوان ئەو گەلانەی دراوسێی یەکترن.

---

٧٧- هەمان سەرچاوە

78- See the Guideline on the recognition of new. States in eastern European and the Soviet Union accepted at a special ministerial Meting of the Twelve on 12,1991

### ٥ - **دەوڵەتە داخراوەکان** Landlocked States

پەرەسەندنی ژمارەی دانیشتووانی جیهان و گەشەکردن لە بواری تەکنەلۆجیای بەکارهێنان و وەبەرهێنان ومەترسی تەواوبوونی سامانە سرووشتییەکان لەسەر زەویدا، دیدەی دەوڵەتانی ئاراستەی زەریا ودەریاکان کرد بەو پێیەی ئەمە سەرچاوەیەکی نوێیە بۆ مەتریالی خاو وەك نەوت و کانزا. ئەمەش پاڵینا بە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە، کە ڕێککەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ یاسای دەریای ساڵی ١٩٨٢ [٧٩] پەسەندبکات لە پێناو چارەکردنی گشت ئەو مەسەلانەی پەیوەستن بە یاسای دەریادا. دەکرێ ئەمەش لەسەر بنەمای ڕێککەوتن و هاریکاری هاوبەشی وا بێت، کە ڕێزبگیرێت لە سەروەری تێکڕای دەوڵەتان لە کاتی کارکردندا لە پێناو دامەزراندنی سیستەمێکی یاسایی بۆ دەریا و زەریاکان. بەم جۆرە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان ئاساندەکات و هاندەدات بۆ بەکارهێنانی دەریا و زەریاکان بۆ مەبەستی ئاشتی و سوودوەرگرتن لە داهاتەکانی بەشێوەیەکی عادیلانە و گونجاو و پاراستنی داهاتە زیندووەکانی و دراسەتکردن و پاراستنی ژینگەی دەریایی. پرۆسەی تۆمارکردنی یاسای دەریا و پەرەپێدانی هەنگاو بە هەنگاوی، کە بەدیهات لەم ڕێککەوتننامەیەدا، یارمەتی دەدات بۆ پتەوکردنی ئاشتی و ئاسایش و هاریکاری و پێوەندی دۆستانە لەنێوان تێکڕای دەوڵەتانی جیهاندا بە گوێرەی پرەنسیپەکانی دادپەروەری و یەکسانی لە مافدا و دەبێتە هاندەر بۆ گەشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەموو گەلانی جیهان بەبێ ئەوەی شوێنە جوگرافیاکەی، ئایا لەسەر کەناری دەریایە یان نا، لەبەرچاو بگیرێت. بەپێی ئەم پرەنسیپانە مەسەلەی دانی دەروازەیەکی یەکسان بە دەوڵەتە داخراوەکان بۆ دەریا و زەریا و سامانەکانیان و بەجێهێشتنیان لە دەرەوەی کاری بەشداری لەم داهاتە سرووشتیانە، تەنانەت لەبەرئەوەی دەکەونە شوێنێك دوورە لە کەناری دەریا و زەریاوە، خرایە بەر باس. لەبەر ئەمانە کۆمەڵە نۆرمێك خرانە نێو یاسای دەریای ساڵی ١٩٨٢ی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە. ئەم نۆرمانە بە دەوڵەتە داخراوەکان ماف دەدات، کە بگەنە دەریا و بگەڕێنەوە و بە سەربەستی بە ترانزیت تێپەڕبن و بەشداری لە خاوەندارێتیی سامانی دەریا و زەریاکان بکەن.

---

٧٩- بۆ دەقی ڕێککەوتننامەکە بڕوانە: http://www.un.org/Depts/los/index.htm

نێزیکەی پێنج یەکی دەوڵەتانی جیهان ئەمڕۆ دەوڵەتی داخراون [٨٠]. زۆرینەی زۆریان لەو دەوڵەتانەن، کە ئاستێکی نزمیان لە گەشەکردن و پەرەسەندندا هەیە. "نەبوونی ڕێگەی گەیشتن بە دەریا و دووری لە بازاڕە جیهانییەکانەوە و بەهای تێچووی تێپەڕبوون و مەترسی گواستنەوە، کە ئەم بارەی قورستر کرد، تەگەرەی مەترسیداری وان، کە داهاتی هەناردە و هاوردەی سەرمایەی تایبەت و پەرەسەندنی داهاتی خۆجێیی لە وڵاتە گەشەسەندووە Developing countries داخراوەکاندا سنووردارەدەکەن، دواتریش کارێکی نەرێنیانە دەکەنە سەر گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و ئابووری تێیاندا"[٨١].

نەتەوە یەکگرتووەکان شازدە وڵاتی لە وڵاتە گەشەسەندووە داخراوەکان، کە ژمارەیان سی و یەکە، دەسنیشان کرد وەك ئەو دەوڵەتانەی، کە لەبەر بچووکی و لاوازی قەبارەی ئابووریان، نزمترین ئاستی گەشەیان هەیە.

دەوڵەتی داخراو/ ناکەناری دەریایی یان زەریایی / ئەو دەوڵەتەیە، کە ناکەوێتە سەر کەناری دەریایی و بۆ ئەوەی بگاتە دەریا دەبێت بە ترانزیت بە خاکی دەوڵەتێك یان چەند دەوڵەتێکی تردا تێپەڕبێت، کە پێیان دەگوترێت دەوڵەتی ترانزیت. "transit State"

گەیشتن بە دەریا بە لایەن دەوڵەتە داخراوەکانەوە پێویستییەکی گرینگی بەردەوامە. وتراوە، کە دەریا موڵکێکی بێ خاوەنە ((res communis)) (ملك شائع). ئەمەش بە هەموو دەوڵەتان، چ کەناری بن یان بێ کەناربن، مافی تێپەڕبوونی ئاسایی کەشتیوانی بە ئازادی دەدات بەرەو دەریا و لە دەریاشەوە بەرەو وڵاتی خۆی. لە رابردوودا تێپەڕبوونی دەوڵەتە داخراوەکان ڕەتدەکرایەوە. تەنانەت هەندێ جار ناچاردەکرا لە جیاتی ئەوە بۆ ڕێگەی تر بگەڕێت بۆ گواستنەوەی کاڵا بەرەو دەریا و لە دەریاوە بەرەو خاکی خۆی، بەڵام ئێستە

---

٨٠- ئێستا لە جیهاندا ٤٦ دەوڵەتی داخراو، واتا بێ کەناری دەریایی، هەیە، ئەوانەش ئەمانەن: ئەفغانستان، ئەندورا، ئەرمینیا و نەمسا و ئازەربەیجان و کۆماری باشووری سودان و بێلارووسیا و بوتان و بۆلیفیا و بۆتسوانا، بورکینا فاسو، بوروندی، کۆماری ئەفریقای ناوەند، کۆسۆڤۆ، چاد، چیك، ئەسیوبیا، هەنگاریا، کازاخستان، قیرغیزیا، لاوس، لیسوتو، لینخشتاین، لوکسمبورگ، فیروم، مالاوی، مالی، مۆڵداڤا، مەنگولیا، مەکەدۆنیا، نیپاڵ، نیجیریا، باراگوای، رواندا، سان مارینو، سربیا، سلوفاکیا، سوازیلاند، سویسرا، تاجیکستان، تورکمەنستان، ئوگەندا، ئۆزبەکستان، ڤاتیکان، زامبیا و زمبابوی.

٨١- بڕوانە: بڕیاری کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان ژمارە A/RES/59/ 245

یاسای نێودەوڵەتیی سیستەمێکی تەواوی داناوە بۆ چارەسەری ئەم بابەتە. مادەی ۱۲۵ی ڕێکەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ یاسای دەریای ساڵی ۱۹۸۲ ئاماژەدەکات، کە دەوڵەتە بێکەنارەکان مافیان هەیە ((بە ئازادی بەسەر خاکی دەوڵەتی ترانزێتدا تێپەڕبێت بە هەموو ئامارێکی گواستنەوە)) ئەمەش لە کاریگەری، جێگەی جوگرافیای دوور لە دەریاوە، کەم دەکاتەوە لەسەر ئابووری دەوڵەتە داخراوەکان، بەڵام هێشتا کێشەیەکی گرینگ هەیە لە بەردەم ئەو دەوڵەتانە. ئەویش ئەوەیە کە بەندەرێکی تایبەت بە خۆیان نییە، چونکە وەك دەزانین بەندەر رۆڵێکی فرە گرینگ دەگێڕێت لە پرۆسەی گەشەکردنی هەر وڵاتێکدا. لەبەر ئەمە ئەم دەوڵەتانە پشت بە بەکارهێنانی بەندەری وڵاتە دراوسێکانی خۆیان بۆ هاوردە و هەناردەی کاڵا دەبەستن. ئەمەش وا پێویست دەکات، کە بە یەکسانی مامەڵە لەگەڵ دەوڵەتە داخراوەکاندا بکرێت لە بەندەرەکاندا. بۆیە دانانی هەر کۆسپێك لە بەردەم گەیشتن بە بەندەر یان رەتکردنەوەی بە پێشێلکردنی ئازادی دەریای گشتی دادەنرێت.

هەوڵدان لە پێناو مسۆگەرکردنی یەکسانی لە بەندەرە دەریاییەکان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ۱۹۲۳، کاتێك ڕێککەوتننامەی تایبەت بە سیستەمی نێودەوڵەتی بۆ بەندەری دەریایی ئیمزاکرا.

مادەی ۱۳۱ لە یاسای دەریای ساڵی ۱۹۸۲ دەڵێت: (( ئەو کەشتییانەی ئاڵای دەوڵەتی بێ کەناریان هەڵگرتووە مافیان هەیە بە هەمان مامەڵەی یەکسان مامەڵەبکرێن، کە لەگەڵ کەشتی دەوڵەتانی بیانی دیکە دەکرێت)).

دەوڵەتان بە کردەوە بەم ئاراستەیەدا چوون بۆ ڕێکخستنی ئەو لایەنانە بە ڕێککەوتننامەی دووقۆڵی لەنێوان دەوڵەتە داخراوەکان و دەوڵەتەکانی کەناری دەریا و دەوڵەتانی ترانزیت. ئەمانە هەموویان بواریان رەخساند بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی کاراو و باوەرپێکراو، کە بووە مایەی هاتووچۆی ئاسان و پەلە بەرەو دەریا و گەڕانەوە بۆ دەوڵەتی بێ کەنار. وێڕای ئەمەش مافی دەوڵەتانی ترانزیتی مسۆگەرکرد، کە لە کاتی جێبەجێکردنی سەروەری خۆیدا بەسەر خاکەکەیدا دەتوانێت هەموو کردەکارییەکی پێویست وەربگرێت بۆ ئەوەی دڵنیابێت، کە ئەو ماف و ئاسانکاریانەی دەدرێن بە دەوڵەتە داخراوەکان، بە هیچ شێوەیەك نابنە کردەوەی دوژمنکاری لەسەر بەرژەوەندیی ئەو.

سەبارەت بە بەرزاییەکانی دەریا high seas مادەی۸۷ی ڕێککەوتننامەی یاسای دەریا ئاماژەدەکات، کە (( بەرزاییەکانی دەریا کراوەیە بۆ تێکڕای دەوڵەتان، چ کەناری بن یان

داخراو، ئەم ئازادییە بەپێی ئەو مەرجانەی لەم ڕێککەوتننامەیە و لە نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی دیکەدا هاتوون پێڕەودەکرێن))[82] و برێتین لە کەشتیوانی و فڕین ودانانی کابڵ و هێڵی لوولەی نقوومکراو و ئازادی دروستکردنی دوورگەی دەستکرد و ڕاوەماسی و لێکۆڵینەوەی زانستی، هەروەها بیناسازی ڕێگەپێدراوی تریش بەپێی یاسای نێودەوڵەتی. بۆ هیچ دەوڵەتێك نییە بەشێك لە دەریای بەرز، بە بیانووی یاساوە، بخاتە ژێر سەروەری خۆیەوە (مادەی ٨٩). هەموو دەوڵەتێك مافی هەیە، چ کەناری بێت یان داخراو، کەشتی بڕوێنێت لەژێر ئالای خۆیدا لە دەریای بەرزدا. لەم حاڵەتەدا کەشتییەکە لەژێر دەسەلاتی یاسایی خۆیدا دەبێت، جگە ئەو حاڵەتە بەدەرانەی کە بە ئاشکرا لە پەیماننامەی نێودەوڵەتی یان لە ڕێککەوتننامەی ڤییەنا بۆ یاسای دەریای ساڵی ١٩٨٢ هاتوون. هەروەها بەپێی مادەی ٩٥ی ئەو ڕێککەوتننامەیە، کەشتییە جەنگییەکانی دەوڵەتەکان، چ کەناری بن یان داخراو، یاسابەندی (حصانە) تەواویان هەیە بەرامبەر هەر دەوڵەتێك جگە ئەو دەوڵەتەی ئالاکەی هەڵدەگرن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە دەوڵەتە داخراوەکان مافیان هەیە هێزی دەریای پێکبهێنن لە دەریای ئازاددا بە مەرجێك ڕەچاوی نۆرمە یاساییە نێودەڵەتییەکان بکەن لەم بارەیەوە.

دەوڵەتە داخراوەکان ساڵەهای ساڵە هەوڵدەدەن لە پێناو دابینکردنی بەشداریکردنی تەواو لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا بۆ بنەوەی دەریا و زیان نەگەیاندن پێی بە هۆی جێگەی جوگرافیاییەوە. بەم جۆرە ئەم دەوڵەتانە توانیان چەند نۆرمێك لە ڕێککەوتننامەی یاسای دەریادا بچەسپێنن بە جۆرێك، کە لە مەینەتییەکانیان کەم بکاتەوە و خزمەتی بەرژەوەندییە تایبەتەکانیان بکات. مادەی ١٥٢ی ڕێککەوتننامەکە داوا لە دەسەلاتی نێودەوڵەتی The Authority بۆ بنی دەریا[83] دەکات، کە گرینگییەکی تایبەتی بدات بە دەوڵەتە داخراوەکان

---

٨٢- بە پێی ماددەی ٨٧ بەرزایی دەریا هەموو پارچەکانی دەریا دەگرێتەوە لە دەرەوەی ناوچەی ئابووری پەتی یان دەریای هەرێمی یان ئاوی ناوخۆی دەوڵەت.

٨٣- ڕێککەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ یاسای دەریای ساڵی ١٩٨٢ لە هەموو دەوڵەتە لایەنەکانی (**دەسەلاتی نێودەوڵەتیی بۆ بنی دەریا**) دروستکرد بە مەبەستی ڕێکخستن و چاودێری چالاکی لە ناوچەکەدا بۆ بەڕێوەبردنی داهاتی.

تاوەکو بتوانن بەسەر ئەو کۆسپانەدا زاڵبن، کە تووشیان دەبێت لەبەر جێگەی جوگرافیاییان و دووریان لە دەریاوە و گرانی گەیشتن پێی.

بنی دەریا و زەریا و ناو زەوی و ئەو سامانە سرووشتییانەی تێیدان بە سامانی هاوبەشی مرۆڤایەتی دەزانرێت بەپێی ڕێککەوتننامەی یاسای دەریای ساڵی ١٩٨٢ و بۆ هیچ دەوڵەتێك نییە خۆی بە خاوەنی بزانێ یان سەروەری خۆی پیادەبکات بەسەر هیچ بەشێکی ئەم ناوچەیەدا یان ئەو ساواتانەی تێیدان[٨٤]. بۆ هیچ دەوڵەتێك یان کەسێکی سرووشتی یان یاسایی نییە دەستبگرێ بەسەر خاوەندارێتی هەر بەشێکی ناوچەکەدا و داننانرێت بە هەر داواکارییەکەدا یان پێڕەوکردنی ئەم جۆرە دەسەڵاتە یان مافی سەروەریدا لەوێ. دەسەڵات کاردەکات بۆ دابەشکردنی سوودی دارایی و هەر سوودێکی ئابووری تر، کە لەم ناوچەیە بە دەستدێت بە شێوەیەکی دادپەروەریانە لە ڕێگەی میکانیزمێکی گونجاوەوە. چالاکی لەناوچەدا لە بەرژەوەندی تێکڕای مرۆڤایەتی دەبێت بەبێ ئەوەی جێگەی جوگرافییای دەوڵەتان لەبەرچاو بگیرێت، چ کەناری بێت یان داخراو، لەگەڵ گرینگی پێدانێکی تایبەتی بە بەرژەوەندی و پێویستییەکانی دەوڵەتە گەشەسەندووەکان و ئەو گەلانەی هێشتا سەربەخۆیی تەواوی خۆیان بەدەست نەهێناوە یان شێوەیەکی تری ئۆتۆتۆمییان نییە[٨٥]. ناوچەکە کراوە دەبێت بۆ بەکارهێنانی تەنیا بۆ مەبەستی ئاشتییانە لە لایەن هەموو دەوڵەتانەوە، چ کەناری بن یان داخراو، بە بێ جیاوازی[٨٦]. مادەی ١٥٣ لە ڕێککەوتننامەکە ڕێکخستن و بەڕێوەبردن و چاوەدێری چالاکیی لە لایەن دەسەڵاتەکەوە دەبێت لە جیاتی تێکڕای مرۆڤایەتی لە ڕێگەی دامەزراوەکەوە، کە دەزگەیەکی جێبەجێکاری سەر بە دەسەڵاتە و بەهاوبەشی لەگەڵ دەوڵەتە لایەنەکان یان ئەوانەی کە ئەم دەوڵەتانە یان هاووڵاتییەکانیان کونترۆڵیان دەکەن بە کردەوە و ئەگەر ئەو دەوڵەتانە پشتگیریان بکەن[٨٧].

---

٨٤- بڕوانە: دەقی ماددەی ١٥٦ و ١٥٧ لە ڕێککەوتننامەکە.

٨٥- بڕوانە: دەقی ماددەی١٤٠ لە ڕێککەوتننامەکە.

٨٦- بڕوانە: دەقی ماددەی١٤١ لە ڕێککەوتننامەکە.

٨٧- هەندێ دەوڵەت وەك ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ڕێککەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکانیان بۆ یاسای دەریای ساڵی ١٩٨٢ ئیمزانەکرد، لەبەرئەوەی سستەمی پیشەسازی کانزایان لە بنی دەریا و زەریا، کە لە بەشی یانزەمی ڕێککەوتننامەکەدا هاتبوو ڕەتکردەوە. بەڵام لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە سیاسی و

کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بەوەوە نەوەستا تەنیا ئەو مافانە لە ڕێککەوتننامەیەکی مولزەم بۆ گشت دەوڵەتان بچەسپێنێ، بگرە کاریشی کرد لە پێناو دانانی میکانیزمێك بە مەبەستی جێبەجێکردنیان بە کردەوە. بەم جۆرە زنجیرە کۆنگرە و فۆرومێکی نێودەوڵەتی بەستران و چەندەها دۆکومێنتی نێودەوڵەتی دەرکرا بە مەبەستی کاراکردنی ئەو مافانەی لە ڕێککەوتننامەی ڤییەنا بۆ یاسای دەریا هاتوون و هەروەها لە پێناو پڕکردنەوەی ئەو کەلێنانەی تێیدان. لەوانەش پرۆگرامی کاری ئەلماتی، کە لە کۆنگرەی وەزاری نێودەوڵەتی وڵاتانی گەشەسەندووی داخراو و وڵاتانی ترانزیتی گەشەسەندوو و وڵاتانی بەخشێنەر و دامەزراوە دارایی و گەشەکردنی نێودەوڵەتی تایبەتمەند بە هاریکاری لە بواری گواستنەوەی ترانزیت، کە لە شاری ئەلماتی لە کەزەخستان بەسترا لە ٢٨و٢٩/٨/٢٠٠٣ [٨٨] و بڕیاری

---

ئابووریيە نیونەتەوەییە گرنگەی ڕوویاندا، پاش کۆتاییهاتنی شەڕی سارد و پشتبەستنی زیاتر بە بنەماکانی بازاڕی ئازاد، لە دەرەوەی تەوەری دەوڵەتە پیشەسازییە گەورەکانیش، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، لە کۆتایی هەشتاکان و سەرەتای نەوەتەکان، بە سەرپەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، ڕووی کردە بەستنی ڕێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی لە ساڵی ١٩٩٤ بۆ هەمووارکردنی بەشی یانزەمی ئاماژەپێکراو و لە ١٦/١١/ ١٩٩٨ چووە واری جێبەجێکردنەوە، بڕوانە:

William H.Taft ,Testimony before the Senat Foreign Relation Committee Washington, DC October 21.2003 See
http://2001-2009.state.gov/g/oes/rls/rm/2003/25573.htm

88- Report on the International Ministerial Conference of Landlocked and Transit Developing Countries and Donor Countries and International Financial and Development Institutions on Transit Transport Cooperation, Almaty, Kazakhstan, 28 and 29 August 2003 See http://archive.unctad.org/en/docs/aconf202d3_en.pdf Last visited on 14/6/2012

هەندێ دەوڵەتی داخراو لە ئەفریقا زنجیرە سمینارێکیان بەست بە مەبەستی ( پەلەکردن لە یارمەتیدانی دەوڵەتە داخراوەکانی ناوچەی ئەفریقا بۆ جێبەجێکردنی ئەو حوکمە پەیوەندیدارانەی لە ڕێککەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەوەکان بۆ یاسای دەریای ساڵی ١٩٨٢هاتوون). سمیناری یەکەمی لە سوازیلاند Swaziland لە حوزەیرانی ٢٠٠٥ بەسترا و سمیناری دووەم لە لیسۆتۆ Lesotho لە ٢٨/١١ تاوەکو ١/١٢/٢٠٠٥ بەسترا.

ئەم **دەوڵەتە ئەفریقاییە داخراوانە بەشدارییان تێدا کرد: سوازیلاند Swaziland و لیسۆتۆ** Lesotho و زامبیا Zambia و مالاوی Malawi و ئۆگەندا Uganda و بۆتسواناBotswana.

بەڵام ئەم دەوڵەتە ئەفریقاییە داخراوانەش بەشدارییان تێدا نەکرد: بورکینا فاسۆ Burkina Fasof بوروندی Burundi کۆماری ئەفریقای ناوەند و Central African Republic, زمبابۆی ,Zimbabwe چاد Chad, Ethiopia,

کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ژمارە Res /A/٥٩/٢٤٥ لە ٢٠٠٥/٣/٣، کە دیسان دووپاتی کردەوە، کە وڵاتە داخراوەکان مافیان هەیە ڕێگەیان بدرێتێ بڕۆنە سەر دەریا و لێیەوە بگەڕێنەوە و ئازادی گواستنەوەیان هەیە بە ناو خاکی وڵاتی ترانزیتا بە هەموو جۆرێکی ئامێری گواستنەوە بەپێی ئەو نۆرمانەی، کە لە یاسای نێودەوڵەتیدا پێڕەودەکرێن. کۆمەڵەی گشتیی لە بڕیارەکەیدا هانی وڵاتە بەخشێنەرەکان و پرۆگرامی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ گەشەکردن ودامەزراوە دارایای و گەشەکردنی فرەلایەن دەدات، کە یارمەتی دارایی و تەکنیکی پێشکێش بە وڵاتانی گەشەسەندووی بێ کەنار وڵاتانی ترانزیتی گەشەسەندوو بدەن بە جۆری بەخشیش و قەرزی مەرجئاسان بە مەبەستی دروستکردنی خانووبەرە و ئامێر بۆ گواستنەوە و عەمبارکردن و پاراستن و باشترکردنەوەیان و دروستکرنی ڕێگەی یەدەگ و باشترکردنی پێوەندی لە پێناو پتەوکردنی پروژەی پروگرامە ناوچەییەکان و هەرێمییەکان و نێو هەرێمییەکان و هەروەها هەڵسن بە دراسەتکردنی هەندێ حاڵاتی تر وەك باشکردنی ڕەوشی جۆرەها ئامێری گواستنەوە و بەکارهێنانیان بە باشترین شێوە و باشترکردنی کاریگەریی لەنێوان ئامێرەکانی گواستنەوە بە درێژایی ڕێگەکانی گواستنەوە.

**٥- پێوەری حکوومەت یان دەسەڵاتی حوکمڕانی:**

دەسەڵاتی سیاسی گرینگییەکی زۆری هەیە بۆ سەرهەڵدانی دەوڵەت. کۆمەڵگە بۆئەوەی ئەرکەکانی پیادەبکات پێویستی بە دەسەڵاتێك یان حکوومەتێکی ناوەندی هەیە، بەڵام ناکرێ ئەمە وەك مەرجێکی پێشوەخت دابنرێ بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ. بگرە وەك هێمایەکە گوزارشت دەکات لە بوونی جۆرە قەوارەیەکی سیاسی - کۆمەڵایەتی زەروور و تەواو بۆ بونیادنانی دەزگەی جێبەجێکاری و یاسادانان و دادوەری. ئەزموونی پێکهاتنی هەردوو دەوڵەتی کەرواتیا و بۆسنە-هێرسۆگۆڤینیا، کە لە یۆگۆسلاڤیای پێشوو جیابوونەوە وایکرد بیر لە پێوەرێکی تازە بکرێتەوە. ئەویش ئەوەیە دەبێ حکوومەت پیادەی دەسەڵاتی لەسەر هەرێمەکەی بەشێوەیەکی کارابکات، واتا هەرێمەکەی بە شێوەیەکی فیعلی بەڕێوەببات. ئەوەبوو دەوڵەتە ئەندامەکانی ئەنجومەنی ئەورووپی پێزانینیانکرد بە سەربەخۆیی هەردوو دەوڵەت و دواتر لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش وەرگیران. کەچی بەپێی مادەی "٤"ی

ئەسیوپیا ,Mali مالی ,Niger نایجیر Rwanda ڕواندا. بڕوانە:
htt://www.thecommonwealth.org/shared_asp_files

دەستوورەکەی تەنیا دەوڵەت تێدا بە ئەندام وەردەگیرێ. ئەمە لە کاتێکدا بوو هێزی ناحکومی زۆر بەشی ئەو دوو وڵاتەیان بەڕێوەدەبرد و شەڕی نێوەخۆییش بە سەرخاکەکەیانەوە گەرم بوو.

پەرەسەندنی مافی بڕیاردانی چارەنووس کاریگەرییەکی زۆری لەسەر پێوەری حکوومەت هەبووە. دەبینین لە کاتێکدا بۆچوونە تەقلیدییەکان جەختیان کردۆتە سەر هەبوونی سەقامگیریی و بەڕێوەبردنی کردەیی هەرێمەکە وەك دوو فاکتەر لەو فاکتەرانەی کە پێویستە لەنێو فاکتەرەکانی حکوومەتدا بن ئێستە دوو داخوازیی تریشیان خرایەپاڵ، ئەوانیش سرووشتی نوێنەرایەتیکردن و دیموکراتیبوونی حکوومەتن، واتا ئایا ئەو حکوومەتە بە راستی نوێنەری گەلی هەرێمەکەیە و پرەنسیپەکانی دیموکراتی پێڕەودەکات. لە کاتێکیشدا پەرەسەندنی زیادی مافی بڕیاردانی چارەنووس کاریگەریی کردۆتە سەر ئەو پێوەرەی، کە دەڵێت دەسەڵات دەبێت بە شێوەیەکی کردەنیی ممارەسە بکرێت، ئێستە وا دیارە دەکرێ لە کاریگەریی ممارەسەی فیعلی سووکبکرێتەوە تا رادەیەك یان بەلایەنی کەم بەوەی پێوەستە بە لەناوبردنی کۆلۆنیالیزم decolonisdition . دەکرێ بە چەند نموونەیەك ئەوە روون بکرێتەوە.

کۆنگۆی بەلچیکی لە ٣ ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٠ و لە گەرمەی شەڕی نێوخۆییدا، تەنانەت شەڕ بەرەو پایتەختیش بڵاوەی کردبوو سەربەخۆیی وەرگرت. چەند هەفتەیەك دواتر سوپای کۆماری راپەڕی و دوابەدوای ئەمەش هێزەکانی بەلچیکا دەستیان تێ وەردا. کەچی هەرێمی کاتانگاش جیابۆوەو دوابەدوای داڕوخانی راستەقینەی حکوومەتیش دان بەکۆنگۆدا نرا وەك دەوڵەتی سەربەخۆ لە لایەن ژمارەیەکی زۆر لە دەوڵەتەکانەوە و بەبێ بەرهەڵستیکردن ئەندامێتی لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا پەسەندکرا[٨٩].

لە گینیا – بێساویش، کە کۆلۆنێکی "موستەعمەرە" پورتوگالی بوو رووداوەکان بە پێچەوانەوە بوون. شاندی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە بەرەو ناوچە رزگارکراوەکانی

---

٨٩- کاتێك نەتەوە یەکگرتووەکان دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە دەربارەی بڕیاری سەربەخۆیی کۆنگۆ لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٦٠ دوو لایەنی حکوومی کێبڕکێیان دەکرد لە سەر نوێنەرایەتیکردنی شەرعییانەی کۆنگۆ لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا. یەکەمیان شاندێك بوو بەسەرۆکایەتی سەرۆك وەزیران و دووەمیشیان شاندێك بوو بە سەرۆکایەتی سەرەك کۆمار. دواجار شاندی سەرۆکی حکوومەت بۆی رەخسا پێزانینی نەتەوە یەکگرتووەکان وەدەست بێنێ. دەربارەی ئەم بابەتە بڕوانە:

Keesings Contemporary Archives p 4-5 and Hoskins, Kongo pp 96-99

هەرێمەکە لە ساڵی ١٩٧٢ نێردرا بۆی دەرکەوت دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزمی حوکمڕانی تەواوی ناوچەیەکی بەربڵاوی ئەو هەرێمەی لەدەستداوە و دانی بەوەدا نا، کە بزووتنەوەی رزگاریخوازی PAIGC 3\2 تا ٣\٤ ی ناوچەکە بەڕێوەدەبات و لە لایەن خەڵکی ناوچەکەوە پشتگیری لێ دەکرێ. ئەمەش یانی هێزەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی پیادەی بەڕێوەبردنی کارایی " اداره فعليه " De Facto دەکەن لەوێدا. کاتێکیش هێزەکانی رزگاریخواز سەربەخۆیی گینیا – بێساوی لە ١٩٧٣\٩\٢٤ ڕاگەیاند، دەسەڵاتی پورتوگال بەرهەڵستی لێکرد و مەسەلەکەی خستە پێش کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەو پێیە داگیرکردنێکی ناشەرعییە بۆ چەند بەشێك لە هەرێمی گینیا ـ بێساو. دەوڵەتە رۆژئاواییەکان پشتگیرییان لە هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی پورتوگال کرد و رەتیان کردەوە، کە ئەو هەرێمە پێوەری تەواوی پێکهێنانی دەوڵەتی تیا بێ، بەڵام نەتەوە یەکگرتووەکان سەربەخۆییەکەیان بە ڕەوا پەسندکرد بە زیاتر لە ٩٣ دەنگ و گینیا – بێساو بووە دەوڵەتێکی سەربەخۆی سەروەر[٩٠]. ئەم پێزانینە نێودەوڵەتییە لە کاتێکدا هات چەند ناوچەیەکی بەربڵاو و شارگەلێکی گەورە و زۆرینەی دانیشتووانیش بە پراکتیك لەژێر دەسەڵاتی هێزەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازیدا نەبوون.

سەرەڕای نوێکاری پرەنسیپی تەقلیدیی تایبەت بە بەڕێوەبردنی کردەیی حکوومەت، لە هەندێ باردا بەهەمان شێوە، دەکرێ مافی بڕیاردانی چارەنووسیش بە پێوەرێکی تر دابنرێ بۆپێکهاتنی دەوڵەت. دەبینین دوای ئەوەی رۆدیسیا یەکلایەنە لە ١٩٦٥\١١\١١ دا سەربەخۆیی راگەیاندرا هیچ دەوڵەتێك دانی پێدا نەنا بە گوێرەی ئەو بڕیارانەی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە وای دانا سەربەخۆییەکە کارێکی نامەشرووعە[٩١]. وێڕای ئەوەش شەڕی نێوەخۆیی، کە لەوێ روویدا وایکرد رۆدیسیا ببێتە دەوڵەتی سەربەخۆی زیمبابۆی و بەو شێوەیە دانی پێدانرا. دەکرا وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ دان بە رۆدیسیادا بنرابایە لەبەرئەوەی، کە لە پراکتیکدا مەرجی پێکهێنانی دەوڵەتی تێدایە.

رەنگە هەندێ کەس بڵێن ناکرێ هیچ قەوارەیەك بکرێتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بەبێ ئەوەی پێزانین وەدەست بهێنێ، بەڵام ئەم رایە پەسەندناکرێ، چونکە پێزانین دەوڵەت ناخولقێنێ، بگرە

---

90- General Assembly Resolution 3061(XXVIII)

91- General Assembly Resolution 2024 (XX) and 2151 (XXI) and Security Council Rest. 216 (1965) and 217 (1966)

تەنیا پەسەندی دەكات. ئەو رایەی ماقوولانەترە، كە دان بنرێ بە گـۆڕینی پرەنسـیپی مـافی بڕیاردانی چارەنووس بە شێوەیەك كە ببێتە پێوەرێكی تری پێكهێنانی دەوڵەت. لـە حاڵێكـدا ئەگەر قەوارەیەك ویستی ببێتە دەوڵەتێكی سەربەخۆ و كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دانی بە رەوایی مومارەسەكردنی مافیدا نا لە بڕیاردانی چارەنووس، ئەوە زۆر زەرووره قەوارەكـە بیسـەلمێنێ، كە مەرجە نێوەخۆییەكانی پێشێل نەكردووە بۆ وەدەستهێنانی مافی چارەنووس. لێرەشـدا زۆر زەحمەتە بە وردی پێناسەی ئەم مەرجە بكرێ لەبەر رۆشنایی پیادەكردنی دەوڵەتـەكان تـا ئـەم رۆژگارەمان، بەڵام دەكرێ بـۆ نموونـە بگـوترێ پیـادەكردنی بـەردەوامی سیاسـەتی جیـاوازی رەگەزی و پێشێلكردنی بەربادی مافی مـرۆڤ لـەو وڵاتـەدا كـە داوای دامـەزرانـدنی دەوڵـەت دەكات داخوازییەكانی پێكهاتنی دەوڵەت پووچەڵدەكەنەوە.

لەم رووەوە دەكرێ ئاماژە بدرێ بە پراكتیكی نێودەوڵەتی لەبارەی جیابوونەوەی هەندێ لـە قەوارە فیدراڵییەكان لە یۆگۆسلاڤیای پێشوو و پێكهێنـانی دەوڵـەتی سـەربەخۆیان. دەبیـنین ئەنجومەنی ئەورووپایی لە روانگەی پرەنسیپی مافی بڕیاردانی چارەنووس لـە ١٩٩١\١٢\١٦ هەڵوێستێكی هاوبەشیان بەرامبەر ئەو دەوڵەتانە وەرگرت، كە لەسەر هەرێمەكانی یۆگۆسلاڤیا و یەكەتیی سۆڤێتی پێشوو دامەزران[٩٢]. ئەم دۆكومێنتە هەندێ مەرجی داناوە بۆ پێزانین بـەو دەوڵەتانە، وەك رێزگرتن لە سەروەریی یاسا و دیموكراتی و مافی مرۆڤ و بـە تایبـەتی جـەختی كردۆتە سەر داخوازیی زامنكردنی مافی كەمایەتییەكان. هەرچەند ئەو دۆكومێنتە زیاتر بـاس لە مەسەلەی پێزانین دەكات لەوەی پێوەرەكانی پێكهاتنی دەوڵەت، بەڵام هـەردوو مەسـەلەكە تێكئالاوو پێكەوە بەستراون و مەرجەكانی پێـزانین لـەو حاڵەتانـەی، كـە بـە شـێوەی گشـتی گوزارشتیان لـێ دەكـرێ، نـەوەك بـە دەسـتەواژەی راشـكاو، ئـەوە بـە زۆری لـە پراكتیكـی نێودەوڵەتیدا بە مەرج دادەنرێن بۆ پێكهاتنی دەوڵەت.

ناوەڕۆكی ئەهلییەت برێتییـە لـە سـەربەخۆیی، كـە گرینگـە بـۆ پێكهـاتنی دەوڵـەت و بەرئەنجامێكی یاسایەتی لە هەلومەرجی تایبەتدا. سـەربەخۆیی" الاسـتقلال" راگەیانـدنێكی رەسمییە، كە دەوڵەتەكە ملكەچی سەروەریی دەوڵەتێكی تر نییە، یانی ئەركـەكانی مـانیعن و گشتین لەژێر كاریگەریی كلكایەتی كردەیی دەوڵەتی تـر نییـە، واتـا ئەركـەكانی بـە ئـازادی پیادەدەكات و تەنیا ملكەچە بەرامبەر نۆرمی یاسای نێودەوڵـەتی.[٩٣] مەسـەلەی زەروورەتـی

92- 31 ILM, 1992 , p 1486
93- Customs Regime between Germany and Austria Case ,PCIJ Ser A/B (1931)

فەراهەمبوونی ڕادەیەك لە سەربەخۆیی بە پراکتیـك، هـەروا سـەربەخۆیی رواڵـەتی، بابـەتی مشتومڕن و رەنگە لە هەندێ حاڵەتدا گاریگەر بن. بـۆ نموونـە کۆمـاری باشـووری ئـەفریقیا سیستەمی (Bantustan)ی داهێنا و بەپێی ئەو سیستەمە وڵاتەکەی، بە گوێرەی رەچەڵەکی نەتەوە رەش پێستەکانیان، دابەشکرد بۆ چەند هـەرێمێك "بانتوسـتانێك" و سـەربەخۆیی بـە هەندێکیان دا، بەڵام لەسەر ئاستی ناوەخۆ و نێودەوڵەتیشـدا ئـەم سیسـتەمە قبـووڵ نـەکرا، چونکە بە سیستەمێکی رواڵەتی زانرا بە مەبەسـتی شـاردنەوەی سیاسـەتی رەگەزپەرسـتی و ئەپارتایدی پێڕەوکراو لە لایەن کۆماری باشووری ئەفریقیاوە. بۆ نموونـە Transkei، کـە لـە ١٩٧٦ سەربەخۆییەکەی راگەیەندرا لە لایەن کۆماری باشـووری ئـەفریقیاوە، نێزیکـەی ٩٠٪ بودجەکەی لـە لایـەن ئـەو کۆمـارەوە دەبەخشـرا. هـەرێمی Bophuthatswana، کـە لـە ١٩٧٧/١٢/٦ سەربەخۆیی راگەیەندرا دابەش ببووە سەر چـەند بەشـێك و هـەرێمی کۆمـاری ئەفریقیای باشوور کـەوتبووە نێوانیـان و لێکـی جیادەکردنـەوە[٩٤]. لـە بـەر ئەمانـە هـەردوو رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان **و رێکخراوی** یەکەتیی ئەفریقایی رایانگەیاند، کە ئەم جـۆرە سەربەخۆییە شەرعی نییە و داوایان لە هەموو دەوڵەتەکان کرد داننەنێن بەم قەوارە نوێیانەدا، چونکە بەکردەنیی بەشێکن لە باشووری ئەفریقیا. تەنانەت ئەو پێشکەوتنە ئابوورییـەی، کـە هەندێ لـە قـەوارەکان بەیارمـەتی دەرەکیـی دەوڵەتـەکانی تـر وەدەسـتی دێـنن هەڵوێسـتی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ناگۆڕێ.

دەبینین وێڕای ئەوەی، کە باشـووری ئـەفریقیا وەك دەوڵـەتێکی سـەربەخۆ، بەشـێکی لـە هەرێمەکەی خستە ژێر چاودێری یاسای نێودەوڵەتی، بەڵام پێـوەرە رواڵەتییـەکانی پێکهـاتنی دەوڵەت نەیانتوانی شەرعیەتی نێودەوڵەتی بدەنە ئەو قەوارانە. بۆیە وەك قەوارەی بە رواڵـەت سەربەخۆ مانەوە. جا ئەگەر بمانەوێ پێگەی یاسایی ئـەوجۆرە قەوارانـە دیـاری بکـەین ئـەوە پێویستە بگەڕێین بۆ پێوەرگەلێکی تر، نەك پێوەری پێکهاتنی دەوڵەت، چونکە ئەمەی تریـان لەسەر ئەم حاڵەتە پراکتیزەنابێ لەبەرئەوەی ناکرێ بۆخزمەتکردنی سیاسـەتێکی نـارەوای وەك جیاوازی رەگەزی پاساو بۆ ئەو رێ و شوێنە پیادەکراوانە بهێنرێتەوە.[٩٥]

لەم لایەنەوە دەکرێ ئاماژە بدەین بەو ئاڵۆزییانەی، کە ئالأبوون بە سەربەخۆیی یەکلایەنەی

---

No.41 Permanent Court of International Justice

94- UKMIL, 57 BYIL.1986 pp.507-508

95- General Assembly Res.31/61A 80 – R Mulerson, Internaional Law,Rights and Politics, London.1994, p.119

(لیتوانیا)وه له ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٩٠. ئەوە بوو یەکیەتیی سۆڤێت لە ساڵی ١٩٤٠ لیتوانیای لکاندە کۆمارەکانی خۆیەوە و دەوڵەتە رۆژئاواییەکانیش دانیان نەنا بەم لکاندنە بە شێوەی یاسایی، بەڵام لە رێگەی پێوەندییەکانیانەوە لەگەڵ یەکیەتیی سۆڤێتدا ئەم لکاندنەیان بە واقیعی قبووڵ کرد. دەبینین لە سەروبەندی تەنگژەی دەستووری لە یەکیەتیی سۆڤێتی پێشوو و هەوڵدان بۆ دامەزراندنی یەکیەتییەکی کۆنفیدراڵی لەنێوان (١٥) دەوڵەت، کە لە پاش لێکترازانی یە کێتی سۆڤێت پێکهاتبوون سەربەخۆیی لیتوانیا پێشوەخت بوو، چونکە لە قۆناخێکی زۆر ناسکدا روویدا. لەبەر ئەمە لە لایەن دەوڵەتەکانی ترەوە بەهیچ شێوەیەك دانی پێدا نەنرا، بەڵام کاتێك یەکیەتیی فیدراڵی لەو دەوڵەتە سەربەخۆیانە پێکهات، کە پێشتر سەر بە یەکیەتیی سۆڤێتی پێشوو بوون، شان بە شانی پێزانین بە دەوڵەتەکانی تری بەڵتیق، لە ساڵی ١٩٩١ دان بە لیتوانیاشدا نرا.[96] ئەم رێگەیانە کە لە میانەی کارکردندا دروستبوون. دەبینین ئەو هۆکارانەی یارمەتی دروستبوونی دەوڵەتی کۆنگۆیاندا جێبەجێ دەبنە سەر رواندا و بروندی و چەند حاڵەتێکی تری "سەربەخۆیی پێشوەخت"دا. لە لایەکی ترەوە کاتێك قەوارەکان هەوڵی جیابوونەوە دەدەن لە دەوڵەتێك پێوەری هەبوونی دەسەڵاتی فیعلی بە شێوەیەکی توند بە سەریدا دەسەپێنرێت. ئەمە سەبارەت بە بیافرا و هەندێ هەوڵی سەرنەگرتووی تریش روویدا.

دەبێ لێرە ئاماژە بە "دەوڵەتە لەتبووەکانیش" بکەین. کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بە بڕیاری ژمارە (١١١) ١٩٥ دامەزراندنی دەوڵەتی کۆریای پەسەندکرد. سەربەخۆیی کۆریا بە رەزامەندی دەوڵەتی یەکگرتووی کۆریای پێشو بوو، بە مەرجێك پێڕەوی هەندێ نۆرمی یاسایی وەك هەڵبژاردنی حکوومەتێك بە ئازادی بۆ تێکرای کۆریا بکرێت، بەڵام بوونی دەسەڵاتێك بەکردەنیی لە باکور و مانەوەی، بووە هۆی راگەیاندنی دەوڵەتێکی جیاواز لە باشووریش. بەم جۆرە دوو دەوڵەت پێکهاتن، یەك لە باشوور و یەك لە باکور، دواتریش هەردوو دەوڵەتی کۆریای باکوور و کۆریای باشوور بە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان وەرگیران.

هەرچەندە تایوان حکوومەتێکی فیعلی هەبوو، بەڵام دانی پێدا نەنرا وەك دەوڵەتێکی جیا، چونکە حکوومەتەکەی گواستەوە بۆ دەرەوەی چین "منفی" و بەدرێژایی ماوەیەکی زۆر داوای جیابوونەوەی نەدەکرد، بگرە بەردەوامبوو بەو پێیەی گوایە حکوومەتی چینە.

---

96- R Mulerson, Internaional Law,Rights and Politics, London.1994, p.119

بەم جۆرە مەرجی بوونی حکوومەت هەندێ ئاسەواری یاسایی لێ دەکەوێتەوە. لـە لایەنـە پۆزەتیڤەکەیەوە بوونی حکوومەت، واتا دەسـەڵاتی حـوکمڕانی لـە هـەرێمێکی دیـاریکراودا بەڵگەیە، کە لەوێ پێگەیەکی یاسایی دیاریکراو هەیە، لە هەمان کاتدا بە گشتی، برێتییە لە مەرجێکی پـێش پێکهێنـانی دەوڵـەت. بـەردەوامی حکوومـەت لـە هـەرێمی پێوەندیـداردا هۆکارێکی گرینگە لەو هۆکارانەی، کە کەسی یاسایی بەرجەستەدەکەن. سەرەڕای ئـەوەی کـە یاسا دەوڵەت جیادەکاتەوە لە حکوومەتەکەی، تەنیا حکوومەت دەوڵەتەکەی ئیلـزام دەکـات. بۆ نموونە لە رێگەی پەیماننامەوە. بەم جۆرە بـوونی حکوومـەت لـە هـەرێمێکی دیـاریکراودا مەرجێکی پێشـەکییە بـۆ دامەزرانـدنی پێوەنـدیی نێودەوڵـەتی ئاسـایی، بـەڵام لـە لایەنـە نەگەتیڤەکەیەوە ئەگەر قەوارەیەك شێوازێکی پتەوی نەبێت لـە شـێوازەکانی حکوومـەت لـە هەرێمێکی دیاریکراودا ئەوە ئاستەنگ دەکەوێتە پێش پرۆسەی گواستنەوەی ئەو هەرێمـە بـۆ دەوڵەت، سەرەڕای نەبوونی هۆکاری دیکەش وەك دانی سەربەخۆیی بە هەرێمی پێوەندیدار لـە لایەن دەسەڵاتی بەرپرسی پێشووەوە.

بە کورتی پێکهێنانی دەوڵەت تەنیا حاڵەتێکی واقیعی نییـە، بگـرە لـە رووی یاسـاییەوە برێتییە لە دڵنیابوون لە سنووری داواکردنی ماف، بە تایبەتی مافی شایسـتەیی بـەڕێوەبردنی هەرێمێکی دیاریکراو. رەوایـەتی ئـەو داواکردنـەی مـاف دەوەسـتێتە سـەر هەنـدێ راسـتی پێوەندیـدار بـە کارەکـەوە و ئـەو بەرهەڵسـتییەی بەرامبـەری دەکرێـت. هـەروەکو مافـە هەرێمییەکانی دیکەش، حکوومەتیش وەك مـەرجێکی پێشـەکی بـۆ دامەزرانـدنی دەوڵـەت مەرجێکی رێژەییە لە هەندێ جاردا نەبێ، بەڵام کارەکـە جیـاوازە لـە هەنـدێ حاڵەتـدا. وەك دەزانینن هەر دەوڵەتێك برێتییە لە دەزگەیەکی رەسـەن کـە لەسـەر سـەربەخۆییەکی سیاسـی دیاریکراو بونیادنراوە. ئەمەش لە رێککەوتننامەکەی مۆنتیڤیدیۆدا هـاتووە، وەك " توانـای چوونە ناو پێوەندیی نێودەوڵەتییەوە لەگەڵ دەوڵەتانی تردا".

پێویستە زەرورەتی بوونی حکوومەتێکی فیعلـی وەك دیادەیـەکی سـەرەکی بێـت تـاوەکو بەکاربهێنرێت بۆ بەهێزکردنی داواکاری پێکهێنانی دەوڵەت لە لایەن قەوارەی پێوەندیـدارەوە. چونکە حکوومەت یـان حکوومـەتی فیعلـی برێتییـە لـە بناخەیـەکی پێویسـت بـۆ پێـوەرە سەرەکییەکانی تری سەربەخۆیی.

سەرباری ئەمانە، یاسای نێودەوڵەتی کاتێك "هەرێم" پێناسە دەکات بەو رێگەیەدا نـاڕوات، کە یاسای نێوەخۆیی دەیگرێتەبەر سەبارەت بە خاوەندارێتیی عەقار، بگرە دەڕوانێتە هەرێم لـەو

روانگەوە ئایا حکوومەتەکە پیادەی دەسەڵات دەکات یان دەتوانێت پیادەی بکات بە سەر هەرێم و دانیشتووانی پێوەندیداردا. چونکە سەروەری هەرێم خاوەندارێتیی هەرێم نییە، بگرە برێتییە لە پیادەکردنی دەسەڵاتی حکومی بە سەر هەرێمەوە. کەواتە هۆکاری باش هەن، کە حکوومەت بە گرینگترین پێوەر دابنرێت بۆ پێکهێنانی دەوڵەت بە رادەیەك ئەو پێوەرەکانی دیکە پێوەستن پێیەوە. لە روانگەی کاروباری هەردوو، ناوەخۆ و دەرەوە، ئەمە دروستە. دەسەڵاتی حکوومەتی برێتییە لەو بناخەیەی کە پێوەندییە نێودەوڵەتییە ئاساییەکانی نێوان دەوڵەتانی لەسەر بونیاددەنرێ. هەر کارێکی قەوارەکە بە شێوەیەکی سەرەکی لە رێگەی گەڕانەوە بۆ دەزگە سەرەکییەکانی حکوومەت واتا دەزگەی یاسادانان و دەزگەی جێبەجێکاری و دەزگەی دادوەری دیاریدەکرێت.

**وەك بەرئەنجام دەتوانین بڵێین:**

١- پێویستە لەسەر ئەو قەوارەیەی دەیەوێ ببێتە دەوڵەت حکوومەتێك یان رێکخراوێکی شێوە حکوومەتی هەبێت، کە بە شێوەیەکی گشتی کۆنترۆڵی هەرێمەکەی بکات و لە توانایدا بێت ئەو قەوارانەی تر، کە داواکارییان بە سەرییەوە هەیە دووربخاتەوە.
٢- یاسای نێودەوڵەتی مەرجی تایبەتی دانەناوە بۆ سرووشت و رادەی ئەم کۆنترۆڵە، جگە لە بەرقەراری یاسا و ئاسایش و بونیادنانی دەزگە سەرەکییەکان.
٣- لە کاتی پراکتیزەکردنی پرەنسیپە گشتییەکەدا بەسەر حاڵەتە تایبەتەکاندا، دەبێت ئەم خاڵانە لەبەر چاو بگیرێت:

١- پێویستە مەرجی دەسەڵاتی بەکردەنیی بەوردی جێبەجێ بکرێ کاتێك داواکاری پێکهێنانی دەوڵەت تووشی بەرەنگاری دەبێتەوە بەناوی یاسای نێونەتەوەییەوە.
٢- پێویستە بزانرێت ئایا ئەو حکوومەتەی داوای دانپێدانان دەکات و کۆنترۆڵی تەواوی هەرێمە پێوەندیدارەکە ناکات دەسەڵاتی وەدەسهێناوە لە رێگەی رەزامەندی دەوڵەتی پێشووەوە و پیادەی جۆرە دەسەڵاتێك دەکات بە سەر هەرێمەکەدا یا نا.
٣- جیاوازی هەیە لەنێوان پێکهێنانی دەوڵەتێکی نوێ لە لایەکەوە و بەردەوامبوونی دەوڵەتێکی پێکهاتووەوە لە لایەکی دیکەوە. لە حاڵەتی یەکەمدا دەبێت پێوەری

کۆنترۆڵی بەکردەنیی بە وردی جێبەجێ بکرێت.[97]

توانای دەوڵەت لە بەستنی پێوەندیی لەگەڵ دەوڵەتەکانی تـر لایـەنێك لـە بـوونی قـەوارە پێکدێنێ و هەروا بەڵگەیەکیشە بۆ پێزانین لە لایەن دەوڵەتەکانی ترەوە. ئەم پێوەندییـە تـەنیا مافی دەوڵەتـە خـاوەن سـەروەرییەکان نییـە، بگـرە رێکخـراوە نێودەوڵەتییـەکان و دەوڵـەتی ناسەربەخۆیش بۆیان هەیە پێوەندیی یاسایی پێکبێنن لەگەڵ قەوارەی تر بەپێی نۆرمی یاسـای نێودەوڵەتی، بەلاّم پێویستە دەوڵەتی خاوەن سەروەری توانای تەواوی هەبێت پێوەندی یاسـایی لەگەڵ قەوارەکانی تر ببەستێت بەو شێوەیەی پێی وایە گونجاوە بۆ خۆی. ئەگەر ئەم توانایە بەو شێوەیە فراهەم نەبێ قەوارەکە بەوە دانانرێ، کە دەوڵـەتێکی سـەربەخۆیە. بـاس باسـی ئـەو فشارە سیاسییە نییە، کە ولاّتێك لەسەر ولاّتێکی دی پیادەی دەکات بۆ ئەوەی پـاڵی پێـوەنێ کارێ بکـات یـان کارێـك رەت بکاتـەوە. ئەمـەش زۆر جـار لـە کۆمەڵگـەی نێودەوڵەتیـدا روودەدات، بگرە باسەکە لەسـەر نـەبوونی دەسـەلاّتی چـوونە نێـو پێوەنـدیی نێودەوڵەتییـە، جیاوازییەکە ئەوەیە، کە بوون یان نەبوونی ئەهلییەتی یاسایی خۆی کاریگەریی دەبـێ بەسـەر بڕیارەکاندا، نەوەك ڕادەی دەسەلاّت و فشار.

97- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

2006 pp 55.J.Crawford, The Creation of States in International Law 2 ed, Oxford

**٦- جۆرەکانی دەوڵەت:**

**١ - دەوڵەتی سادە**

تایبەتمەندیی دەوڵەتی سادە ئەوەیە، کە دەسەڵات تێدا ناوەندییە و یەکە کارگێڕییەکانی بەبێ ئۆتۆنۆمین و کەسایەتی یاسای نێودەوڵەتییان نییە. واتا کاروباری دەرەوە و ناوەخۆی دەوڵەت بە یەك دەزگە سپێردراوە. دەوڵەتی سادە یەك دەستوور و یەك پەرلەمان و یەك حکوومەتی هەیە. ئێستە زۆرینەی دەوڵەتەکانی جیهان سادەن وەکو: فەرەنسا، بولگاریا، ژاپۆن، ئێران، تونس، ئەرگوای، چیلی و سعوودیە.

**٢- دەوڵەتی پێکهاتەیی:**

دولەتی پێکهاتەیی لە یەکگرتنی زیاتر لە دەوڵەتێك، یان لە ویلایەتێك پێکدێ و دەزگەیەکی هاوبەش یان سەرۆکێکی باڵا، تیادا دەسەڵات دەگرێتە ئەستۆ. ئەم دەوڵەتانە دابەش دەبن بۆ یەکیەتیی کەسیی و یەکیەتیی کردەیی و یەکیەتیی کۆنفیدراڵی و یەکیەتیی فیدراڵی.

**١- یەکیەتیی کردەیی (پراکتیکی)**

ئەم یەکیەتیییە لە زیاتر لە دەوڵەتێك پێکهاتووە، کە لەنێوەخۆیاندا لەیەك دەوڵەتدا یەکدەگرن. ئەو دەوڵەتەی دەچێتە پاڵ ئەم جۆرە یەکیەتیییە سەروەریی دەرەکی و کەسایەتییە یاساییە دەرەکییەکەی لە دەست دەدات و بوونی کەسێکی یاسایی نێودەوڵەتی نوێ سەرهەڵدەدات. دەکرێ ئاماژە بەم یەکیەتیییە پراکتیکییانە لە مێژوودا بدرێ: یەکیەتیی سویدی-نەرویژی ١٨١٤-١٩٠٥، یەکیەتیی هەنگاری- نەمساوی ١٨٦٧-١٩١٨ و یەکیەتیی دانیمارکی- ئیسپانی ١٩١٤-١٩١٨.

**٢- یەکیەتیی کەسیی:**

ئەو یەکیەتیییە لەژێر دەسەڵاتی تاکە سەرۆك دەوڵەتێکدا بونیاددەنرێ، بەتایبەتی لە دەوڵەتە شانشینەکاندا. دەبینین شایەك لە هەمان کاتدا دەبێتە سەرۆکی دوو دەوڵەت یان زیاتر و هەر دەوڵەتێك کەسایەتیی یاسایی نێودەوڵەتی خۆی دەپارێزێ، وەك یەکیەتیی پۆلۆنیایی- لیتڤی ١٣٨٦-١٦٦٩، یەکیەتیی ئینگلیزی- هانۆڤەری ١٧١٤-١٨٣٨ و یەکیەتیی هۆڵەندی- لوکسومبۆرگی ١٨١٥-١٨٩٠.

### ٣- یەکیەتیی کۆنفیدراڵی:

بە زۆری، ئەم جۆرە یەکیەتییە بەپێی پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی پێکدێت کە لایەنەکانی کۆك دەبن لەسەر پێکهێنانی هەندێ دامودەزگەی ناوەندی لە بوارەکانی سیاسەتی دەرەوە و بەرگری و ئابووری. ئەو دەوڵەتانەی یەکیەتیی فیدراڵی پێکدێنن سەربەخۆیی و کەسایەتییە یاساییە نێودەوڵەتییەکەیان دەپارێزن. وەرگرتنی بڕیار لە چوارچێوەی یەکیەتییەکەدا بە زۆرینەی زۆری دەنگ دەبێ، یان بە گشتی دەبێ. ئەم شێوە یەکیەتییە سیفەتێکی کاتی هەیە. زۆر جار یەکیەتییەکە هەڵدەوەشێتەوە بە بێ ئەوەی کاریگەری هەبێت بە سەر پێگەی یاسایی دەوڵەتە لایەنەکان یان دەبێتە یەك دەوڵەتی فیدراڵی. چەندین نموونە لە مێژوودا هەن لەبارەی ئەم شێوازە دواینەی کۆتایی پێهاتنی یەکیەتیی کۆنفیدراڵی، بۆ نموونە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە سەرەتای پێکهاتنی لە ساڵی ١٧٧٦ دەوڵەتێکی کۆنفیدراڵی بوو، بەڵام لە ساڵی ١٧٨٦ بووە دەوڵەتێکی فیدراڵی. هەروەها ولاتی سویسراش، کە لە ساڵی ١٧٩١ لە دەوڵەتێکی کۆنفیدراڵی پێکهات، ساڵی ١٨١٨ بووە دەوڵەتێکی فیدراڵی و پەسەندی دەستووری دەوڵەتێکی فیدراڵی کرد و بەپێی ولاتەکە کرایە ٢٣ ویلایەت هەر ویلایەتێکی دەستوور و پەرلەمان و حکوومەتێکی تایبەت بە خۆی هەبوو. بۆیە کۆنفیدراڵی پتەوترین شێوەیە لە شێوەکانی هاوکاری نێوان ئەو دەوڵەتە سەربەخۆیانەی پێکەوە کاردەکەن بە گوێرەی پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی و بەپێی هەندێ دەزگەی ناوەندی خاوەن ئەرکی دیاریکراو پێکدەهێنرێن. بۆ نموونە پەیمانی بەرایی سەبارەت بە پێکهێنانی یەکیەتیی کۆنفیدراڵی نێوان یەکیەتیی کۆنفیدراڵی بۆسنە- هیرسوگوڤینیا و کۆماری کەرواتیا لە ساڵی ١٩٩٤ لە دەقەکەیدا دەڵێ: دامەزراندنی یەکیەتیی کۆنفیدراڵی (( پێناسەی نێودەوڵەتی یان کەسایەتی یاسایی کەرواتیا یان یەکیەتییە فیدراڵییەکە ناگۆڕێ)).[٩٨] لە پاش داڕوخانی یەکیەتیی سۆڤێت و جیابوونەوەی کۆمارە فیدراڵییەکان و پێکهاتنی دەوڵەتانێکی سەربەخۆ سەر لە نوێ بڕیاریاندا فیدراسیۆنی دەوڵەتە سەربەخۆکان بونیاد بنێن. سەرەتا یەکیەتییەکە لە هەر یەك لە رووسیا و بیلۆرووسیا و ئۆکرانیا لە ١٩٩١/١٢/٨ پێکهات. دوای ئەوەش فرەوان بووەوە بە هاتنەڕیزی ١٢ دەوڵەتی تر، پێشتر هەر یەکە و کۆمارێك بوون لە چوارچێوەی یەکیەتیی سۆڤێتی پێشوو. دۆکومێنتی پێکهاتنی یەکیەتییەکە، کە بریتییە لە پەیماننامەیەکی

---

98- 33. ILM, 1994, P. 605

نێودەوڵـەتی لایەنـەکان لـەنێوان خۆیانـدا لـە ١٩٩٣/٦/٢٢ مۆریـانکرد، هەنـدێ پرەنسـیپی لەخۆگرتووە، وەك: ڕێزگرتن لە سەروەری و یەکیـەتیی هـەرێمیێ دەوڵەتـەکان و مـافی بڕیـاردانی چارەنووسی گەلان و قەدەخەکردنی بەکارهێنانی هێـز یـان هەڕەشـەکردن پێـی، یەکلاکردنـەوەی کێشەکان بە ئاشتی. هەروا دۆکومێنتەکـە جـەختی کـردووە، کـە (( کۆنفیدراسـیۆنی دەوڵەتـە سەربەخۆکان نە دەوڵەتە و نە قەوارەیەکیشە بە سەرووی دەوڵەتەکانەوە))[99]

یەکیەتیی کۆنفیدراڵی پێکدێ لە ئەنجومەنی سەرۆکانی دەوڵەتەکان، کە باڵاترین دەزگەیـە لە یەکیەتییەکە و چەند دەسەڵاتێکی هەیە پێوەستن بە کێشە پرەنسیپیەکانەوە، هەروەها پێك هاتووە لە ئەنجومەنی سەرۆکەکانی حکوومەتەکان و ئەرکی هەماهەنگی و هاوکارییە لەنێوان دەزگە جێبەجێکارییەکان لە دەوڵەتـە ئەندامەکانـدا. پێویسـتە تاکیـد بکـرێ، کـە ئـەم دوو ئەنجومەنە بڕیارەکانیان بە گشتی دەنگ وەردەگرن. شان بەشانی ئەم دوو دەزگەیە ئەنجومەنێك هەیـە بـۆ وەزیرانـی دەرەوە و لیژنـەی هەماهـەنگی و لیژنـەی ڕاوێـژکاری، کـە لیژنەیـەکی جێبەجێکاری و هەماهەنگی هەمیشەییە بۆ یەکیەتییەکە. هەروا کۆمەڵێکی تر لـە لیژنـەی لاوەکی تایبەت بە بواری ئابووری و سەربازی و کولتووری پێکهاتووە.[100]

## ٤ - یەکیەتیی فیدراڵی:

ئەم یەکیەتییە لە چەند کۆمارێك یان چەند ویلایەتیك یان چەند هەرێمێك پێکدێت. هەر یەکەیان سەربەخۆیی خۆیان هەیـە لـە هەنـدێ کاروبـاری نێوەخـۆدا بـەپێی پەیماننامەیـەکی نێودەوڵەتی یان دەستوورێك، کە سیستەمە فیدراڵییەکە بـە گـوێرەی پێکـدێت. سـەربەخۆیی ویلایەتەکان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا جیاوازە بەپێی جیاوازی ئەو دۆکومێنتەی هەر یەك لە ویلایەتەکانی پێکهێناوە. هەر ویلایەتێك بەشداری لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا دەکەن وەك کەسێکی یاسای نێودەوڵەتی بە قەد ئەو دەسـەڵاتانەی دەسـتوور پێـی دەدات، وەك: بەسـتنی پەیماننامەی نێودەوڵـەتی و ئەنجامـدانی دانووسـتانی نێودەوڵـەتی. وەك نـۆرمێکی گشـتیش یەکیەتیی فیدراڵ کەسی یاسایی سەرەکی پێکدێنێ لە یەکیەتییەکە و گوزارشت لـە هـەموو ویلایەتەکان دەکات لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا.

---

99- 34. ILM. 1995. P. 1298

١٠٠- هەمان سەرچاوە

دەستوور، لە دەوڵەتی فیدراڵیدا، سەرچاوەی دابەشکردنی دەسەڵاتە. دەستوور خۆی بۆ خۆی لە ڕێککەوتن پێکدێت لەنێوان ئەو قەوارە Entites سیاسیانەی، کە هەر یەکەو سەرکردایەتی هەرێمێك یان نەتەوەیەك یان کۆمەڵە کەسانێك دەکات، کە بەرژەوەندی و مێژوو و خاکی هاوبەشیان هەیە و دەیانەوێت لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی یەکگرتووی فیدراڵیدا ئەمانجەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن. ئەوان لە لایەکەوە دەیانەوێت سەربەخۆ بن لە چوارچێوەی هەرێمەکانی خۆیاندا، لەولاشەوە دەیانەوێت هێزەکانیان یەك بخەن بەئامانجی دروستکردنی دەوڵەتێکی یەکگرتووی بەهێزتر لە رووی سیاسی و ئابووری و سەربازییەوە. سەرەڕای ئەمانە رەنگە ریشەی ئەم یەکگرتنەش بگەڕێتەوە بۆ چەند رووداو و راستییەکی مێژوویی وا بە جۆرێك وایان لێ بکات، کە لە چوارچێوەی یەك دەوڵەتدا بەرژەوەندیی گشتی خۆیان بتوانن باشتر بپارێزن.

بە چەند شێوەیەك دەستوور دەسەڵات بەسەر حکوومەتی ناوەندی و حکوومەتە هەرێمییەکاندا دابەشدەکات. هەندێ دەستوور دەسەڵاتەکانی حکوومەتی ناوەندی دیاریدەکەن و ئەوانەی دەمێننەوە دەدرێن بە حکوومەتی هەرێمەکان. هەندێ دەستووری دیکەش دەسەڵاتی حکوومەتی هەرێمەکان دیاری دەکات و ئەوانی دیکەش بۆ حکوومەتی ناوەندی دەهێڵێتەوە. دەستووریش هەیە دەسەڵاتی هەر یەکە لە حکوومەتی ناوەندی و حکوومەتەکانی ئەندام دیاری دەکات و سنوورداریان دەکات.

دەستووری عێراق ساڵی ٢٠٠٥ لە مادەی (١١٠)دا دەسەڵاتە حەسرییەکانی دەسەڵاتە فیدراڵییەکانی دیاریکردووە و لە مادەی (١١٤)دا دەسەڵاتە هاوبەشەکانی نێوان دەسەڵاتی فیدراڵی و دەسەڵاتی هەرێمەکانی دیاریکردووە. لە مادەی (١١٥)دا ئاماژەدەکات، کە هەر شتێك کە لە دەسەڵاتە حەسرییەکانی دەسەڵاتە فیدراڵییەکاندا نەهاتبێت ئەوە لە دەسەڵاتی هەرێمەکاندایە و لە حاڵەتی ناکۆکیدا،سەبارەت بە دەسەڵاتە هاوبەشەکان، پێشەکی بۆ یاسای هەرێمەکان دەبێت.

شانبەشانی پیادەکردنی رۆژانە رێسایەکی یاسایی هەیە بەپێی هەندێ دەسەڵاتی سەروەری دەدرێن بە حکوومەتی مەرکەزی. لەوانە دارشتنی سیاسەتی دەرەوە و بەستنی رێککەوتننامەی نێودەوڵەتی و پەیمانی ئاشتبوونەوە و جاڕدانی جەنگ و پەیمانی سەربازی و کردنەوە و داخستنی پێوەندیی دیبلۆماسی و بە ئەندامبوون لە رێکخراوی نێودەوڵەتی دەگرێتەوە. لە رووی ناوەخۆوە کاروباری دارایی و دارشتنی بوجەی گشتی وڵات و سەرپەرشتی

کردنی کاروباری پێوەر و کێشەر و دامەزراندنی سوپا و بەرگریکردن لە گشت وڵات لە مەترسی دەرەوە و چاپکردنی دراو و لێدانی سکە و هەندێ دەسەڵاتی گشتی تریش دەچنە خانەی دەسەڵاتەکانی حکوومەتی ناوەندەوە. ئەو دەسەڵاتەکانی دیکەش، کە دەمێننەوە دەکەونە چوارچێوەی دەسەڵاتی حکوومەتی هەرێمە ئەندامەکان.

دابەشکردنی دەسەڵات لە دەوڵەتی فیدراڵیدا وا دەکات مەسەلەی گرینگ سەرهەڵبدەن لە یاسای نێودەوڵەتیدا، بە تایبەتی لە ڕووی کەسایەتیی یاسایی نێودەوڵەتی و یاسابەندی و بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتییەوە.

بێگومان دەوڵەتی فیدراڵی کەسایەتیی یاسایی نێودەوڵەتی تەواوی هەیە، بەڵام دەستووری ویلایەت یان دەستووری یەکیەتییە ناوەندییەکە و مومارەسەی باو لەسەر ئاستی پێوەندییەکانی ویلایەتەکە لەگەڵ دەوڵەتەکانی تردا ئەهلییەتی یاسایی ویلایەتەکە و توانای یاسایی دیاریدەکەن بۆ چوونە نێو پێوەندیی نێودەوڵەتی یاساییەوە. ویلایەتی فیدراڵی دەتوانێ کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتی جیا لە دەوڵەتی فیدراڵی وەدەست بێنێ لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی لە ڕێگەی ڕێککەوتن یان پێزانین وەك ئەو حاڵەتەی لە کاتی سەرهەڵدانی دەوڵەتی نوێ ڕوودەدات[101]. دەبینین وەرگرتنی هەردوو کۆماری بیلارووسیا و ئۆکرانیای سۆڤێتی بە دوو ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا لە ساڵی ١٩٤٥ وەك پێزانینێك بوو بە کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتییان، کە هیچ گومانێکیان لەسەر نییە.

لە مادەی (٥)ی بڕگە (٢)ی ڕەشنووسی یاسای پەیماننامەکان، کە لێژنەی یاسایی نێودەوڵەتی ئامادەی کردبوو هاتووە: ((ویلایەتە فیدراڵییەکان لە دەوڵەتی فیدراڵیدا لە توانایاندا هەیە پەیمان ببەستن ئەگەر دەستووری فیدراڵی دانی پێدانا و بەستنی پەیمانەکە لە چوارچێوەی ئەم دەسەڵاتانە بوو))، بەڵام ئەم مادەییە لە کۆنفرانسی ڤیەننا لەبارەی یاسای پەیماننامەکان ڕەتکرایەوە بە بیانووی ئەوەی، کە ئەم حوکمە لە دەرەوەی ئەرکی کۆنفرانسەکەیە. بیانووی سەرەکی ڕەتکەرەوەکان ئەوە بوو گوایە ئەم مادەیە ماف بە لایەنی سێیەم دەدات دەست وەرداتە کاروباری ناوەخۆی دەوڵەتە فیدراڵییەکان لە ڕێگەی داواکردن بۆ شرۆڤەکردنی ئەحکامی دەستوورەکانیان. هەروا پێیانوایە ئەم مادەییە پرسیی یەکلاکردنەوەی کێشەی کەسایەتیی یاسایی لە ئەرکی یاسای نێوەخۆییەوە دەگوازێتەوە بۆ ئەرکی یاسای نێودەوڵەتی[102].

---

101- I. Brownlie, Principles. P.75
102- A/ conf, 39/SR.8, 28 April. 1969

ئەگەرچی دەستووری ناوەندی لە کاتی دابەشکردنی دەسەڵاتدا هەندێ جار جەخت دەکاتە سەر کۆتبەندکردنی دەسەڵاتی ویلایەتەکان سەبارەت بە بەستنی پەیماننامەی نێودەوڵەتی، بەڵام پراکتیکی نێودەوڵەتی مافی هەر ویلایەتێکی چەسپاندووە، کە دەبێ ئەوەندە کەسایەتیی یاسایی نێودەوڵەتی هەبێت، بە شێوەیەك زەمانەتی ئەوە بکات، کە بتوانێ هەندێ لەو پەیماننامانە ببەستێ، کە بە شێوەیەکی توندوتۆڵ بەستراون بە بەرژەوەندی ویلایەتەکەوە و زەروورەتی ئاسایشی نێودەوڵەتییەوە. لۆترپاخت (Lauterpacht) لە ڕاپۆرتێکیدا لەبارەی یاسای پەیمان، دەڵێت: ((ئەو پەیواتانەی ئەندامەکانی یەکیەتییەکە لە دەوڵەتی فیدراڵیدا دەیبەستن، بەپێی یاسای نێودەوڵەتی بە پەیمان دادەنرێن)).[103] وێڕای ئەوەش بە ئەزموون دەرکەوتووە دەوڵەتە بیانییەکان جگە لە هەندێك حاڵەت نەبێ، ئامادە نین دانبنێن بە پێگەی کەسی یاسایی و نێودەوڵەتی تەواوی ئەندامەکانی یەکیەتیی فیدراڵیدا، دەبینین بەشداریکردنی ڕاستەوخۆی ئەندامەکانی یەکیەتیی فیدراڵ لە پێوەندییە یاساییە نێودەوڵەتییەکاندا مەسەلەیەکی ئاڵۆزە، چونکە دەوڵەتە بیانییەکان وای بە باشتر دەزانن مامەڵە لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندیدا بکەن.[104]

یاساناسانی تر هەن دان نانێن بە کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتی ئەندامانی یەکیەتیی فیدراڵدا، بۆ نموونە فیتسمۆریس (Fitzmourice) ئاماژەی داوە، کە ئەندام لە یەکیەتیی فیدراڵیدا وەك بریکارێك بۆ ئەو دەوڵەتە فیدراڵییە ناوەندییە مامەڵەدەکات، کە تەنیا خۆی کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتی هەیە تەنیا ئەویش ئەو قەوارەیەیە، کە پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان ئیلزامی دەکەن و بەرپرس دەبێ لە جێبەجێکردنیان.[105]

ناکرێ ئەم بۆچوونە پەسەندبکرێ تەنیا لە حاڵەتێکدا نەبێ، ئەویش کاتێك یەکیەتییە فیدراڵییەکە لە چەند هەرێمێك پێکدێت، کە پێشتر دەوڵەت بوون. ئەو کات پێوەندیی نێوانیان تۆخمی نێودەوڵەتی وەردەگرێ و دوایەش یەکیەتیی فیدراڵی وەك وەکیلێك بۆ دەوڵەتە یەکگرتووە فیدراڵییەکان ڕەفتار دەکات، وەك ئەو حاڵەتەی لە سویسرا هەیە.

لە چەند بارێکی دیکەدا هەندێ لە ویلایەتەکان بەرەو فرەوانبوونی دەسەڵاتەکانیان هەنگاودەنێن بە شێوەیەك بە تەواوی لە دەوڵەتی سەربەخۆ نێزیك دەبنەوە. دەبینین دەستووری

103- Yearbook of the ILC,1953, VOL.11, P.139

١٠٤- ا. ا. لوکاشوك: یاسای نێودەوڵەتیی گشتی، بەشی گشتی، مۆسکۆ ل ٣١٠

105- Yearbook Of the ILC, 1958. VOI.11, P.24.

تەتەرستان، کە کۆمارێکە لە چوارچێوەی یەکیەتیی فیدراڵی رووسیدا، لە ساڵی ١٩٩٢بەم شێوەیە پێناسەی پێگەی یاسایی کۆماری تەتەرستانی کردووە: ((تەتەرستان دەوڵەتێکە خاوەن سەروەرییە و کەسێکە لە کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی)) و ((خۆی سیاسەتی دەرەوەی دادەڕێژێت)). ڕوونە ئەم پێگە یاساییە بە لای رووسیاوە سنووری یەکیەتیی فیدراڵی دەبەزێنێ. لە بەر ئەمەش دادگەی دەستووری لە یەکیەتیی فیدراڵی رووسیدا ساڵی ١٩٩٢ ئاماژەی داوە، کە ئەو ئەحکامانەی سەبارەت بە سەروەری نێودەوڵەتی تەتەرستان هاتوون لارییان هەیە لەگەڵ ئەو پێگە دەستوورییەی کە یەکیەتییە فیدراڵییەکە هەیەتی.[١٠٦] لە رووی دەسەڵاتی بەستنی پەیماننامەی نێودەوڵەتییەوە دەوڵەتە فیدراڵییە جیاجیاکان سیستەمی جیاجیایان داناوە بەپێی پەیمان یان ئەو دەستوورەی، کە دەسەڵات لەنێوان ویلایەتەکان و یەکیەتیی ناوەندی دابەش دەکات. دەبینین لە هەندێ باردا هەندێ لە ئەندامەکان پێش ئەوەی بێنە یەکیەتییەکەوە هەندێ مەرج بۆ ئەوە دادەنێن. بۆ نموونە دەستووری سویسرا مافی بەستنی پەیمان لەگەڵ دەوڵەتە بیانییەکان سەبارەت بە کێشەکانی تایبەت بە ئابووری و پێوەندی سنوور و کاروباری پۆلیس دەداتە کانتۆنەکان. دەستووری ئەمەریکاش دەسەڵاتی بەستنی پێوەندی دەرەوەی داوەتە تەنیا حکوومەتی فیدراڵی. وێڕای ئەوەش هەندێ لە ویلایەتە ئەمریکییەکان ڕێککەوتننامە دەبەستن لەگەڵ دەوڵەتی بیانی یان ویلایەتەکانی دیکە لەبارەی دامەزراندن و نوێکردنەوەی ڕێ و بانی خێرا و پردی نێودەوڵەتی، ئەویش لە پاش ڕاوێژکردن لەگەڵ دەسەڵاتە فیدراڵییەکاندا.

دەستووری بۆسنا - هیرسۆگۆڤینیا لە مادەی (٣)یدا دەڵێت: ویلایەتەکان مافیان هەیە پێوەندیی تایبەت دامەزرێنن لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێیەکان لە چوارچێوەی سەروەری بۆسنە و هیرسۆگۆڤینیا و یەکیەتییە هەرێمییەکاندا، هەر ویلایەتێکیش بۆی هەیە بچێتە ڕێککەوتننامەوە لەگەڵ دەوڵەت و ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بە ڕەزامەندیی کۆمەڵەی پەرلەمانی Parliamentary Assembly و کۆمەڵەی پەرلەمانیش بۆی هەیە بە یاسایەك بڕیاربدات، کە هەندێ لە جۆرەکانی پەیمان ئەم جۆرە ڕەزامەندییە ناخوازێ.[١٠٧]

---

١٠٦- ا. ا. لوکاشوك هەمان سەرچاوە ل ٣١٢

١٠٧- یەکەتیی فیدراڵی بۆسنا و هیرسۆگۆڤینا لە دوو ویلایەت پێکهاتووە: ١ – یەکەتیی بۆسنا و هیرسۆگۆڤینا ٢ –کۆماری سربسکە. ئەم یەکەتییە لە ساڵی ١٩٩٥ بەپێی ڕێککەوتننامەی دایتون پێکهات.

دەستووری عێراق باسی مافی هەرێمی کوردستانی نەکردووە بۆ بەستی پەیمانی نێودەوڵەتی، بەڵام بە کردەوەی ڕۆژانەی هەرێمی کوردستان و دەوڵەتانی بیانی دانندراوە بەو مافەدا بە شێوەیەکی بێ دەنگی. بەڵگەش ئەوەیە کە ئێستە زیاتر لە بیست کونسوڵگەری بیانی لە هەولێردا هەن و زۆرینەی زۆریان لەپاڵ ئەرکی کونسوڵگەریدا ئەرکی دیبلۆماسیش جێبەجێدەکەن، ئەمەش تەنیا لەگەڵ کەسی یاسای نێودەوڵەتیدا ئەنجامدەدرێت.

ئەو ڕاستییانەی سەرەوە ئەوە دەگەیەنن، کە ئەو بنەما گشتییانەی دەستووری یەکیەتیی فیدراڵی و دەستووری هەر هەرێمێکیان لەسەر دروستکراوە لەگەڵ مومارەسەی بەکردەنیی هەرێمە فیدراڵییەکان سنووری کەسایەتیی نێودەوڵەتی هەرێمەکان دیاری دەکەن. واتە دەستوور هەرچەندە رادیکاڵ و نەرم بێت و سەردەمانە و دوور لە توندڕۆیی بێت، ئەوەندە دەسەڵاتی هەرێمەکان فرەوانتر دەبن و پێوەندیی نێوان ئەندامەکانی یەکیەتییەکە پتەوتر دەبن. پێچەوانەی ئەمەش راستە. پێڕەوکردنی سیاسەتی گوماندار و جیاوازی و رەگەزپەرستانە و تایفەگەری و کۆنەپەرستانە و ناشارستانییانە لە لایەن حکوومەتی ناوەندەوە بەرامبەر هەرێمەکان دەبنە هۆکاری دوورکەوتنەوەی هەرێمەکان لەیەکدیی و دروستبوونی کێشە و گەڕان بە دوایی شێوەیەکی ی جێبەجێکردنی مافی چارەنووسدا.

لە بەر ڕۆشنایی ئەو بۆچوونانەی سەرەوە، دەکرێ بگەینە بەرئەنجامی ئەوەی، کە ناوەڕۆکی دەستووری نێوەخۆیی یەکیەتیی فیدراڵی ویلایەتەکان و مومارەسەی بەکردەنیی ویلایەتەکان بازنەی کەسایەتیی یاسایی ویلایەتەکان یەکلادەکەنەوە. پێزانینیش بەو کەسایەتییە، هەرێمەکە دەگوازێتەوە بەرەو کەسایەتییەکی یاسایی نێودەوڵەتی کامڵتر.

### ٣- دەوڵەتی سەروەریی ناتەواو:

دەوڵەتی بێ سەروەری کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتی هەیە، بەڵام لە هەندێ کاروباری نێودەوڵەتیدا کۆتبەندکراوە و ناتوانێ پیادەی بکات، چونکە بەستراوە بە دەوڵەتێکی ترەوە بەپێی ڕێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی.

لە هەمان کات ئەم دەوڵەتانە قەوارەی سەربەخۆیی یاسایی خۆیان و خاوەنداریێتیی هەرێمییان و تەبەعییەتی هاووڵاتیانیان بۆ ئەو هەرێمە بە لای خۆیانەوە دەپارێزن.

یاسای نێودەوڵەتی چەند جۆرێك لە دەوڵەتی بێ سەروەریی بەخۆوەی دیوە. ئەوانیش دەوڵەتە تابیعەکان و دەوڵەتی پارێزراو (محمیة) و ئەو هەرێمانەن کە خراونەتە ژێر سیستەمی مەندات و هەروا سیستەمی ویسایەتەوە.

١- سیستەمی پاشکۆیی تەبەعییەت (Protectorate) و پاراستنی نێودەوڵەتی بەپێی سیستەمی تەبەعییەت دەوڵەتە تابیعەکە لەگەڵ دەوڵەتێکی تر بە پێوەندییەکی یاساییەوە دە بەسترێ و سەربەخۆیی دەرەکی و هەندێ لە دەسەڵاتە نێوەخۆییەکانی لە دەست دەدا بۆ ئەوەی دەوڵەتە (مەتبووعە)ـەکە بیانگرێتە ئەستۆ.[108]

لە حاڵەتی دەوڵەتی پارێزراویشدا (Protected State) قەوارە پارێزراوەکە پێگە یاساییەکەی وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ دەپارێزێ، بەڵام دەچێتە پێوەندییەکی بەڵێنی لەگەڵ دەوڵەتێکی تر و دەسەڵاتی نێوەخۆیی و دەرەکی گرینگ دەداتە ئەمەی دوایی.[109]

جۆری پێوەندیی نێوان هەردوو لا و سرووشتی پێگەی یاسایی و ماف و ئەرکی قەوارەی (تابیع)یان پارێزراو دەگەڕێتەوە بۆ رێککەوتننامەی نێوان هەردوو لا و هەڵوێستی لایەنەکانی سێیەم بەرامبەر ئەو پێوەندییە. بۆ نموونە پەیماننامەی (فاس) ساڵی ١٩١٢، کە لەنێوان فەرەنسا و مەغریب بەسترا، مافی پیادەکردنی هەندێ ئەرکی سەروەری دایە فەرەنسا لە جیاتی مەغریب بە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانیشەوە. وێڕای ئەوەش دادگەی دادی نێودەوڵەتی تاکیدی کرد، کە مەغریب بە دەوڵەتێکی خاوەن سەروەری دەمێنێتەوە پێوەندیی هەر چۆنێك بێت بە فەرەنساوە، ئەویش بەپێی ئەو رێککەوتننامەیەی باسکرا.[110] ئەمە واتە قەوارە پارێزراوەکە وەك دەوڵەت سەروەرییە فەرمییەکەی و پێگە یاساییەکەی خۆی دەپارێزێ و بەم سیفەتە لە هەموو ئاستێکی نێودەوڵەتیدا مامەڵەدەکات بەپێی ئەحکامەکانی ئەو رێککەوتنەی نێوان خۆی و دەوڵەتە پارێزەرەکە، کە مۆری کردووە، بەڵام ڕادەی ئەو دەسەڵاتانەی دراونەتە دەوڵەتی پارێزەر و شێوازی کۆتایی هێنانی رێککەوتننامە مۆرکراوەکە لە هەر حاڵەتێکدا جیاوازییان هەیە. لە هەندێك حاڵدا دەقی رێککەوتننامە تاکیددەکاتە سەر ئیلتیزامکردنی دەوڵەتی پارێزراو بە ڕاوێژکاری دەوڵەتە پارێزەرەکەوە یان پێڕەوکردنی ڕێنماییەکانی لە رووی کاروباری دیپلۆماتی و پێوەندییەکانی دەرەوە. بۆ نموونە کۆمەڵەی گەلان کاتی خۆی قایل نەبوو (Liechtenstein) بێتە ریزییەوە بە بیانووی ئەوەی ئەم قەوارەیە لە توانایدا نییە ئەو ئیلتیزاماتانە جێبەجێ بکات، کە پەیمانی کۆمەڵە خستییە ئەستۆی دەوڵەتە ئەندامەکانی بەو پێیە دەوڵەتی خاوەن سەروەرین، وەك: نوێنەرایەتی

---

108- Oppenheims International Law, P.266
109- Crawford, Creation of statehood PP.187-208
110- ICJ, Reports, 1952, PP.176, 188

دیپلۆماتی[111]. ئەم ڕەتکردنەوەیە لە کاتێکدا هات ئەو دەوڵەتە لایەنێك بوو لە دادگەی دادی نێودەوڵەتی و لایەنێکیش بوو لە کێشەی(Nottebohm)، کە خرابووە پێش دادگەکە[112]. ئەم مافەش تەنیا دەوڵەتەکان هەیانە. هاتنەڕیزی (Liechteustein)یش بۆ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە پایزی ساڵی ١٩٩٠ ئەنجامدرا.

## ٢- **سیستەمی مەندات** Mandate **"الانتداب"**:

دوای سەرکەوتنی دەوڵەتە کۆلۆنیالیزمییەکان لە شەڕی یەکەمی جیهاندا بە سەر ئەڵمانیا و دەوڵەتی عوسمانی و ڕووخانی رووسیای قەیسەری، دەوڵەتە سەرکەوتووەکان پەنایان بردە بەر دانانی سیستەمێکی یاسایی نێودەوڵەتی وا کە ڕێیان بدات دەستبگرن بە سەر سامانەکانی ئەڵمانیا و دەوڵەتی عوسمانیدا. لە پێناو ئەوەشدا سیستەمی مەنداتیان داهێنا، کە مادەی (٢٢) لە دەستووری کۆمەڵەی گەلان دایڕشت. ئەم دەستوورەش پەیمانی ئاشتەوایی ساڵی ١٩١٩ داینابوو.

لە مادەی ٢٢ دا هاتووە، کە ئەم هەرێمانە بەپێی ئەو پرەنسیپە هەڵدەسووڕێنرێن، کە دەڵێت: ((خۆشگوزەرانی و پەرەسەندنی ئەم جۆرە گەلانە ئەمانەتێکی پیرۆزە لە ئەستۆی گەلانی پێشکەوتوو دایە...)) بۆ پیادەکردنی ئەم پرەنسیپە ئەرکی ڕابەرایەتی کردنی ئەم گەلانە درایە ((ئەو گەلە پێشکەوتووانەی کە بە هۆی سەرچاوە و ئەزموون و پێگەی جوگرافییان دەتوانن بەرپرسیارێتی بگرنە ئەستۆ...)).

ئەو هەرێمانەی کە سیستەمی مەندات ئەو کاتە دەیگرتنەوە بەپێی مادەی (٢٢) کرابوون بە (٣) پلەوە. بەپێی مەنداتی پلە (A) هەر یەك لە عێراق و ڕۆژهەڵاتی ئەردەن و فەڵەستین خرانە ژێر مەنداتی بەریتانیاوە و سوریا و لوبنانیش خرانە ژێر مەنداتی فەرەنساوە. مادەی(٢٢) وای دانا ئەم وڵاتانەی، کە سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوون ((بە پلەیەکی پێشکەوتن گەیشتوون، کە بواربدات بە شێوەی کاتی دان بە بوونیاندا بنرێ وەك دەوڵەتی سەربەخۆ، بەڵام بە مەرجێ لە هەڵسوڕانی کاروباریاندا پەنا ببەنە بەر ڕێنمایی دەوڵەتی مەنداتۆر تا ئەو ڕۆژەی دەتوانن خۆیان هەڵسوڕانی هەموو کاروباریان دەگرنە ئەستۆ...)).

گەلانی ئەفریقیای ناوەڕاستیش، کە برێتی بوون لە کامیرۆن و تۆگۆ و تەنجانیقا و رواندا و

111- Report of the 5th Committee of the League 6.12.1920
112- 22. ILR .P.349

بوروندی لە بازنەی مەنداتی پلە (B) دانران و لە بەرئەوەی ئەم گەلانە لە ڕووی پێشکەوتنەوە لە دواوەی کۆمەڵەی یەکەم دەهاتن، ئەوە ئـەرکی بـەڕێوەبردنی هـەرێم بـە دەوڵـەتی خـاوەن مەندات سپێردرا، بەو مەرجەش ڕەچاوی بەرژەوەندی مـادی و مانـەوی دانیشـتووانی بکـات لەسەر بناخەی ئازادی ئەم گەلانە و یەکسانی لەگەڵ گەلانی تردا.

مەنداتی پلە (C ) یش کەناری باشووری ڕۆژئاوای ئەفریقیا/ نامیبیا/ و گینیـای نـویٚ و دوورگەی ساموا و کۆلۆنە ئەڵمانییەکانی باکووری هێڵی یەکسان و دوورگـەکانی (کـارۆلین)ی دەگرتەوە. ڕێدرا بە دەوڵەتی خاوەن مەندات ئەم هەرێمانە وەك بەشێك لە هەرێمـەکانی خـۆی بەڕێوەببات لەگەڵ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییە مادی و مانەوییەکانی دانیشتووانی و ئازادییان.

ئـەرکی لیژنـەی مەنـداتی نێودەوڵـەتی هەمیشـەیی چـاوەدێری بـەڕێوەبردنی دەوڵەتـە مونتەدەبەکان بوو بۆ ئەو هەرێمانەی لەژێر مەنداتیانن، ئەویش بە نۆڕینی ئەو ڕاپۆرتانەی، کە پێوستە دەوڵەتە پێوەندیدارەکان بەرزبکرێنەوە بۆ ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان بە شێوەی خولی.

بەپێی سیستەمی مەندات هەر هەرێمێك، کە ئەم سیسـتەمە دەیگرتـەوە خـاوەن قـەوارە یاساییە تایبەتەکەی خۆی بوو. ئەمەش ڕادە و فرەوانییەکەی دەوەستایە سەر جۆری مەندات و پلەکەی. پیادەکردنی سەروەریش لەنێوان دەوڵەتـە خـاوەن مەنداتـەکان و کۆمەڵـەی گـەلان و هەرێمەکە دابەش ببوو بە شێوەیەك ڕێژەکەی بە گوێرەی جۆری مەنداتەکە جیاوازبوو.[١١٣]

ئـەو دەوڵەتانـەی خرابوونـە ژێـر سیسـتەمی مەنداتـەوە زۆرینـەیان ڕزگاریـان بـوو و سەربەخۆییان وەرگرت و بوونـە ئەنـدام لـە ڕێکخـراوی نەتـەوە یەکگرتووەکانـدا، بـەڵام ئـەو هەرێمانەی ئازاد نەکرابوون تاوەکو دووەمین شەڕی جیهان خرانە ژێر سیستەمی چـاوەدێرییەوە (ویسایە)، کە دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان دایهێنا.

## سیستەمی مەندات و کوردستان:

ساڵێك دوای شەڕی یەکەمی جیهانی نوێنەرانی هەر سیٚ دەوڵەتی زلهێز بەریتانیا و فەرەنسا و رووسیا دەستیان کردە وتووێژی نهێنی بۆ دابەشکردنی میراتەکانی بەرەی ئەڵمانیا و دەوڵەتی عوسمانیدوای دۆڕاندنیان. بەم جۆرە لە ١٩١٦/٥/١٦ پەیمانی سایکس - پیکۆیان ئیمزاکرد. بەپێی ئەم پەیمانە رۆژئاوای سوریا و لبنان ویلایەتی ئەدەنە درانە فەرەنسا و عێراقی

---

١١٣- علی صادق أبو هیف :یاسای نێودەوڵەتیی گشتی. الاسکندریە، ل ١٠٠

عەرەبی و بەندەرەکانی عەکا و حەیفا درانە بەریتانیا و ئەرمەنستانی تورکیا و باکووری کوردستان درانە رووسیا[١١٤]، بەڵام دوای سەرکەوتنی شۆڕشی بەلشەفی لە رووسیا لە ساڵی ١٩١٧ رووسیا پەیمانەکەی ئاشکراکرد و لێی کشایەوە .

دوای سەرکەوتنی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان لە شەڕدا کۆنگرەی سان ریمۆ لە شاری سان ریمۆ لە ئیتاڵیا لە ١٩-٢٦/٤/١٩٢٠ بە ئامادەبوونی سەرۆکوەزیرانی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتاڵیا و باڵیۆزی ژاپۆن بەسترا. لەم کۆنگرەیەدا باسی چارەنووسی ناوچەکە و گەلانی رۆژهەڵات کرا و لە ئەنجامدا بەپێی پەیمانی سان ریمۆ، کە لە ٢٥/٤/١٩٢٠ ئیمزاکرا، ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دابەشکراو و سیستەمی مەنداتی بۆ دارێژرا. سوریا و لوبنان خرانە ژێر مەنداتی فەرەنساوە و عێراقی عەرەبی، واتا ویلایەتی بەغداد و بەسرە و فەلەستین و رۆژهەڵاتی ئوردن خرانە ژێر مەنداتی ئینگلیزەوە و پەیمانیش درا بە جوولەکەکان وڵاتێکی سەربەخۆیان بۆ پێکبهێنرێت. لەبارەی کوردستان بڕیاردرا بە پەیمانی سیڤەر سەربەخۆیی کوردستان دابینبکرێت، واتا باکووری کوردستان ویلایەتی موسل، کە کوردستانی باشوور دەگرێتەوە بکرێ بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ.[١١٥]

لە ١٠/٨/١٩٢٠ پەیمانی سیڤەر لەنێوان تورکیا و دەوڵەتە هاوپەیمانەکانبەسترا. بەپێی مادەکانی ٦٢ و ٦٣ و ٦٤ی ئەم پەیمانە، دەبوایە دەوڵەتێکی کوردی لە باکووری کوردستان پێکبهێنرێت و مافیش درایە باشووری کوردستان بچێتە پاڵی[١١٦]. ئەم داننانە بە مافی چارەنووسی گەلی کورددا لەسەر بنەماکانی مادەی ٢٢ی دەستووری رێکخراوی کۆمەڵەی نەتەوەکان League of Nations دارێژرابوو. بەپێی ئەم مادەیە مەندات ئەو پێکهاتانە دەگرێتەوە ((کە جاران سەر بە ئیمپراتورییەتی تورکی بوون و گەیشتوونەتە رادەیەکی پێشکەوتن، کە دەکرێ دانبنرێت بە بوونیاندا وەك دەوڵەتی سەربەخۆ بە شێوەیەکی کاتی، لەژێر ئامۆژگاری و یارمەتی ئیدارەی دەوڵەتی مەنداتۆر تا ئەو کاتەی دەتوانن خۆیان لەسەر پێی خۆیان راگرن. ویستی ئەم پێکهاتانە دەبێت بە شێوەیەکی بنەڕەتی بەهەند وەربگیرێت لە هەڵبژاردنی دەوڵەتی مەنداتۆردا)).[١١٧]

114- http://wwi.lib.byu.edu/index.php/Sykes-Picot_Agreement
115- http://en.wikipedia.org/wiki/San_Remo_conference#Text_of_the_Resolution
116- The Treaty Of Peace Between The Allied And Associated Powers And Turkey Signed At Sevres August 10'1920
117- http://avalon.law.yale.edu/20th_century/leagcov.asp#art22

سەرهەڵدانی دەوڵەتی تازەی تورکیا بەسەرکردایەتی مستەفا کەمال و ناتەبایی کورد و هەڵخەڵەتانی بە بەڵێنەکانی ئەو سەرکردە تورکە و بەریتانیا هەموو هەوڵەکانی دیپلۆماتی کوردی بەناوبانگ شەریف پاشای پووچەڵکردەوە و پرۆژەی دروستکردنی دەوڵەتی کوردی لەباربرد، دوای هەوڵێکی زۆر لە ڕێگەی کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە بەریتانیا توانی باشووری کوردستان (ویلایەتی موسڵ)ی دەوڵەمەند بە نەوت و ئاو بخاتە پاڵ عێراق.

لە کۆنگرەی سان ڕێمو عێراق خرابووە ژێر مەنداتی بەریتانیاوە. لە لائیحەی مەنداتدا هاتووە، کە هیچ حوکمێك لەم لائیحەیەدا ڕێگە لە مەنداتۆر ناگرێت، کە ئیدارەیەکی سەربەخۆ لە ناوچە کوردییەکان پێکبهێنێت.[118]

لە کاتی ئامادەکاریدا بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی دامەزرێنەر (المجلس التأسیسی) حکوومەتی عێراق لە ١٩٢١/٧/١١ بەیاننامەیەکی دەرکرد و تێیدا دەڵێت: ((ئەنجومەنی وەزیران پێیوایە، کە ناوچە کوردییەکان مافی تەواویان هەیە بەشداری بکەن یان نەکەن لە هەڵبژاردنەکە.. ئەم هەڵوێستە ناکرێتە بەهانە بۆ وەرگرتنی کردەکاری دژی کوردەکان لە داهاتوودا، بەڵام حکوومەتی عێراق ئارەزوودەکات دانیشتووانی ناوچە کوردییەکان لەگەڵیدا بەشداربن و لە دەوڵەتی عێراق جیانەبنەوە))[119] .

دوای ئەو گۆڕانکارییانەی ئاماژەمان پێکرد، پەیمانی لۆزان بۆ ڕێکخستنەوەی بەرژەوەندییەکان لە باری تازەدا ئامادەکرا. هەڵوەشانەوەی پەیمانی سیڤەر، بە هەموو ئەو مافانەوە کە تێیدا بوون، یەکێك بوو لە ئەرکە گەورەکانی ئەم پەیمانە.

بەشی سێیەمی پەیمانەکە لەژێر ناونیشانی پاراستنی کەمایەتییەکان لە مادەی ٣٧-٤٤ باسی دابینکردنی مافی کەمایەتییەکان دەکات. لە کاتێکدا بە هیچ جۆرێك ناوی کورد نەهاتووە، تەنیا ئەوە نەبێ، کە لە مادەی ٣٨دا دەڵێت: ((حکوومەتی تورکی پابەند دەبێ، کە پاراستنی تەواوەتی و پڕ دابین بکات بۆ ژیان و ئازادیی گشت دانیشتووانی لە تورکیا بەبێ جیاوازی نەتەوە و زمان و ڕەگەز و ئاین.

**١١٨- عبد الرزاق الحسني: تاریخ العراق السیاسي الحدیث، بغداد، ١٩٥٧، ص ١٧٢.**

١١٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

گشت دانیشتووانی تورکیا بۆیان هەیە بە ئاشکرا و بە تایبەت و بە ئازادیی پێڕەوی ئاین و باوەڕی خۆیان بکەن...))[120]، بەڵام مادەکانی ٣٩-٤٤ تەنیا بۆ مافی کەمایەتییە غەیرە ئیسلامەکان تەرخانکراون، ئەگەرچی کورد بە تەنیا چەندەها جار بەقەد ئەوان دەبوو. ئەمەش باشترین بەڵگەیە بۆ هەڵوێستی نایەکسانی و دووڕوویی و درۆزنانەی وڵاتانی ئیمپریالیزم و پێشێلکردنی مافی نەتەوە چەوساوەکان و لەتلەتکردنیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان.

لە پێناو پاراستنی کەمە ئاینییەکان و نەتەوەکانی ناو دەوڵەتی تورکیا لە مادەی (٣٧)دا ئاماژەدەکەن، کە ((تورکیا پابەندە کە ئەو بنەمایانەی لە مادەکانی ٣٨-٤٤دا هاتوون بە یاسای بنەڕەتی دادەنرێن و ناکرێ هیچ یاسایەك و هیچ ڕێنماییەك و نە کاری فەرمی ناکۆکبن یان یەکنەگرنەوە لەگەڵ ئەم بنەمایانە، هەروەها هیچ یاسایەك و ڕێنماییەك و کارێکی فەرمی لە سەروویانەوە نابێت))[121].

نە دەوڵەتە ئیمپریالییەکان و نە دەوڵەتی تورکیا ئیلتیزامەکانیان بەرامبەر بە گەلی کوردستان جێبەجێ نەکرد. نەوەك هەر ڕێگەی جێبەجێکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووسیان لێگرت، بگرە لە سادەترین مافی کولتووری و زمانەوانی بێبەشیان کرد و دەیان ساڵ نکۆڵیان لە بوونی دەکرد وەك گەلێکی خاوەن ڕەگەز، زمان، خاك، مێژوو، کولتوور، هەست و نەست و نەریتی هاوبەش.

کوردستانی باشوور لەجیاتی ئەوەی بخرێتە ژێر مەنداتەوە بەسترا بە عێراقەوە، بەڵام گەلی کورد بەردەوام بوو لەخەبات تاوەکو لە ١٩٢٢/١٢/٢٤ حکوومەتی بەریتانیا و حکوومەتی عێراق بەیاننامەیەکی هاوبەشیان دەرکرد لەبارەی دانتان بە حکوومەتەکەی شێخ مەحمودی نەمردا، کە لە سلێمانی لە ١٩٢٢/١٢/١٠ دامەزرا. لە بەیاننامەکەدا هاتبوو: ((حکوومەتی بەریتانیا و حکوومەتی عێراق داندەنێن بە مافی دانیشتووانی کوردی ناو دەوڵەتی عێراقدا، کە دەوڵەتێکی کوردی پێکبهێنن لە چوارچێوەی ئەم سنوورەدا. هەردوولا هیوادارن کە گشت لایەنە کوردەکان لە زووترین کاتدا بگەنە ڕێککەوتن لەنێوان خۆیاندا سەبارەت بە شێوازی ئەو حکوومەتەی دەیانەوێ و سنوورەکانی و دەسەڵاتەکانی و هەروەها هیوادرین بەرپرسانی خۆیان

---

١٢٠- بۆ دەقی پەیمانەکە بڕوانە:

http://wwi.lib.byu.edu/index.php/Treaty_of_Lausanne

١٢١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بنێرن بۆ بەغدا بۆ باسکردنی پێوەندی ئابووریان لەگەڵ حکوومەتی بەریتانیا و عێراقدا...))[122].

بەڵام لەجیاتی جێبەجێکردنی ئەم بەڵێنە هەردوولا هێرشیان بردە سەر حکوومەتی کوردستان و دوای شەڕێکی سەختی ناهاوتا لەناویان برد بەیارمەتی سەرەکی دوژمنە مێژووییە سەرەکییەکەی کورد، کە ئەویش ناتەبایی و ناکۆکی ناوەخۆی خۆیەتی.

لە ١٩٢٥/١٢/١٦ ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان بڕیاری دا بەتەواوی ویلایەتی موسل، بە کوردستانی باشوورەوە، بخاتە پاڵ عێراق. بەم جۆرە باشووری کوردستان بووە بەشێك لەم دەوڵەتەی عێراقە، کە لە سەرەتای دامەزراندنییەوە تاوەکو ئێستە دووچار و گیرۆدەی ئەم پرسەیە. بەمەش بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد چووە قوناغێکی نوێوە.

عێراق لە ١٩٣٢/١٠/٣ بووە ئەندام لە کۆمەڵەی نەتەوەکان[123]، بەمەش مەندات کۆتایی هات و عێراق بووە دەوڵەتێکی سەربەخۆ. سەبارەت بە پرسی کورد، عێراق لە داوای ئەندامێتییەکەیدا خۆی پابەندکردووە، کە زمانی کوردی شانبەشانی زمانی عەرەبی بکاتە زمانی فەرمی لەو دەڤەرانەی کورد زۆرینەیە و بەڵێن دەدات، کە ئەو ئیلتیزامانەی پێوەندییان هەیە بە کەمە ئەتەنی و ئاینی و زمانەوانییەکانەوە ئیلتیزامی نێودەوڵەتین و ناکرێ بگوڕدرێن بەبێ رەزامەندی کۆمەڵەی نەتەوەکان، هەر ئەندامێکی ئەم رێکخراوە مافی هەیە سەرنجی کۆمەڵە رابکێشێ بۆ پێشێلکردنی ئەو ئیلتیزامانە یان تووشی هەڕەشەبوونیان. لەم حاڵەتانەدا ئەنجومەنی کۆمەڵە بۆی هەیە پەنابەرێ بۆ کردەکاری گونجاو. ئەم ئیلتیزامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان بەپێی رێککەوتنێك گواستراوەتەوە بۆ رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی ئێستە.

### ٣- سیستەمی چاوەدێری "وصاية" :

پاش ئەوەی دووەمین شەڕی جیهان کۆتایی پێهات و کۆمەڵەی گەلانیش نەما، سیستەمی مەندات گۆڕایە سیستەمی چاوەدێری بەپێی فەسڵی ١٢ و ١٣ ی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان. مادەی (٧٦) لە دەستوورەکە ئاماژەی دا، کە ئامانجە سیاسییەکانی سیستەمی چاوەدێری برێتییە لە چەسپاندنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی و هەوڵدان بەرەو

١٢٢- **عبد الرزاق الحسني:** هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٢٣- **عبد الرزاق الحسني:** هەمان سەرچاوەی پێشوو.

پێشکەوتنی دانیشتووانی هەرێمی ژێر چاوەدێری لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئـابووری و فێرکردنەوە و پێشکەوتنی بەردەوام بەرەو ئۆتۆنۆمی یان سەربەخۆیی بەپێی هەلومەرجی هـەر هەرێمێك و گەلێك بە گوێرەی ئارەزووی ئەم گەلانە کە بەوپـەڕی ئازادییـەوە گوزارشـتی لـێ دەکەن و بەپێی ئەو مەرجانەی لە ڕێککەوتننامەکانی چاوەدێری دێن.

مادەی ٧٧ی دەستووری نەتـەوە یـەکگرتووەکان ئـەو هەرێمانـەی سیسـتەمی چـاوەدێری دەیانگرێتەوە بەم جۆرە دیاریکردووە:

١- ئەو هەرێمانەی پێشتر سیستەمی مەندات دەیانگرتنەوە.

٢- ئەو هەرێمانەی لە دەوڵەتە دوژمنکارەکان دابڕاون لە ئاکامی دووەمین شەڕی جیهانی.

٣-ئەو هەرێمانەی کە دەوڵەتانی بەرپرس لە کاروباریان بە ئارەزووی خۆیان دەیانخەنـە نـاو سیستەمی چاوەدێرییەوە.

دەستوورەکە پرسیی دیاریکردنی کام لەو هەرێمانەی لـە سـەرەوە باسـکران دەخرێنـە نـاو سیستەمی چاوەدێرییەوە و بە چ مەرجێك بەجێهێشت بۆ ئەو ڕێککەوتننامانـەی، کـە دواتـر لەنێوان دەوڵەتە پێوەندیدارەکان و بە سەرپەرشتی ئەنجومەنی چاوەدێری دەبەسترێن.

ئەو دەوڵەتانەی هەرێمەکانی ژێر مەنداتیان وەڕێـوەدەبرد بـە دەنگـی دەسـتووری نەتـەوە یەکگرتووەکانەوە هاتن و دەستیان لە هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتیان بەردا بۆ ئەوەی بخرێنە ژێـر سیستەمی چاوەدێرییەوە تەنیا کۆماری باشووری ئەفریقیا نەبێ، کە ئەوەی ڕەتکردەوە و ڕازی نەبوو هەرێمی باشووری ڕۆژئاوای ئەفریقیا" نامیبیا " بخرێتە ژێر سیسـتەمی چـاوەدێرییەوە. دەبینین بە درێژی (٤٥) ساڵ سەرپێچـی لـە بڕیارەکـانی کۆمەڵـەی گشـتی[١٢٤] و ئەنجومـەنی ئاسایشی[١٢٥] نەتەوە یەکگرتووەکان و دادگەی دادی نێودەوڵەتی[١٢٦] کرد، بەڵام دواجار کۆماری باشووری ئەفریقیا ملکەچ بوو بـۆ بڕیارەکـانی کۆمەڵگـەی نێودەوڵـەتی و لـە ١٩٩٠/٤/٢٣ نامیبیا سەربەخۆیی وەرگرت.

کۆلۆنەکانی پێشووی ئیتاڵیاش، کە لەژێر سیسـتەمی چـاوەدێری دانـران بـە بڕیارەکـانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، هەموویان سەربەخۆیی تەواویان وەدەست هێنا. ئـەوە بوو لیبیا لە ساڵی ١٩٥٢ سەربەخۆیی وەرگرت و سۆمالیش لـە سـاڵی ١٩٦٠، ئـەریتیریاش

124- General Assembly Res. 2145 (xx1) and 2248 (xx11)
125- Security Council Res. 263 (1969), 269 (1969) and 276 (1970
126- ICJ Reports, 1974. P.16; 49 ILR, P.3
127- Security Council Res. 683(1990)

ڕێیەکی تری گرتەبەر، ئەوە بوو نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٥٠ لکاندی بە ئەسیوپیاوە، بەڵام دوای شۆڕشێکی خوێناوی، کە نێزیکەی ٣١ ساڵ درێژەی کێشا لە ١٩٦٢تاوەکو١٩٩٣ گەلی ئەریتیریا توانی سەربەخۆیی وەربگرێ.

هەرێمەکانی باسیفیکیش، کە ژاپۆن وەك دەوڵەتی خاوەن مەندات بەپێی سیستەمی ئینتدابی جاران بە ڕێوەی دەبردن، لە ژاپۆن دابڕان لەبەر چەند هۆیەکی ئەمنی و خرانە ژێر سەرپەرشتی ئەنجومەنی ئاسایشەوە.

سەبارەت بە هەرێمەکانی باسیفیك، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پەیماننامەیەکی لەگەڵ کۆمەڵەی دوورگەکانی ماریانی باکوور و ڕێککەوتننامەی یەکیەتیی ئازادی لەگەڵ دەوڵەتەکانی مایکرۆنیزیای فیدراڵی و هەروا لەگەڵ کۆماری دوورگەکانی مارشاڵدا، بەست. کاتێك ئەم ڕێککەوتننامانە لە پایزی ساڵی ١٩٨٦چوونە واری جێبەجێکردنەوە، کۆتایی هێنان بە سیستەمی چاوەدێری بە سەر ئەم هەرێمانەدا ڕاگەیاندرا[١٢٧]. ئەوە بوو ئەنجومەنی چاوەدێری سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان یەکیەتییە سیاسییەکانی نێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئەو دەوڵەتانەی بە پراکتیکێکی بە ڕەوا دانا بۆ مافی بڕیاردانی چارەنووس و دوای ئەوەی ئەو کێشانەی، کە سەریان هەڵدا لەنێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و کۆماری پالاو لەبارەی هاتوچۆی کەشتییە جەنگی و ئۆتۆمبیلەکانی ئەمەریکا لە ئاوی هەرێمی پالاودا Palau چارەسەرکران، لە ساڵی ١٩٩٤ پالاو بووە دواین هەرێم لە چوارچێوەی سیستەمی چاوەدێریدا، کە سەربەخۆیی وەربگرێ، بەمەش ئەرکی سیستەمی چاوەدێری کۆتایی هات.[١٢٨]

127- Security Council Res. 683(1990).
128- Security Council Res. 956 (1994).

## باسی یەکەم

## چەمك و سرووشتی پێزانین

### ١- چەمکی پێزانین:

رەوتی رووداوەکـان لـە گۆڕەپـانی نێودەوڵەتیـدا سـەلماندوویانە، کـە ژیـانی دەوڵەتـەکان چەقبەستوو و نەگۆڕ نییە، بگرە لە گۆڕانێکی هەمیشەییدایە. دەبینین دەوڵەتی نـوێ لـەدایك دەبێ و هی تریش ئاوادەبێت و هەندێ جاریش چەند کۆمەڵێك بە شێوازی نایاسـایی و دژ بـە دەستوور دەسەڵات لـە وڵاتێکـدا دەگرنەدەسـت، یـاخیبوون بـەرپادەبێت و دەسـەڵاتی تـازە سەرهەڵدەدا و کۆنترۆڵی چەند شوێن و ناوچەیەك دەکەن، کە ملکەچی دەسەڵاتی دەوڵەت نـین. هـەر رووداوێکـیش لـەم رووداوانـە پرسـێك دەورووژێـنن. ئایـا ئـەم جـۆرە رووداوانـە چ بەرئەنجامگەلێکیان لێ دەکەونەوە. دەبێ هەر دەوڵەتێکیش بڕیار بدات ئایـا دان بـەم قـەوارە یاساییە نوێیە دەنێ یان نا؟، ئایا ئەم پێزانینە دەبێ چ شێوازێك لەخۆبگرێ؟.

پێزانین ئاسەواری یاسایی گرینگی لێ دەکەوێتەوە چ لەسەر ئاستی یاسای نێودەوڵەتی یـان لەسەر ئاستی یاسای نێوەخۆیی وەك یەك، جا ئەگەر پێزانین بە قەوارەیەك ئەنجامدرا، ئـەوکات ئەو قەوارەیە دەبێتە بابەتێك بۆ ماف و ئیلتیزام. واتا ئەویش ئەو ئیلتیزامانە وەردەگرێت، کە دەدرێنە دەوڵەتی بیانی لە پێش دادگەی نێوەخۆییدا، کە دەزگە و کەسانی تر نییانە.

لە گەلێك باردا بڕیاری تایبەت بە پێزانین زیاتر دەوەستێتە سەر هەڵوێستی سیاسی تا وەك هۆکاری یاسایی. هەندێ لە دەوڵەتەکان قایل نابن دان بە دەوڵەتێکی تازەدا بنێن، نەوەك ئـەو کارە کاریگەریی هەبێ بەسەر ئەو بارودۆخەی لە ئارادایە و نایانەوێ لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و نێوەخۆییدا گۆڕانی بەسەردابێت. بۆ نموونە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بـۆ چـەندین ساڵ قایل نەبوو دان بە چینی میللی و کۆریای باکووردا بنێت، نەك لەبەر قەناعەت نەکردنی، کە دەسەڵات لەم دوو دەوڵەتەدا بە پراکتیك سەروەریی خۆیان پیادەدەکەن لە خاکیاندا، بگـرە لەبەرئەوەی ئـارەزووی نـەدەکرد قبـووڵی بەرئـەنجامی ئـەم جـۆرە پێزانینـە بکـات. ئـەوەش هەڵوێستێکی سیاسی شاراوە بوو لە تۆی دەستەواژەگەلێکی یاساییدا. جگە لـەوەش پێـزانین،

بە قەوارەیەك، بوار بە زۆر ئیحتیمال دەدات سەبارەت بەو جۆرەی ئایا وەك دەوڵەتێكی خاوەن سەروەریی تەواو دانی پێدا دەنێت یان وەك دەسەڵاتێكی كردەیی لە هەرێمێكی دیاریكراوی سەر بە دەوڵەتێكی تر. بۆیە پێزانین **بریتییە لە راگەیاندنێك لە كەسێكی یاسایی نێودەوڵەتییەوە دەردەچێت بە مەبەستی قایلبوون بە پێگەی یاسایی نێودەوڵەتی كەسێكی یاسایی نێودەوڵەتی كردەیی یان ئەگەری دیكە.** هەروەها پێزانین خۆی لە خۆیدا یارمەتی بەشداربوون دەدات لە پرۆسێسی یاسایی نێودەوڵەتیدا و بایەخێكی گرینگی هەیە لە پێوەندییە دووقۆڵییەكاندا. ئامانجی پێزانین تەنیا ئەوە نییە بە راشكاوی بۆ كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بڵاوی بكاتەوە، كە بە رواڵەتی داننراوە بە كەسێكی یاسایی نێودەوڵەتیدا كە هەیە. بگرە كارێكە گرینگییەكی سیاسی و بەرئەنجامی یاسایی نێودەوڵەتی پڕ بایەخی هەیە. بوونی پێزانین تەنیا ئەوە نییە رابگەیەندرێ، كە دەوڵەتێك پێكهاتووە، بگرە یارمەتی دەدات بۆ پیادەكردنی كەسێتیی یاسایی نێودەوڵەتی و ئەو ماف و ئیلتیزاماتەی بەرامبەر كەسانی تری یاسای نێودەوڵەتی لێدەكەونەوە[1].

پێزانین ئیلتیزامێكی نێودەوڵەتی نییە لەسەر دەوڵەتەكان، كە لە نۆرمەكانی یاسای نێودەوڵەتییەوە هەڵقوڵابێت، بگرە كارێكی خۆبەخشانەیە بۆ بونیادنانی پێوەندیی نێودەوڵەتی تەقلیدییانە لەنێوان كەسەكانی یاسای نێودەوڵەتیدا[2]. لە دۆكومێنتێكی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریكادا ساڵی ١٩٧٦ هاتووە: (ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا پێیوایە یاسای نێودەوڵەتی داوا لە دەوڵەت ناكات بۆئەوە وەك دەوڵەت دان بە قەوارەیەكی تردا بنێت. مەسەلەی پێزانین بە قەوارەیەك وەك دەوڵەت، مەسەلەیەكە دەگەڕێتەوە، بۆ بڕیاری هەر دەوڵەتێك. لە پێناو گەیشتن بەم بڕیارەش ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا بەشێوەیەكی تەقلیدی بە دوای كومەڵێك راستیدا گەڕاوە، كە ئەوانیش كۆنترۆڵكردنی كردەیی هەرێمێك و هەبوونی دانیشتووانێكی دیاریكراو و ئیدارەیەكی حكومییانەی رێك و پێك لە هەرێمەكە و توانای كردەیی بۆ بونیادنانی پێوەندیی دەرەكی و بە دەنگەوەچوونی ئیلتیزاماتە نێودەوڵەتییەكان. هەروا ویلایەتە یەككگرتووەكان ئەوە لەبەرچاودەگرێ ئایا قەوارەی ناوبراو پێزانینی وەدەست هێناوە لەلایەن كۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە)[3].

---

1- Орлин Борисов. Международно публично право, София. 2003, стр 6.
2- Орлин Борисов. Международно публично право, София. 2003, стр 19.
3- DUPIL, 1976 PP. 19-20

### ٢- سرووشتی پێزانین:

یاساناسەکان لە بۆچوونەکانیاندا سەبارەت بە سرووشتی پێزانین، دەبنە دوو بەشەوە: هەندێکیان پێیانوایە پێزانین بریتییە لە پرۆسێسی دروستکردنی دەوڵەت. هەندێکیشیان لەو بڕوایەدان، کە پرۆسێسێکە دان بەبوونی دەوڵەتدا دەنێ یان بەدیاریدەخات.

### تیۆریی پێزانینی دروستکەر "المنشيء"

بەپێی ئەم تیۆرییە دەوڵەت نابێتە کەسێکی یاسایی نێودەوڵەتی تەنیا دوای پێزانین نەبێت، واتە پێزانین خۆی دەوڵەت پێکدێنێ و بەبێ بوونی دەوڵەتیش بوونی نابێ. دەوڵەت بەبێ پێزانین پێی ناکرێ لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا خۆی رێك بخات و ناشتوانێ بەو مافانە شادبێت، کە یاسای نێودەوڵەتی پەسەندیان دەکات.

هەندێك دەڵێن دەوڵەت لە رووی نێوەخۆییەوە لە هەرێمەکەیدا و بە پیادەکردنی لە چوارچێوەی سنوورەکەیدا، کەسایەتی یاسایی هەیە، تەنانەت ئەگەر لە لایەن دەوڵەتەکانیشەوە پێنەزانرابێت، بەڵام نابێتە کەسێکی نێودەوڵەتی ئەگەر پێزانینی نێودەوڵەتی لەبەرامبەری نەکرێ، چونکە خودی ئیرادەی دەوڵەتەکان دەوڵەتی تازە پێکدێنێ بۆ ئەوەی کەسێتی نێودەوڵەتی کامڵ بێت و پاشان شایستەی ماف و ئیلتیزام بێت. ئەم تیۆرییە ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتی و مێژوویی و سیاسیانە لەبەرچاوناگرێ، کە دەوڵەتەکە لە چوارچێوەیاندا پێکهاتووە، کە پێوەست نین بە ئیرادەی دەوڵەتەکانەوە.

ئەگەر ئەم تیۆرییە قەبوول بکەین واتای وایە ئەو دەوڵەتەی پێزانینی وەدەست نەهێناوە، ئەو ئیلتیزاماتانەی یاسای نێودەوڵەتی دەیانسەپێنێ ئەو ناگرنەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە دەتوانێت ئیلتیزام نەکات بە دەستدرێژی نەکردن بۆ سەر کەسانی تری یاسای نێودەوڵەتی و ملکەچ نابێت، کە دەست لە کاروباری نێوەخۆیی دەوڵەتەکانی تر وەرنەدات. کێشەیەکی تریش هەیە ئەویش ئەوەیە ئەگەر هەندێك دەوڵەت دانی پێدا بنێن و هەندێکی دیکە قایل نەبن دانی پێدابنێن، ئایا ئەو کاتە تا چ ڕادەیەك دەبێتە کەسێکی یاسایی؟

### تیۆریی پێزانینی دەرخەر "declaratory theory "

پرۆسێسی پێزانین بەپێی ئەم تیۆرییە تەنیا قایلبوونە، کە کەسێکی یاسایی نێودەوڵەتی نوێ بوونی هەیە لەسەر گۆڕەپانی جیهانی و پێوەرەکانی پێکهاتنی، کە پێوەستن بە رەوتی

خۆی و بارودۆخی ناوچەکەوە تەواون، ئەمانەش ڕێگەی بۆ خۆشدەکەن بەشداری لـە پێوەندییـە نێودەوڵەتییەکان بکات. دانپێدانەنان دەوڵەت هەڵناوەشێنێتەوە، بگرە پێوەندییـەکانی لەگـەڵ ئەو دەوڵەتەی دانی پێدانەناوە پەکدەخات.

پراکتیکی نێودەوڵەتی مەیلی بۆ قبوولکردنی ئەم تیۆرییە هەیە بـۆ ئەمـەش زۆر نموونـە هەن. دەبینین دادگەی نێوبژیوانی لەنێوان پۆڵۆنیا و ئەڵمانیا ساڵی ١٩٢٩ لەبارەی پێـزانین بـە پۆڵۆنیا ساڵی ١٩١٩ جەختدەکاتە سەر ئەوەی، کە پێزانین وەك بۆچوونی زۆرینـەی یاساناسـە نێودەوڵەتییەکان کارێکی پێکهێنەر نییـە، بگـرە تـەنیا ڕێ و شـوێنێکی دەرخـەرە، چـونکە دەوڵـەت بـوونی هەیـە و پێـزانینیش تـەنیا ڕاگەیاندنێکـە بـۆ ئـەم بوونـە، کـە لـە لایـەن دەوڵەتەکانەوە دەردەچێ.

هەندێ لە یاساناسان لەو بڕوایەدان پێزانین بە دەوڵەت وەك گەواهیدانێکە بۆ لـەدایکبوونی دەوڵەت، بۆیە هەرکاتێ پێوەرەکانی تەواو بن مافی هەیە دانی پێدابنرێ. لە ڕووی پراکتیکەوە ئەگەر توخمەکانی پێکهاتنی دەوڵەت تەواونەبن پێزانین ناتوانێ بیکاتە کەسێکی یاسایی. بۆیە پێزانین لێرەدا بە واتای پێزانین دێ بە تەواوبوونی ئەو توخمانەی دەوڵەت، کە پێش ئەم پێزانینە دێن. واتاشی وایە ڕەتکردنەوەی پێزانین لە لایـەن دەوڵەتەکانـەوە بـە دەوڵـەتێکی نـوێ، ئـەم دەوڵەتە نوێیە لە کەسایەتییە نێودەوڵەتییەکەی و لەو ماف و ئیلتیزامانـەی لێـی دەکەونـەوە بێبەش ناکات. بگرە کۆتبەندی دەکات لەوەی بچـێتە نێـو پێوەنـدیی سیاسـییەوە و پیـادەی سەروەریی لە دەرەوەدا بکات.

لە مادەی "٣" ی ڕێککەوتننامەی مونتیفیدیۆ لە ١٩٣٣\١٢\٢١، کە لەنێوان دەوڵەتـە ئەمەریکاییەکاندا بەسترا لەبارەی ماف و ئەرکی دەوڵەتەکان هاتووە: "بوونی سیاسی دەوڵەت جیایە لە پێزانینی دەوڵەتەکانی تر پێی. دەوڵەت تەنانەت پێش ئەوەیش دانپێدابنرێ، مـافی هەیە بەرگری لە قەوارە و سەربەخۆیی خۆی بکات و کـار بـۆ مانـەوەی خـۆی و بـەدیهێنانی خۆشگوزەرانی بۆ دانیشتووانی بکات و ئەو سیستەمانەش بۆ خۆی دابنێ، کە بگونجێ بـۆی و یاسـا و ڕێسـای پێویسـت دابـنێ بـۆ پاراسـتنی بەرژەوەندییـەکانی و دەزگـە جیاجیاکـانی بەڕێوەبات و دەسەڵات و ئەرکی دادگەکانیشی دیاری بکات".

بەرئـەنجامی سرووشـتی پێزانینـی دەرخـەر ئەوەیـە، کـە کاریگەرییەکـەی بـەرەودواش دەگەڕێتەوە، واتا: هـەر لـەو کاتـەوەی دەوڵـەتی نـوێ بـە پراکتیـك وەك کەسـێکی یاسـایی نێودەوڵەتی سەربەخۆ لەدایکدەبێ.

هەندێ لە دەوڵەتەکان لە هەندێ باردا، چارەسەرییەکی مامناوەندی لەنێوان هەردوو تیۆرییەکە قبووڵدەکەن، چونکە پرۆسێسی پێزانینی دەوڵەتێك بە دەوڵەتێکی تر، ئاماژەدەدا، کە دەوڵەتی یەکەم وای داناوە، کە بەلای دەوڵەتی دووەمەوە پێوەرە سەرەکییەکانی یاسایی نێودەوڵەتی تەواون بۆ پێکهاتنی دەوڵەت. بێگومان پێزانین هەڵوێستێکی سیاسییە و لە گەلێ باردا تەنیا لەبەر چەند هۆیەکی سیاسی دەدرێ.

هەندێ کەس پێزانین لەسەر ئاستی سیاسی بە دروستکەر دادەنێن، چونکە ئاماژەدەدات، کە قەوارە تازەکە دەوڵەتێك پیکدێنێ لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و بەڵگەیە لەسەر قبووڵکردنی پێگە سیاسییە نوێیەکەی لە لایەنی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە. ئەمەش واتای وا نییە، کە رەفتاری پێزانین دروستکەرێکی یاساییە، چونکە ماف و ئیلتیزاماتەکان وەك بەرئەنجامێك بۆ پێزانین نایە. ئێستە پراکتیکی باو لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، لە هەندێ هەلومەرجی تایبەتدا، هۆکاری دی دەخوازێ بۆ پێزانین، وەك مافی مرۆڤ.

ئەنجومەنی ئەورووپی لە ١٦\١٢\١٩٩١ راگەیاندنی تایبەت بە رێنماییە گشتییەکان سەبارەت بە پێزانین بە دەوڵەتە تازەکان لە ئەورووپای رۆژهەلات و یەکەتیی سۆڤێتی پێشوو دەرکرد. ئەم راگەیاندنە هەڵوێستێکی هاوبەشی دەوڵەتانی ئەنجومەنی ئەورووپایی دارشت لەبارەی پێزانین بە دەوڵەتە تازەکان. تێیدا هاتووە، بە تایبەت پێزانین ئەمانەی لای خوارەوەی گەرەکە:

١- رێزگرتن لە دەستووری رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەحکامەکانی بەڵگەنامەی کۆتایی تایبەت بە هلسنکی و بەڵگەنامەی پاریس[٤]. بەتایبەتی ئەوی پێوەندی هەیە بە حوکمی یاسا و دیموکراتی و مافی مرۆڤەوە.

٢- زامنکردنی مافی کەمایەتییە نەتەوەیی و ئەتنییەکان بەپێی ئەو بەڵێنانەی لە کۆنگرەی ئاسایش و هاوکاری لە ئەورووپادا هاتوون.

٣- رێزگرتن لە سنووری بونیادنراو و بە رێگەی ئاشتی و بە رێککەوتنئامەی هاوبەش نەبێ نابێ بگۆڕدرێ.

٤- رێزگرتن لە هەموو بەڵێننامەکانی تایبەت بە داماڵینی چەك و بڵاونەبوونەوەی چەکی ئۆتۆمی و هەروا ئەوی پێوەستە بە ئاسایش و سەقامگیریی هەرێمی.

٥- بەڵێندان بە چارەسەرکردنی کێشەکانی تایبەت بە مافی دەوڵەت و کێشە ناکۆکەکانی هەرێمی

---

٤ کۆبوونەوەی لووتکەی سەرۆك دەوڵەتان و حکوومەتانی ئەنجومەنی ئەورووپایی لە ١٩٩٠ دەریکردووە.

بەرێگەی ڕێککەوتن و نێوبژیوان.

ئەنجومەنی ئەورووپی لە هەمان ڕۆژدا لە بەیاننامەیەك لەبارەی یۆگۆسلاڤیا ڕەزامەندی ئەندامەکانی تێیدا دەرخست، کە داندەنێن بە دەوڵەتەکانی یۆگۆسلاڤیادا بەو پێیەی ئەم مەرجانەیان جێبەجێکردووە. مەرجەکانیش ئەمانە بوون:

١- هەبوونی ئارەزووی سەربەخۆیی و پابەندبوون بەو بەڵێنانەی لە ڕێنماییە گشتییەکاندا هاتوون.

٢- پابەندبوون بەو مەرجانەی لە پرۆژەی ڕێککەوتننامەی تایبەت بە یۆگۆسلاڤیا هاتوون، بەتایبەتی ئەو مەرجانەی پێوەستن بە مافی مرۆڤ و کەمایەتییەکانەوە.

٣- هاوکاریکردنی هەوڵەکانی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەنجومەنی ئاسایش و کۆنگرەی تایبەت بە یۆگۆسلاڤیا.

ئەنجومەن و ئەندامەکانی جەختیان لەسەر ئەوەشکرد، کە دەبێ کۆماری یۆگۆسلاڤیا پێش ئەوەی دانی پێدابنرێ، زەمانەتی دەستووری و سیاسی بدات و جەخت بکات، کە ئیددیعای هەرێمی نییە بەرامبەر بە دەوڵەتە دراوسێیەکان.[5]

لەبەرئەوەی پێویستە دەوڵەتی نوێ ئەومەرجە یاساییە نێودەوڵەتییە سەرەکییانەی پێکهاتنی دەوڵەتی تیابێ، بۆیە دەبێ پێزانین ئەم دووخاڵەی تێدا هەبێت:

١. ئاماژەدان بە ڕاستییە زەرووره فەراهەمبووەکان

٢. ئاماژەدان بەوەی دەوڵەتی نوێ دەیەوێ ئەو ئاسەوارانەی لەسەر پیادەبن، کە لە بەرئەنجامی پرۆسێسی پێزانین دەبنەوە. بۆ نموونە پراکتیزەکردنی ئەحکامەکانی یاسابەندی "حەسانەتی" دیپلۆماتی لەسەر نوێنەرانی دەوڵەتە نوێیەکان کە داوای پێزانین دەکەن. ئەوە بەس نییە ئەو دەوڵەتەی داوای پێزانینی لێ دەکرێ بە هەقیقەتەکان بزانێ، بگرە پێویستە ئارەزووی هەبێ لەو بەرئەنجامە یاسایی و سیاسییانەی لە پێزانینەکەی دەکەونەوە و بچنە واری جێبەجێکردنەوە. ئەمەش پرسێکی حەتمییە بەپێی سرووشتی دروستکەری پرۆسێسی پێزانین و سەرهەڵدانی هەقیقەتی نوێ لە واقیعی پراکتیکدا لە ماوەی نێوان ئەو ڕووداوانەی وایکردووە دەوڵەتە نوێیەکە پێکبێ و نێوان پێزانینی واقیعی پێی لە لایەن دەوڵەتەکانی تر. بۆیە یاساناسان پێیان وایە پێزانین ئەسەرێکی ڕەجعی هەیە دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی سەرهەڵدانی دەوڵەت، نەوەك بۆ مێژووی پێزانین پێی.

---

5- U K materials on International Law, 62 By IL, 1991, pp.559-60

## باسی دووەم

## شێوە و جۆرەکانی پێزانین

### ١- شێوەکانی پێزانین:

لەبەرئەوەی چەندین جۆر قەوارە هەن کە پێویستیان بەپێزانین هەیە، بۆیە پێزانین چەند شێوەیەکی جیاجیای لەخۆگرتووە، دەکرێ دابەشیان بکەین بەسەر دوو شێوەی فەرمیدا:

### أ- پێزانینی کەتواری یاخۆ واقیعی "de facto "

ئەمە برێتییە لە شێوەیەکی تەقلیدی بۆ پێزانینی فەرمی، بەڵام لە رووی قەبارەوە سنووردارە، واتا بەشی و کاتییە بە بەراوردکردن لەگەڵ پێزانینی یاسایی "du jure" . پێوەری پەسندکراو نییە لەبارەی قەبارەی ئەم پێزانینە و ئەو ئاسەوارانەی لێی دەکەونەوە، بەڵام بە گشتی هەندێ رەفتار وەك پێوەندیی کونسوڵی یان بەستنی رێککەوتننامەی بازرگانی بە هەنگاوی گواستنەوە دادەنرێ پێش پێزانینی راشکاوی بنبڕ. لای ئەم جۆرە پێزانینە لێناپێچرێتەوە لە بوونی یاسایی دەوڵەت بە سیفەتێکی فەرمییانەی راشکاو، چونکە دیپلۆماتکارەکان بە وریان لەوەی نەوەك رەخنەیان لێ بگیرێ لەسەر پەلەکردنیان لەپێزانینی بنبڕی راشکاو بە دەوڵەتێکی تازە پێکهاتوو، کە رەنگە هەلومەرجی سەرهەڵدانی وریایی بخوازێ سەبارەت بە پێزانینی. لە لایەکی دیکەشەوە بەنیازن پەلەبکەن لە بەستنی پێوەندیی ئابووری هاوبەش بۆخزمەتکردنی بەرژەوەندییەکانیان. لە رووی ئاسەواری یاساییشەوە جیاوازی نییە لەنێوان هەردوو جۆرە پێزانینەکە de facto ,de jure ئەو دەوڵەتەی دەیەوێ دان بەوەی تر بنێت بەپێی رووداوی سیاسی و بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی رەفتاردەکات. پێش ئەوەش ئەم هەنگاوە بنێت گۆڕانکارییە هەمیشەییەکان و وەدیهێنانیان و شەرعییەتیان لەبەرچاودەگرێ بە ئامانجی پاراستنی بەرژەوەندی و مافی دانیشتووانەکەی. چونکە پێزانین بەرئەنجامگەلێکی یاسایی دەنێتەوە، رەنگە کار بکەنە سەر بەرژەوەندییەکانیان لە یاسای نێوەخۆییدا.

### ب- پێزانینی یاسایی jure de

ئەمەش برێتییە لە دووەمین جۆری فەرمی پێزانین زۆر جار بە شێوەیەکی راشکاو و کۆتایی دەردەچێ. بەرئەنجامیشی بەستنی پێوەندیی دیپلۆماتی و هاوکاریی لێدەکەوێتەوە لە بواری ئابووری و بازرگانی و کولتووری و زۆر بواری تر.

### ٢ - جۆرەکانی پێزانین:

### ١- پێزانینی ئاشکرا Explicit recognition

ئاسان نییە جیاوازی بکرێت لەنێوان پێزانینی قبوولکراو بە دەوڵەتی نوێ، بەتایبەتی ئەو دەوڵەتەی تێکەڵ بووە لەگەڵ دەوڵەتێکی تر یان لێی جیابۆتەوە لەنێوان دەستێوەردان لە کاروباری نێوەخۆیی لەرێگەی پێزانینی پێشوەخت یان پەلەکراو وەك ئەوەی روویدا لەسەر هەڵوێستی حکوومەتی نایجیریای فیدراڵ سەبارەت بە پێزانین بە بیافرا لە لایەن پێنج دەوڵەتەوە[٦]. لە هەر بارێکیشدا پێویستە لەسەر دەوڵەتەکان بەر لەوەی بڕیاری پێزانین بدەن، لە رەوشی راستەقینە و مەرجی کاملبوونی سەرهەڵدانی دەوڵەت یان قەوارەکانی تر بکۆڵنەوە بۆ ئەوەی تۆمەتبار نەکرێن بە پەلەکردن. هەندێك پێیان وایە ئەو پێزانینەی لە ١٩٩٢\١\١٥ بە کەرواتیا کرا لە لایەن ئەنجومەنی ئەورووپایی و دەوڵەتە ئەندامەکانی لەگەڵ نەمسا و سویسرا پێکەوە پێزانینێکی پێشوەخت بوو. چونکە کەرواتیا لەو دەمەدا و چەند ساڵێکیش دواتر بە پراکتیك کۆنترۆلی ٣/١ ی هەرێمەکەی نەدەکرد. سەرەڕای ئەوەش لیژنەی نێوبژیوانی تایبەت بە یۆگۆسلاڤیا لە پێنجەمین راپۆرتیدا لە ١٩٩٢\١\١١ ئاماژەی داوە، کە ئەو مەرجانەی لە رێنماییە گشتییەکانی ئەنجومەنی ئەورووپیدا هاتوون، کە لە ١٩٩١\١٢\١٦ دەریکردووە بەسەر کەرواتیادا پراکتیزەنابن، چونکە ئەو دەستوورەی کەرواتیا پەسندیکرد بە گشتیی ناگونجێ لەگەڵ داخوازییەکانی مافی مرۆڤ و کەمایەتییەکان[٧]. هەروا ئەو پێزانینەش کە ئەنجومەنی ئەورووپی و ئەندامەکانی لە ١٩٩٢\٤\٦ دەریانکرد لەبارەی پێزانین بە بۆسنە و هیرسۆگۆڤینا دیسان پێشوەخت هات و لە کاتێکدا بوو، کە ئەو وڵاتە تەنیا نیوەی هەرێمەکەی بە دەستەوە بوو تاوەکو کاتی بەستنی رێککەوتننامەی دایتۆن لە ساڵی ١٩٩٥. هەندێك وا

---

6- Lauterpacht, Recognition. PP-7-8

7- M. Weller. The International Response to the Dissolution of the Socialist Federal Republic of Yugoslavia, 86 AJIL, 1992. p. 569

شرۆڤەی ئەم کارە دەکەن، کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بەتایبەتی لە رێگەی ئەندامێتی لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە تەنیا مافی دەوڵەتەکانە دەستی کردووە بە قبوولکردنی پێوەری تەقلیدی نەرم بۆ بە دەوڵەتبوون لەباری تایبەت بە یۆگۆسلاڤیا.

لە٢٠٠٨/٢/١٧ پەرلەمانی کۆسۆڤۆ سەربەخۆیی خۆی لە سربیا راگەیاند و دەوری ٤٠ دەوڵەت بە ئاشکرا دانیپێدا نا، لەنێویاندا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، فەرەنسا، ئوسترالیا، بەریتانیا، تورکیا، ئیتاڵیا، ژاپۆن و کۆمەڵە دەوڵەتانێکیش دژی سەربەخۆیی بوون وەك رووسیا، بێلارووسیا، جۆرجیا، سربیا، رۆمانیا و ئیسپانیا●. ئەم دەوڵەتە تاوەکو ئێستە نەبووەتە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان● هەرچەندە وەك دەوڵەتێکی نوێ چەسپاوە لەنێوەندە نێودەوڵەتییەکاندا.

### ٢- پێزانینی بێدەنگ " Implied Recognition"

لە بەر ئەوەی دەرکردنی پێزانین پێوەستە بە ئیرادەی دەوڵەت و ئارەزوویەوە پێویست نییە پێزانین راشکاو و ئاشکرا و کراوە و ورد بێت، بگرە دەکرێ لە چوارچێوەی چەند بارێکی تایبەتدا لێی تێبگەین. هەندێ هەلومەرج هەن لە میانەیاندا مرۆڤ تێ دەگات، کە دەوڵەتێك رێگەیەکی ناڕاستەوخۆ یان نائاشکرای تری بەکارهێناوە بۆ دانان بە دەوڵەتێکی تردا. بۆ ئەوەی رێگە بە لێکدانەوەی هەڵە نەدرێت، هەندێك لە دەوڵەتەکان جاری وا هەیە بە راشکاوی بڵاوی دەکەنەوە، کە هەندێ رەفتار و هەڵویستیان سەبارەت بە وڵاتانی تر ناکرێ، وەك پێزانینێکی بێ دەنگی لێکبدرێنەوە. ئەمەشیان دەوڵەتە عەرەبییەکان لە بەرامبەر ئیسرائیلدا پیادەیان کردووە. لە چەند حاڵەتێکی تردا ئەگەر شتێك نەبێ پێزانینی بێدەنگی رەدبکاتەوە، ئەوە هەندێك رەفتار لە هەلومەرجی تایبەتدا دەکرێ وا دابنرێ، کە پێزانینە بە قەوارەیەکی دیاریکراو. دەکرێ ئەم مەسەلەیە لێکبدرێتەوە ئەگەر لەو هەلومەرجانە بکۆڵینەوە، کە پێزانینی سەپاندووە بەبێ دەرکردنی لێدوانێکی فەرمی. بۆ نموونە برووسکەی پیرۆزبایی بە بۆنەی گێڕانەوەی سەروەری بە پێزانینێکی بێدەنگی دادەنرێ بە دەوڵەتی نوێ. هەروا

---

●بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی کۆسۆڤۆ بڕوانە:

http://ru.wikipedia.org/wiki/%D0%9A%D0%BE%D1%81%D0%BE%D0%B2%D0%BE

http://www.un.org/ar/members/growth.shtml

دامەزراندنی پێوەنـدی دیپلۆمـاتی فـەرمی لەگەڵیـدا، بـەڵام پێوەندییـە نافەرمییـەکان وەك پێوەندیی نێوان ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا و چـینی کۆمۆنیسـت لەشەسـتەکان و حەفتاکاندا لە وارشۆ بە پێزانین دانانرێ. قبووڵکردنی کونسوڵی راسپێردراوی دەوڵـەتێك، کـە دانی پێدانەنراوە و دەسەڵاتی بدرێتێ ئەرکەکانی پیادەبکات زۆر جار وەك پێزانین دادەنرێ بـەو دەوڵەتە، بەڵام نەك لە هەموو حاڵێکدا[8]. بۆنموونە لە تـایوان کۆنسـولگەری بـەریتانیا هەیـە، کەچی بەریتانیا دانی بە تایواندا نەناوە. رەنگە گرێـدانی پەیماننامەیـەکی دووقـۆلی لـەنێوان دەوڵەتێك و دەوڵەتێکی دیکەدا بە پێزانینی بێدەنگی بزانرێ ئەگەر پەیماننامەکە کاتی نـەبێ، بەڵام لە هەمان کاتدا پەیماننامەی هاوشێوە هەن لەنێوان دەوڵەتی هاوشێوەدا و ئەمیان بەوەی دیکەیان دان نانێت. بۆیە دەبێ مرۆڤ لە هەر حاڵەتیك بکۆڵێتەوە بۆ ئـەوەی مەسـەلەکە روون بێت. هەروا تۆمارکردنی سکالانامە لە لایەن دەوڵەتێکەوە دژی دەوڵەتێکی دیکە بـە پێـزانین دانانرێ.

بەشداربوونی دوو دەوڵەت یان زیـاتر لـە دانووسـتاندا و مـۆرکردنی پەیماننامەیـەکی بـە کۆمەڵیی، وەك دەستووری نەتـەوە یـەکگرتووەکان بـە پێـزانین بـە یـەکتر دانـانرێ. دەبیـنین ژمارەیەکی زۆر لە دەوڵەتە ئەندامەکان لـە نەتـەوە یەکگرتووەکانـدا دان بـە یـەکتر یـان بـە حکوومەتەکانیاندا نانێن. بۆ نموونە هەم ئیسرائیل و هـەم وڵاتـە عەرەبییـەکان ئەنـدامن لـە نەتەوە یەکگرتووەکانـدا بـەبێ ئـەوەی دان بـە یـەکتردا بنـێن، بـەڵام ئەگـەر دەوڵـەتێك لـە بەرژەوەندیی ئەندامێتی دەوڵەتێکی دیکە دەنگی دا، ئەوە نیشانەی پێزانینە پێی. بـۆ نموونـە بەریتانیا دەنگدانی لـە بەرژەوەنـدیی ئەنـدامێتی مەکـدۆنیا لـە نەتـەوە یـەکگرتووەکان بـە پێزانینێك بە مەکەدۆنیا دانا وەك دەوڵەت. بێگومان ئەندامێتی لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا بە بەڵگەیەکی بەهێز دادەنرێ بۆ پێکهاتنی دەوڵەت. ئەویش لەو روانگەیەوە کە ئەندامێتی لـەو رێکخراوە نێودەوڵەتییەدا بەپێی ماددەی "٤"ی دەستوورەکەی تەنیا بۆ دەوڵەت دەبێ.

گەلێك جار دەوڵەتەکان لە کۆنگرە نێودەوڵەتییەکاندا بلاوی دەکەنەوە، کە بەشـداربوونیان لە کۆنگرەکە و مۆرکردنیان لەسەر دۆکومێنتە کۆتاییەکانی بە پێزانین دانانرێ بەرامبـەر بـەو دەوڵەتە بەشداربووانە، کە ئـەو دانیپێـدا نـەناون، وەك دەوڵەتـە عەرەبییـەکان و ئیسـرائیل. پراکتیکـی نێودەوڵـەتی وای بۆچـووە کـە پێزانینـی بێـدەنگی دەبـێ تـەنیا لـە حاڵەتێکـدا

8- Oppenhiem. International Law. P. 171, note 9

پیادەبکریّ. بۆیە مەسەلەکە وا دەخوازیّ بە وردی لیّکۆلّینەوە سەبارەت بە حالّەتەکانی تر بکریّ بەر لە حوکمدان لەبارەی فرەوانبوونی رەفتارەکە تاوەکو ببیّتە دانپیّدانان. مەیلی دەولّەتەکان وایە ئەم شیّوازە سیاسییە گرینگەی پیّزانین لەژیّر چاوەدیّری بمیّنیّتەوە و ریّ نەدریّ بە لیّکدانەوەی هەندیّ لە رەفتارەکانیان، کە گوایە پیّزانینی بیّدەنگییە.

### ٣- پیّزانینی مەرجدار:

هەندیّ جار سرووشتی رامیارییانەی پیّزانین جۆرە پیّزانینیّك دەسەپیّنیّ، کە پیّزانینی مەرجداری پیّدەوتریّت. جار هەیە بۆ ئەوەی پیّزانین بە دەولّەتیّك بکریّت مەرج دادەنریّت، کە دەبیّت ئەو دەولّەتە کاریّکی دیاریکراو ئەنجام بدات یان ئیلتیزام بکات بە ئەنجامدانی یان نەدانی کاریّك. وەك مامەلّەکردنی باش لەگەلّ کەمایەتییە ئایینییەکان. لەسەدەی نۆزدەهەم ئەمە روویدا لە مەسەلەی پیّزانین بە هەندیّك لە دەولّەتەکانی بەلقان. جاری وەهاش هەیە پیّگەی دۆستایەتی باشتر دەدریّت بەو دەولّەتەی پیّزانین دەردەکات. بۆ نموونە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە سالّی ١٩٣٣ دانی بە یەکەتیی سۆڤیّتدا نا بەو مەرجەی، کردەوەی وەها ئەنجام نەدات زیان بە ئاسایشی نیّوەخۆیی ئەمەریکا بگەیەنیّ و هەروا هەندیّ لە داواکارییە داراییە کەلّەکەبووەکان لەسەری یەکلابکاتەوە.

مەرجەکان هەرچۆنیّك بن، پیّشیّلکردنیان واناکات پیّزانین هەلّوەشیّنریّتەوە، بگرە ئەوە بەپیّشیّلکردنیّك دادەنریّ بۆ نۆرمەکانی یاسای نیّودەولّەتی و پرەنسیپە سیاسییەکان. سرووشتی مەرجەکان بەستراوە بە ریّککەوتن لەنیّوان دوو لایەنی پیّوەندیدار، بەلاّم لیّرەدا گرینگە جیاوازی بکریّ لەنیّوان پیّزانینی مەرجدار و پرۆسیّسی پەرەسەندنی پیّوەرەکانی پیّزانین بە گشتی ئەگەرچی هەردوو چەمکەکە لە هەندیّ لایەنەکانیاندا ریّك وەکو یەکن.

### ٤- پیّزانینی بە تاك و پیّزانینی بە کۆمەلّ:

زۆرینەی جۆرەکانی پیّزانینی یاسایی، ئەو دانپیّدانانە تاکییانەیە، کە لە لایەن هەر دەولّەتیّك بە تەنیا و لە خۆیەوە دەردەچیّ یان وەك وەلاّمدانەوەیەك بۆ داواکاری دەولّەتە تازەکە. وەك پیّزانین بەو دەولّەتانەی دوای لیّکترازانی یەکەتیی سۆڤیّتی پیّشوو و یۆگۆسلاڤیای پیّشوو پیّکهاتن. پیّزانینی بە کۆمەلّیش لە لایەن چەند دەولّەتیّکەوە بە کۆمەلّی دەردەچیّ لە پەیماننامەیەکدا یان لە بەلّگەنامەیەکی هاوبەشدا یاخود لە کۆنگرەیەکی نیّودەولّەتیدا. وەك

پێزانین بە بەلچیکا لە کۆنگرەی لەندەن ساڵی ١٨٣١ و پێزانین بە سربیا، رۆمانیا و مۆنتینیگرۆ لە کۆنگرەی بەرلین ساڵی ١٨٧٨ و بە پۆڵۆنیا و چیکوسلۆڤاکیا لە کۆنگرەی پاریس ساڵی ١٩١٩.

ئەگەر دەوڵەت وەك ئەندامێك وەربگیرێ لە رێکخراوێکدا یان دەزگەیەکی نێودەوڵەتی کە تەنیا دەوڵەت تیایاندا بەشداربن وەك رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و رێکخراوی لەو بابەتە ئەوە ئەو وەرگرتنە بە شێوەیەك لە پێزانینی بەکۆمەل بە دەوڵەتی نوێ دەزانرێ. ئەگەر قبوولکردن بە گشتی تەواوبوو، ئەوا وەك پێزانینێکە بۆی لەلایەن هەر یەکێکیانەوە، بەلام ئەگەر هەندێك لاری هەبێت پێزانینەکە گشتیی نییە و دەوڵەتە بەرهەڵستکارەکان ئیلتیزام بە بریاری زۆرینەوە ناکەن، ئەمەش واتا بەشداری ناکەن لە بەرهەڵستی لە دەوڵەتە نوێیەکە، چونکە پێزانین وەك زانراوە لەو رەفتارانەیە، کە پێوەستە بە ویستی هەر دەوڵەتێك و بڕیاری تایبەتی و بە تەواوی ئازادییەوەی.

بەلام ئەم مەسەلەیە پێش دووەمین شەڕی جیهانی، واتە لە سەردەمی کۆمەڵەی گەلاندا جیاواز بوو. قبوولکردنی ئەندامێتی دەوڵەتێك تێیدا وەك ئەوە بوو، کە بەکۆمەڵی دانی پێدانرابێ لەلایەن هەموو دەوڵەتە ئەندامەکانەوە. وەك هاتنەریزی یەکەتیی سۆڤێت بۆ ئەندامێتی رێکخراوەکە لە ساڵی ١٩٣٤ بە رازیبوونی ٣٩ دەنگ و بەرهەڵستی ٣ دەنگ و دەنگ نەدانی ٧ ئەندام. ئەوەش بە پێزانین دانرا بە یەکیەتیی سۆڤێت لە لایەن هەموو ئەندامەکانەوە.

# باسی سێیەم

## پێزانین بە حکوومەت

پێزانین بە حکوومەتی نوێ زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ پێزانین بە دەوڵەتی نوێ. دەبینین هەرچی پێوەستە بە سەرهەڵدانی دەوڵەت بارودۆخی واقیعی لەبەرچاودەگیرێ بۆ دیاریکردنی پێوەری پێزانین، بەڵام کێشەکە بەش بەحاڵی حکوومەت جیاوازە کاتێک دەگۆڕێت. زۆر جار پێزانین بە حکوومەت دەکرێ کاتێک ئەگەر گۆڕانەکە بنەما دەستوورییەکانی دەوڵەت نەگرێتەوە، پاشانیش لە پێزانین بە حکوومەتەکان پێوەری توانا و پێگە یاساییەکەی قەوارەکە بە هەند وەرناگیرێ. دەبینین کاتێك دەوڵەتێك دان بە بوونی چەند پێوەرێکی واقیعییانە و بەرئەنجامەکانی دەنێ بۆ قبووڵکردنی حاڵەتیکی دیاریکراو، واتا بوونی حکوومەتێکی تازە، ئەم رەفتارەی وەك پێزانین دادەنرێ. بۆ نموونە لە حاڵەتی پێزانین بە حکوومەتێك نەك هەر دان دەنرێ بەفراهەمبوونی پێداویستییە زەروورەکانی، بگرە ئەو دەوڵەتەی پێزانینی کردووە بە شێوازێك رەفتاردەکات تاوەکو روونی بکاتەوە، کە ئەو قبوولی دەسەلاتی حوکمڕان دەکات لەو دەوڵەتە هەروا قەبوولی بەرئەنجامە یاساییە تەقلیدییەکانیش، کە لەم پێگەیە دەکەونەوە دەکات، وەك ئەو ئیمتیاز و حەسانەتانەی کە پێوەستن بە یاسای نێوەخۆییەوە. بەرژەوەندی سیاسی رۆڵێکی گەورە دەگێرێ بۆ وەدەستهێنانی پێزانین یان رەتکردنەوەی و پێویستە دەوڵەتەکان پەنا ببەنە بەر هەندێ پێوەر تاوەکو بتوانن جیاوازی بکەن لەنێوان گۆڕانکارییە شەرعی و گۆڕانکارییە ناشەرعییەکان لە حکوومەتدا. ئەگەر ئێمە بەریتانیا وەك نموونەیەك وەربگرین دەبینین لە گەلێك باردا لەسەر ئەم رێبازە رەفتاری کردووە. جێگری وەزیری دەرەوەی بەریتانیا لە ساڵی ١٩٧٠ ئاماژەیداوە، کە پێویستە تاکید لەوە بکرێ کە حکوومەت ئاسۆی ماقووڵانەی هەیە بۆ هەمیشە بەردەوامبوون و پشتگیری جەماوەری وەدەستهێناوە و بە پراکتیك زۆرینەی بەشەکانی هەرێمی دەوڵەتی پێوەندیدار بەرێوە دەبات.[٩]

بەریتانیا ئەم سیاسەتەی پیادەکرد لە سەروبەندی پێزانین بە هەردوو حکوومەتی چینی

9- 799 HC Deb, col.23, 6/4/1970

شیوعی و دوایش هەنگاریا، کە سۆڤێتییەکان لە ساڵی ١٩٥٦ دایاننایەوە پاش سەرنەکەوتنی کوودەتا لەوێ. ئەم سیاسەتە ناکرێ بە سیاسەتێکی گشتیی دابنرێ، لە هەموو بارێکدا پراکتیزەبکرێ. دەبینین بەریتانیا بە درێژی چەندین ساڵ قایل نەبوو دان بە کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی و ڤێتنامی باکور و کۆریای باکور بنێ، بەڵام ئەم هەڵوێستە لە بەرئەنجامی چەند بەرژەوەندییەکی سیاسییەوە هات و لە هەلومەرجێکی تایبەتدا بوو. جا ئەگەر ڕەتکردنەوەی پێزانین بە بیانووی ناشەرعی حکوومەت و هاتنی بە شێوەی نایاسایی بێت لە جیاتی ئەو ڕاستییەی، کە توانای نییە کۆنترۆڵی ڕاستەقینەی خاکەکەی خۆی بکات، ئەوا ئەم ڕەتکردنەوەیە سەنگی خۆی وەك بەڵگەیەکی متمانەپێکەر لە دەست دەدات. بە واتایەکی تر ئەگەر ڕادەی ئەو دەسەڵاتەی حکوومەتە نوێییەکە بە سەر هەرێمەکەوەی پیادەی دەکات، ڕوون نەبێ، ئەوە دانپێدانانی دەوڵەتەکانی تر پێی بە فاکتەرێکی گرینگ دادەنرێ و لەسەر حکوومەتی پێوەندیدار کاریگەری دەبێ. ئەگەر حکوومەتی نوێ سەقامگیربوو و چەسپا دان پێدانەنانی کار ناکاتە سەر سیفەتە شەرعییەکەی.

گۆڕینی حکوومەت بە هەر شێوازێك بێت کارناکاتە سەر خودی قەوارەی دەوڵەتەکە. چونکە دەوڵەت کەسایەتییە یاساییە نێودەوڵەتییەکەی بە لابردنی حکوومەتەکەی لە دەست نادات.

دوو جۆرە پێزانین هەن، نابێ تێکەڵاوی لەنێوانیاندا بکرێ. پێزانین بە دەوڵەت کاردەکاتە سەر کەسایەتیی یاسایی دەوڵەت، بەڵام پێزانین بە حکوومەت کاریگەریی دەبێ بە سەر سرووشتی دەسەڵاتی حکوومەت نەوەك دەوڵەت. دەکرێ هەردوو پێزانین بە دەوڵەت و بە حکوومەتیش لە یەك کاتدا ڕووبدات لەو حاڵەتەی دەوڵەتە تازەکە پێکدێ. بۆ نموونە بەریتانیا و ئەمەریکا لە یەك کاتدا دانیاننا بە حکوومەت و دەوڵەتی ئیسرائیلدا. پێزانین بە حکوومەت بە دانپێدانانێکی بێدەنگی بە دەوڵەتیش دادەنرێ، بەڵام ناکرێ پێزانین بە دەوڵەت بە پێزانینێکی بێدەنگی بە حکوومەت بژمێردرێ. پێزانین بە حکوومەت کەسێکی نوێ دروستناکات لە یاسای نێودەوڵەتیدا، بگرە ڕۆڵێکی گرینگ دەگێڕێ لە پێوەندییە دیپلۆماتییەکاندا. لە بەرئەوە ناکرێ لەگەڵ ئەو حکوومەتانەی دانیان پێدا نەنراوە، پێوەندیی دیپلۆماتی ببەستێ و نوێنەرانی دیپلۆماتی ئاڵوگۆڕ بکرێن.

وێڕای ئەوە زۆرینەی یاساناسان تیۆریی بەڕێوەبردن بە پراکتیك پەسەنددەکەن سەبارەت بە پێزانین بە حکوومەت، بەڵام تیۆریی دیکەش هەن لەبارەی پێزانین، گرینگترینیان تیۆرییەکەی (Tobar)ە، کە تیۆریی شەرعیشی پێدەگوترێ. ئەم تیۆرییە پێیوایە دەبێت دان نەنرێ بەو حکوومەتانەی، کە بە

ڕێگەی نادەستووری و ناشەرعییەوە دەسەڵات وەردەگرن و دانیشتووانیش پشتگیرییان لێ ناکەن بە لایەنی کەمەوە. ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا بە تایبەتی ئەم سیاسەتەی لە ئەمەریکای لاتینیدا پیادەکرد. یەکێك لە هۆکارە گرینگەکان بۆ دانانی ئەم تیۆرییە پاراستنی سەقامگیری بوو لەناوچەی گرینگی کەناڵی پەنەما. بە لۆژیك ئەم بیرۆکەیە لەسەر دانپێدانەنان بە هەموو ئەو گۆڕانکارییەی دێنە پێش لە بەرئەنجامی کاری شۆڕشگێڕی، بونیاد نرابوو.

لە گۆشەنیگای ئەمەریکاییەکانەوە ئەم تیۆرییە گۆڕا بۆ ئەو سیاسەتەی ویلسن پیادەی دەکرد و برێتیبوو لە ڕەوایی دیموکراتی، واتا ئەگەر شۆڕش پشتگیریی گەل وەدەست نەهێنێ پێزانین وەدەست ناهێنێ. ئەوە بوو ئەم تیۆرییە بە تایبەت بۆ بەرەنگاربوونەوە لە یەکیەتیی سۆڤێت تاوەکو ساڵی ١٩٣٣ بەکارهێنرا، بەڵام دوا جار پاشەکشەی پێکرا تاوەکو گەیشتنە قبووڵکردنی لەم سەردەمەدا تەنیا وەك وەسفێکی سیاسی، کە ئەو دەوڵەتەی پێزانین دەکات لەبەرچاوی دەگرێ.

ئەم تیۆرییە، تیۆرییەکی تەواو پێچەوانەی ورووژاند، کە ئەویش تیۆریی (ئیستراداEstrada =)ی وەزیری دەرەوەی مەکسیك بوو. ئەم تیۆرییە بانگەشەدەکات بۆ پێزانینی ئۆتۆماتیکییانە لە هەر هەلومەرجێکدا بێت بەبێ ڕەچاوکردنی ڕەهەندی سیاسی و باروودۆخی دامەزراندنی دەوڵەت. ئەم تیۆرییە ڕەخنەی لێگیراوە بەوەی کە نالۆجیکە، بەتایبەتی کاتێك حکوومەتێکی دیکەی رقەبەر هەبێ لە بەرامبەریدا و جیاوازی نێوان پێزانین و درێژەدان بە پێوەندیی دیپلۆماتی کەمدەکاتەوە بۆ نزمترین ئاست. کێشەکەش لەوەدایە کە پێزانین دەبێتە دەستخۆشی لەو حکوومەتەی بە نارەوا دەسەڵات وەردەگرێ. ئەگەر ئەو فاکتەرەکانی تر، کە شان بە شانی هەلومەرجی دانپێدانان دێن، بە هەند وەربگیرێن، بێگومان پرۆسێسێکی ئاڵۆزی نازەرووری لێ دەکەونەوە. بۆ نموونە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٧٧ بلاوی کردەوە، کە ((پراکتیکی دەرەوەی ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا دانپێدانانی دوورخستۆتەوە لە حاڵەتی گۆڕینی حکوومەتەکان و لەم حاڵەتە ئارەزووی ئەمەریکا لەبەرچاودەگرێ لەوەی، ئایا دەیەوێ پێوەندیی دیپلۆماتی لەگەڵ حکوومەتە تازەکەکان ببەستێ یان نا.. سیاسەتی ئیدارەی ئەمەریکا ئەوەیە، کە بەستنی پێوەندییەکان ڕازیبوون یان ناڕازیبوون نییە بەو پێوەندییانە، بگرە تەنیا گوزارشتە لە ئارەزوومان بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارمان لەگەڵ حکوومەتەکانی تر ڕاستەوخۆ بەپێی ویستمان)).[10]

---

10- DUPIL, 1981- 1988, vol. 1, 1993, po 295

لە ساڵی ١٩٨٨ حکوومەتی بەریتانیا بڵاویکردەوە، کە ئەو لێرە بەدوا بۆ دەوڵەت نەبێت، پێزانین دەرناکات[11]. ئەمە لەو تێگەیشتنەوە هات، کە پێزانین برێتییە لە دەسخۆشیکردن لە کردەوەکەی حکوومەتەکە. ئەمەش زۆر جار نیگەرانی دەورووژێنێ، بە تایبەتی بەوەی پێوەستە بەو حکوومەتانەی مافی مرۆڤ پێشێل دەکەن. ئەو دەوڵەتانەی کۆمەڵگەی مەدەنییان لەنێوەخۆیاندا بونیادناوە وەك: بەلجیکا و فەرەنسا و ئوستراليا و کەنەدا و هۆڵەندا لەسەر ئەم ڕێبازە دەڕۆن، واتا دانپێدانەنان بەو حکوومەتانەی کە لەگەڵ دەسەڵات گرتنەدەست، مافی مرۆڤیش پێشێلدەکەن.

ئەم گۆڕانکارییە لە پێزانیندا هەموو کێشەکانی چارەسەرنەکرد، بگرە لە جیاتی پێزانینی فەرمی تێڕوانینی ئاراستەی چارەسەری نافەرمی کرد. ئەوە بوو بەریتانیا بڵاویکردەوە، کە درێژە دەدات بە چارەسەرکردنی ڕژێمە ناشەرعییەکان بە شێوەیەکی سرووشتی لەبەر ڕۆشنایی خەملاندنی ئەوەی ئایا دەتوانن خۆیان پیادەی دەسەڵاتی فیعلی بکەن لەسەر هەرێمی دەوڵەتی پێوەندیدار یان نە، هەروا ئەگەری بەردەوامبوون یان بەردەوام نەبوونیان هەیە.[12] دەکرێ بڵێین هەموو ئەوەی لە پێزانین گۆڕاوە هەڵوەشانەوەی پێزانینە بە حکوومەت.

---

11- C. Simmons, UK Abolition of the Doctrine of Government: A Rose by another Nam? Public Law 1981, P, 249

12- 408 HL, Deb, cols, 1121-1122, 28/04/ 1980

## باسی چوارەم

## پێزانین بە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی

یاسای نێودەوڵەتی تەقلیدی جیاوازی لەنێوان پێزانین بە جەنگاوەران و پێزانین بە بزووتنەوەکانی ڕزگاریخوازی نیشتمانی و پێزانین بە نەتەوە کردووە، بەڵام یاسای نێودەوڵەتی هاوچەرخ بە تێڕوانینێکی گشتگیرییانەی بابەتیانە دەڕوانێتە مەسەلەکە، بەو پێیە کە شۆڕش و جەنگ چەند قۆناخێکن بزووتنەوە ڕزگاریخوازییەکانی نەتەوە چەوساوەکان یان ژێردەستەکان پێیدا دەڕۆن لە پێناو گەیشتن بە مافی بڕیاردانی چارەنووس و سەربەخۆیی. بۆیە لێرەدا لەژێر ناونیشانی پێزانین بە بزووتنەوە ڕزگاریخوازییەکانی گەلان، لەم مەسەلەیە دەکۆڵینەوە و تیشک دەخەینە سەر قۆناخە جیاجیاکانی پەرەسەندنیان تاوەکو سەربەخۆییبوونی تەواو.

گوزارشتکردن لە ئیرادەی وەدەستهێنانی مافی بڕیاردانی چارەنووس هەمیشە پێش پرۆسێسی پێزانین دێ. لەم قۆناخەی هاوچەرخدا دەربڕین لەو ئیرادەیە لە ڕێگەی پێکهاتنی حکومەتی کاتی یان هەمیشەیی یان جاڕدانی دەوڵەتی سەربەخۆوە دەبێت، بەڵام لە هەوەڵین قۆناخی خەبات لە پێناو وەدیهێنانی مافی بڕیاردانی چارەنووس بە ڕێگەی پێکەوەنانی بەرەی ڕزگاریخوازی و ڕێکخراوی بەرخودان، وەدی دێت.

کامڵبوونی ئەهلییەتی نەتەوە وەك کەسێك لە کەسەکانی یاسایی نێودەوڵەتی بە توندی بەندە بە پێزانینییەوە. ئەم ئەهلییەتەش لەوە بەرجەستەدەبێت، کە کاتێك نەتەوە بتوانێ کۆمیتەی شۆڕشگێڕی و بەرەی نیشتیمانی و ئەو حیزب و ڕێکخراوانە دابمەزرێنێ، کە توانایان هەبێت لە ئاستی نێودەوڵەتیدا نوێنەرایەتی بکەن و لە ئاستی نێوەخۆییشدا پێشڕەویی بکەن.

لە قۆناخی یەکەمی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانیدا واتا **قۆناخی شۆڕش**، هەندێ جار دان بە شۆڕشدا دەنرێ لە لایەن دەوڵەتەکانەوە بە دەوڵەتە ئەسڵەکەشەوە. ئەگەر پێزانین لە لایەن دەوڵەتە ئەسڵەکەوە کرا، ئەوا ئەم دەوڵەتە بەرپرسیارێتی کردەوەی شۆڕشگێڕان ناخاتە ئەستۆی خۆی، چونکە ئەوان وەك کەسێکی نێودەوڵەتی دانیان پێدانراوە، پاشان ئەوان بەرپرسیارێتی یاسایی کردەوەکانیان لە ئەستۆی خۆیاندایە. پێزانینیش لە لایەن دەوڵەتە بیانییەکانەوە مافی ئەوە بە شۆڕشگێڕان نادات کەشتییە بیانییەکان بپشکنن و ئابلووقەی

دەریایی دابنێن. ئەم جۆرە پێزانینە بە بزووتنەوەکانی ڕزگاریخوازیدا، کۆنترین جۆرە لە مێژوودا و لە کاتێکدا سەریهەڵدا، کە گەلانی ئەمەریکای ناوەڕاست و باشوور لـە دژی کۆلۆنیـالیزمی ئیسپانی و ڕژێمە سەرکوتکارەکاندا خەباتیان دەکرد، وەك شۆڕشەکانی نێـوان هـەردوو سـاڵی ١٨٩١ ـ ١٨٩٥ لە هەر یەك لە وڵاتەکانی چیلی و فەنزەویلا و بەرازیل و کوبا.

کاتێك شۆڕش پەرەدەسێنێ و دەستی دەڕوا، کـە دەسـەڵاتی زاڵبێـت بـە سـەر بەشـێکی هەرێمەکەیدا بە ڕێگەی لەشکرێکی پوخت و ڕێك و پێك و پابەنددەبێت بە ڕێسـا و یاسـاکانی جەنگ و بێلایەنی لە پرۆسەی سەربازیدا، ئەوکاتە نۆرەی پێزانینێکی تر دێت، ئەویش **پێزانینە بە جەنگاوەران**. ئەم جۆرە پێزانینە لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەم سەریهەڵدا وەختێك گـەلانی ئەمەریکای باشوور لە دژی کۆلۆنیالیزمی ئیسپانی شۆڕشیان کرد و ویلایەتە یـەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ١٨١٧ دانیپێدانان و بەریتانیاش لە ساڵی ١٨٢٢ هەروا فەرەنسا و بـەریتانیاش لە ساڵی ١٨٦١ بە سیفەتی جەنگاوەریی دانیان نا بەو ویلایەتە باشوورییانە، کە چوونە کۆڕی جەنگ لە پێناو جیابوونەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

**ئەو بەرئەنجامانەی لەم جۆرە دانپێدانانە دەکەونەوە ئەمانەن:**

١- مامەڵەکردن لەگەڵ جەنگاوەران بە سیفەتی دیلـی جـەنگ لـە کـاتی دیلکردنیانـدا، چونکە نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵـەتی گشـتی جێـی نۆرمـەکانی یاسـایی تـاوانی نـاوەخۆی دەوڵەتی ئەسڵ دەگرنەوە لە کاتی پێوەندیی نێوان هەردوولا.

٢- جەنگاوەران مافیـان هەیـە ئابڵووقـەی دەریـایی بسـەپێنن و کەشـتییە بێلایەنـەکان بپشکنن و قاچاغچییان بگرن.

٣- دەوڵەتەکانی تر یارمەتی دوو لایەنەکە نەدەن و بێ لایەن بن لە بەرامبەریاندا.

بیرۆکەی پێزانین لە یاسای نێودەوڵەتی گشتیدا بە جۆرێ پێی نایـە قۆنـاخێکی نوێـوە لـە سەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهـانی، کاتێـك چـیك و سـلۆڤاك و پۆڵۆنییـەکان **ڕێکخـراوی ڕزگاریخوازی نیشتمانییان** لە تاراوگە دروستکرد و شان بە شانی هاوپەیواتان چوونە جەنگ لە دژی ئەڵمانیا و ئیمپراتۆرییەتی نەمساوی ـ مەجەرستان بـە ئامـانجی پێکـەوەنانی دەوڵـەتی نەتەوەیی سەربەخۆی خۆیان.

لەو دەمەدا پێزانین بە واتای پێزانین بە مافی ئەم گەلانە نەهات لە بڕیاردانی چـارەنووس و پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی نەتەوەیی بۆیان پاش ئەوەی شەڕ بە کۆتایی دێت، بگرە تـەنیا بە واتای پێزانین دەهات بە بەشداربوونی ئەم نەتەوانە لە جەنگ شان بە شانی ئەو دەوڵەتانـەی

دانیان پێیان ناوە. واتا پێزانین تەنیا بۆ ئەوە هاتووە شەرعییەت بدرێ بە بەشداربوونی هێزی چەکداری ئەم نەتەوانە لە جەنگ شانبەشانی هێزەکانی هاوپەیواتان.[١٣]

لە کاتی دووەمین شەڕی جیهاندا **پێزانین کرا بە کۆمیتەکانی بەرخودان**، کە گەلانی پۆلۆنیا و چیکۆسلۆڤاکیا و فەرەنسا و بەلجیکا و هۆڵەندا و لوکسەمبورگ و نەرویژ و یوگۆسلافیا و یۆنان پێکیان هێنان لە پێناو ڕزگاربوون لە ئەلمانیای نازی. لە پاش شکستی نازییەکان لە جەنگ و دامەزراندنی بەرەی سۆشیالیستی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی لە دژی کۆلۆنیالیزم و چەوساندنەوەی نەتەوەیی، پەرەیسەند و لە لایەن بەرەی شیوعی و وڵاتە تازە پێگەیشتووەکانەوە ڕاستەوخۆ پێزانینیان وەدەست هێنا.

پێزانین بە **بزووتنەوەکانی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی** نۆرمێکی شەرعییانەی گرینگ پێکدێنێ بۆ پێشکێشکردنی جۆرەها کۆمەك و یارمەتی بۆ گەلانی خەباتگێڕ لە پێناو بەدەستهێنانی مافی بڕیاردانی چارەنووس و ڕۆڵێکی دیار دەگێڕێ بۆ پێشخستنیان لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە، سەرەڕای ئەوەی فاکتەرێکی گرینگە بۆ بەستنی پێوەندیی نێودەوڵەتی لەنێوان کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی گشتی و چەسپاندنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی و بەدیهێنانی دراوسێیەتی باش و هاوکاری لەنێوان گەلاندا.

ڕێکخراوە نێودەوڵەتی و هەرێمییەکان بۆ پەرەسەندنی پێزانین بە بزووتنەوەکانی ڕزگاریخوازی نیشتمانی هاوکارییان کردووە. ئەوە بوو ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕۆڵێکی کارای بینی لە پرۆسێسی لەناوبردنی کۆلۆنیالیزم و بەوەش ڕێگەی والاکرد بۆ پێزانین بە بزووتنەوەکانی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی لە ئەفریقیا و ئاسیا. لەم بوارەشدا بڕیاری کۆمەڵەی گشتیی سەبارەت بە لەناوبردنی کۆلۆنیالیزم ساڵی ١٩٦١ ڕۆڵێکی گرینگی هەیە، چونکە سیفەتی شەرعییەتی ئیلزامی داوە بەو خەباتە چەکدارییەی گەلان دەیگێڕن لە پێناو وەدیهێنانی مافی بڕیاردانی چارەنووس پاشانیش پێزانین بە نوێنەرە شەرعییەکانیان، کە بەرجەستەن لە حیزبەکان و بەرەو ئەو کۆمیتانەی ئەو بزووتنەوانە سەرکردایەتییان دەکەن.

لێرەوە پێزانین بە نەتەوە خەباتگێڕەکان لە پێناو مافیاندا، وەك کەسێك هاتووە لە کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی، ئەمەش بواری پێداون نووسینگەی تایبەت بە خۆیان بکەنەوە لەو دەوڵەتانەی دانیان پێداناون و بەشداری بکەن لە کارەکانی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان

---

١٣- مەجۆریان: ماف و ئیلتیزامە سەرەکییەکانی دەوڵەت. مۆسکۆ، ١٩٦٥، ل ١٠٢.

یاخود تەنانەت لە هەندێ باریشدا وەك ئەندامێكی چاودێر وەربگیرێن لـە هەنـدێ رێكخـراوی نێودەوڵەتی و یارمەتی بدرێن ئەو مافانەیان جێبەجێ بـێ، کـە یاسـای نێودەوڵـەتی گشـتیی پەسەندی دەکات بـۆ جـەنگاوەران و هـەروا وەرگـرتنی یارمـەتی لـە دەوڵەتـەکان لـە پێنـاو پیادەکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووس.

ئـەم جـۆرە پێزانینـە پراکتیزەکردنـی بـەخۆوەبینی لـە کـۆنگرە نێودەوڵەتییەکانـدا، وەك کۆنگرەی باڵای دەوڵەتانی بێلایـەن لـە سـاڵی ١٩٦٤، کـە تاکیددەکاتـە سـەر شـەرعییەتی بزووتنەوەکانی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی لە پێنـاو وەدیهێنـانی مـافی بڕیـاردانی چـارەنووس و دانانیان وەك تاکە نوێنەری ڕەوا بۆ بەرژەوەندیی گەلەکانیان لە دانووسـتانەکان و چارەنووسـی دواڕۆژیان.

کۆمەڵێك بڕیار لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەرچووە جەختیان کردۆتە سـەر پێـزانین بە بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکان لە کۆلۆنەکانـدا، بـۆ نموونـە بڕیـاری کۆمـەڵی گشـتیی نەتـەوە یەکگرتووەکان ژمارە (٢٩١٨) لە ١٤\١١\١٩٧٢ ئاماژەیداوە، کە حیزبـی سـەربەخۆیی لـە گینیا_ بێسا و دوورگەکانی (راس الاخضر) تاکە نوێنەری ڕەوای گەلن و هەردوو بزووتنـەوەی فریلیمۆ Frelimo و ماپاڵ Mapal نوێنـەری ڕاسـتەقینەی گـەلی مۆزانبیـق و ئـەنگۆلان، هەروا بڕیارەکە داواش لە دەوڵەتەکان و دەزگەکانی نەتەوە یـەکگرتووەکان دەکـات نوێنـەرانی بزووتنـەوە ڕزگاریخوازییـەکانی ژێـر دەسـەڵاتی کۆلۆنیـالیزمی پورتوگـال بەشـداردەبن لـە گفتوگۆکانی تایبـەت بـە بەرژەوەندییـەکانیان. دیسـان داوادەکـات جـەنگاوەرانی بزووتنـەوە ڕزگاریخوازییەکان لە مۆزانبیق و ئەنگۆلا و گینیـا و دوورگـەکانی (راس الاخضـر) لـە کـاتی دەستگیرکردنیاندا لە شەڕ وەك دیلی جەنگ مامەڵەبکرێن بەپێی ئەو پرەنسـیپانەی، کـە لـە ڕێککەوتننامەی جنێڤدا هاتوون بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دیلەکانی جەنگ و پاراستنی کەسانی سیڤیل لە کاتی جەنگ (ساڵی ١٩٤٩). بڕیارێکی تریش، کە نەتەوە یەکگرتووەکان لە سـاڵی ١٩٧١ دەریکرد، دەڵێت: پێویستە بەشداربووەکانی بـەرخودان و ئەوانـەی لـە پێنـاو ئازادیـدا لـە باشووری ئەفریقیا و هەرێمەکانی ژێر دەسـەڵاتی کۆلۆنیـالیزم و داگیرکردنـی بیـانی و ئەوانـەی لـە پێناوی ئازادی و مافی چارەنووسیان خەبات دەکەن، لـە کـاتی دەسـتگیرکردنیان بـەپێی پرەنسـیپی یاسـای نێودەوڵـەتی و ئـەحکامی ڕێککەوتننامـەکانی لاهـای سـاڵی ١٩٠٧ و هـەروا ڕێککەوتننامەکانی جنێڤی ساڵی ١٩٤٩ وەك دیلی جەنگ ڕەفتاریان لەگەڵدا بکرێ.

# باسی یەکەم

# چەمکی میراتگریی دەوڵەت و بەردەوامبوون

## ١- چەمکی میراتگریی دەوڵەت:

قەوارە سیاسییەکان هەتا هەتایە وەك خۆیان نامێننەوە، بگرە هەمیشە گۆڕانکارییان بەسەردادێ یان دەگۆڕدرێن و لەناودەچن. دەبینین دەوڵەتانێك هەڵدەوەشێنەوە یان لێکدەترازێن و دەبنە دەوڵەتی تازە و چەند یەکیەتییەکی فیدراڵی دادەمەزرێن، یاخود لێکتر جیادەبنەوە. بۆیە پێویستە یاسای نێودەوڵەتی ئەم ڕووداوانە لەخۆ بگرێت و بیانخاتە چوارچێوە گشتییەکەیەوە، بە شێوەیەك لە ئەگەری زەرەر و زیان و پشێوی و ناسەقامگیری کەم بکاتەوە تا ئەوپەڕی ڕادەی. ئەم گۆڕانکارییانە لە پاش دووەمین شەڕی جیهانیدا گەیشتنە لوتکە، کاتێك زیاتر لە ١٠٠ دەوڵەتی سەربەخۆی نوێ دامەزران.

گۆڕانی سەروەریی سیاسی لەسەر قەوارەی هەرێمێکی دیاریکراودا لە ڕوانگەی یاسای نێودەوڵەتی و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە، هەندێ کێشە دەورووژێنێ. بۆ نموونە ئەو دوڵەتە تازەیەی پێکهاتووە، چۆن ئیلتیزام دەکات بەو پەیماننامانەی دەوڵەتی پێشوو بەستبووی کاتێ سەروەریی بەسەر ئەو هەرێمەدا کێشابوو؟ ئایا هاوولاتێتی بە شێوەی ئۆتۆماتیکیانە دەگوازرێتەوە بۆ دانیشتووان تاوەکو جێی هاوولاتێتی دەوڵەتی پێشوو بگرێتەوە؟ ئایا چارەنووسی سامانە گشتییەکانی دەوڵەتی پێشوو چی بەسەردێ؟ و تا چ ڕادەیەك دەسەڵاتی نوێ بەرپرسیاردەبێ لە بەرامبەر قەرزە کۆنەکانی دەوڵەت؟

نابێ تێکەڵاوی بکرێ لەنێوان میراتگری لە یاسای نێودەوڵەتی و میراتگری لە یاسای نێوەخۆییدا. دەبینین لەبەرئەوەی بەرژەوەندی و بۆچوون لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، لێکئالاون، ئەوە پرەنسیپەکانی سەروەری دەوڵەت و یەکسانی نێوان دەوڵەتەکان و دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوەخۆ ڕێدەگرن لەوەی پرەنسیپێکی گشتی دابنرێ بۆ میراتگری نێودەوڵەتی، وەك ئەوەی لە میراتگری یاسای نێوەخۆییدا هەیە. وێڕای ئەو هەولانەش، کە دراون بۆ پێڕەوکردنی بیرۆکەی یاسای ڕۆمانی سەبارەت بە درێژەدان بە کەسایەتی یاسایی ئەو دەوڵەتەی لە

بەرئەنجامی یاخیبوون و شۆڕش دەڕۆخێ، ئەوە ئەم چارەسەرە خزمەتی بەرژەوەندیی دەوڵەتەکان و پراکتیکی نێودەوڵەتی ناکات. دەبینین لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئەو تیۆرییە زاڵبوو، کە بانگەشەی دەکرد بۆ ڕەتکردنەوەی هەر گواستنەوەیەکی ماف و ئیلتیزام و بەرژەوەندیی دارایی لە دەوڵەتی پێشووەوە بۆ دەوڵەتی تازە. ئەم تیۆرییە جارێکی تر سەریهەڵدا لە پرۆسێسی لەناوبردنی کۆلۆنیالیزم لە وێنەی پرەنسیپی ( تۆمارگەی خاوێنClean slate) بە واتای ئەوە دێ، کە دوڵەتە تازەکە سەروەریی وەردەگرێ بەبێ ئەو ئیلتیزاماتانە، کە پاشماوەی دەوڵەتە کۆنەکەن.

پرسیی میراتگری دەوڵەتەکان لەگەڵ حاڵەتەکانی گواستنەوەی سەروەری هەرێمدا سەرهەڵدەدات، وەك پرۆسێسی لەناوبردنی کۆلۆنیالیزم، کە لە هەموو یان لە بەشێك لە یەکەیەکی هەرێمیی دەگرێتەوە، یاخود پرۆسێسی لێکترازانی دەوڵەتێك و جیابوونەوە، یان خستنەپاڵ، یان تێکەڵکردن کە لە هەرێمێکدا ڕوودەدات.

لە هەر بارێك لەم بارانەدا قەوارەیەك هەمووی یان بەشێکی نامێنێ بۆ ئەوەی دەسەڵاتێکی تر جێی بگرێتەوە، ئەم کارەش وادەکات کێشەی گواستنەوەی ماف و ئیلتیزام بێتەئاراوە. بە هەرحاڵ مەسەلەی جێگرتنەوەی دەوڵەتەکان ماف و ئیلتیزامە گشتییەکانی دەوڵەتەکان، کە لە یاسای نێودەوڵەتیدا هاتوون، ناگرێتەخۆ، چونکە ئەم مەسەلەیە لە پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتییەوە سەرچاوەی گرتووە و ئیلزامی هەموو دەوڵەتێکی خاوەن سەروەری دەکات و لە ڕێگەی گواستنەوەیەوە لە دەوڵەتی پێشووەوە نایەت. هەروەها دەبێ جیاوازی بکرێ لەنێوان میراتگری دەوڵەتەکان و میراتگری حکوومەت بەتایبەتی لە ڕێگەی شۆڕش و ئەو بەرئەنجامانەی لە پێزانین و بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی دەکەونەوە.

لە گەلێ باری وەك یەکدا ئەو کێشانەی تایبەتن بە میراتگری لە ڕێگەی پەیماننامەوە چارەسەردەکرێن، بەتایبەتی ئەو پەیماننامە هەمەلایەنانەی، بە تایبەت لە گۆڕانکارییە هەرێمییەکان دەکۆڵنەوە، وەك: پەیماننامەی (سانت جەرمان) لەساڵی ١٩١٩، کە چارەسەری هەندێ کێشەی کرد، کە پێوەندییان هەبوو بە ڕووخانی ئیمپراتۆرییەتی (نەمسا ـ مەجەر)ـەوە، هەروا ڕێککەوتننامە دووقۆڵییەکانی نێوان دەوڵەتی کۆلۆنیالیزمی و دەوڵەتی تازە ڕزگاربوو.

دەبینین هەر یەك لە بەریتانیا، فەرەنسا و هۆڵەندا سیستەمی ڕێککەوتننامەکانی گواستنەوەیان پێڕەوکرد لەگەڵ کۆلۆنەکانیان، کە بوونە دەوڵەتی سەربەخۆ. هەندێ لەم

ڕێککەوتننامانە جەختیان کردووە، کە هەموو ئەو ماف و تایبەتمەندی و ئیلتیزام و ئەرکانەی لەسەر ئەستۆی دەوڵەتە کۆلۆنیالیزمەکە بوون سەبارەت بە هەرێمیٚ پێوەندیدار بەپێی دۆکومێنتی نێودەوڵەتی کارپێکراو، دەگوازرێنەوە بۆ دەوڵەتی نوێ[1]. ئەم سیستەمە جێی ڕەزامەندی هەندێ لە دەوڵەتە تازەکان نەبوو، ئەوە بوو هەندێکیان یەکلایەنە بڕیاریاندا بە دیاریکردنی ماوەیەکی دیاریکراو بۆ کارکردن بە ڕێککەوتننامەی بەستراو لەگەڵ دەوڵەتی کۆلۆنیالی تاوەکو لەو ماوەیەدا چاو دەخشێنرێ بە مەسەلەی قبوولکردنی یان ڕەتکردنەوەی ڕێککەوتننامەکە. بەم جۆرە هەر یەك لە تەنجانیقا و ئۆگەندا و بوروندی ساڵی ١٩٦١ ئەم ڕێبازەیان پێڕەوکرد[2]. ئەو ڕێککەوتننامە دووقۆڵییانەش، کە بەپێی نۆرمی یاسای نێودەوڵەتی عورفی (نەریتی) هەڵناوەشێنەوە، لە کۆتایی ئەو ماوەیەی بۆیان دیاریکراوە، کۆتاییان پێدێت.

بەهەرحاڵ، مەسەلەی میراتگری لە یاسای نێودەوڵەتیدا، مەسەلەیەکی ئاڵۆزە. کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی گونجاو چارەسەری هەندێ لەو نۆرمانەی نەکردووە، کە ئەو گۆڕانکارییە سیاسییە تایبەتییانە، کە سەریان هەڵدا بگرێتەوە. لەبەرئەوە ئەو لێژنە نێوبژیوانییەی لە لایەن کۆنگرەی تایبەت بە یۆگۆسلاڤیا پێکهات، ئاماژەی دا، کە هەندێ پرەنسیپی چەسپاو هەن لە یاسای نێودەوڵەتیدا، دەکرێ لەسەر میراتگری دەوڵەتەکان پراکتیزەبکرێن، بەڵام پێویستە ئەو مەسەلانە دیاری بکرێن، کە دەشێ لەمیانەیاندا ئەم نۆرمانە بە وردی پراکتیزەبکرێن.

ئەگەرچیش ڕێککەوتننامەکانی ڤیەننای هەردوو ساڵی ١٩٧٨ و ١٩٨٣ هەندێ نۆرمی گشتییان داڕشتووە سەبارەت بە میراتگری دەوڵەتەکان، بەڵام هەندێ لە نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی نەریتی پراکتیزەدەکرێن بۆ چارەسەرکردنی ئەو مەسەلەنێودەوڵەتییانەی پێوەستن بە میراتگری دەوڵەتەکان. دەبینین ڕێککەوتننامەی ڤییەنا ساڵی ١٩٧٨ لەبارەی میراتگری دەوڵەتەکان لە پەیماننامەکاندا لە ساڵی ١٩٩٦ چووە واری جێبەجێکردن، ڕێککەوتننامەی ڤیەنناش ساڵی ١٩٨٣ لەبارەی میراتگری سامانی دەوڵەت و ئەرشیف و قەرزەکان تاوەکو هەنووکە نەچۆتە واری جێبەجێکردنەوە. وێڕای ئەوەش زۆرینەی ئەو ئەحکامانەی لەم ڕێککەوتننامەیەی دواییەدا هاتوون ڕەنگدانەوەی پرەنسیپە زاڵەکانی یاسای نێودەوڵەتین.

---

1- O. Connell, state Succession in municipal Law and International Law, Cambridge, 1967 vol. 2, pp.352- 73
2- Yearbook of the ILC, 1974, vol.2 p.192

دەکرێ **میراتگری وا پێناسە بکرێ، کە بەرپرسیارێتی دەوڵەتێك لە هەرێمێکی دیاریکراو، جێگەی بەرپرسیارێتی دەوڵەتێکی تر دەگرێتەوە، لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا**[3]، بەڵام ئەم پێناسەیە لە توێیدا کۆمەڵێك لەو گیروگرفتانە دەشارێتەوە، کە لەگەڵ حاڵەتەکانی پێکهـاتنی دەوڵەتی نوێدا دێن و تەنانەت لەگەڵ گواستنەوەی ئەو شـتانەی دەکـرێ لـە دەوڵـەتی پێشـوو بگوازرێتەوە بۆ دەوڵەتێ یان دەوڵەتانی نوێ. چونکە میراتگـری دەوڵەتـەکان دەسـتەواژەیەکی گشتییە بە واتای گۆڕانکاری ڕاستەقینەی سـەروەری دێـت لـە هـەرێمێکی دیـاریکراودا. لـە گەلێك باردا ئەوە ڕوون نییە چ ماف و ئیلتیزاماتێك لەمیانەوە بۆ ئەوی تریان دەگوازرێنـەوە، هەروا تا چەند ورد و بە دیقەتن. بە زۆریش مەسەلەکە بەستراوە بە هەر بارێکی تایبەتەوە، بۆ نموونە چ ڕوودەدات لە بارێکدا ئەگەر دوو دەوڵەت لە دەوڵەتێکدا تێکەڵ بکرێن یان هەرێمێ لە جەستەی دەوڵەتێکی بونیادنراو جیابێتەوە و ببەسترێ بە دەوڵـەتێکی تـرەوە یـان بەشـێك لـە هەرێمی دەوڵەتێك جیابکرێتەوە و دەوڵـەتێکی نـوێ لەسـەری بونیـاد بنـرێ یـان دەوڵـەتێك لێکبترازێ و دوو دەوڵەت یان زیاتر پێك بێت یان دەوڵەتێکی تازە لە بەرئـەنجامی لـەناوبردنی کۆلۆنیالیزم پێك بێت.

## ٢- میراتگری دەوڵەتەکان و بەردەوامبوون:

بەردەوامبوونی دەوڵەت لە حاڵەتی میراتگریدا بەو واتایە دێت، کە دەوڵەتێك نامێنێـت و لە جێگەکەیدا دەوڵەتێك یان زیاتر دروسـتدەبێ و یـەکێکیان خـۆی بـەو دەوڵەتـە لەناوچـووە دەزانێ و پێیوایە بەردەوامی ئەوە. ئەم مەسەلەیە لە یاسای نێودەوڵەتیدا یەکێکە لە مەسەلە ئاڵۆزەکانی ئەم سەردەمە. دەبینین کاتێك دەوڵەتێکی نوێ سەرهەڵدەدات دەبێ بڕیاربدات ئایـا ئەم سەرهەڵدانەی درێژەپێدانە بۆ دەوڵەتی پێشوو، یان خۆی بە دەوڵەتێکی تازە دادەنێت؟ بـۆ نموونە هیندستان بەو شێوەیە قبووڵکرا، کـە درێژەپێدانـە بـۆ هیندسـتانی بـەریتانیا، کەچـی پاکستان کە لەگەڵ هیندستان پێکەوە هیندستانی بەریتانیایان پێکهێنـابوو، بـە دەوڵـەتێکی تازە دانرا. یۆگۆسلاڤیاش پێش جەنگی یەکەمی جیهان درێژەپێدان بوو بـۆ دەوڵـەتی سـربیا، بەڵام ئیسرائیل بە تەواوی جیاوازە، چونکە جێـی فەڵەسـتینی گرتـەوە، کـە لـەژێر مەنـداتی

---

٣- بڕوانە: ماددەی دووی ڕێککەوتننامەی ڤیەننا سەبارەت بە جێگری دەوڵەتان لە پەیماننامەدا ساڵی ١٩٧٨.

بەریتانیادا بوو. جیابوونەوەی هەرێمێك لە دەوڵەتێکی دامەزراو کارناکاتە سەر بەردەوامبوونی ئەو دەوڵەتە وێڕای کەمبوونەوەی هەرێم و دانیشتووانەکەی. پاکستان باشترین نموونەیە دوای ئەوەی بەنگلادیش لێی جیابووەوە. دەبینین لەم حاڵەتەدا دەوڵەتە کۆنەکە دەمێنێ بە هەموو سەنگێکییەوە و بە هەموو ئەو ماف و ئیلتیزامانەی، کە سەرچاوەیان لە بوونی ئەو هەرێمەوە دەگرت وەك بەشێك لە دەوڵەتە کۆنەکە. لە حاڵێکیشدا ئەگەر دەوڵەت لێکترازا بۆ دوو دەوڵەت یان زیاتر، ئەوە ئەو ماف و ئیلتیزاماتانە دابەشدەکرێن بە سەر ئەو دەوڵەتانەی لێی جیابوونەتەوە. بۆ ئەوەش بزانین ئایا کام لەو دەوڵەتانە درێژەپێدانە یان جێگرەوەی دەوڵەتە هەڵوەشاوەکەیە، دەبێ بۆ نێوبژیوانی پەنا ببەینە بەر پێوەرە تەقلیدییەکانی سەرهەڵدانی دەوڵەت و راگەیاندنی سەربەخۆیی دەوڵەتە تازە پێوەندیدارەکان و ئەو هەڵوێستانەی دەوڵەتەکانی تر و رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان لەبارەی مەسەلەکە دەیانگرنەبەر.

ئەم کێشەیە لە هەڵوەشاندنەوەی یەکیەتیی سۆڤێت و یۆگۆسلاڤیا بە زەقی خۆی نواند. یەکیەتیی رووسی خۆی وا دانا درێژەپێدانە بە یەکیەتیی سۆڤێتی پێشوو و قبووڵیش کرا لە رووی ئەندامێتی یەکیەتیی رووسی لە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە.

بڕیاری ئەنجومەنی سەرانی دەوڵەتەکانی کۆنفیدراسیۆنی دەوڵەتە سەربەخۆکان لە ١٩٩١/١٢/٢١ لەبارەی پێزانین بە بەردەوامبوونی ئەندامێتی یەکیەتیی رووسیا لە ئەنجومەنی ئاسایش و رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی تر، زۆر گرینگ بوو. وێڕای ئەوەش کە هەموو ئەو رێ و شوێنانەی کۆنفیدراسیۆنی دەوڵەتە سەربەخۆکان گرتیانە بەر لە کۆتایی ساڵی ١٩٩١ بەتەواوی نەدەگونجان لەگەڵ پرەنسیپی بەردەوامبووندا، بەڵام داخوازی رووسیا لەبارەی بەردەوامبوونی بۆ یەکیەتیی سۆڤێت قبووڵکرا لە لایەن کۆمارەکانی پێشووەوە و هەروا لە پراکتیکی نێودەوڵەتیشدا قبووڵکرا. کەچی حاڵەتێکی تایبەت سەریهەڵدا بەوەی پێوەستە بە دەوڵەتەکانی بەڵتیق (ئەستۆنیا- لاتڤیا- لیتوانیا) ئەمانە لە پاش دووەمین شەڕی جیهان بووبوونە دەوڵەتی سەربەخۆ، بەڵام یەکیەتیی سۆڤێت ساڵی ١٩٤٠ لکاندنی بە خۆیەوە و بەمەش کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی هەڵوێستی جیا جیای وەرگرت بەرامبەر ئەم پرۆسێسە. هەندێك ڕەتیانکردەوە و دانیان پێدانەنا، هەندێکی دیکەش بە واقیعی قبووڵیانکرد ( de facto). دوای ئەو گۆڕانکارییانەی بە سەر یەکیەتیی سۆڤێتی جاراندا هات دەوڵەتەکانی بەڵتیق لە ئابی ساڵی ١٩٩١ سەربەخۆیی خۆیان راگەیاند، بەم بۆنەیەشەوە ئەنجومەنی

ئەورووپی لە ٢٧/ئاب/١٩٩١ بەیاننامەیەکی خۆشحاڵی دەرکـرد لـەبارەی ئـەو راگەیاندنـە و دەستخۆشی گەڕاندنەوەی ئەو سەربەخۆییەی لێکردن، کە لە ساڵی١٩٤٠ لە دەسـتیان دابـوو، دوا بە دوای ئەویش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ١٩٩١/٩/٤ دانیپیـدانان. پاشـان پیادەکردنی گێڕانەوەی سەربەخۆیی قبـووڵکرا و لەسـەر ئاسـتی نێودەوڵـەتی وا ناکـات ئـەم دەوڵەتانە ببنە جێگری یەکیەتیی سۆڤێت، دوایەش خۆیان ئازادن لەو ماف و ئیلتیزامانەی لەم میراتگرییە دەکەونەوە.

پێچەوانەی ئەمە بارەکە لە یۆگۆسلاڤیا جیـاواز و ئـاڵۆز و کارەسـاتئامێز بـوو، دەبیـنین هەرەسهێنانی یەکیەتیی یۆگۆسلاڤیای سۆشیالیستی فیـدراڵ چـەند مـانگێکی خایانـد. لـەو ماوەیەدا چەند کۆمارێك سەربەخۆییان راگەیانـد. بڕیـاری ژمـارە (٨)ی لیژنـەی ناوبـژیوانی سەبارەت بە یۆگۆسلاڤیا لە ١٩٩٢/٧/٤ کۆتایی ئەو ڕاپرسییەی رایگەیاند، کە لـە بۆسـنا و هیرسۆگۆڤینا لە شوبات و ئاداری ساڵی ١٩٩٢ بەڕێوەچوو و بەرئەنجامەکـەی بـرێتی بـوو لـە پشتگیریی زۆرینە بۆ سەربەخۆیی.

لیژنەکە تاکیدی کرد، کە دەزگە هاوبەشەکانی کۆماری یۆگۆسلاڤیای سۆشیالیسـتی فیـدراڵ لـە بەجێگەیانـدنی ئەرکـەکانی ڕاوەسـتاوە. هـەروا دان بـە سـلۆڤینیا و کـەراواتیا و بۆسـنە و هیرسۆگۆڤینا نرا لە لایەن ئەنجومەنی ئەورووپی و دەوڵەتەکانی تـر و لـە پاشـان ئـەم دەوڵەتانـە بوونە ئەندام لـە نەتـەوە یەکگرتووەکانـدا. لیژنەکـە گەیشـتە ئـەو بەرئەنجامـەی کـە دەوڵـەتی یۆگۆسلاڤیای سۆشیالیستی فیدراڵ ئیدی وەك خۆی نـەما، واتـا بـوونی نـەما. وێـڕای ئـەوەش کۆماری یۆگۆسلاڤیای فیدراڵ، کە لە ١٩٩٢/٤/٢٧ پێکهاتبوو لە سربیا و مۆنتینیگرۆ خۆی وا دانەدەنا، کە دوڵەتێکی نوێیە، بگرە وەك درێژەپێدانێك خۆی دانا بۆ دەوڵەتە کۆنەکە، واتـا: بـۆ کۆماری یۆگۆسلاڤیای سۆشیالیستی فیدراڵ. لە بەرامبەردا، ئەم راگەیاندنە ڕەتکرایەوە لە لایەن کۆمارەکانی پێشووی یەکیەتیی یۆگۆسلاڤیا و هەروا لە لایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیشـەوە. بـۆ نموونە بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش ژمارە (٧٧٧) لە ١٩٩٢ تاکیدی کردەوە، کە ئەو دەوڵەتانـەی جاران بە کۆماری یۆگۆسلاڤیای سۆشیالیستی فیدراڵ ناسرابوون بوونی ڕاگیراوە و نییە و کۆماری یۆگۆسلاڤیا ( سربیا و مۆنتینیگرۆ) بۆیان نییە درێژەبدەن بە ئەندامێتی کۆمـاری یۆگۆسـلاڤیای سۆشیالیستی فیدراڵی جاران بە شێوەی ئۆتۆماتیکی لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا. بۆیە دەبینین بە پێچەوانەی ئەوەی لە یەکیەتیی سۆڤێت ڕوویدا، داخـوازی کۆمـاری یۆگۆسـلاڤیای فیـدراڵ وەك جێگرەوەی یۆگۆسلاڤیای کۆن، وەك پێویست پشتگیری لیّ نەکرا.

تیــۆری میراتگــری لــە یاســای نێودەوڵەتیــدا، مەســەلەی یەکخســتنی دەوڵەتــەکانیش دەگرێتەخۆ، یەکێك لە شێوازەکانی یەکخستن یان (یەککگرتن)، دامەزراندنی دەوڵەتێکی نوێیــە بە گشتی وەك ئەوەی لە تێکەڵبوونی نێوان کۆمــاری یەمــەنی عــەرەبی و کۆمــاری یەمــەنی دیموکراتیی میللی، ڕوویدا. ئەوە بــوو بــەپێی ڕێککەوتننامــەی نێــوان هــەردوو دەوڵــەت لــە ۱۹۹۰/٤/۲۲ لە دەوڵەتێکدا یەکخران بە ناوی (کۆمــاری یەمەنــەوە) هــەروا ڕێکخســتن بــە ڕێگەی تێکەڵکردنی دەوڵەتێك لەگەڵ دەوڵەتێکی تریشدا دەبێ، ئەو کات یــەکیان نــامێنێ و دووەمیان بە چڕیی زیاتری دانیشتووانی و ڕووبەرە هەرێمییە فرەوانترەکــەی بــەردەوام دەبێــت، وەك ئەوەی لە ئەڵمانیا ڕوویدا.

لە بەرئەنجامەکانی دووەمین جەنگی جیهانی، ئەڵمانیا دابەشکرایە چەند ناوچــەیەك لــەژێر دەسەڵاتی داگیرکاری هەر یەك لە ئەمەریکا و یەکیەتیی سۆڤێت و بەریتانیا و فەرەنسا، بەڵام (بەرلین) نەخرایە سەر هیچ کامێك لەو ناوچە داگیرکراوانە. پیــادەکردنی دەســەڵاتی بــاڵا لــەو ناوچانە بە شێوەی کاتی درایە سەرکردەکانی هێزی چەکدار لەو چوار دەوڵەتە هاوپەیواتانــە. لــە پاش ئەو گۆڕانکارییانەی، کە لەو ناوچانەی بە دەســتی یەکیــەتیی ســۆڤێتەوە بــوون ڕوویانــدا، دەســەڵاتی بــاڵا گواســترایەوە بــۆ کۆمیتەیــەکی بــاڵای هاوپــەیواتان لــە (بــۆن). بــەپێی ئــەو ڕێککەوتننامەیەی، کە لەنێوان هەرسێ لایەنەکە و کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵ بەسترا و لە ساڵی ۱۹۵۵ چــووە واری جێبەجێکردنــەوە، کۆتــایی بــە داگیرکــردن هێنــراو ســەرکردایەتی بــاڵای هاوپەیواتانیش هەڵوەشایەوە، بەڵام دەوڵەتە هاوپەیمانــەکان مــاف و ئیلتیزاماتــەکانی خۆیانیــان هێشتەوە سەبارەت بە (بەرلین) و سەبارەت بە ئەڵمانیاش بە گشتی و بە یەکیەتیی ئەڵمانیاشەوە و چارەسەری ئاشتییانەی کێشەکانی تایبەت بە مەسەلەکەشەوە. پێزانین بە (کۆماری ئــەڵمانیای دیموکراتی)یش لەسەر هەمان بنەما هات، واتا وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆی خاوەن سەروەری، کە دەسەڵاتی تەواوی هەیە بەسەر کاروباری نێوەخۆیی و دەرەوەدا. ئەمە ئەو هەســتەی دروســتکرد، کە ئەڵمانیا هێشتا وەك دەوڵەتێك لە ڕوانگەی یاسای نێودەوڵەتییەوە، بوونی هەیــە و پێوەنــدیی نێوان هەردوو دەوڵەتی ئەلمان و هاوبەندییان لەگــەڵ دەوڵــەتی ئــەڵمانیای پێشــوو ســاڵی ۱۹٤۵ بایەخی زۆر و ئاڵۆزکارییەکی گەورەیان ورووژاند، چونکە ئەڵمانیای فیــدراڵ هەمیشــە خــۆی بــە واریسی دەوڵەتی ئەڵمانیای پێش ۱۹٤۵ دادەنا.[٤]

4- F.A. Mann, Germanys present Legal state Revisited 16 1 CLQ, 1967, p. 760

دوای ئەو گۆڕانکارییانەی یەکیەتیی سۆڤێت و ولاَتە سۆشیالیستەکانی سەر بەوی گرتەوە، کۆمەڵە ڕێککەوتننامەیەك لە مانگی مایسی (١٩٩١)وە، مۆرکران لەنێوان هەردوو دەوڵەتی ئەڵمانیدا لە پێناوی یەکیەتییدا، وەك ڕێککەوتننامەی یەکیەتیی دراو و ئابووری و کۆمەلاَیەتی لە ١٨/٥/ ١٩٩٠ و دواتر لە (١٢/٩/١٩٩٠) یش ڕێککەوتننامەی چارەسەری کۆتایی کێشە هەڵپەسێراوەکانی نێوان هەردوو ئەڵمانیا و چوار دەوڵەتەکە، مۆرکرا. بەمەش چارەسەری هەموو ئەو کێشانە کران، کە لە ئاکامی دووەمین شەڕی جیهان سەبارەت بە ئەڵمانیا هاتبوونەئارا. دووەمین ڕێککەوتننامە، کە لەنێوان هەردوو ئەڵمانیا گرێدرا لە ٣١/ ئابی /١٩٩٠ سەبارەت بە یەکگرتنی هەردوو ئەڵمانیا لە ٣٠/١٠/١٩٩٠ تاکیدی کردووە، دەبێ یەکگرتن لە ڕێگەی ئەوەوە بێت، کە کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی بخرێتە پاڵ ئەڵمانیای فیدراڵ بەپێی مادەی (٢٣) لە یاسای بنەڕەتی کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵ. ئەمە واتا یەکگرتنی ئەڵمانیا بە پرۆسێسی تێکەڵبوونی ناوچەکانی کۆماری ئەڵمانیای دیموکرات لەگەڵ ئەڵمانیای فیدراڵ ئەنجامدراوە لە ڕێگەی فرەوانکردنی بازنەی جێبەجێکردنی دەستووری ئەڵمانیای فیدراڵ بۆ ئەوەی هەرێمی ئەڵمانیای دیموکراتیش بگرێتەوە. بۆ نموونە مادەی (٧) تاکیددەکاتە سەر فرەوانبوونی سیستەمی دارایی کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵ بۆ ئەوەی هەرێمی کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی جارانیش بگرێتەوە. مادەی (٨)یش دەڵێت: هەر کە یەکیەتییەکە دەستی پێکرد، یاسا فیدراڵییەکان لەو ناوچانەشدا پیادەدەکرێن، کە پێشتر سەر بە کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی بوون.

دیارە ئەم جۆرە ڕێگەچارەیە لە پراکتیکی نێودەوڵەتیدا پێشوازییەکی باشی لێکرا و هیچ دەوڵەتێك لاری نەبوو لەسەری[5]. بە دەستەواژەیەکی تر ئەگەر بۆچوونی لایەنەکانی پێوەندیدار بە شێوەی ڕاستەوخۆ و هەروا ئەو پەسەندکردنەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لەبارەی یەکیەتیی ئەڵمانیاوە دەربڕی، لەبەرچاوبگرێن، دەکرێ ئێستە ئەڵمانیا وا دابنرێ، کە درێژەپێدانە بۆ کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵ، هەروا کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتیش بەوە دابنرێ، کە لەو مێژووەی ئەڵمانیای یەکگرتوو لەدایکبوو، ئیدی ئەویش بوونی نەماو ئاوابوو.

5- Oppenheims International Law, P. 210

## باسی دووەم

## کاریگەریی گۆڕانکارییە هەرێمییەکان لەسەر پەیماننامە

### ١- خستنەپاڵ و تێکەڵکردن:

کاتێك دەوڵەتێك دێنێ دەوڵەتێکی تر دەخاتە پاڵ هەرێمەکەی خۆی، دەوڵەتێکی نوێ دروستنابێ، وەك خستنەپاڵی کۆماری ئەڵمانیای دیموکرات بۆ سەر کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵ لە ساڵی ١٩٩٠، بگرە ئەو دەوڵەتەی بوونی هەیە فرەوان دەبێتەوە و دەمێنێت و بوونی بەردەوام دەبێت، بەڵام ئەو دەوڵەتەی خراوەتە پاڵ بوونی نامێنێ، نۆرمی بنەڕەتی ئەوەیە ئەو پەیماننامانەی، کە سیفەتی سیاسییان پێوەیە و دەوڵەتە لکێنراوەکە کاتی خۆی گرێی داون ئەوانیش بە نەمانی ئەمیان، نامێنن[٦]. کەچی ئەو پەیماننامە هەرێمییانەی، کە سنووری دەوڵەتە لێکدراوەکەیان دارشتووە، دەمێننەوە و کاریان پێ دەکرێ. ئەو پەیماننامانەش دەوڵەتی ئەسڵ گرێی داون، نەك هەر دەمێنن بگرە فرەوان دەبنەوە بۆ ئەوەی سنوورەکانی ئەو خاکەش بگرنەوە، کە پێشتر سەر بە دەوڵەتە لکێنراوەکە بووە و ئێستە بوونی نەماوە. پیادەکردنی ئەم پرەنسیپە بەستراوە بە ڕێککەوتنی هەردوو لاوە، بۆ نموونە لە حاڵەتی یەکگرتنی ئەڵمانیادا، مادەی (١١) لە پاشکۆی ژمارە (١)ی پەیماننامەی یەکگرتن لە ساڵی ١٩٩٠ کۆمەڵێك لەو پەیماننامانەی، کە کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵ کاتی خۆی بەستبوونی لەبارەی چەند بابەتێکی تایبەت بە پەیمانی باکووری ئەتڵەسی " ناتۆ" بەدەرکرد تاوەکو خاکی ئەڵمانیای دیموکراتی پێشوو نەگرنەوە. خاڵی یەکەم لە مادەی(٣١)ی ڕێککەوتننامەی ڤیەننا لەبارەی میراتگری دەوڵەتەکان لە پەیماننامەکان ئاماژەیداوە، کە لە کاتی یەکگرتنی دوو دەوڵەت یان زیاتر و پێکهاتنی یەك دەوڵەتی جێگرەوە، پەیماننامەکان بە کارپێکراوی دەمێننەوە لە حاڵێکدا ئەگەر دەرنەکەوت، کە ئەوە لەگەڵ ئامانج و بابەتی پەیماننامەکە ناگونجێ یاخود دەبێتە هۆی ئەنجامدانی گۆڕانێکی بنەڕەتی بۆ مانەوەی کارپێکردنی. خاڵی

---

6- Oppenheim, International Law, p. 211

دووەمیش جەختی کردۆتە سەر ئەوەی، ئـەم جـۆرە پەیماننامەیـە تـەنیا بەسـەر ئـەو بەشـەی دەوڵەتی جێگرەوەیەدا پیادەدەبێ، کە لـە کـاتی میراتگریـدا دەیگرتـەوە. ئەمــە خـۆی ئـەو نۆرمەیە ئەگەر دەوڵەتی جێگرەوە بڵاوینەکاتەوە، کە پەیماننامە بەکۆمەڵـەکان پیـادەدەبن بـۆ ئەوەی هەموو خاکەکەی بگرنەوە یاخود پەیماننامە بە کۆمەڵەکان یەکێکن لەوانەی، کە بەپێی ئەحکامەکانیان یان لەبەر سنووورداری بەشـداربووانیان و ئامـانج و بابـەتیان پێویسـتیان بـە ئیجماعی هەموو لایەنەکان هەیە، ئەو کاتە لایەنەکان رێکدەکەون لەسەر پێچـەوانەی ئـەوە. ئەم پرەنسیپە گشتییە بەسـەر پەیماننامــە دووقۆڵییـەکانیش پراکتیزەدەبـێ ئەگـەر دەوڵـەتی جێگرەوە و لایەنە پێوەندیدارەکانی تر پێچەوانەی ئەوە رێکنەکەون.

ئەم ئەحکامانە جۆرێك لە مەنتیق هەڵـدەگرن لـە حاڵـەتی یەکخسـتنی دوو دەوڵـەت بـۆ پێکهێنانی دەوڵەتی سێیەمی نوێ، وەك یەکخستنی تانجانیقا و زیمبـابۆی لـە سـاڵی ١٩٦٤، ئەوە بوو پەیماننامەکانی هەردوو لا بە کارپێکراوی مایەوە لە چوارچێوەی سنووری نوێدا.

## ٢- دابڕینی بەشێك لە دەوڵەتێك و لکاندنی بە دەوڵەتێکی دیکەوە:

کاتێك بەشێك لە دەوڵەتێك دادەبڕن و وەك پاشکۆ بە دەوڵەتێکی ترەوە دەبەسترێ نـۆرمی گشتی لەم حاڵەدا ئەوەیە، کارپێکردنی پەیماننامەکانی دەوڵەتی یەکەم لـەم بەشـە ڕابگـیرێ و کـارپێکردنی پەیماننامــەکانی دەوڵـەتی دووەم بیگرێتــەوە، ئەمــە ئەگــەر پیـادەکردنی ئـەو پەیماننامانە نـاکۆك نـەبێ لەگـەڵ ئامـانج و مەبەسـتەکانیدا یـان وابکـات گۆڕانکارییـەکی گەوهەری لە مەرجەکانی بەردەوامبوونی ڕووبدات بەپێی مـادەی (١٥) لـە رێککەوتننامــەی ڤیەننا بۆ میراتگری دەوڵەتەکان. ئەمەش لەگەڵ پراکتیکی دەوڵەتەکاندا دەگونجێ. بۆ نموونـە: کاتێك ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ساڵی ١٨٩٨ دوورگەکانی هاوای خسـتە پـاڵی خـۆی بواری کارپێکردنی پەیماننامەکانی خۆی فرەوان کردەوە بۆ ئەوەی (هاوای)یش بگرێتــەوە و بــە بەلجیکاشی ڕاگەیاند، کە پەیماننامە ئەمەریکاییــە بەلجیکییــەکان لــە هــەرێمێ (هاوای)شـدا پراکتیزەدەکرێن.[٧]

---

8- O. Connell, state Succession in municipal Law and International Law, Cambridge, 1967 vol. 2, pp.377- 378

### ٣- جیابوونەوە لە دەوڵەتێك و پێكهاتنی دەوڵەتێك یان چەند دەوڵەتێكی تازە:

فاكتەرە ڕاستەقینەكانی نەمانی دەوڵەتەكان و جیابوونەوەیان جیاوازن و شێوەكانیشیان زۆرن وەك لێكترازانی یەكیەتیی و سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ دەوڵەتی پێشوو، وەك: هەرەسی كۆماری عەرەبی یەكگرتوو و جیابوونەوەی هەر یەك لە سووریا و میسر بۆ دۆخی جارانیان پێش ساڵی ١٩٥٨، یان لێكترازانی دەوڵەتێك بۆ چەند دەوڵەتێكی دی، كە پێوەندیی نییە بە یەكیەتیی هەرێمیی پێشووەوە، وەك: هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆرییەتی نەمسا و مەجەر و ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە ساڵی ١٩١٩. كاتێك جیابوونەوە لە دەوڵەتێكی سەربەخۆ ڕوودەدات بۆ پێكهێنانی دەوڵەتێكی تازە، دەوڵەتی پێشوو دەمێنێتەوە بەڵام لە چوارچێوەی سنوورێكی تەسكتر و بەبێ هیچ گۆڕانكارییێك لە ئیلتیزام و مافە نێودەوڵەتییەكانی، بەڵام ئەوی پێوەستە بە دەوڵەتە جیابووە نوێیەكە، بۆچوونی باو ئەوەیە ئەو دەوڵەتە تازەیە دەچێتە واری ژیانی نێودەوڵەتییەوە بە ئەستۆیەكی پاك بە بێ ئەو ئیلتیزام و مافانەی بكەونە ئەستۆ، كە لەو پەیماننامانەوە هەڵقوڵاون، كە دەوڵەتی ئەسڵ بەستبوونی. نۆرمی گشتیش ئەوەیە ڕێ نەدرێ بەوەی دەوڵەتەكان ئیلزام بكرێن بە پەیماننامەگەلێك كە خۆیان نەیانبەستووە.[٨]

ئەم نۆرمە لە پراكتیكی نێودەوڵەتیدا چەسپاوە. دەبینین كاتێك بەلجیكا لە هۆڵەندا لە ساڵی ١٨٣٠ و كۆبا لە ئیسپانیا ساڵی ١٨٩٨ و پەنەما لە كۆلۆمبیا ساڵی ١٩٠٣ و فنلەنداش لە رووسیا دوای یەكەمین شەڕی جیهانی جیابوونەوە دەوڵەتە تازەكان دەستیاندایە ژیانی خۆیان بە تۆمارگەیەكی خاوێنەوە Clean slate.[9]

وێڕای ئەو هەڵوێستە سرووشتییە، كە ڕێككەوتننامەی ڤیەننا سەبارەت بە میراتگری دەوڵەتەكان وەریگرت لەبارەی هەرێمە ڕزگاركراوەكان لە كۆلۆنیالیزم ( decolonized territory) مادەی (٣٤)ی پەیماننامەكە جەختی كردووە، كە ئەگەر بەشێك یان چەند بەشێك لە هەرێمی دەوڵەتێك جیابۆوە و دەوڵەتێك یان زیاتر پێكهات چ دەوڵەتی پێشوو بمێنێ یان نەمێنێ، ئەوا پەیماننامە كارپێكراوەكان تاوەكو مێژووی میراتگری (واتا جیابوونەوە)، كە پێوەستن بە هەموو هەرێمی دەوڵەت وەك خۆیان كاریان پێدەكرێ بە لایەنی هەموو دەوڵەتە جیابووەكان و هەر پەیماننامەیەك ئەگەر لە بەشێك لە خاكی دەوڵەتی ئەسڵ پیادەكرابێ، ئەوا

---

8- O, Connell, State Succession in Municipal Law and International Law, vol. 11, Cambridge1967, P.88

9- Yearbook of International law Commission 1974 vol .11, part 1, p.263

پەیماننامەکە تەنیا پیادەدەبێت بەسەر ئەو دەوڵەتەی تازە پێکهاتووە لەسەر ئەم بەشە. ئەم ئەحکامانە پراکتیزەدەکرێن لە حاڵێکدا ئەگەر دەوڵەتانی پێوەندیدار لەسەر پێچەوانەی ئەوە ڕێك نەکەون، یان ئەگەر لە پەیماننامەکە یان لە هەلومەرجی دانانیدا دەرنەکەوێ، کە پیادەکردنی لەسەر دەوڵەتی جێگرەوە ناکۆکە لەگەڵ ئامانج و بابەتی پەیماننامەکە، یانیش گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە مەرجەکانی کارپێکردنیدا نەکرێ[10]. ئەگەر دەوڵەتی ئەسڵ وەك دەوڵەتێك مایەوە ئەوا ئەم جۆرە پەیماننامانە بە کارپێکراوی دەمێننەوە بەلایەن ئەو خاکەی دەوڵەتە ئەسلەکە لەسەری ماوە ئەگەر لایەنەکان بە پێچەوانەی ڕێکنەکەون یان دەرکەوت، کە تەنیا پێوەستە بە بەشە جیابووەکەوە یان لە پەیماننامە و لە هەلومەرجی دانراویدا دەرکەوت، کە پیادەکردنی پەیماننامە بە لای دەوڵەتی ئەسڵەوە لاری هەیە لەگەڵ بابەت و ئامانجی پەیماننامەکە یانیش ئەگەر گۆڕانکاری بنەڕەتی بێت بەسەر مەرجەکانی کارپێکردنیدا.

ڕێککەوتننامەی ڤیەننا ئەو چەمکەی پەسەندکردووە، کە لە ڕەشنووسی لیژنەی یاسای نێودەوڵەتیدا هاتووە و جەختی کردۆتە سەر داخوازی پاراستنی سیستەمی پەیماننامە بە کۆمەڵەکان، کە سەقامگیری پێوەندیی پەیمانی دەخوازێ پرەنسیپی بەردەوامبوونی یاسایی dejure continuity وەك نۆرمێکی گشتی پراکتیزبکرێ[11]. ڕەنگە ئەوە وەك هەوڵێك بێت بۆ جیاکردنەوەی سەربەخۆیی دەوڵەتە رزگاربووەکان لە کۆلۆنیالیزم لەو جۆرەکانی تری سەربەخۆیی، بەڵام ئەمە چەمکێك پێکدێنێ، کە جیاوازە لەگەڵ چەمکە کۆنباوەکە، چونکە ئەو نۆرمەی لە مادەی (٣٤) دا هاتووە، ناکرێ بە ڕەنگدانەوەیەك دابنرێ بۆ یاسای نەریتی. دەکرێ بگوترێ داخوازییەکانی سەقامگیریی نێودەوڵەتی لە هەندێك ناوچەدا پاڵ بە دەوڵەتەکانەوە دەنێت بۆ چارەسەرییەك، کەوا بکات ئەو ئیلتیزامانەی لە پەیماننامەکانی دەوڵەتی ئەسڵدا هاتوون دەوڵەتە سەربەخۆ تازە جیابووەکانیش بگرنەوە. دەبینین ڕێنماییەکانی تایبەت بە پێزانین بە دەوڵەتە تازەکان لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات و یەکیەتیی سۆڤێتی پێشوو، کە ئەنجومەنی ئەورووپی لە ١٩٩١/١٢/١٦ پەسەندی کردن ئاماژەی داوە، کە پێزانین بەم دەوڵەتانە وا دەخوازێ قبووڵی هەموو بەڵێننامە پەسندکراوەکان بکەن، کە پێوەستن بە چەك

---

١٠- بڕوانە: مادەی سی و چواری ڕێککەوتننامەی ڤیەننا سەبارەت بە جێگری دەوڵەتان لە پەیماننامەدا ساڵی ١٩٧٨.

11- M.N. Shaw International Law 4th Eden , Cambridge.1999 P.692

داماڵین و بڵاوەکردنەوەی چەکی ئۆتۆمی و هەروا بە ئاسایش و سەقامگیریی نێودەوڵەتییەوە [١٢]، بەڵام بێگومان مەرجە سیاسییەکانی پێزانین هەمان مەرج نین بۆ قبوولکردنی ئەو بەرئەنجامانە لە میراتگری دەکەونەوە. بە هەرحاڵ لەوێ ڕا چەند بەڵگەیەکی ڕوون هەن دەسەلمێنن، کە هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا مومارەسەی فشار بووە لەسەر ڕووسیا و ئەو دەوڵەتە نابەلتیقیانەی، کە لە لێکترازانی یەکیەتیی سۆڤیێتی پێشووەوە پێکهاتن تاکو وا بکەن مولزەم بن بە هەندێك لە پەیماننامەکانی یەکیەتیی سۆڤیێتی پێشوو. وەك درێژەپێدان بە پرۆسێسی چاوەدێری ڕێککەتننامەکانی پڕچەککردن و میکانیزمی. ئەوی زانراوە ڕووسیای فیدراڵی بووە درێژەپێدەری یەکیەتیی سۆڤیێت و بێگومان یەکێك لە بەرئەنجامەکانی ئەم بەردەوامبوون و درێژەپێدانەش مانەوەی ئیلتیزاماتەکانی دەوڵەتی سۆڤیێتە بە کارپێکراوی لە ئەستۆی ڕووسیادا، بەڵام کێشەیەکی تر هاتە بەرئەنجام ئەویش چارەنووسی چاوەدێریکردنی چەکی ئۆتۆمی و ئەو جۆرەکانی تری ئەو چەکانەن، کە لەسەر خاکەکانی ئەو دەوڵەتانەن و لە یەکیەتیی سۆڤیێتی پێشوو جیابوونەوە. دەبینین وێڕای قایلبوونی ئەم دەوڵەتانە بە گشتی بە ملکەچبوونیان بۆ ئەو ئیلتیزامانەی لە بەرئەنجامی ڕێککەوتننامە مۆرکراوەکانەوە لە لایەن یەکیەتیی سۆڤیێتی پێشوو کەوتوونەتەوە، ڕێککەوتننامەی جیا جیاش مۆرکران لەگەڵ هەر یەك لە دەوڵەتە ئۆتۆمییە نوێیەکان: ئۆکرانیا، بیلارووسیا و کازاخستان. بەم شێوەیە پابەندکران بە ڕێککەوتننامەکانی چاوەدێری، کە یەکیەتیی سۆڤیێتی پێشوو مۆری کردبوون [١٣]. بۆیە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئۆکرانیا لە ڕێگەی ئاڵوگۆڕکردنی یاداشتنامەوە لە ١٩٩٥/٥/١٠ ڕێککەوتن لەسەر دانانی مادەی (٣٤) لە ڕێککەوتننامەی ڤیەننای تایبەت بە میراتگری دەوڵەتەکان ساڵی ١٩٧٨ وەك خاڵی سەرەتا سەبارەت بە ڕێککەوتننامە دووقۆڵییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت. دوای چاوخشاندن بە هەموو ڕێککەوتننامەکاندا هەردوو لا گەیشتنە ئەوەی کە هەندێکیان مەحاڵە جێبەجێ بکرێن و هەندێکی تریشیان لەسەر لیستی پاشکۆیەك ڕیزبەندکران و وەك ڕێککەوتننامەی کارپێکراو.

---

12- 92 International Law Reports, PP.173- 174

13- See The Agreement on Joint Measures with Respect to Nuclear Weapons, 31 International Legal Materials 1992 P.152

### ٤-دەوڵەتە تازە سەربەخۆکان:

لێکترازانی کۆمەڵێك لە دەوڵەتەکان، وەك یەکیەتیی سۆڤێت، یۆگۆسلاڤیا و چیکۆسلۆڤاکیا، کە بە ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە پەیماننامەی نێودەوڵەتی بە کۆمەڵی تایبەت بە ئاسایش و ئاشتی نێودەوڵەتییەوە بەسترابوون، هەروا سەرهەڵدانی چەندین دەوڵەتی تازە وایانکرد مەسەلەیەك بە زەقی سەرهەڵبدات، ئەویش تا چەند دەوڵەتە تازەکان ئیلتیزام دەکەن بەو پەیماننامانەی دەوڵەتە کۆنە لەناوچووەکان مۆریانکردبوون. دەبینین ئەو شێوازانەی بەکارهێنراون بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانە دەسەلمێنن، کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بەرەو ئەو ئاراستەیە دەڕوات زەمینەیەك دابڕێژێ لە پێناو بونیادنانی نۆرمێکی یاسایی نوێ لەبارەی میراتگری.

ڕێککەوتننامەی ڤیەننا سەبارەت بە میراتگری دەوڵەتەکان لە پەیماننامەکاندا ساڵی ١٩٧٨ زاراوەی دەوڵەتە تازە سەربەخۆییەکانی ((Newly Independet States)) بەکارهێناوە بۆ هەرێمە ڕزگاربووەکان لە کۆلۆنیالیزم لە بەرئەنجامی لەناوبردنی کۆلۆنیالیزم (decolonization). دەبینین لە برگەی یەکی مادەی (٢)دا وای پێناسەکردوون، ئەو هەرێمانەن، کە لە پێش مێژووی میراتگری، واتا ڕۆژی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی، ڕاستەوخۆ پاشکۆبوونە، واتا سەربەخۆ نەبوونە لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا و دەوڵەتی ئەسڵ بەرپرسیاربووە لێیان[١٤]. مادەی(١٦) لە ڕێککەوتننامەی نێوبراو نۆرمێکی گشتی داناوە دەڵێت دەوڵەتە تازە سەربەخۆکان مولزەم نین بە بەردەوامبوونی کارپێکردنی هەر پەیماننامەیەك، یان تیایدا ببنە لایەنێك لەبەر ئەو واقیعەی، کە پەیماننامەکە کار پێکراوبووە لە مێژووی میراتگرییەوە سەبارەت بە هەرێمێ پێوەندیدار. ئەم حوکومە لەسەر پرەنسیپی تۆمارگەی خاوێن(Clean Slate) بونیادنرا، کە پراکتیزەکرا لەسەر ئەو دەوڵەتانەی لە بەرئەنجامی ڕزگاربوونیان پێکهاتن لە دەوڵەتەکانی وەك: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و موستەعمەرە ئەمەریکاییە ئیسپانییەکان کاتێك سەربەخۆییان وەرگرت.

سکرتارییەتی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٤٧ لە کاتی گفتوگۆکردن لەسەر پێگەی پاکستان، کە تایبەت بوو بە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکەوە ئاماژەی دا، کە هەرێمی جیابووەوە واتا پاکستان برێتییە لە دەوڵەتێکی نوێ و بەرپرسیارێتی ئەو ماف و ئیلتیزاماتانە هەڵناگرێ، کە لە ئەستۆی دەوڵەتە کۆنەکەدا بوو.

---

14- See Vienna Convention on succession of states in respect of Treaties 1978.Articie 2(f) .

رێککەوتننامەی ڤیەننا لەبارەی میراتگری دەوڵەتەکان لە پەیماننامەکانـدا سـاڵی ١٩٧٨ جەختی کردۆتە سەر ئەو نۆرمەی چارەسەری پەیماننامە دووقۆڵییەکان دەکات. بـالا دەسـتیی سرووشتە تایبەتییەکەی و بەرامبەرییەکەی ئەم جۆرە پەیماننامانە بە پێچەوانەی ئەوەی باوە لە پەیماننامە بە کۆمەڵییەکاندا، وادەکات قابیلی کارپێکردن نەبن لەنێوان دەوڵـەتی جێگـرەوە و دەوڵەتی پێشوو. ئەگەرچیش پراکتیکی نێودەوڵەتی هەندێ بەردەوامبوونی بـەخۆوە دیـوە لـە هەنـدێ بـواردا، وەك رێککەوتننامـــە خزمەتگوزارییـــە ئاسمانییـــەکان و رێککەوتننامـــە بازرگانییەکان، بەڵام لیژنەی یاسایی نێودەوڵەتی پێی وابوو ئـەوەیان رەنگدانـەوەی نـۆرمێکی نەریتی نییە دوور لە ئیرادەی دەوڵەتە پێوەندیدارەکان، بگـرە نـۆرمی سـەرەکی پێوەسـت بـە پەیماننامە دووقۆڵییەکان ئەوەیە، کە بەردەوامبوونی کارپێکردنیان لە پاش سەربەخۆیی دەبێتە بابەتی رێککەوتنێکی ڕاشکاوانە یان بێدەنگی لەنێوان دەوڵەتی تازە سەربەخۆ و دەوڵەتەکـەی تر، کە لایـەنی گرێبەسـتە لەگـەڵ دەوڵـەتی پێشـوو. مـادەی(٢٤) ئامـاژەدەدات، کـە ئـەو رێککەوتننامە دووقۆڵییانەی بۆ هەرێمی پێوەندیدار کارپێکراون، بە کارپێکراو دادەنـرێن بـۆ دەوڵەتە تازە سەربەخۆکە و ئەو دەوڵەتە لایەنانەی دیکە، کە هەڵوێستی خۆیان بـە ڕاشـکاوی یان بە ڕەفتارێك دەربڕیوە، کە دەکرێ بە قایلبوون دابنرێ.

لە واقیعدا جیاوازییەك هەیە لەنێوان حاڵەتی ناچارکردنی دەوڵەتێکی نوێ بۆ ئەوەی ببێتە لایەنێکی مولزەم لە پەیماننامەیەکی دەوڵەتی پێشوو و حاڵەتی هـاتنی ئارەزوومەندانـەی بـۆ ڕیزی ئەو پەیماننامەیە. پراکتیکی نێودەوڵەتی دەسەلمێنێ، کە دەوڵەتی نوێ لەو شێوازەی پێی دەوترێت بڕینی خێرا (Fast Track) سوود وەردەگرێ لە بەشداربوون لە پەیماننامەکاندا. بـۆ نموونە دەوڵەتانی نوێ دەبەخشرێن لەو مەرجە کردەکارییە شەکلییانە، کـە پێویسـتە دەوڵەتـە کۆنەکان بیگرنەبەر بۆ چوونەریزی پەیماننامەوە.[١٥]

مادەی (١٧) لە رێککەوتننامەی ڤیەننا ئاماژەی داوە، کە دەوڵەتـە تـازە سـەربەخۆکان دەتوانن لە بەیاننامەی میراتگریدا Notification of Succession بڵاوی بکەنەوە، کە بە لایەن دابنرێن لە هەر پەیماننامەیەکی بە کۆمەڵی کارپێکراودا لە کاتی مێژووی میراتگرییەوە سـەبارەت بـەو هەرێمـەی دەوڵەتـە نوێیەکـە لەسـەری دامـەزراوە ئەگـەر لـە پەیماننامەکـە دەرنەکەوت، کە ئەو ئەحکامانەی پێوەستن بە دەوڵەتی تازە سەربەخۆکە لارییان هەیـە لەگـەڵ

15- Oppenheims International Law 9th Eden 1992, by Sir R. Jennings and Sir A. Watts, P.229

ئامانج و بابەتی پەیماننامەکە یان وادەکات گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی بەسەر مەرجەکانی کارکردنیاندا بێت. سەرەڕای ئەوەش کاتێك لە سرووشتی خودی پەیماننامە دەرکەوت، کە هاتنەڕیزەوەی لە لایەن دەوڵەتانی دیکەوە قایلبوونی هەموو لایەنەکان دەخوازێ، ئەوە پێویستە ئەو قایلبوونە وەدەست بێنێ.[16]

با چیکوسلۆڤاکیا وەك نموونەیەك وەربگرین بۆ پێکهاتنی دوو دەوڵەتی تازە لە بەرئەنجامی هەڵوەشانەوەی دەوڵەتە کۆنەکە. ئەوە بوو چیکوسلۆڤاکیا لە **١٩٩٢/١١/٢٥** وەك دەوڵەتێك لێکترازا و دوو دەوڵەتی لێ پێکهات . ئەوانیش کۆماری چیك و کۆماری سلۆفاکیان. ئەو دوو دەوڵەتە بەیاننامەیەکی هاوبەشیان بۆ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەرکرد، تیایدا ڕوونیان کردەوە، کە هەردوو دەوڵەتەکە پابەندی هەموو ئەو پەیمانە نێودەوڵەتییانە دەبن، کە دەوڵەتی پێشووی چیکوسلۆفاکیا کاتی خۆی بە ستوونی و دانووستانیش دەکەن لەگەڵ دەوڵەتانی پێوەندیدار لەبارەیانەوە. بەپێی ئەم نۆرمە بەریتانیا لە **١٩٩٣/١/١** نامەیەکی بۆ هەردوو کۆماری چیك و سلۆفاکیا ڕەوانەکرد، تێیدا هاتبوو: بەریتانیا هەموو ئەو ڕێککەوتننامە و پەیمانە کارپێکراوانەی لەگەڵ کۆماری پێشووی یۆگۆسلاڤیا بەستووە بە کارپێکراو دەژمێرێ لەنێوان بەریتانیا و کۆماری چیك لە لایەك و لەنێوان بەریتانیا و کۆماری سلۆفاکیا لە لایەکی تر.

---

16- See Vienna Convention 1978.Artcle 17(3) and article 272

## باسی سێیەم

# کاریگەریی میراتگری لەسەر ماڵ و موڵکی گشتی و تایبەت

### ١- ماڵ و موڵکی گشتی:

میراتگریی ماڵ و موڵکی گشتی و تایبەت دەگەڕێتەوە بۆ یاسای نەریتیی، چونکە ڕێککەوتننامەی ڤیەننا لەبارەی ماڵ و موڵکی دەوڵەت و ئەرشیف و قەرزەکان ساڵی **١٩٨٣** نەچۆتە واری جێبەجێکردن و ئێستەش لە ئاسۆدا وا بەدیارناکەوێ لە کاتێکی نێزیکدا کاری پێ بکرێ.

نۆرمی بنەڕەتی بۆ دابەشکردنی ماڵ و موڵك (سامان) و ئەرشیف و قەرزەکان لە باری میراتگریدا ئەوەیە، لایەنەکان دەبێ لە ڕێگەی ڕێککەوتنەوە ئەم جۆرە کێشانە چارەسەربکەن. پاشان هەموو ئەو نۆرمانەی لە ڕێککەوتننامەی ڤیەننا ساڵی **١٩٨٣**، هاتوون، جێبەجێ ناکرێن ئەگەر بە ڕێککەوتن نەبێ[١٧].

سەرەڕای ئەوەش کۆمیتەی نێوبژیوانی تایبەت بە یۆگۆسلاڤیا لە بۆچوونی ژمارە (٩)ی ئاماژەی داوە، کە پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتانەی کە لە ئاکامی لێکترازانی کۆماری یۆگۆسلاڤیای سۆشیالیستی فیدراڵ پێکهاتن لەنێوان خۆیاندا ڕێکبکەون، لە ڕێگەی ڕێککەوتننامەوە، بۆ چارەسەرکردنی هەموو لایەنێکی میراتگری. دیسان لە بۆچوونی ژمارە (١٤)شدا جەختی کردۆتە سەر ئەم هەڵوێستە کاتێك دەڵێ: هەوەڵین پرەنسیپ، کە دەبێت بە سەر میراتگری دەوڵەتەکان پراکتیزەبێ ئەوەیە، دەبێت دەوڵەتە دامەزراوەکان لەنێوان خۆیاندا ڕاوێژبکەن و ڕێکبکەون لەسەر چارەسەرکردنی هەموو کێشەکانی تایبەت بە میراتگری لەنێوانیاندا[١٨].

نۆرمی کلاسیکی گریمانە دەکات ماڵ و موڵکی گشتیی دەوڵەتی پێشوو بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکییانە دەگوازرێنەوە بۆ دەوڵەتی جێگرەوە. جیاوازی لەنێوان ماڵ و موڵکی گشتی و

---

١٧- بڕوانە: مادەی: ١٢، ١٧، ١٨، ٢٢، ٢٣، ٢٧، ٢٨، ٣٠، ٣١، ٣٧، ٣٨، ٣٨، ٤١،٤٠

18- 96 ILR, p.731

ماڵ و موڵکی تایبەت تاڕادەیەك پێوەستە بە جیاوازی هزریی لەنێوان یاسای گشتی و یاسای تایبەت. ئەم جیاوازییەش لەو دەوڵەتانەی پێڕەوی بیرۆکەی یەکیەتیی یاسا دەکەن تەمومژاوییە. ئەگەرچی چەندین حاڵەت هەن دەکرێ لەمیانەیاندا ڕێککەوتن بکرێ سەبارەت بە دیاریکردنی ئەوەی: ئایا لێرەدا مەبەست چییە لە ماڵ و موڵکی گشتی، بەڵام لە چەند بارێکی دیکەدا لایەنەکان ناچاردەبن بۆ زانینی ئەم مەسەلەیە پەنا ببەنە بەر یاسای نێوەخۆیی. جگە لەوەش خودی یاسای نێودەوڵەتی خۆ لادەدات لەوەی بچێتە نێو مشتومڕی پێناسەکردنی کۆمپانیا و دەزگە گشتییەکان.

لەم جۆرە حاڵەتانەدا پەنادەبرێتە بەر یاسای نێوەخۆیی دەوڵەتە ئەسڵەکە بۆ زانینی سرووشتی ماڵ و موڵکە پێوەندیدارەکان بۆ ئەوەی لە کاتی میراتگریدا بڕیار لەسەر چارەنووسیان بدرێ. مادەی (٨) لە ڕێککەوتننامەی ڤیەننا ساڵی ١٩٨٣ ئاماژەدەدات، کە ماڵ و موڵکی دەوڵەت بە گوێرەی ئەم ڕێککەوتننامەیە: ((ئەو موڵك و سامان و ماف و ئیمتیازاتانەن، کە بەپێی یاسای نێوەخۆیی دەوڵەتی ئەسڵ موڵکی دەوڵەتە ئەسڵەکەن لە کاتی میراتگرییەوە))، ئەم نۆرمەش ئێستە باوە لە نەریتی نێودەوڵەتیدا. لێژنەی نێوبژیوانی تایبەت بە یۆگۆسلاڤیا جەختی لەسەر ئەم هەڵوێستە کرد کاتێك ئاماژەی بەوە دا، کە بۆ مەسەلەی دیاریکردنی خاوەندارێتیی سامان و قەرز پێویستە پشت ببەسترێ بە یاسای نێوەخۆیی کۆماری یۆگۆسلاڤیای سۆشیالیستی فیدراڵ، کە لە کاتی میراتگریدا واتا لە مێژووی سەربەخۆیەوە کاری پێدەکرا. لەم حاڵەتەشدا ئەگەری ئەوە هەیە چەند ئاستەنگێك سەرهەڵدەن لە ڕووی دابەشکردنی ماڵ و موڵك و قەرز کاتێك مێژووەکانی سەربەخۆیی دەوڵەتە جیاجیاکان جیاواز دەبن، لەم بارەدا پێویستە ئەم جۆرە کێشانە بە ڕێککەوتنی لایەنە پێوەندیدارەکان چارەسەربکرێن.

پوختەی ئەو گرفتەی ڕووبەڕووی لێژنەی نێوبژیوانی یۆگۆسلاڤیا ببووەوە ئەوە بوو، کە یەکەمیان دەستووری کۆماری یۆگۆسلاڤیای سۆشیالیستی فیدراڵ خاوەندارێتیی زۆرێك لە موڵك و سامانی گواستەوە بۆ کۆمارە ئەندامەکانی یەکیەتییەکە. لێژنەکە جەختی کرد، کە ئەم موڵك و سامانە ناگەڕێتەوە بۆ دەوڵەتە کۆنەکە، سەرچاوە و کۆمەکییان هەرچۆنێك بێت. دووەمین گرفتیش ئەو خاوەندارێتییە سۆشیالیستییە بوو، کە لە دەوڵەتە سۆشیالیستەکانی پێشوودا باوبوو. لەم حاڵەتەشدا لێژنەکە پەنای بردە بەر پراکتیزەکردنی هەردوو پرەنسیپی هەرێمی و کارگێڕی (وەزیفی) و ئاماژەی دا: ((خاوەندارێتیی سۆشیالیستی)) زۆرینەی

دەگەڕایەوە بۆ ئەو سەندیکا کرێکارییانـەی کەسـێکی یاسـایی بـوون لـە هـەر کۆمـارێ لـە کۆمارەکانی یەکیەتیی فیدراڵیدا، کە بـە ڕێگـەی لقەکانیانـەوە کاریـان دەکـرد و ملکەچـی دەسەڵاتیان بوون. بۆیە موڵك و سامانی ئەم لقانـە و قـەرز و ئەرشـیفەکانیان بـە مەبەسـتی میراتگری دابەش ناکرێن، بگرە دەگەڕێنەوە بۆ هەر یەك لەو دەوڵەتانەی پیـادەی سـەروەرییان دەکەن لەو هەرێمەی بەسەریەوەن، بەڵام ڕێکخـراو و ئـەو سـەندیکایانەی، کـە خاوەنـدارێتیی سۆشیالیستییان پیادەدەکرد لەسەر ئاستی فیدراڵی یان ئاستی دوو کۆمار یـان زیـاتر مـاڵ و موڵك و قەرز و ئەرشیفیان دابەشدەکرێن بە سەر ئەو دەوڵەتە نوێیە پێوەندیدارانەی، کـە وەك بریکار پیادەی کاریان دەکرد بۆ کۆماری یۆگۆسلاڤیای سۆشیالیستی فیدراڵ و لە کاتێکدا ئەم بریکارییە گشتییە نەیەتە سەلماندن، ئەوە ئەم ڕێکخراوانـە وەك کۆمپانیـای کـەرتی تایبـەت دادەنرێن، کە میراتگیری دەوڵەت پیادەناکرێ لەسەر موڵك و ماڵیان.

پرەنسیپی گشتی باو لە یاسای نێودەوڵەتی نەریتیدا ئەوەیە، سامانی گشتی، کە مـوڵکی دەوڵەتی ئەسڵە و کەوتۆتە سەر هەرێمی پێوەندیدار دەگوازرێنـەوە بـۆ ئـەو دەوڵەتـە نوێیـەی لەسەر هەرێمەکە بونیادنراوە. پاشان نۆرمی گشتی ئەوەیە: ئـەو موڵـك و سـاواتانەی یاسـای دەوڵەتی ئەسڵ بە سامانی گشتی یان حکومی ناوزەدیان دەکات، خاوەندارێتییان دەگەڕێتـەوە بۆ ئەو دەوڵەتە تازەیەی بە سەر هەرێمەکەیەوەیە.

دەبێ جیاوازی بکرێ لەنێوان ماڵ و مـوڵکی گواسـتراوە و نەگواسـتراوە، مـاڵ و مـوڵکی گواستراوە کە لە هەرێمدا هەن، دەگواسترێنەوە بۆ دەوڵەتی نوێ بەپێی ڕێککەوتننامەی ڤیەننا ساڵی ۱۹۸۳. پراکتیکی نێودەوڵەتیش لە یۆگۆسلاڤیای پێشوو جەختی لەسەر ئەم حەقیقەتـە کردووە.

هەرچی پێوەستە بە زەوی و زار و عەقاری نەگواستراوە، کە لە دەرەوەی هەرێمی دەوڵـەتن یان دەوڵەتەکانی جێگرەوەن، کە دەوڵەتی ئەسڵ بە پراکتیك خاوەندارێتیی تەقلیدیی خـۆی بـە سەریاندا پیادەدەکات، ئەوە دەبنە موڵکی ئەم دەوڵەتە، ئەگەر دەوڵەتە پێوەندیدارەکان لەسەر پێچەوانەی ئەوە ڕێك نەکەون، بەڵام ئەگەر دەوڵەتە ئەسڵەکە کۆتایی پێهات و نەما، ئەوە ماڵ و موڵکی لە دەرەوەدا بە یەکسانی لـە پـاش خـۆی لـەنێوان دەوڵەتـە تـازە پێکهاتووەکانـدا دابەشدەکرێ.

خاڵی یەکی مادەی(۱۵) لە ڕێککەوتننامەی ڤیەننا ساڵی ۱۹۸۳ ئاماژەدەدات، کە ئـەو ماڵ و موڵکە نەگواستراوانەی کـە سـەر بـە هەرێمـەکانی دەوڵەتـە نوێییـەکان بـوون "تـازە

سەربەخۆکان" و لە دەرەوەیاندا بوون و بوونەتە موڵکی گشتی دەوڵەتە ئەسڵەکە لە کاتی تەبەعییەتیاندا، ئەوە دەگوازرێنەوە بۆ دەوڵەت یان دەوڵەتە نوێیەکان بەپێی ڕێژەی بەشداربوونی هەرێم تێیدا.

ئەوەی پێوەستیشە بە زەوی و زار و عەقاری گواستراوەوە، کە لەسەر هەرێمی دەوڵەتە تازەکەن، ئەوە پرەنسیپی هەرێمی دیسان بەردەوام دەبێت. ڕێککەوتننامەی ڤیەننا سالی ١٩٨٣ ئاماژەدەدات: ((.. ماڵ و موڵکی گواستراوەی دەوڵەت، کە موڵکی دەوڵەتی پێشوون و بۆ چالاکییەکانی تەرخانکرابوون لە چوارچێوەی هەرێمی پێوەندار، دەگوازرێنەوە بۆ دەوڵەتە تازە پێکهاتووەکە لەسەر ئەم هەرێمە)) (مادەی ١٧).

بەڵام کێشەکە بە لایەنی ماڵ و موڵکی گواستراوە، کە کەوتوونەتە دەرەوەی هەرێم، ئالۆزە. بڕگە (٢) لە خالی یەکەمی مادەی (١٧)دا دەڵێت: ئەم جۆرە موڵك و سامانە لە حاڵێکدا ئەگەر بەشێك لە دەوڵەت جیابۆوە بە ڕێژەیەکی یەکسان دەگواسترێنەوە بۆ دەوڵەتە نوێیەکە.

کۆمیتەی ناوبژیوانی تایبەت بە یۆگۆسلاڤیا ئاماژەیداوە بەو پرەنسیپە گشتییەی دەڵێت، کە ماڵ و موڵك و قەرز و ئەرشیفی دەوڵەتی یۆگۆسلاڤیای پێشوو (جگە لە ماڵ و موڵکی نەگواستراوە لە چوارچێوەی هەر دەوڵەتێکی نوێدا) لەنێوان دەوڵەتە تازەکاندا دابەشدەکرێن و ئەو مەوجودات و ئیمتیازاتانەش قابیلی دابەشکردنی هاوسەنگ نین، بەرئەنجامە گشتییەکەیان بە سەر دەوڵەتەکاندا دابەش دەکرێ.

بە بۆچوونی ئێمە پرسی میراتگری لە حاڵێکدا دەوڵەت لێکترازا یان خرایە پاڵ دەوڵەتێکی تر، لە حاڵەتەکانی تر ئاسانترە، چونکە دەوڵەتە تازە پێکهاتووەکە لە ئاکامی لێکترازانی دەوڵەتی پێشوو، دەستدەگرێ بە سەر قەرز و ژێرخانەکانی دەوڵەتی لێکترازاو. ئەوەی پێوەستیشە بە خستنەپاڵ دەکرێ لەم ڕووەوە ئاماژە بە یەکگرتنی ئەڵمانیا بدرێ.

مادەی(٢١)ی ڕێککەوتننامەی ئەو یەکگرتنە ئاماژەدەدات، کە مەوجوداتی کۆماری ئەڵمانیای دیموکرات، کە بۆ مەبەستی کارگێڕیی پەتی تەرخانکرابوو هەروا ئەوانەش، کە بۆ مەبەستە گشتییەکان بەکاردەهێنران لە چوارچێوەی خاکی کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی پێشوو دەبنە مەوجوداتی فیدراڵی. بە هەقیقەت کاری نێودەوڵەتی ـ هەندێ نۆرمی بنەڕەتی لێ دەربچێ ـ دەسەلمێنێ، کە هەموو شتێك لە هەر هەلومەرجێکدا بێت، بەستراوە بە ڕێککەوتنی تایبەتەوە لەنێوان لایەنە پێوەندیدارەکاندا.

دەبینین لە حاڵەتی چیکۆسلۆفاکیای پێشوو هەردوو دەوڵەتە تازەکە ڕێککەوتن لەسەر دابەشکردنی سامان و ئیمتیزاتەکانی دەوڵەتە کۆنەکە بە ڕێژەی ٢ بە ١، ئەمەش بریتییە لە ڕێژەی دانیشتووانی هەردوو دەوڵەتە تازەکە. لە حاڵەتی یەکیەتیی سۆڤێتی پێشووشدا رووسیا و دەوڵەتە تازە پێکهاتووەکان ڕێککەوتننامەیەکیان لە ساڵی ١٩٩١-١٩٩٢ مۆرکرد بۆ دابەشکردنی سامان و ئیمتیازاتەکانی یەکیەتیی سۆڤێتی پێشوو بەپێی ڕێژە. ئەوە بوو بۆ نموونە رووسیا ٦١/٣٤ی بەرکەوت، ئۆکرانیاش ١٦/٣٧ی بەرکەوت.

## ٢ -ماڵ و موڵکی تایبەتی تاک :

ئەو دەوڵەتانەی تازە پێکدێن پابەنددەبن بە پاراستنی بیانییەکان و ماڵ و موڵکی تایبەتیان بەپێی ئەو بیرۆکە بنەڕەتییەی باوە لەم بوارەدا، ئەویش ڕێزگرتنە لە مافی بەدەستهێنراو (المكتسب)، کە هەندێ جار هەموو جۆرە بەرژەوەندییەکی یاسایی لەخۆدەگرێ. لە حاڵەتی میراتگریدا ئەو بیانییانە ئەو مافانەشیان دەپارێزرێت بەرامبەر دەوڵەتی نوێ. هەندێ لە یاساناسان بەم شێوەیە وەسفی ئەم بیرۆکەیە دەکەن، کە بریتییە لە پرەنسیپێکی بنەڕەتی لە پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی. کەچی هەندێکی دیکەشیان وای بۆ دەچن، کە سەرچاوەیەکە بۆ نیگەرانی. بۆیە هەندێ ناکۆکی هەیە لەسەر ڕادەی ئەو مافە. ئەم بیرۆکەیە لە لایەکەوە وا دەگەیەنێ، کە گواستنەوەی سەروەری کارناکاتە سەر ماف، لە لایەکی تریش ئاماژەدەدات بە پاراستنی بیانی بەپێی توانا لە ئاکامی ئەو گۆڕانکارییانەی لە میراتگرییەوە دێن.

دادگەی دادی نێودەوڵەتی هەمیشەیی لە سەروبەندی هەردوو شەڕی جیهانیدا لە چەند کێشەیەکیان کۆڵییەوە، کە پێوەستبوون بە مافی بەدەستهێنراو لە پۆڵۆنیا لە پاش وەرگرتنی سەربەخۆیی و یەکخستنی ئەو بەشانەی، کە بەسەر ئەڵمانیا و رووسیا و نەمسا و مەجەردا دابەشکرابوون. کێشەکان بەسترابوون بە چەند مافێکی بەدەستهێنراوەوە لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەڵمانیا و لێرەدا دەسەڵاتدارانی پۆڵۆنیا وروژاندیان.

دەبینین لە ((کێشەی نیشتەجێکراوە ئەڵمانەکان))دا، پۆڵۆنیا هەوڵیدا خاوەندارێتیی لەو نیشتەجێکراوە ئەڵواتانە وەرگرێتەوە، چونکە زۆرینەیان قەواڵەی گواستنەوەی خاوەندارێتییان وەدەسنەهێنابوو بەر لە ڕزگاربوونی پۆڵۆنیا، بەڵام بەپێی یاسای ئەڵمانی ئەو ئەڵمانییانە بۆیان هەبوو ئەم جۆرە بەڵگەنامەیە وەدەستبێنن چ لە ڕێگەی کرێی درێژخایەن (Lease) یانیش لە

ڕێگەی دانی نرخیان بە قستی دیاریکراو و بەردەوام، کاتێکیش دوا قیست دەدرێ زەوییەکە دەبێتە موڵکی خۆیان. ئەوە بوو دادگە بڕیاریدا یاسای ئەڵمانی لەم حاڵەتەدا پراکتیزەدەکرێ و خاوەندارێتیی بەدەستهاتووی زەویش بەم شێوەیە پێویستە بپارێزرێ بە گوێرەی ئەحکامی پەیمانی پاراستنی کەمایەتییەکانی ساڵی ١٩١٩. لەوەش گرینگتر، دادگە تاکیدی کرد تەنانەت ئەگەر دوای کارپێنەکردنی ئەم جۆرە پەیواتانەش ((ئەوە بەپێی یاسای کارپێکراو، مافی تایبەتیی بەدەستهاتوو لە کاتی گۆڕینی سەروەریدا، هەڵناوەشێتەوە)).

دەبێ ئاماژە بدرێ، کە لە پشتی بەرنامەی نیشتەجێکردنی ئەڵمانییەکان لە خاکی پۆلۆنیادا پێش ئەوەی ڕزگاری بێت، گەلێك فاکتەری سیاسی هەبوون. وێڕای ئەوەش گۆڕینی سەروەری کاری نەکردە سەر مافی بەدەستهاتووی تایبەت بەم شێوازە و لە بەرامبەر دەوڵەتی تازەدا جێبەجێکرا، بەڵام ئەوە زۆر جێی گومانە ئەوەیان لەم ڕۆژگارەدا قبووڵ بکرێ، چونکە بەردەوامبوونی مافی کەسێتی لە حاڵەتی میراتگریدا واتای وا نییە دەوڵەتی نوێ ناتوانێ ئەم جۆرە مافانە هەڵبوەشێنێتەوە. چونکە یاسای نێودەوڵەتی چەند مەرجێکی تایبەتی داناوە بۆ لێسەندنەوەی خاوەندارێتیی بیانییەکان. نۆرمی گشتی ئەوەیە: مافی بەدەستهاتوو لە لایەن بیانییەکانەوە دەبێ بەردەوام بێت، بەڵام باشتر وایە بە ڕێگەی ڕێککەوتننامە چارەسەربکرێ. ئەم بۆچوونە تەنیا ئەو مافە تایبەتانە دەگرێتەوە، کە وەرگرتنیان یان وەدەستهێنانیان ئەنجامدراوە. دوایەش ئەو مافانەی پێویستە لە داهاتوودا وەربگیرێن بەرامبەر بە دەوڵەتی نوێ مولزەم نین، هەروا سکاڵای داواکردنی قەرەبووکردنەوە بەرامبەر ئەو زەرەر و زیانەی چارەسەرنەکراون، ئەوانیش بەرامبەر بە دەوڵەتی تازە مولزەم نین.

لە حاڵەتی هەڵەکردنی دەوڵەت، لەم ڕووەوە نەمانی دەوڵەت کۆتایی بە بەرپرسیارێتی ئەو هەڵانە دێنێ، کە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی کردوونی. هەرچەندەش ئەوە نۆرمێکی گشتییە لە یاسای نێودەوڵەتیدا، بەڵام دەوڵەتی تازە ئەگەر هەمان هەڵەی کرد یان بەردەوامبوو لەسەر هەمان هەڵەی دەوڵەتی پێشوو، ئەوا لە بەرامبەر ئەو کردەوانەی بەرپرسیارێتی هەڵدەگرێ. ئەمەش دادگەی نێوبژیوانی تایبەت بە کێشەی لایتهاوس (Lighthouses)ی نێوان فەرەنسا و یۆنان لە ساڵی ١٩٥٦ سەبارەت بە هەندێ لەو ئیلتیزامانەی کۆمپانیایەکی فەرەنسی لە هەرێمدا وەدەستی هێنا دوای ئەوەش گواسترایەوە بۆ یۆنان، تاکیدی لەسەر کرد.

کێشەی مافی بیانییەکان لە کاتی میراتگریدا بە شێوەیەکی توونـد وتۆڵ بەستراوە بە ناکۆکییە ئایدۆلۆژییەکان و فشاری ئابوورییەوە. بۆ نموونە دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان هەمیشە

تێدەکۆشــن بــۆ پشــتگیریکردن لــە تیــۆری مــافی بەدەســتهاتوو بــە پێچــەوانەی دەوڵەتــە کۆمۆنیستەکان و دەوڵەتانی جیهانی سێیەم، کە دژین و دەیانەوێ ئەو مافانە بە جۆرەها رێگە وەربگرنەوە، وەك خۆماڵیکردن.

### ٣ - میراتگری لە قەرزدا:

بەپێی نۆرمەکانی یاسای نێودەوڵەتی تەقلیدی حکوومەتی جێگیر هەمیشــە بەرپرســە لــە قەرزەکانی حکوومەتی پێشوو.[١٩] سەرچــاوەی ئــەم بۆچــوونەش ئەوەیــە، کــە دەوڵــەت، نــەك حکوومەت، کەسی یاسایی یاسای نێودەوڵەتییە. هەرچەندە قەرز ئەنجامی رەوشــتی بەرپرســە حکومییەکانە، بەڵام ئەمانە، کاتێك گرێبەستی قەرز ئیمزادەکەن، کارەکانیــان تــەنیا بــەناوی دەوڵەتەکانیانەوە ئەنجامدەدەن. بۆیە گۆڕان لە حکوومەتدا کارناکاتە سەر کەسایەتی دەوڵەتــە قەرزارەکە.

کاتێك میراتگری دەوڵەت روودەدات کێشەی بەرپرسیارێتی دەوڵەتی جێگیر بەرامبــەر بــە قەرزەکانی دەوڵەتی پێشوو سەرهەڵدەدات. لێــرەدا حاڵــەتی وا هەیــە دەوڵــەتی پێشــوو، کــە قەرزەکەی کردووە هەڵوەشاوەتەوە و نەماوە.

رێسای نەریتی یان پەیماننامەی بە کۆمەڵی کارپێکراوی روون نییە، کە نیشانی بدات کەی دەوڵەتی جێگیر بەرپرسیارە لە قەرزی دەوڵەتی پێشووی. یاساناسان بۆچوونی جیاوازیان هەیــە لەسەر ئەو رێسایانەی، کە دەبێ لەم حاڵەتانەدا جێبــەجێ بکــرێن. لــە لایەکــەوە هەنــدێکیان بۆچوونیان بەرەو تۆمارگەی خاوێنە، کە بەپێی دەوڵەتی نوێ بە هیچ شێوەیەك پابەندنابێت بــە ئیلتیزامەکانی دەوڵەتی پێشووەوە. هەندێکی تریان لایەنگری بۆچوونێکی میراتگــری گشــتین، کە بەپێی دەوڵەتی جێگیر بە گشتی پابەندە بە ئیلتیزامەکانی دەوڵەتی پێشووەوە. یاساناســی تر هەن پێیانوایە، کە بەپێی بۆچوونە گشتییەکە قەرز ئەگــەر پــیس بێــت "Odious Debt" دەبێت دەوڵەتی جێگر پابەندنەکرێت، جگە لە حاڵەتی بەردەوامبوون[٢٠] Continuity .

---

19-Daniel Patrick O'Connell, State Succession in Municipal Law and International Law. Val.1, CUP (1967), p.6

٢٠- سەرچاوەی پێشوو، ل187.

**دوو جۆری قەرزی پیس هەن:**

١- قەرزی رژێم یان قەرزی دوژمنایەتی، ئەم جۆرە قەرزانە هەڵدەوەشێنرێنەوە ئەگەر ئەم پێوەرانەیان تێدا بێت:

١. ئەگەر قەرزەکە دژی بەرژەوەندی دەوڵەتی قەرزار بێت. واتە بۆ جێبەجێکردنی پێداویستی و بەرژەوەندیی دەوڵەتەکە بەکارنەهێنرابێت.

٢. ئەگەر قەرزدەرەکان زانیبێتیان قەرزەکانیان بۆ چەوسانەوەی دانیشتووانی دەوڵەتە قەرزارەکە بەکاردەهێنرێن.[21] ئەگەر بە بێ رەزامەندی گەلی دەوڵەتەکە وەرگیرابێت.[22]

٢ - قەرزی شەڕ: لە سەردەمی بیستەمەوە بیردۆزی (قەرزی شەڕ) تەسکرایەوە بە جۆرێك، رێگەبدات بە دەوڵەتی جێگرەوە تەنیا ئەو قەرزانە نەداتەوە، کە خەرجکراون بۆ خۆئامادەکردن بۆ شەڕ یان بەرپاکردنی و بەڕێوەبردنی دژی دەوڵەتی جێگرەوە یان دەوڵەتگەلێکی تر.[23]

لەبەرئەوەی رێسایەکی یاسایی نییە قەرزی چەوساندنەوە (رژێم) هەڵوەشێنێتەوە لەرووی میراتگرییەوە، زۆرجار پەنادەبرێتە بەر پرۆسەی بڕیار دروستکەران ( decisionmaking process) لە حاڵەتی میراتگری دەوڵەت و حکوومەتدا. میراتگری تەقلیدی نیشانی دەدات، کە تێکڕای پرۆسەی بڕیاردروستکەرانی نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی گشتی پێداویستییەکانی مافی مرۆڤ و سەقامگیری جیهانی و هەماهەنگی نێوانیان لەبەرچاودەگرێت. ئێستە لەم سەردەمەدا دادگەکان و حکوومەتەکان و دەزگە داراییەکان هێز و توانای خۆیان تەرخانکردووە بۆ ئەوەی ئیلتیزامە بازرگانییەکان مسۆگەربکەن، سەرەڕای میراتگری، تاوەکو کاردانەوەی خراپی میراتگری لەسەر ئابووری جیهانی بێننە کەمترین ئاست[24].

کاتێك میراتگری دەوڵەت یان حکوومەت روودەدات رەنگە هەندێ لە بەشداربووانی سیستەمی نێودەوڵەتی وابکەن، کە ئیلتیزامی بازرگانی دەوڵەتی پێشوو هەڵوەشێتەوە یان

21- Kevin H. Anderson, International Law and State Succession: A Solution to the Iraqi Debt Crisis, 2005 Utah L. Rev. (2005).p. 401

22- Christoph G. Paulus, "Odious Debts" vs. Debt Trap: A Realistic Help?, 31 BROOK journal of International Law. 83 (2005)

23- Summary Records of the 1420th Meeting, [1977] 1 Y.B International Law. Commition, U.N. Doc. A/CN.4/SER.A/1977

24- Tai-Heng Cheng, Power, Norms, and International Intellectual Property Law, Michigan. journal of International Law. vol 28 No 1 (2006) p. 109

هەمواربکرێتەوە. دەکرێ ئەم بەشداربووانە حکوومەتی جێگیر بن یان میدیا و رێکخراوی غەیرە حکومی یان دەوڵەتانێکی تر، کە بەرژەوەندییان لە هەڵوەشانەوەی ئەم ئیلتیزامانە هەیە. لەولاشەوە رەنگە بەشداربووی دیکە هەبێت بەرامبەر بەم پرۆسەیە بوەستێت. ئەمانە هەموو دەبنە هۆی کاردانەوە لە لای دەوڵەتە پێوەندیدارەکان. بێگومان ئەمەش پاڵ بە هەردوولاوە دەنێت تاوەکو بکەونە وتوویژ لەگەڵ کەسانی قەرزدەر لە پێناو گەیشتن بە بڕیارێکی نێودەوڵەتی. ئەگەر هاتوو قەرزەکان تێکڕا بوونیان قورساییەکی زۆریان، بە شێوەیەکی ناعادیلانە، خستبێتەسەر دەوڵەتی جێگیر ئەوە دەکرێ ئەو ئیلتیزامانە کەم بکرێنەوە، بەڵام ئەگەر سوودبەخش بن بۆ ئەو هەرێمەی دەوڵەتی جێگیری لەسەر پێکهێنراوە ئەوە دەمێننەوە.

بەم جۆرە یاسای نێودەوڵەتی سەردەم لە میانەی پرۆسەی بڕیاردانا هاوسەنگی دەکات لەنێوان سیاسەتی مانەوەی ژێرخانی ئابووری نێودەوڵەتی و جێبەجێکردنی داخوازییەکانی مافی مرۆڤ بە گوێرەی هەر حاڵەتێکی تایبەتی جیاواز لە حاڵەتەکانی میراتگری.

لەم سەردەمەی ئێستەدا وڵاتەکان خۆیان گیرنەداوە لە چوارچێوەی تەسکی بیردۆزی قەرزی پیس. بگرە لە جیاتی ئەوە بڕیاردەرە نێودەوڵەتییەکان پەنادەبەنە بەر سیاسەتی شیکردنەوەی گشت ئیلتیزامەکان بە ئیلتیزامی پەیمانیشەوە.

لە ساڵی ١٩٩١ کاتێك دەوڵەتەکانی بەڵتیق سەربەخۆیی خۆیان گەڕاندەوە لە داگیرکاری سۆڤێتی هەموو ئیلتیزامەکانی سۆڤێتیان پەرچنەدایەوە لەسەر بنەمای قەرزی پیس. بگرە لە جیاتی ئەوە بڕیاردەرە نێودەوڵەتییەکان هەندێ ئیلتیزامیان هەڵوەشاندەوە و هەندێکی تریان هێشتەوە. سوید و ئیستۆنیا بڕیاریاندا، کە سنووری هاوبەشی دیاریکراویان وەك سەردەمی داگیرکاری سۆڤێت بهێڵنەوە بۆ ئەوەی زیان بە پیشەسازی راوەماسییان نەگات [٢٥] .

رەوتی نێودەوڵەتی دەریخستووە، کە بە پێچەوانەی بیردۆزی قەرزی رژێمەوە، ئەو ئیلتیزامانەی چەوسێنەرەوەن و بە بێ رەزامەندی دانیشتووانی دەوڵەت کراون، میراتگری دەیانگرێتەوە و دەمێنن، بەڵام نوێ دەکرێنەوە بە شێوەیەك گونجاو بن بۆ هەموو لایەنەکان و بەربەست بن لە شێواندنی بازرگانی جیهانی.

---

25- Jan Klabbers; Practice Regarding State Succession and Issues of Recognition (The Hague: Kluwer, 1999, co-edited with M. Koskenniemi, O. Ribbelink & A. Zimmermann) p .314

ئەو ئیلتیزامانەی کە حکوومەتە سۆشیالیستەکانی یەکیەتیی سۆڤێتی و یۆگسلاڤیای جاران چووبوونە نێوی، بە قەرزی رژێم دانران لە لایەن دەوڵەتە غەیرە سۆشیالیستییە جێگیرەکانیانەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دەوڵەتانە و خاوەن بڕیارە نێودەوڵەتییەکان ئەم ئیلتیزامانەیان هەڵنەوەشاندەوە. لە جیاتی ئەوە قایلبوون بە بەردەوامبوونی قەرزەکان و ئیلتیزامە پەیمانییەکان و داوایان کرد سەر لە نوێ رێکبخرێنەوە، بە شێوەیەك نەبنە بارقورسی بۆ دەوڵەتە جێگرەوەکان.[٢٦]

لە ١٩٩٧ مەکەدۆنیا لەگەڵ یانەی لەندەن دا رێککەوت، کە لە بڕی ٦٤٤ ملیۆن دۆلار قەرز، کە بۆی ماوەتەوە لە رژێمی پێشووەوە دانەوەی ٣٦٤ ملیۆن دۆلاریان دەگرێتە ئەستۆ و دابەش دەکرێتە سەر چوار قۆناخ و لە ماوەی پانزە ساڵدا دەدرێنەوە.[٢٧]

بە هەمان شێوە کێشەی نێوان ئوسترالیا و تەیموری رۆژهەڵات چارەسەرکرا. کێشەکە لەوەدا بوو، کە لە ساڵی ١٩٨٩ ئەندەنووسیا بەپێی ئەوەی گوایە تەیموری رۆژهەڵات بەشێکە لێی لەگەڵ ئوسترالیا پەیمانی گاپی تەیموری (Timor Gap Treaty ) ئیمزاکردبوو بۆ وەبەرهێنان لە دەریای تەیمور و دابەشکردنی داهاتی بە سەر هەردوو لادا، بەڵام دوای رزگاربوونی تەیموری رۆژهەڵات ئەم پەیماننامەیە سەر لە نوێ داڕێژرایەوە و ناوی گۆڕا بۆ (Timor Sea Agreement). بەپێی ئەم رێککەوتنە نوێیە ئیلتیزامە بازرگانییەکانی جاران مانەوە لەبارەی وەبەرهێنانی هاوبەش، بەڵام ئەمجارە بڕیاردرا داهاتەکە لەنێوان ئوسترالیا و تەیموری رۆژهەڵات دابەش بکرێت بە رێژەی نۆ بە یەك.[٢٨]

بێگومان قەرزەکانی رژێمی لەناوچووی عیراق، کە کۆی گشتییان دەگاتە ١٤٠ ملیار دۆلار زۆرینەی زۆریان وەك قەرزی رژێم دەژمێردرێن، چونکە بەبێ رەزامەندی و بەرژەوەندی گەلی عێراق کرابوون و تەنانەت بۆ چەوساندنەوەی دانیشتووانی وڵاتەکە بەکارهێنراون.[٢٩]

---

٢٦ بڕوانە: راگەیاندنی هاوبەشی هۆڵەندا و سلۆڤینیا لە ١٩٩٢\٧\٣١ لەبارەی پێوەندیی پەیمانی دوولایەنەیان، لە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٨٦.

27- The Economist Intelligence Unit, Country Profile; Yugoslavia (Serbia – Montenegro) &Macedonia 1996-1997. 53 “1997

28- Press Release, UNTAET, Timor Sea Arrangement, Negotiated by U.N., Approved by East Timor Cabinet (July 3, 2002), http://www.un.org/peace/etimor/news/N030701.htm

29- Kevin H. Anderson, International Law and State Succession: A Solution to the Iraqi Debt Crisis, 2005 UTAH L. REV (2005), p .436

کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دوای رزگارکردنی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣ چەند هەنگاوێکی ئابووری نا لە پێناو پاراستنی عێراق لەو قەرزانە و ئاسەواری رووخێنەری لەسەر ئابووری عێراق و جیهان. بەم ئاراستەیە ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بە بڕیاری ژمارە ١٤٨٣سندوقی گەشەکردنی عێراقی (Iraqi Development Fund ) دامەزراند و بڕیاری دا داهاتی نەوتی عێراقی تێبخرێت و ئەم داهاتەشی خستە ژێر یاسابەندییەوە (الحصانة) تاوەکو کەس نەتوانێت داوای یاسایی لەسەر تۆماربکات[٣٠]. حکوومەتی ئەمەریکاش لە لایەن خۆیەوە بە فەرمانی جێبەجێکاری U.S. Executive Order ژمارە،٣٠٣١٣ داهاتەکەی لە سندوقەکەدا خستە ژێر یاسابەندییەوە بۆ ماوەیەکی دیارینەکراو.[٣١]

لە بەر ئەوەی لە حاڵەتی عێراق میراتگری دەوڵەت نییە، بگرە میراتگریی حکوومەتە قەرزەکان هەڵنەوەشانەوە، ئیدی لە رێگەی یانەی پاریس بۆ قەرزەکانی عێراق، ئەمەریکا و عێراق هەوڵیاندا و قەبارەیان کەمکردەوە بە رێژەی ٢٠٪ و بە دوو قۆناخ و لە ماوەی ٢٣ ساڵدا بدرێتەوە.

ئەو خاوەن قەرزانەی لە دەرەوەی یانەی پاریس بوون لە ٢٠٠٦\٧\١٨ لەگەڵ عێراقدا رێککەوتن لەسەر کەمکردنەوەی قەرزە بازرگانییەکانیان بە رێژەی ١٠,٢٥٪ بۆ ئەو قەرزانەی لە ٣٠ ملیۆن کەمترن و ٥,٨٠٪ بۆ ئەوانەی لە ٣٥ ملیۆن زیاترن.[٣٢]

دەرئەنجام دەتوانین بڵێین کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ئێستە لەم سەردەمەدا پیادەی ئەو بۆچوونە دەکات، کە قەرزی پیسی هەم دەوڵەتی جێگیر و هەم حکوومەتی جێگیر هەڵنەوەشێتەوە، بگرە لە جیاتی ئەوە رێکبخرێتەوە و کەم و هەمواربکرێتەوە، بە شێوەیەك تاوەکو نە کاربکاتە سەر ئابووری و ئاڵوگۆڕی جیهانی و نە بەربەستبێ لە بەردەم گەشەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە دەوڵەتی قەرزار.

---

30- S.C. Res. 1483

31- Exec. Order No. 13,364, 69 Fed. Reg. 70177 (Nov. 29, 2004

32- Press Release, Republic of Iraq, Ministry of Fin., Iraq Announces Conclusion of Commercial Debt Settlement (July 18, 2006)

# باسی یەکەم

## چەمك و بناخەی بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی



### ١ - چەمکی بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی:

بەرپرسیارێتی دەوڵەت پرەنسیپێکی سەرەکیی یاسای نێودەوڵەتییە، کە لە سرووشتی سیستەمی یاسایی نێودەوڵەتی و بیردۆزی سەروەری یاسا و یەکسانی دەوڵەتەکانەوە سەرهەڵدەدات. بەرپرسیارێتی ئەوە دەگەیەنێ، کاتێك دەوڵەتێك کارێك ئەنجام دەدات، کە ناڕەوایە بەپێی یاسای نێودەوڵەتیی دژی دەوڵەتێکی دیکە، بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتیی بەرپا دەبێت لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا. سەرپێچیکردن لە پابەندبوونێکی نێودەوڵەتیی دەبێتە هۆی داواکردنی قەرەبووکردنەوە.

بەم پێیە مرۆڤ دەکەوێتە بەردەم کارکردن لەگەڵ کۆمەڵە پرەنسیپێکدا، کە کاردانەوەی کارێکی تر دەگرنەوە. بە واتایەکی دیکە ئەو ڕێوشوێن و دەرهاویشتانەی، کە لە سەرپێچیکردن لە نۆرمێکی گەوهەری یاسای نێودەوڵەتی دەکەونەوە.

لێژنەی یاسای نێودەوڵەتی لە خولی ٥٣دا لە ساڵی ١٩٩٨ پڕۆژەی ئەو ماددانەی پێوەندییان هەیە بە بابەتی (( بەرپرسیارێتی دەوڵەتان لەسەر کاری ناڕەوا لە یاسای نێودەوڵەتی)) تەواوکرد و لە خولی ٥٦ لە ساڵی ٢٠٠١ کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، وەك پاشکۆی بڕیارێك بڵاویکردەوە و خستییە پێش دەوڵەتان بەبێ ئەوەی داوایان لێ بکات بڕیاری پێشەکی لەسەر بدەن یان پەسەندی بکەن[1]. دواتر لە خولی ٦٢ لە ساڵی ٢٠٠٧ کۆمەڵەی گشتی بڕیاری دا، کە ئەم بابەتە بخرێتە ئەجیندای خولی (٦٥)ـەوە، کە لە ساڵی ٢٠١٠ دەگیرێت و داوای کرد تیمێکی کارکەری سەر بە لێژنەی شەشەم دراسەی مەسەلەی دانانی ڕێککەوتننامەیەك سەبارەت بە بەرپرسیارێتی دەوڵەتان لەسەر کاری ناڕەوا لە یاسای نێودەوڵەتیدا بکات [2]. لە خولی ٦٥ دا کۆمەڵەی گشتی داوای لە دەوڵەتانی ئەندام

1- Responsibility of States for internationally wrongful acts. See A/RES 56/83 at 28 January 2001

2- A/RES/62/61

کرد را دەربڕن، ئایا " پرۆژە مادەکان دەبێت چ شێوازێك وەربگرێت... و ئەو مەودا دەسەلاتە یاساییەی خۆیان دیاری بکەن، کە هاوولاتییانی خۆیان دەگرێتەوە و زانیاریی بدەنە سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان لەبارەی هەلوێستیان بەرامبەر بەرزکردنەوەی داوا لەسەر رەوشتی خراپ..." [٣].

ئەم پرۆژەیە برێتییە لە چوار دەروازە. یەکەمیان کاری نارەوای دەولەت لەیاسای نێودەولەتیدا دەگرێتەخۆ. دووەمیان، لەبارەی ناوەڕۆکی بەرپرسیارێتی نێودەولەتی دەولەتە و سێیەمیان باسی رێوشوێنی چارەسەرکردنی بەرپرسیارێتی نێودەولەتی دەکات و بەشی چوارەمیش بۆ ئەحکامی گشتیی تەرخانکراوە.

پرۆژەکە یەکەم هەنگاوە لە رێگەی تۆمارکردنی Codificationی نۆرمەکانی یاسای نێودەولەتی لە بواری بەرپرسیارێتی دەولەتدا، چونکە پرەنسیپ و مومارەسەی دەولەتان و دادوەریی نێودەولەتی و یاسای عورفیش، دەگرێتەخۆ [٤].

هەرچەندە ئەم ماددانەی پرۆژەکە بڕیاریان لەسەر نەدراوە و کۆمەلەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان بە شێوەی رێککەوتننامەی نێودەولەتی نەیخستۆتە پێش ئەندامانی بۆ پەسەندکردنی، بەلام زۆر لە دادگە نێودەولەتییەکان ئاماژەیان پێدەکەن لە بڕیارەکانیاندا و دەکرێت تا رادەیەك بە نۆرمگەلێکی عورفی نێودەولەتی لە قەلەم بدرێن. بۆیە تۆژینەوەکەی ئێمەش لێرە لە روانگەی ئەو پرۆژە گرینگەوە دەکرێت.

بەرپرسیارێتی یاسایی نێودەولەتی، ئەو ئاسەوارە ناخوازیارانەیە، کە تووشی کەسی یاسایی نێودەولەتی دەبن لەسەر ئەو پێشێلکارییەی کردوویێتی بۆ نۆرمی یاسای نێودەولەتی، یان ئیلتیزامی نێودەولەتی.

بەرپرسیارێتی نێودەولەتی ئامرازێکی یاساییە بۆ مسۆگەرکردنی چاوەدێریی ئەم نۆرمانە و بژاردنی ئەو زیانەی کەوتوونەتەوە. لە رووی سرووشتی خۆیەوە ئەو ئاسەوارە یاساییانە، کە بەرپرسیارێتی یاسایی نێودەولەتی پێکدەهێنن ناخۆشن بۆ دەولەتی یان رێکخراوی پێشێلکار. ئەم بەرپرسیارێتییە پێوەستە بە رێژەی خەتەرناکی پێشێلکارییەکە و دەکرێت ئەمانە بگرنەخۆ:

١- بەرپرسیارێتی لەسەر دوژمنکاری و جینۆساید و جیاوازیی رەگەزی و رێگرتن لە

---

3- Resolution No. A/RES/65/19 Draft A/65/463 at 6/2/2010

4- Volker Hüls: State Responsibility for Crimes under International Law: Filling the Justice Gap in the Congo, , *April 2004* Page 12

دانی سەربەخۆیی بە گەلان یان وڵاتانی کۆلۆنیالی و پێشێلکاری یاسا و نەریتی جەنگ.

٢- پابەندبوونی دەوڵەتی پێشێلکار، کە ئەو زیانەی گەیاندوویێتی بە کەسانی تری یاسای نێودەوڵەتی ببژێرێت و لە هەندێ حاڵەتدا بژاردنی کەسی تاك و یاساییش دەگرێتەوە.

٣- بەکارهێنانی کردەکاریی زۆرەملێ، بەپێی یاسای نێودەوڵەتی، بەرامبەر پێشێلکاریی یاسایی. ئەمە بەکارهێنانی هێزی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش دەگرێتەوە بە گوێرەی مادەی (٤٢)ی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان.

زۆر دۆکومێنتی نێودەوڵەتی بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتییان رێکخستووە، وەك: دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەو رێککەوتننامانەی جینۆساید و جیاوازیی رەگەزییان قەدەخەکردووە و رێککەوتننامەکانی ژنێف بۆ پاراستنی لێقەوماوانی جەنگ ساڵی ١٩٤٩ و پرۆتۆکۆلە پاشکۆکانیان لە ساڵی ١٩٧٧ و رێککەوتننامەی یاسای دەریا ساڵی ١٩٨٢ و هەندێ کاری نێودەوڵەتی تریش بەرپرسیارێتی تاك لەسەر تاوانی دژ بە ئاشتی و مرۆڤایەتی و تاوانی جەنگ و هەندێ تاوانی تر لە لایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە، بە شێوەیەکی فرەوان دانپیێدانراو لە رووی یاساییەوە چەسپێنرا. بەرپەسیارێتی تاك دەکەوێتەوە کاتێك هەڵسوکەوتی تاکەکان دەبەسترێنە کارێکی تاوانئامێزی دەوڵەتەوە. ئەم جۆرە بەرپرسیارێتییە بە باشی لە پێڕەوی ناوەخۆی هەردوو دادگەی سەربازی نێودەوڵەتیدا لە نوێرنبێرگ و تۆکیۆ ساڵی ١٩٤٥ و١٩٤٦ رێکخراوە.

## ٢- بناخەی بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی:

هۆکاری ئاراستەکردنی بەرپرسیارێتی دژی کەسی یاسایی نێودەوڵەتی سەرپێچیکردنێتی لە یاسای نێودەوڵەتی، کە برتییە لە ئەنجامدانی یان نەدانی کارێك لە لایەنییەوە. ئەمەش دەبێتە پێشێلکردنی نۆرمێکی یاسای نێودەوڵەتی یان پابەندبوونێکی نێودەوڵەتی خۆی، کە دەبێتە گەیاندنی زیانێکی مەتریالی یان نامەتریالی بە کەسێکی یاسای نێودەوڵەتی یان کۆمەڵە کەسانێکی لەو جۆرە یان تێکرای کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی. وەك نموونەش بۆ ئەم جۆرە کارانە دەتوانین ئاماژەبکەین بۆ رەفتاری دوژمنکاری و سنووردارکردنی نایاسایانەی سەروەریی دەوڵەت و دەسدرێژی بۆ سەر یەکیەتیی خاکی دەوڵەت و سەربەخۆیی رامیاری و پێشێلکردنی ئیلتیزامگەلێك، کە سەرچاوەیان پەیماننامەی نێودەوڵەتییە. بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی ئەو کاتە سەرهەڵدەدات، کە پێوەندیی هۆکاری هەبێت لەنێوان رەوشتە نایاساییەکەی کەسی یاسای نێودەوڵەتی و ئەو زیانەی کەوتۆتەوە.

هەندێ مەرج هەن بوونیـان پێکـەوە بەرپرسـیارێتی نێودەوڵـەتی پێکـدەهێنن، ئەوانـەش ئەمانەن:

١. ئەنجامدانی یان نەدانی کارێك لـە لایـەن کەسـی یاسـای نێودەوڵەتییـەوە، کـە پێشـێلی نۆرمێکی یاسای نێودەوڵەتی بکات.
٢. پێویستە پێشـێلکارییە یاسـاییەکە بدرێتـە پـاڵ کەسـێکی یاسـای نێودەوڵـەتی و پێـی تۆمەتباربکرێت.
٣. پێشێلکارییە یاساییەکە دەبێت زیـانی گەیاندبێتـە کەسـێکی یاسـای نێودەوڵـەتی یـان کۆمەڵە کەسانێکی لەو جۆرە.
٤. دەبێـت پێوەنـدی هـەبێت لـەنێوان پێشـێلکارییەکەی کەسـی یاسـای نێودەوڵـەتی و زیانگەیاندن بە کەسێکی تر یان کۆمەڵە کەسانێکی یاسای نێودەوڵەتی.

نەزانینی یاسای نێودەوڵەتی، یان لێکدانەوە و پراکتیزەکردنـی ناڕاسـتی نابنـە پاسـاو بـۆ پێشێلکردنی یاسای نێودەوڵەتی. ناکرێت دەوڵەت بە یاسـا یـان ڕێنماییـە ناوەخۆکـانی خـۆی پشت ببەستێت وەك پاساو بۆ ئەو ڕەوشتەی پێشێلکاری لێ کەوتووەتەوە بۆ نۆرمێکی یاسـای نێودەوڵەتی، بە جۆرێك کە بووەتە هۆی گەیاندنی زیان بە کەسێکی تری یاسای نێودەوڵەتی.

ئەنجامدانی یان نەدانی کاری نایاسـایی، کـە دەبێتـە هـۆی سـەرهەڵدانی بەرپرسـیارێتی نێودەوڵەتی، دەکرێت لە لایەن دەزگەیەك لە دەزگەکانی دەوڵەتەوە بێت بێ ئەوەی پێگەی ئـەو دەزگەیـە لـە سیسـتەمی دەزگـەکانی دەسـەڵات و کـارگێڕی دەوڵـەت لەبەرچـاوبگیرێت. ئەنجامدەرانی ئەم کارانە یان کارنەکردنە دەکرێت کەسانێك بـن ڕاسـپێردرابێتن، کـە بـە نـاوی دەوڵەتەوە کاربکەن.

دەکرێت بەرپرسیارێتی دەوڵەت بگەڕێتەوە بۆ دەرکردنی یاسایەك یان بڕیارێکی یاسـاکاری ناکۆك لەگەڵ ئەحکامی پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی، کە خۆی لایەنێتی یـان بـە پێچـەوانەوە یاسایەکی دەرنەکردووە، کە دەبوایە بەپێی ئیلتیزاماتە نێودەوڵەتییەکانی دەریبکردابایە.

دەکرێت بەرپرسیارێتی دەوڵەت لە ئەنجامی هەڵوێسـت وەرنـەگرتنی دەزگـەکانی دەوڵـەت سـەرهەڵبدات، لـە کاتێکـدا دەکـرا هەڵوێسـت وەرگـرتنی ببێتـە هـۆی ئەنجامنـەدانی پێشێلکارییەکی یاسایی. بۆ نموونە لـە حاڵـەتی ڕێنـەگرتن لـە توندوتیـژی دژی نوێنەرایـەتی دیپلۆماتی دەوڵەتێکی تر لە وڵاتدا یان هێرشی چەکدارانە بۆ سەری. لەم حاڵەتـەدا دەوڵـەتی خانەخوێ بەرپرسیارە لەسـەر کـارە پێشـێلکارییەکانی هاووڵاتیـانی خـۆی و ئـەو بیانیانـەی

نیشتەجێی وڵاتەکەین و ئەو ڕێکخراوانەش سەر بەوانن. سەرەڕای ئەمەش بەرپرسیارێتی دەکەوێتە سەر دەوڵەت لە دەرئەنجامی وەرنەگرتنی کردەکاری پێویست، کە لەسەریان بووە بیکەن بۆ ڕێگرتن لەو کارە نایاساییانە. دەوڵەت دەکرێت بەرپرسیارێتی بکەوێتە ئەستۆی لەسەر ئەنجامدانی کاری نایاسایی دەوڵەتێکی بیانی لەسەر خاکەکەی ئەو دژی دەوڵەتی سێیەم یان هاووڵاتی ئەو دەوڵەتی سێیەمە.

زیادەڕۆییش لە بەکارهێنانی دەسەڵات لەلایەن دەزگەیەکی دەوڵەتەوە یان بەرپرسێکییەوە دەبێتە هۆی بەرپرسیارێتی دەوڵەت، ئەگەر ئەو زیادەڕۆییە زیان بگەیەنێتە دەوڵەتێکی بیانی یان کەسێکی سرووشتی یان یاسایی ئەو دەوڵەتە. بۆیە دەوڵەت پابەندە ئەو زیانە قەرەبووبکاتەوە، کە لە کارکردنی دەزگەکانی دەکەونەوە کاتێك بچنە هانای گەمییەکی لێقەوماوەوە لە دەریای ئازاددا ئەگەر لە ڕادەی پێویست و ماقوول زیادەڕۆیی بکەن بۆ نەهێشتن و کەمکردنەوە، یان بنبڕکردنی مەترسییەکی کردەنی و جدیانە بۆ پیسکردنی کەنارەکە بە نەوت.[٥]

بەرپرسیارێتی یاسایی نێودەوڵەتیی دەکەوێتە ئەستۆی دەوڵەت، ئەگەر دەزگەکانی یەکە سەربازی و هێزە چەکدارەکانی لەکاتی شەڕدا بە کار و ڕەوشتیان پێشێلکاری بکەن لە ئەحکامی ڕێککەوتننامەکانی ژنێف بۆ پاراستنی لێقەوماوانی شەڕ ساڵی ١٩٤٩ و هەندێ ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتی تر، کە ئامراز و ڕێگەکانی بەڕێوەچوونی شەڕ ڕێکدەخەن. بۆیە پێویستە دەوڵەت ئەنجامی کاری پێویست بدات لە ڕووی یاساکاری و کارگێڕییەوە بۆ ئەوەی دەزگە حکومییەکانی و سەربازییەکانی پابەندبن بە یاسا و ڕەوشتی جەنگەوە، کە لە ڕێککەوتنە نێودەوڵەتییەکاندا چەسپێنراون.

بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی کەسی یاسای نێودەوڵەتی تەنیا لەسەر پێشێلکردنی نۆرمێکی یاسای نێودەوڵەتی یان ئیلتیزامێکی نێودەوڵەتی نابێت، بگرە هەندێ سەرچاوەش هەن دەبنە

---

٥- لەبارەی چوونە هاناوە لە حاڵەتی لێقەوماندا لە دەریای ئازاد و پیسکردنی دەریا بە نەوت. بڕوانە: ماددەی ١و٦ ی ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتیی سەبارەت بە بەرپرسیارێتی شارستانی لەسەر پیسکردن بە نەوت ساڵی ١٩٦٩.

International Convention on Civil Liability for Oil Pollution Damage. Brussels, 29 November 1969 Entry into force: 19 June 1975; Being replaced by 1992 Protocol: Adoption: 27 November 1992; Entry into force: 30 May 1996

هۆی بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی وەك ئـەو سەرچـاوانەی ئەگـەری ئـەوەیان هەیـە، کـە زیـانی مەتریالی زۆریان لێ بکەوێتەوە، لە کاتێکدا بەکارهێنانی یان جێبەجێکردنی ئەم سەرچـاوەیە قەدەخە نییە بەپێی یاسای نێودەوڵەتی. ئەمەش پێی دەگوترێت بەرپرسیارێتی ریسك.

ئەو کەشتیانەی بە وزەی ناوەکی کاردەکەن و ئەو ئامێر و کەرەستانەی دەنێردرێنە ئاسمانی دەرەوە، دەکرێت بە سەرچاوەی مەترسـیداری زیـاد بـژمێردرێن. کەشـتییە وزە ناوەکییـەکان کارەکانیان لە چوارچێوەی ئـازادی کەشـتیوانی لـە دەریـای ئـازاددا ئەنجامـدەدەن و ئـامێرە ئاسمانییەکانیش دەکرێـت بنێـردرێن بـۆ ئاسمـانی دەرەوە بـەپێی پەیماننامـەی پرەنسـیپەکانی کارکردنی دەوڵەتەکان لەرووی لێکۆڵینەوە و بەکارهێنانی ئاسمانی دەرەوە و بـە مـانگ و ئـەو هەسارەکانی تریشەوەی ساڵی ١٩٦٦.[٦] لەبەرئەوەی لە هەردوو حاڵەتدا باس باسی بەکارهێنانی سەرچاوەیەکی خەتەرئامێزی زیادەیـە، دەوڵەتـەکان رێککـەوتوون قـەرەبووی هەنـدێ زیـانی مادیش بکەنەوە، ئەگەرچی لە ئەنجامی پێشێلکارییەکی یاسایی رووی نەداوە. تەنیاش لەبـەر ئەو راستییەی، کە ئەو سەرچاوە هۆی زیانەکەیە. ئەمەش پێـی دەڵـێن بەرپرسـیارێتی بـەبێ گوناه.

مادەی (٢)ی رێککەوتننامەی تایبەت بە بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی لەسەر ئەو زیانانـەی لە تەنەکانی ئاسمانی دەرەوە دەکەونەوە ساڵی ١٩٧١ ئاماژەدەکات، کـە ئـەو دەوڵەتـەی ئـەو جۆرە تەنانە دەنێرنە ئاسمانی دەرەوە بەرپرسیارێتی تەواو و بێ مەرج هەڵدەگرن، کە قـەرەبووی ئەو زیانانە بکەنەوە، کە تەنەکانی ئاسمانی دەرەوە دەیگەیەننە شتومەك لەسەر زەویی یان بـە ئامێرێکی فڕین لەکاتی فڕیندا. بەپێی مادەی ٢٢ی هەمان رێککەوتننامە دەکرێت رێکخراوی نێودەوڵەتیش شانبەشانی دەوڵەت بەرپرسیارێتی بخرێتە ئەستۆی[٧].

دەکرێـت پێشـێلکاری نێودەوڵـەتی بکرێنـە سـێ بەشـی سـەرەکییەوە لـە رووی رێـژەی خەتەرناکییان و فرەوانییان و ئاسەوارەکانییانەوە.

---

6- Treaty on Principles Governing the Activities of States in the Exploration and Use of Outer Space, Including the Moon and Other Celestial Bodies. 19 Dec. 1966 See A/RES/2222 (XXI).

7- Convention on International Liability for Damage Caused by Space Objects 29 Nov. 1971 See A/RES/ 2777 (XXVI) .

### ١- تاوانی نێودەوڵەتی:

تاوانی نێودەوڵەتی پێشێلکارییەکی نێودەوڵەتی خەتەرناکە بۆ نۆرمێکی چەسپێنراوی یاسای نێودەوڵەتی گشتی، کە کاردەکاتە سەر بەرژەوەندی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و بناخەی بوونیان دەکۆڵێ و مەترسی دروستدەکات بۆ سەر ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی. بەپێی بەشی سێیەمی ئەو پرۆژەیەی لیژنەی یاسایی نێودەوڵەتی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان لەبارەی بەرپرسیارێتی دەوڵەت ئامادەیکردووە ئەو پێشێلکارییە نێودەوڵەتییە، کە لە ئەنجامی سەرپێچیکردنی دەوڵەتێك لە ئیلتیزامێکی نێودەوڵەتی سەرهەڵدەدات، کە بە نۆرمێکی یاسای نێودەوڵەتی چەسپێنراوە ئەوەندە بە گرینگ دادەنرێت لەلایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە، کە وەك تاوانێك سەیر دەکرێت دژی تێکڕای کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی. ئەوەی دەکرێت بە تاوانی نێودەوڵەتی دابنرێت ئەمانەن: دوژمنکاری و جینۆساید و ئەپارتاید و کۆلونیالیزم و تاوانی جەنگ و تاوان دژی مرۆڤایەتی و هەندێ تاوانی دیکە.

لەبەرئەوەی ئەم جۆرە تاوانانە بە کردەیی کاردەکەنە سەر تێکڕای کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەوڵەتەکان، بەپێی دەستووری رێکخراوی نێودەوڵەتی دەوڵەتان مافیان هەیە کردەکاری بە کۆمەڵ بۆ وەلاوەنانیان وەربگرن.

### ٢ - تاوانگەلێك کە سرووشتی نێودەوڵەتییان هەیە:

ئەو تاوانانەی کە سرووشتێکی نێونەتەوەیان هەیە، رەوشتگەلێکن مەترسییەکی مەزن لەخۆدەگرن بۆ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و کاردەکەنە سەر بەرژەوەندی هەندێ یان تێکڕای دەوڵەتان. تاوانی کۆیلایەتی و بازرگانی بە کۆیلە و وەبەرهێنانی یان بازرگانی بە مادە هۆشبەرەکان و ئەو مادانەی کاردەکەنە سەر دەروونی مرۆڤ و چەتەیی دەریایی و دەسبەسەرداگرتنی فڕۆکە و تیرۆریزمی نێودەوڵەتی، دەکرێت ئەو جۆرە تاوانانە دابنرێن، کە سرووشتێکی نێونەتەوەیان هەیە.

### ٣ - سەرپێچی نێودەوڵەتیی دیکە:

ئەمانەش برێتین لەو کارە نایاساییانەی، کە زیان دەگەیەننە دەوڵەتێك یان چەند کەسێکی یاسای نێودەوڵەتی و بەرپرسیارێتی لێیان دەکەوێتەوە بۆ دەوڵەتی پێشێلکار بەرامبەر دەوڵەتی زیان لێکەوتوو.

پێشێلکاری یاسا کارناکاتە سەر رایەڵەکانی بوون و بەردەوامبوونی دەوڵەتان و گەلان. وەك نموونەش بۆ ئەم جۆرە پێشێلکارییانە دەتوانین ئاماژە بۆ ئەمانە بکەین: هەڵوێست وەرنەگرتنی دەزگەکانی دەوڵەت بۆ رێگرتن لە کاری نایاسایی دژی نوێنەرایەتی دیپلۆماتی دەوڵەتانی تر و سەرپێچیکردنی لە ئیلتیزامێکی ناو پەیمانێکی بازرگانی نێودەوڵەتی[٨].

8- И. Владимиров; Международно публично право, София. 2001,ctp.43

## باسی دووەم

# جۆر و شێوازەکانی بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی

### ١ - جۆرەکانی بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی:

بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی دەوڵەتان دوو جۆرن: بەرپرسیارێتیی رامیاری و بەرپرسیارێتیی مادی.

بەرپرسیارێتی رامیاری برێتییە لە سەپاندنی کردەکاری ناچارکردن دژی دەوڵەتی پێشێلکار. دەکرێت ئەم بەرپرسیارێتییە شێوەی بەرپرسیارێتی مەتریالیشی بخرێتەپاڵ.

بەرپرسیارێتی مەتریالی ئەو کاتە سەرهەڵدەدات، کە دەوڵەت لە ئەنجامی سەرپێچیکردنی لە ئیلتیزامە نێودەوڵەتییەکانی زیانی مادی دەگەیەنێتە لایەنی تر.

### ٢ - شێوازەکانی بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی:

زەقترین شێوازی بەرپرسیارێتیی رامیاری سزایەکە، کە برێتییە لە کاری ناچارکردن دژی دەوڵەتی پێشێلکار. دەکرێ ئەم سزایانە لە لایەن رێکخراوی نێودەوڵەتییەوە (جیهانی و هەرێمی) و کۆمەڵە دەوڵەتێك یان تاکە دەوڵەتێکەوە جێبەجێ بکرێت.

قەبارە و جۆری سزاکە دەوەستێتە سەر رادەی پێشێلکارییەکە. بۆ نموونە دەکرێ ئەم جۆرە سزایانە بسەپێنرێن بەسەر دەوڵەتی دوژمنکاردا: سنووردارکردنی سەروەری بە شێوەیەکی کاتی و داگیرکردنی سەربازی دوای جەنگ و دابڕینی پارچەیەك لە خاکی دەوڵەتی پێشێلکار و هەڵوەشانەوەی هێزی سەربازی، یان سنووردارکردنی دامەزراندنی سوپا و سنووردارکردنی دەسەڵاتی دادوەری سەبارەت بە داوای تایبەت بە بەرپرسیارێتی کەسانی تاکی دەوڵەتی دوژمنکار لەسەر ئەنجامدانی تاوانی دژ بە ئاشتی و مرۆڤایەتی.

سزاکانی سەر پێشێلکاریی ئاشتی و ئاسایش لە مادەکانی ٣٩ و ٤١ و ٤٢ی دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکاندا چەسپێنراون.

سزا وەك شێوازێکی ناچارکردن تەنیا ئەو کاتانە پەنای بۆ دەبرێت، کە تاوانێکی نێودەوڵەتی قورس ئەنجام بدرێت. ناکرێت لە حاڵەتی تردا سزا بەکاربهێنرێت، چونکە سزا

کاردانەوەی کارێکی نارەوای ئەنقەستە یان گەیاندنی زیانی ئەنقەست. دوای شەڕی دووەمی جیهان سزای رامیاری و مادی بەسەر دەوڵەتە دوژمنکارەکاندا سەپێنرا.

وەك ئاشکرایە، دوای خۆبەدەستەوەدانی بێ مەرجی ئەڵمانیا بەپێی بەیاننامەی رۆژی ١٩٤٥/٦/٥ دەوڵەتە هاوپەیمانەکان دەسەڵاتی بەرزی دەوڵەتی ئەڵمانیایان گرتە دەستی خۆیان و چەکی ئەڵمانیایان داماڵی و هێزە چەکدارەکانیان سنووردارکرد و رێکخراوە نازییەکانیان هەڵوەشاندەوە و قەدەخەیان کردن. بەم جۆرە سیستەمی داگیرکارییان بەسەر ئەڵمانیادا سەپاند.

سزای ناچارکردن Reparations بەپێی مادەی ٣٤ی پرۆژەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان، بریتییە لە بژاردنی ناچاریی تەواوی ئەو زیانانەی لە کارە نارەواکەوە کەوتۆتەوە بە رێگەی **گەڕاندنەوە، یان قەرەبووکردنەوە، یان رازیکردن یانیش بە تێکڕایان:**[9]

١- گەڕاندنەوە: Restitution: پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتەی بەرپرسیارە لەسەر کارێکی نارەوا بەپێی یاسای نێودەوڵەتی ئیلتیزام بەگەڕاندنەوە بکات ، واتا گەڕاندنەوەی بارەکە بۆ شێوەکەی پێش کردنی کارە نارەواکە، بەمەرجێك ئەم گەڕاندنەوەیە:

ا- لە رووی مادییەوە مەحاڵ نەبێت.

ب- قورساییەکی وا دروست نەکات، کە بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ئەو سوودەی لە گەڕاندنەوە لە جیهانی قەرەبووکردنەوە دەست دەکەوێت نەگونجێ.

٢- قەرەبووکردنەوە: Compensation: ئەگەر لە حاڵەتێکدا دەوڵەتی بەرپرسیار لەسەر کارێکی نارەوا نەیتوانی زیانەکە لە رێگەی گەڕاندنەوەوە ببژێرێت، ئەوە دەبێت پابەندبێت بە قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەی، کە لە ئەنجامی کارە نارەواکەیدا دروستبووە. قەرەبوویش هەموو ئەو زیانانە دەگرێتەوە، کە دەکرێت لە رووی داراییەوە هەڵسەنگێنرێن و ئەو هەلانەش دەگرێتەوە، کە لەباربوون بۆ سوودوەرگرتن ئەگەر مسۆگەربوونایە.

٣- رازیکردن: Satisfaction: پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتەی بەرپرسیارە لەسەر کارێکی نارەوا بەپێی یاسای نێودەوڵەتی بەرامبەرەکەی لەسەر ئەو زیانەی لێی کەوتووە رازی بکات،

9- Draft articles on Responsibility of States for internationally wrongful acts. Articles 34 - 38

ئەگەر نەکرا ئەو زیانە چاککاتەوە لە ڕێگەی گەڕاندنەوە یان قەرەبووکردنەوەوە.

دەکرێت رازیکردن بەشێوەی دانان بێت بە پێشیلکارییەکەدا یان داوای لێبوردنی فـەرمی یان هەر شێوەیەکی گونجاوی تر، بەڵام نابێت بە شێوەی سـووکایەتی بێـت بەرامبــەر دەوڵەتـە بەرپرسەکە، بگرە دەبێت گونجاو بێت، لە هاوسەنگی زیانەکە زیاتر نەبێت.

زۆر جار سزای گەڕاندنەوە Restitution بریتی دەبێت لە گەڕاندەوەی ئەو موڵکانــە، کـە بە شێوەی نایاسایانە دەستی بەسەردا گیراوە و لە لایەن دەوڵەتی داگیرکارەوە لە خاکی وڵاتــی داگیرکراوەوە گواستراوەتەوە. بۆ نموونە بەپێی مادەی ٧٥ی پـەیمانی ئاشـتی نێـوان دەوڵــەتانی هاوپەیمان و ئیتاڵیا ئەمەی دوایی ئیلزام کرا، کە هەموو ئەو موڵك و ماڵانەی دەستی بەسەردا گرتووە لە هەر وڵاتێکی تر بە زووترین کات بۆیانی بگەڕێنێتەوە.

دەکرێت ئەم شێوەیەی گێڕانەوەی ماڵ و موڵکە، لە حاڵەتی دەستبەسەرداگرتنی نایاسـایی لەکاتی ئاشتیشدا پێڕەوبکرێت، ئەگەر هاتوو ئەو شتەی دەسـتی بەسـەرداگیراوە لەبــەر هــەر هۆیەك لەناوچووبێت، ئەوە دەکرێت ڕێگەی Substitute، واتـا گۆڕینــەوەی بــە شـتێکی تــر پێڕەوبکرێت. بـۆ نموونــە ئەگــەر شـتە براوەکـە ئۆتۆمبیــل یــان ئـامێری کارگایـەك بێـت و لەناوچووبێت ئەوە دەکرێت لە جیاتی ئەو شتێکی دیکە وەربگیرێتەوە.

بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی، دەکرێت لێسەندنەوەی ماف وئیمتیازاتی لێ بکەوێتــەوە، وەك بێبەشکردنی دەوڵــەتێك لــە دەنگــدان، یــان بێبەشـکردنی لــە نوێنەرایــەتی لــە یــەکێك لــە ئۆرگانەکانی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی، یان بێبەشکردنی لە مافی یارمەتیدان و پێشکێشـکردنی خزمەتگوزاری، یانیش لە ڕێکخراوەکە دەربکرێت وەك دوا هەڵوێست.

پێشــێلکردنی رەوشــتی دبلۆماســی وەك کــاری نادۆســتانە و سەرپێچــی لــە ئەتــەکێتی دیپلۆماتی و سیسـتەمی نیشـتەجێبوونی بیــانی، ئــەم بەرپرسـیارێتیانەیان لــێ دەکەوێتــەوە بەرامبەر ئەو دەوڵەتەی پێیان هەڵساوە:

١- پیادەکردنی هەلوێستی هاوشێوە (retortion)

٢- ئاراستەکردنی گلەیی reprehensiert

٣- رازی کردن repress

٤- پەرچدانەوەی سووکایەتیکردنretort .

# باسی سێیەم

## دۆخەکانی لابردنی بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی

بەپێی مادە تایبەتەکان بە بەرپرسیارێتی دەوڵـەتان لەسـەر کـاری نـاڕەوا بـەپێی یاسـای نێودەولەتی لەم حالەتانەی خوارەودا دەولەت بەرپرسیار نابێت:

### ١- رازیبوون:

رازیبوونی دەولەتێك بە شێوەیەکی ئاسایی لەسەر کـارێکی نـاڕەوای دەولـەتێکی دیکـە، سیفەتی ناڕەوایەتی ئەو کارە لادەبات سەبارەت بە دەولەتی ڕازیبوو، ئەگەر هاتوو ئەو کارە لە چوارچێوەی ئەو ڕازیبوونەدا بێت.

### ٢- بەرگریکردن لەخۆ:

سیفەتی ناڕەوایەتی نامێنێت لەسەر ئەو کارەی دەولەت پەنای بۆ دەبات وەك شـێوازێکی رەوا بۆ بەرگریکردن لە خۆ بەپێی مـادەی ٥١ی دەسـتووری نەتـەوە یـەکگرتووەکان لـەکاتی هێرشی چەکداریدا، تاوەکو ئەنجومەنی ئاسایش کردەکاریی پێویست وەردەگرێت بۆ پاراسـتنی ئاشتی نێودەولەتی.

### ٣- هێزی بەرگرینەکردە: (القوة القاهرة) Force majeure:

ناڕەوایەتی هەلدەگیرێت لەسەر کارێکی ناڕەوای پێچەوانەی ئیلتیزامی نێودەولەتی، ئەگەر ئەو کارە بە هۆی هێزێکی بەرگرینەکردەوە، یان رووداوێکی چـاوەڕواننەکراوەوە و لـە دەرەوەی ئارەزووی دەولەت ئەنجامدرابێت بە شێوەیەك جێبەجێکردنی ئیلتیزامە نێونەتەوەیەکە مـەحالّ بێت لە رووی ماف پێشێلکردنەوە.

### ٤- دۆخی پێویست: Necessity:

دەولەت ناتوانێت پەنابەرێتە بەر حالەتی پێویست وەك بەلگەیەك بۆ لابردنـی ناڕەوایـەتی لەسەر کارێکی نەگونجاو لەگەلّ ئیلتیزامێکی نێونەتەوەیدا، بەدەر لەم دوو حالەتەی خوارەوە:

١- ئەگەر ئەو کارە تەنیا ڕێگەبێت لە پێش دەوڵەتەکە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکی گەوهەریی، کە تووشی مەترسییەکی مەزن و چاوەڕوانکراو بووە.

٢- ئەگەر ئەو کارە کاریگەرییەکی مەزنی هەبێت لەسەر بەرژەوەندییەکی گەوهەری ئەو دەوڵەتە یان ئەو دەوڵەتانەی ئیلتیزامەکە لە بەرژەوەندییان بوو، یان لە بەرژەوەندیی تێکڕای کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بووە.

### ٥- کردەکاری بەرامبەری:

نارەوایەتی لەسەر کاری پێچەوانەی ئیلتیزامی نێودەوڵەتی لادەچێت، ئەگەر وەك کردەکارییەك لە پێناو وەلامدانەوەی کارێکی نارەوای دەوڵەتی سوودمەند لە ئیلتیزامەکە پەنای بۆ برا.

### ٦- دۆخی تەنگانە:

ئەگەر دەوڵەتێك لەتەنگانەدا، پەنا بباتە کارێك، ئەگەرچی نارەواش بێت لە یاسای نێونەتەوەیدا، بە مەبەستی پاراستنی ژیانی خۆی، یان ژیانی هاوولاتیانی، نارەوایەتی لەسەر ئەو کارە لادەچێت بەدەر لەم دوو حاڵەتە:

١- ئەگەر تەنگانەکە لە ئەنجامی رەوشتی دەوڵەت خۆی، پێکەوە لەگەڵ هەندێ هۆکاری تردا، هاتبێتەکایەوە.

٢- ئەگەر ئەو کارە مەترسییەکی هاوشێوە لەگەڵ تەنگانەکەدا بەرپابکات[١٠].

10- Draft articles on Responsibility of States for internationally wrongful acts. Articles 20 - 26

# سەرچاوە بەکارهێنراوەکان

1- Allen Buchanan. Federalism, Secession, and the Morality of Inclusion, Arizona Law Review, vol. 37, Spring 1995.
2- Alexis Heraclides, Secession, Self-Determination, and Nonintervention: In Quest of a Normative Symbiosis, Journal of International Affairs 45:2 (Winter 1992)
3- Allen Buchanan, Secession: The Morality of Political Divorce from Fort Sumter to Lithuania and Quebec (Boulder: West view Press, 1991),
4- Brownlie, Ian, the Rights of People in Modern International Law, In James Crawford (ed) The Rights of Peoples, Oxford: Clarendon Press, 1988
5- Brownlie. I, Principles of Public International Law, 5th Eden, Oxford. 1998
6- P.Birnie and A.Boyle,Internationed Law and the Environment, Oxford University Press, 3rd edition 2009
7- Lea Brilmayer. Groups, Histories, and International Law, Cornell International Law Journal, vol. 25, 1992.
8- Lea Brilmayer. Secession and Self-Determination: A Territorial Interpretation, Yale Journal of International Law, vol. 16, winter 1991.
9- B.S. chimni, International Law and world order, New Delhi, 1993
10- C. Lloyd Brown-John. Self-Determination, Autonomy and State Secession in Federal Constitutional and International Law, South Texas Law Review, vol. 40, no. 3, Summer 1999.
11- J. Charney, Universal International. Law 87 Ajil 1993
12- Lenard J. Cohen, Broken Bonds, Boulder :West view Press,1995
13- O, Connell; State Succession in Municipal Law and International Law, Cambridge, 1967. vol,2,7
14- D. Yaram, Collective Human Rights of Peoples and minorities, (1976) 25 International and Comparative Law Quarterly 102, Oxford University Press
15- Eileen Denza, Diplomatic Law, London.1976
16- M.Dixson & McCorquodale, Cases & Materials on International Law 3rd Eden, London.2000
17- G. Fitzmaurice, The General Principles of International

Law, Considered from standpoint of the Rule of Law, 92. HR. 1957.

18- Geoffrey Robertson; Crimes Against Humanity: The Struggle for Global Justice New Press; Third Edition, 2007

19- D. Greig , International law , 2nd end , London . 1976. P.156

20- Peter Malanczuk, Lakehurst's Modern Introduction to International Law, Seventh Revised Edition Routledge,1997

21- Raju G. C. Thomas, Nation. States, and secession: Lessons from former Yugoslavia , Mediterranean Quarterly,Vol.5 Number 4 Fall 1994

22- Richard Falk, Self-Determination under International Law: The Coherence of Doctrine versus the Incoherence of Experience. In The Self-Determination of Peoples: Community, Nation, and State in an Interdependent World, ed. Wolfgang Danspeckgruber (Boulder: Lynne Reiner Publishers, 2002)

23- Hillier, Timothy: Principles of Public International Law, SE London, Sidney, 1999

24- Robert W. McGee, Secession Reconsidered, Journal of Libertarian Studies, 11:1 (Fall, 1994)

25- Thomas D.Musgrave, Self-Determination and National Minorities Oxford: Clarendon Press, 1997

26- Urs W. Saxer,' the Transformation of Soviet Union: From a Socialist Federation to Commonwealth of Independent States. Loyola of loss Angeles International Comparative Law Journal, july1992.

27- -M.N Shaw, the Title to Territory in Africa,: International Legal Issues, Oxford, 1986

28- Crawford J. The creation of states in International law oxford: Clarendon Press 1979

29- James Crawford, the Creation of States In International Law, 2Edn Clarendon Press, Oxford. 2006

30- S.Hoffman, International Systems and International Law, 14 world politics.1961-2

31- H. kelsen , The Law of the united Nations , London, 1950

32- -.H ·Kelsen Principles of International Law 2 Eden, New York 1966

33- -J. Klabbers: An introduction to internationa Law institutional Cambridge Univerisity Press ;2007

34- H. Lauterpacht.International Law, Collected Papers, Vol 1. General Works. Cambridge , 1970
35- H. Lauterpacht. International Law and Human Rights, London. 1950
36- -Malcolm Anderson, Frontiers – Territory and state formation in the modern world, Polity Press Cambridge .1996
37- Malcolm Shaw; International Law; Cambridge University Press; 6 edition, 2008
38- F.A. Mann, Germanys present Legal state Revisiteed 16 1 CLQ, 1967
39- Malcolm N. Shaw; Principles of Public International Law ;Oxford University Press, USA; 7th edition, 2008
40- N. A Maryan Green: International Law .3ed London 1987
41- A. D McNair, the Law of Treaties, Oxford. 1961
42- G. Mattingly, Renaissances. London. 1955
43- R Mulerson, International Law, Rights and Politics, London.1994
44- Nusbaum,A.Concise History of the Law of Nations, New York,Macmillan,1962
45- D. Murphy ;Principles of International Law; Thomson West; 1 edition 2006
46- L.Oppenheim. International Law, 8th.ed. London. 1963.
47- Samantha Besson & John Tasioulas; The Philosophy of International Law; Oxford University Press, USA, 2010
48- M.N.Shaw.International Law. 4th Ed.Combridge.1999-
49- M.N Shaw, the Title to Territory in Africa: International Legal Issues, Oxford, 1986
50- -G. Schwarzenegger and E.D. Brown, manual of International Law, 6th Ed, London. 1976
51- L.Sohn, World Peace Through world Law 3rd end. New york.1966
52- -Sinclair I, The Vienna Convention on The Law of Treaties, 2end ed , Manchester.1984
53- C. Simmons, UK Abolition of the Doctrine of Government: A Rose by another Nam? Public Law 1981
54- J. G. Starke, The Acquisition of Title to Territory by Newly Emerged States, 41 British Yearbook of International law, 1965
55- Rebecca M. Wallace, International Law 4th Eden, London .2002

56- V. Tunkin, General Theory of sources of International Law; Indian J Int L 474 (1797)
57- G.T. Tunkin, Co- existence and International Law,95 HR,
58- Volker Hüls: State Responsibility for Crimes under International Law: Filling the Justice Gap in the Congo, , April 2004
59- M. Weller. The International Response to the Dissolution of the Socialist Federal Republic of Yugoslavia, 86 AJIL, 1992
60- N.D. White: The law of international organizations ; Manchester University Press' 199
61- Vita Gudeleviciute, Does The Principle of Self-Determination Prevail over The Principle of Territorial Integrity, International Journal of Baltic Law volume2, No,2 (April 2005)
62- И. Владимиров; Международно публично право, София 2001
63- И.Лукашук. международное право.Москва.1997
64- Орлин Борисов. Международно публично право, София. 2003
65- Т. Ядкар, Нацията Като Субект на Межународното право София.1977
66- А. Шишков. Международно публично право. Пловдив 2000
67- Благой Видин , Международно публично право - обща част Издател: ИК С-2000
68- Георгиев. Денчо Суверенитетът в свременно международно право софия 1990
69- И . И.Лукашук. международное право.Москва.1997
70- М.Ганев. Международнправна система эа опаэване на световня мир и сигурност София 2000
71- Мулешкова индивидът в свременно международно публично право софия 1992
٧٢- ارثر نوسيوم: الوجيز في تاريخ القانون الدولي – ترجمة وتعليق . د. رياض القيسي، بغداد، ٢٠٠٢.
٧٣- ايفانوف. س. ا: القانون الدولي. المحرران، كولوسوف وكوزينتسوف، موسكو، ١٩٩٤.
٧٤- د. إبراهيم احمد شلبي: مبادئ القانون الدولي العام – الدار الجامعية، ١٩٨٥.
٧٥- د. الشافعي محمد بشير، قانون حقوق الإنسان. الطبعة الثالثة، منشاة المعارف بالإسكندرية، ٢٠٠٤.
٧٦- د. جابر إبراهيم الراوي، مشكلات الحدود العراقية الإيرانية والنزاع المسلح، الطبعة الاولى، بغداد، ١٩٨٩.
٧٧- جيردهارد فان غلان، القانون بين الأمم، الجزء الثاني، تعريب وفيق زيدي، بيروت، ١٩٧٠.

٧٨- ا. ا. لوكاشوك: القانون الدولي العام، القسم العام، موسكو، ١٩٩٧.
٧٩- علي صادق أبو هيف: القانون الدولي العام، الاسكندرية، ١٩٧٥.
٨٠- عصام العطية: القانون الدولي العام، الطبعة السادسة، بغداد، ١٩٩٨.
٨١- عبد الوهاب الحراري، القانون الدولي العام وتطوره وعلاقاته بالمجتمع الدولي، دار الفرجاني.
٨٢- د. عبد الكريم علوان: الوسيط في القانون الدولي العام، النشر والتوزيع دار الثقافة، ٢٠٠٦.
٨٣- غازي حسن صباريني: الوجيز في مبادئ القانون الدولي العام ، النشر والتوزيع دار الثقافة، ٢٠٠٥.
٨٤- د. طالب رشيد يادكار، مبادىء القانون الدولي العام، اربيل، ٢٠٠٩.
٨٥- سموحي فوق العادة، القانون الدولي العام، دمشق، ٩٦٠.
٨٦- محمد المجذوب ، القانون الدولي العام، دار الحلبي.
٨٧- د. محمد طلعت الغنيمي: الأحكام العامة في قانون الأمم ١ قانون السلام، منشاة المعارف بالإسكندرية.
٨٨- د. محمد يوسف علوان: القانون الدولي العام، دار وائل للنشر، الطبعة الثالثة، ٢٠٠٣.
٨٩- د.عبدالفتاح عبدالرزاق: اعلان عن الدولة، اطروحة دكتوراه، مقدمة الى كلية القانون والسياسة، جامعة صلاح الدين، اربيل، ٢٠٠٨.
٩٠- د.عبدالفتاح عبدالرزاق: عدم التدخل والتدخل في القانون الدولي الطبعة الاولى، اربيل، ٢٠٠٢.
٩١- عثمان على ويس: دەروازەيەك بۆ ياساى گشتى نێودەڵەتى، چاپى يەكەم، هەولێر، ٢٠٠٨.
٩٢- شورش حسن عمر: حقوق الشعب الكوردي في الدساتير العراقية، الطبعة الاولى، السليمانية، ٢٠٠٥.العام:

### گۆڤار و بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکان:

1. International Court of Justice (ICJ) Rep.1988 ,pp 12 - 13
2. ICJ. Reports, 1992, pp. 3.32.94
3. ICJ. Reports, 1989, pp.15.73-74.88
4. -ICJ Reports, 1949, P.174
5. ICJ Reports, 1951, P. 15
6. 8ILR,PP.444,450
7. 10 ICJ Reports, 1969 PP.3,53
8. ICJ Reports,1986,PP.554,633
9. ICJ Reports,1996, Paras.79 and 95
10. ICJ Reports, 1986,PP.14,99-100
11. ICJ Reports,1986 PP.14,102
12. ) 88 AJIL,1994,PP.515
13. A/Res/1514 (XV

14. U.N General Assembly official Records: fifteenth Session supplement No. 16 ( A- 4684) Res. 1514 (XV
15. Official Records of the Economic and social council, 44th session , Supplement. No.6 ( E /5265)
(1998) 161 DLR (4th) 385, 394.
16. Island of Palmas Case (The Netherlands v United States) See United Nation Reports on International Arbitral Awards 2 (1920) 829, Huber Sole Arbitral.
17. Yearbook. Of the International Law commission, 1968 vol.11 P-92
18. International Court of Justice Reports, 1994, PP 6.37; 100 ILR PP. 1, 36
19. International Court of Justice Reports, 1994, PP 6.37; 100 ILR PP. 1, 36
20. Guideline on the recognition of new. States in eastern European and the Soviet Union accepted at a special ministerial Meting of the Twelve on 12,1991
21. Keesings Contemporary Archives p 4-5 and Hoskins, Kongo
22. -General Assembly Resolution 3061(XXVIII)
23. -General Assembly Resolution 2024 (XX) and 2151 (XXI) and Security Council Rest. 216 (1965) and 217 (1966)
24. LM, 1992 , p 1486
25. Customs Regime between Germany and Austria Case ,PCIJ Ser A/B (1931) No.41 Permanent Court of International Justices
26. UKMIL, 57 BYIL.1986 pp.507-508
27. General Assembly Res.31/61A 80 – R Mulerson, Internaional Law,Rights and Politics, London.1994,
28. IL, 1991, pp.559-60
29. 799 HC Deb, col.23, 6/4/1970
30. DUPIL, 1981- 1988, vol. 1, 1993, po 295
31. 408 HL, Deb, cols, 1121-1122, 28/04/ 1980
32. Yearbook of the ILC, 1974, vol.2 p.192
33. Yearbook of International law Commission 1974 vol .11, part 1, p.263
34. 92 International Law Reports, PP.173- 174
35. The Agreement on Joint Measures with Respect to Nuclear Weapons, 31 International Legal Materials 1992
36. - Vienna Convention on succession of states in respect of Treaties 1978.Articie 2(f)

37. . Vienna Convention 1978.Artcle 17(3) and article 27(
38. Yearbook of the ILC, 1958. VOI.11, P.24
39. ICJ, Reports, 1952, PP.176, 188
40. Report of the 5th Committee of the League 6.12.1920
41. -22. ILR .P.349
42. General Assembly Res. 2145 (xx1) and 2248 (xx11)
43. -Security Council Res. 263 (1969), 269 (1969) and 276 (1970)
44. -ICJ Reports, 1974. P.16; 49 ILR, P.3
45. Security Council Res. 683(1990)
46. Us Diplomatic and Consular staff in Iran Case (United States v Tehran) ICJ Rep. 1980 P. 3
47. Foreign Affairs Committee, Report, PP.XXXIII- XXXIV
48. R.V Secretary of state for the Home Department ex parte Bagga [1991] I AII ER 777 court of Appeal
49. 81 AJIL. 1987. P. 937
50. Draft articles on Responsibility of States for internationally wrongful acts.
51. Convention on International Liability for Damage Caused by Space Objects 29 Nov. 1971
52. 6 ILR , PP.362 , 364
53. GA /11030 at 6/2/2010
54. International Convention on Civil Liability for Oil Pollution Damage. Brussels, 29 November 1969
55. Treaty on Principles Governing the Activities of States in the Exploration and Use of Outer Space, Including the Moon and Other Celestial Bodies. 19 Dec. 1966 See A/RES/2222 (XXI).
56. Convention on International Liability for Damage Caused by Space Objects 29 Nov. 1971 See A/RES/ 2777 (XXVI).





**نووسەر لە چەند دێڕێکدا:**

د. تالیب رەشید یادگار لە ساڵی ١٩٤٧ لە کەرکووك لەدایك بووە و خوێندنی سەرەتایی و دواناوەندی هەر لەوێ تەواوکردووە.

– ١٩٧٠ بەکەلۆریۆسی لە یاسا لە زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.

– ١٩٧٠ - ١٩٧٢ لە کەرکووك پارێزەر بووە.

– ١٩٧٧ دکتۆرای لە یاسای نێودەوڵەتی لە زانکۆی سۆفیا لە بۆلگارستان وەرگرتووە.

– ١٩٧٩-١٩٨٠ لە زانکۆی عەنابە لە جەزائیر مامۆستای یاسای نێودەوڵەتی بووە.

– ١٩٨١-١٩٨٦ لە ئیزگەی رادیۆی سۆفیا سەرنووسەری راگەیاندن بووە.

– ١٩٨٧-١٩٨٨ لە لەندەن Kcc سەرۆکی مەڵبەندی رۆشنبیری کوردی بووە.

– ١٩٩١-٢٠٠٣ بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیای Sontac ی بولگاری بووە.

– ٢٠٠٣-٢٠٠٧ لە کۆلێجی یاسا و رامیاری لە زانکۆی سەلاحەدین مامۆستا بووە.

– ٢٠٠٧ تاوەکو ئێستە بەڕێوەبەری گشتیی کاروباری یاسایی لە دیوانی سەرۆکایەتیی هەرێمی کوردستان-عێراق.

– لە ١٩٦٧وە تاوەکو ئەمڕۆ سەدان وتاری لە بواری رۆژنامەوانی و ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و یاساییدا بەزمانی کوردی و عەرەبی و بولگاری بڵاوکردۆتەوە.

– لە ساڵی ١٩٦١وە بەبێ دابڕان بەشداری لە بزووتنەوەی ئازادیخوازی گەلی کوردستان کردووە، بە هەموو شێوەکانی خەباتی.

**پەڕتووك و تۆژینەوەكانی نووسەر:**

١- پرەنسیپەكانی یاسای نێودەوڵەتی گشتی. بە عەرەبی.

٢- هەندێ لایەنی پاراستنی نێودەوڵەتی مافی مرۆڤ. بە عەرەبی.

٣- هەندێ لایەنی دانیشتووان وەك پێوەرێكی دەوڵەت. بە عەرەبی.

٤- هەندێ لایەنی هەرێم وەك پێوەرێكی دەوڵەت. بە عەرەبی.

٥- دەوڵەتە داخراوەكان. بە كوردی.

٦- نەتەوە وەك كەسی یاسای نێودەوڵەتی — دكتۆرانامە بە زمانی بولگاری.

٧- كەسایەتیی نێودەوڵەتی نەتەوە. بەزمانی بولگاری.

٨- كەسایەتی نێودەوڵەتی. بە عەرەبی